# سەردەم ١٩

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کولتووری بیانی




خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: ئازاد بەرزنجی

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: یادگار ئەوڕەحمان



ناونیشان

سلێمانی - فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن: 2130347

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵات

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044162 8486008 – Faz: 0044 162 84 77660

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی ژمارە

14665/615 و 14665/616 تاران

لە ڕێگەی ( e~mail )ەوە

sardam@sardam.org


گۆڤاری (سەردەم) هەر لە سەرەتاوە ویستوویەتی پەنجەرەیەك بێت لەسەر کەلتووری بێگانە، بە تایبەتیش بوارەکانی فەلسەفەو فیکرو تۆژینەوەی ڕەخنەی ئەدەبیو هەڵبژاردە لە دەقی بێگانەو هونەرەجوانەکان. بە مەبەستی ئاشناکردنی خوێنەری کوردیش بەو کەلتوورە؛ گۆڤاری (سەردەم) جەخت لەسەر هەڵبژاردنی چۆنیی بابەتەکانو وەرگێڕانی سەرکەوتوو دەکات. هەر بۆیە ئومێدەوارە کە بتوانێت لەم ڕێیەوە؛ لە بزاوتی ڕۆشنبیریی کوردیدا بە جۆرێك لە جۆران ڕۆڵی خۆی ببینێت. ئەوەش ڕادەگەیەنین کە ئەم گۆڤارە گۆڤاری هەموو وەرگێڕێکی کوردە کە ئەم پێڕەوە ڕەچاو بکات.


دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

سەردەم 19

Sardam

شوباتی
2002
ساڵی چوارەم


# ناوەرۆك

# مۆمی چوارەمی "سەردەم"

بە ژمارەی 19، گۆڤاری سەردەم تەمەنی سێ ساڵ لە دوای خۆیەوە بەجێدێڵێت و پێ لە چوارەم دەنێت، پێوانە بۆ نرخاندنی ساڵی تەمەن لە باری کلتووریدا کە مەبەستی ئێرەی ئێمەیە، چ لەسەر ئاستی کەس و چ وەك کۆمەڵ و دەزگا یان ڕۆژنامەو گۆڤار، لە ڕوانگەی پەرەپێدانی فیکرو دەوڵەمەندکردنی بوارە جیاوازەکانی ڕوناکبیری بە گشتیو بە تایبەتیش ئەو ژانرەیە کە خۆی لەسەر بنیاتناوەو بانگەشەی بۆ کردوەو توانیویەتی هەوڵەکانی خۆی تیا دەرببڕێت.

بە جۆرێکی تر لە بە پسپۆڕی کردنی خۆیدایەتی بۆ ئەو بوارەی خۆی بۆ تەرخانکردوەو چەندیش توانیویەتی بۆ پراکتیزەکردنی ئەو خەونانە لە گیانی سەردەمەکەی نزیك بکەوێتەوەو پێوانە سونەتیو باوەکان ببەزێنێت. ئەگەر توانای پێبەپێ ڕۆیشتنی سەردەمەکەی نەبوو لەسەر ئاستی کرانەوە بەسەر پەنجەرە مەعریفیەکانی دنیادا، یان بەهرەی بوونە -دەنگێك-ی نەبوو بۆ پاراستنی تایبەتمەندیەکانی خۆیو دۆزینەوەی ماناو دەلالەتە وردەکانی کارەکەی کە بەرجەستەی جیاوازیەکانی بکات، ئیدی ڕەوایەتی مانەوەی دەدۆڕێنێت و دەبێتە ئەو تاقە خوێندنەوە بێزارکەرەی کە تەنیاییشت لێدەبێزرێنێت. کرانەوەی هەر گۆڤارو چاپەمەنیەك بە سەر بیری نوێی دنیاو بە پیرەوەچوونی هەر چەمك و شەپۆلێکی جیاواز بە پەیڕەوکردن لە ڕەوشی دیموکراتیانە بۆ گەشانەوەی پشکۆی ئەو بیرانە کە بێ سڵکردن خۆ دەربڕن، هۆی سەرەکی گەشەکردن و بەردەوامی بە زیندو ڕاگرتنی گیانی ئەو ژانرەن. ئایا سەردەم لە ماوەی سێ ساڵی تەمەنیدا چی بۆ ئەم لایەنانە کردوە؟ ئەو "چی"یەی کە هێشتا شایەتەکانی ئامادەن و بێگومان بواری پەناو پەسێوی نابەجێ نادەن.

هەر لە ژمارە یەکەوە سەردەم شناسی خۆی وا کرد کە گۆڤارێکی کلتووری تایبەت بە وەرگێڕانە، وەرگێڕانیش پردی بەستنەوەی کلتوورە جیاوازەکانی دنیایە بە یەکترەوە، پردێك کە لە مەعریفەی کوردیدا تا ڕادەیەکی زۆر نادیارو ناکاریگەر بوەو دەشێت ئەمڕۆ کاتی دروستکردنی هاتبێت دوای ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر دنیاو ناوچەکەو بە تایبەتیش بەسەر کوردستاندا هاتوە. واتا بیرکردنەوە لە پرۆژەیەك کە بە تەمای کەندولەندی زۆرو کۆسپی فرە بووین لە ئەنجامدانیدا. ئەمەیش پێویستی بە کۆمەڵێك پایەی ڕوناکبیرانەیە تا بتوانرێت لەو خاڵی سفرەوە دەست پێبکرێت و ڕێگا بۆ ئەو پێکگەیشتن و لێکگەیشتنە خۆش و خۆشتر بکرێت.

هەر لەو سەرەتایەوە -بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەو پرۆژەیە- دەستەی نووسەرانی سەردەم لە دیدی تاك ڕەهەندیو بە چاوی تەسکی تاك مەودابیەوە بەرهەمیان هەڵنەسەنگاندوە. چونکە ئەوە وەك بیروباوەڕ، کەمکردنەوە بوە لە خەمی گەورەی ڕوناکبیریانەی خۆیان و خەونی پرۆژەکە، کە وەك ئەنجام هەردووکیان دەڕژێنە نێو ئاستی گەشەکردن و فراوانبوونی گۆڤارەکە یان شکستخواردنی. تاقە نەخشەو پلانی چەسپیو بۆ ئەم دیدە، واڵاکردنی زیاتری ئاسمانی بیرو گەڕان بوە بەناو شەقامە تاریکەکانی ئاوەزدا بۆ درەوشانەوەیەکی تازەو دۆزینەوەی ئەو ئەستێرە دوورانەی

دەبوو دەستی هـزرو بـە شارستانی بوونمـان زووتـر بیانگاتـێ، چونکـە پەیوەندیـە مرۆڤایەتیـەکان لـە وشـەوە دەستپێدەکەن و وشەیش ئەسڵی شتەکانە بۆ گۆڕینـەوەی ئەزموونـە دەوڵەمـەندەکانی ئـەم سـەردەمە زۆر خێرایـە، سەردەمێك کە هەموومانی لە ژوورێکی بچووکدا کۆکردۆتەوەو لەوە شەرمتر نیە لە پەنایەکی کلتووریی ئەو ژوورەدا لە یەکدی نەگەین و ئاشنای گیانی یـەکتر نـەبین، هـەر لـە ڕێگای ناسینی ڕۆحەکانەوەیە دەتوانین کۆڵانـەکانی ژیـان و ئایندەمـان بکەینـە باخ و زیندانەکانمان بگۆڕیـن بە قوتابخانـە. زەویـە مینڕێژکراوەکـان بـە عـەقڵی سـەلەفیو قبـووڵ نەکردنی بەرانبەرو تاك جەمسەری بڕیارەکان پاك بکەینـەوە. چەند بتوانین هـەر لـە ڕێگـای زمانـەوە کـە پرۆسـەی وەرگـێڕان سـەرەکیترین ڕەگـەزێتی ڕایەڵـە پسـاوەکانی کلتووریمـان ببەسـتینەوە بـە دنیـای دەرەوەوە. دیـارە ئەمـە حەقیقەتی ڕوە گەشاوەکەی ئەم سەردەمەیەو ڕێنپیگرتنی مایـەی دواکەوتن و کەوتنە، چونکە مرۆڤ لـەوە دەرچـوە چرای وشـەکانی لەناو تاریکایی توناوتونی میدیای شارێکی چەپەکدا سانسۆر بکرێت و دەست لە بینـی ڕاکـانی بنرێت. ئەمڕۆ لە ڕێگای تۆڕەکانی دەزگایەکی پڕ لە موجیزەی وەك ئەنتەرنێتـەوە، هـەر لـە ژووری ماڵەکـەت و شـوێنی کارەکەتدا دەنگی گفتوگۆی هەرە جیدی لەسەر کێشە هەنووکەییەکانی سەردەم و مەسەلە ئاڵۆزەکانی دنیای سیاسەت و ئـابوریو کلتورو تـەکنیك دەکرێت، کرانـەوەی دنیا تـەنیا کرانـەوە نیە لەسـەر کێشـەی دراوو تـەنگژەی بازرگـانیو ڕێگاکانی بە یەکتر گەیشتن، بەڵکو کرانەوەی دەرگاشە بەسەر فیکرو فەلسەفەو ئایدیای نوێو مەزەب و ڕوانینی جیاو هەناسەی ئازادیدا، سەردەمی دەربڕیـن و خۆسەلماندنە، دەرکەوتنی شوناسی جیاوازو تایبەتمەندیە گومبوەکانـە. زەمانێکە بۆ گفتوگۆی کلتورەکـان بەڕەهـەندی بە ڕەونـەق و کـەم -وزەیانـەوە. بە ڕووناك و تاریکیانـەوە، ئەگـەرچی دەشێت نە زمانی یەکگرتوو نە کلتووری هاوبەشیان هەبێت، بەڵام پردی دیالۆگی زیندو بۆ لێکبوردن و لەگەڵ یەکتردا هەڵکردن و پەرەدان بە گیانی خەونە ئینسانیەکان لەهەر کونیەك بن زمانێکی هاوبەشی هەیە، وتنی گۆرانیەکانە بە ئاوازی ڕەنگاڵەیی نەك بە ڕیتمێکی نەگۆڕی بێزارکەر. ئەگەری داخران لەسەر ئەم سەردەمە، واتا ژیان لـە تاریکاییداو سڕینەوەی ئومێدەکانی ئایندە. ئێمە مەحکوومین بە کرانەوە بەسەر دنیایەکدا کە لە دنیای دوێنێ ناچێت. ئیدی تۆ هەر ئەوەندەت لە سەرە لە جوانیەکانی هەڵبژێرێت و بەهرەمەند بیت -ئەگەر خۆت گەیاندبێتە پلەی هەڵبژاردن- و ئەو دیاردەو تەکنیکە دزێوو ڕواڵەتیانەیش کە دەیانەوێت ڕۆحت بکەنە ماشینێکی ڕەق و تەق و بێگیان بیانبوێریت، هەروەها بواردن و تووڕدانی ئەو دەستە ڕەشانەیش کە چاوەچاوی کوشتنی گیانی سەردەمیانەو کار بۆ گەڕانەوەی سەردەمانێك دەکەن کە مێژوودەستی یادکردنەوەی لێ شتوون..

پار -لە سێیەمساڵی تەمەنی سەردەمدا- زیاتر ئەم حەقیقەتانە دەرکەوتن، ئەوانەیش کە هێشتا لە بن پەردەدا بوون، بە تایبەتی دوای تراژیدیاکەی *11*ی سیبتامبەری ئەمریکاو شکستی توانا ڕەشەکان لە ئەفغان و شوێنی تردا. ئەگەر تاکە مانایەك لە دوای ئەو ڕوداوانەوە هەبێت ئەوەیە ئێمە -وەك کورد- بەشێکین لەو پێکهاتە مرۆڤایەتیەی کە کارەساتەکان کاری لێدەکەن و دەبێت ئێمەیش لە ئاستی ئەو کارلێکردانەدا بین. ئەگەر بە خوێنی تازەو توانای تازەوە پێشوازی ڕووداوەکان نەکەین، چۆکی داهێنان و بیرمان لە زەوی دەدات. گۆڤاری سەردەم بۆ ساڵی ئایندە، خۆی بە بەرپرسیاری گۆڕان و ئەو خوێنە تازەیە دەزانێت و خوێنەرو نووسەرەکانیش لەو بەرپرسیاریەتیە نابوێرێت.

***سەرنووسەر***

حەلیم بەرەکات

# ڕۆشنبیران لە کۆمەڵگای عەرەبی هاوچەرخدا

## چەند سەرنجێك دەربارەی ڕیشەو بنەما چینایەتیەکانیان


تابلۆیەکی شێوەکار بەشار عیسا

**و. ناوات نەحمەد**

کاتێك تۆژەر دەیەوێت لەو پەیوەندییە بکۆڵێتەوە کە لە نێوانی جێگای ڕۆشنبیرانی عەرەب، لە بونیادی چیانەیەتیداو بەرهەمە ڕۆشنبیرییەکەیاندا هەیە، خۆی دەبینێتەوە، ناچارە لە سفرەوە دەست پێبکات. لەبەر هۆیەکی سادە توشی ئەم گرفتە دەبێت، بریتیە لە بزری تیۆریزەکردن و لێکۆڵینەوەی مەیدانی دەربارەی ئەم مەسەلە ئاڵۆزە.

کارە جیدیەکان بایەخیان بەم پەیوەندیە نەداوەو جارجارە بە شێوەیەکی سەرپێیی ئاماژەیان کردوە بۆ هەندێك لە وەرچەرخانە چینایەتیەکان لە کۆمەڵگای



محەمەد عابد

کەواتە پێش ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی دەربارەی ڕەگوڕیشەی ڕۆشنبیران و ئینتیمای چینایەتییان، ئەنجام درابێت، ئێمە دەتوانین چی بڵێین؟

عەرەبیی هاوچەرخدا. ئەگەر کتێبە زۆر بڵاوەکەی ئەلبیرت حۆرانی بپشکنین ، کە دەربارەی فیکری عەرەبییە لە سەردەمی ڕێنیسانسدا سەرمان سوڕ دەمێنێت لەم فراوانیە وردەو ئەم تەخشکردنە دوورو درێژەی بیری دیارترین بیریارەکانی عەرەب. حۆرانی هەموو ئەمانە دەکات بێئەوەی هیچ بایەخێك بدات بە پەیوەندیی نێوان فیکرو ڕەگوڕیشە چینایەتیەکانی، لەگەڵ ناکۆکیی وململانێ کۆمەڵایەتیەکان[1].

هەروەها هیشام شەرابی هاوڕێم، دەری دەخات، کە لە پۆلاندنی ڕۆشنبیرانی عەرەبدا، بێ مەبەست شیکردنەوەی چینایەتیانەی پشتگوێ خستوە، ئەگەڕاوە بە دوای سەرچاوەکانی بیرکردنەوەیان و سروشتی ئەو ململانێیەی بەڕیوەی دەبەن، بۆیە هەوڵی داوە لە نوسینەکانی دواتریدا قەرەبۆی ئەو پشتگوێخستنانە بکاتەوە[2]. لەگەڵ ئەوەدا کە عەبدوڵڵای عەرەوی پەنای بردۆتە بەر پێڕەوی مێژوویەتی و تەرکیزی کردۆتە سەر بیری ئایدیۆلۆجیی، وەلێ ئەویش خۆی لە شیکردنەوەی چینایەتی خافڵاندوەو بەوەوە داکەوتوە، مەسەلەی نوێکردنەوەو ململانێی نێوانی لیبراڵیزم[1*] و سەلەفیەت[2*] ڕوون بکاتەوە لە چوارچێوەی پێکگەیشتن یان بەریەك کەوتنی ڕۆشنبیریی عەرەبیی . ئیسلامی و ڕۆشنبیریی خۆراواییدا[3].

محەمەد عابد جابری[3*] و هی تریش سەرقاڵی مەسەلەی هەڵبژاردن بوون لە نێوانی نمونەی عەرەبی ئیسلامی و نمونەی ئەوروپیدا. ئەویش دیسان سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی جەنگی نێوان کۆن و نوێ بوە دوور لە ململانێی چینایەتی[4]. لەگەڵ ئەدۆنیسدا خەسڵەتەکانی ڕۆشنبیری باو دەبن بە خەسڵەتی زەینی بۆ ئەو تاقمانەی لە دەستەڵاتدان، نەك زیهنیەتی تەواوی کۆمەڵگای عەرەبی، بەڵام جارجارە لەسەر ئاستێکی ڕۆشنبیری مەسەلەکە لێکدەداتەوە، هەروەك خۆی ئاماژەی بۆ دەکات "لێکۆڵینەوە دیاردە ڕۆشنبیریەکان لە خودی خۆیاندا، بە جیا لە بنکە مادییەکانیان و ... بونیادی ئابوری و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان"[5].

کەواتە پێش ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی دەربارەی ڕەگوڕیشەی ڕۆشنبیران و ئینتیمای چینایەتییان، ئەنجام درابێت، ئێمە دەتوانین چی بڵێین؟ خۆ ئەگەر چەند سەرنجێکی گشتیمان پێشەکش کرد، ئایا جگە لەوەی بە گریمانە دایان بنێین و بڵێین پێویستییان بە سەلماندنە، دەبێ بیانهێڵینەوە بۆ دوای ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی سۆیۆلۆجیی لە ئایندەدا"[6].

لەبەر هەموو ئەمانە، ئەم لێکۆڵینەوەیەی خۆم بە هەوڵێك دادەنێم بۆ خستنە ڕووی گرفتی لێکۆڵینەوەی ڕۆشنبیری لە ڕەسەن و ئینتیمای چینایەتیدا، لە هەمان کاتیشدا بۆ

ئایا ڕۆشنبیران ئەوانەن كە بە وشە مامەڵە دەكەن، ئەو كاتەش وتەو كردەوە لەیەك جیابكەینەوە

پێشكەشكردنی چەند سەرنجێك. گریمانەیەك و پێناسەكردنی هەندێك لە زاراوەكان و پرەنسیپە پێویستەكان كە ڕەنگە یاریدەدەر بن بۆ ڕێخۆشكردنی ئەنجامدانی ئەو چەشنە لێكۆڵینەوە پێویستانە.

یەكەمجار توشی مەسەلەی دیاریكردنی ڕۆشنبیران دەبین، یان بیریاران، یاخود ئەنتلیجنسیا، ئەمەش مەسەلەیەكە، زۆرجار وا تێدەگەین زۆر ڕوونەو پێویستیمان بە پێناسەكردنی نیە.

## ڕۆشنبیران كێن ؟

ئایا ئەوانەن كە پلەیەكی دیاریكراوی خوێندنیان تەواو كردوە (ئەمە ڕەگەزی هاوبەشە لە نێوانیاندا)، چ پلەیەك؟ بۆ تەواوكردنی ئەم پرسیارە، ئایا ئەوانەن كە مومارەسەی چەشنە كارو چالاكیەك دەكەن ، كە تێیدا پسپۆڕییان وەرگرتوە. بڵێین ئەوانە پارێزەرو ئەندازیارو ئوستادو مامۆستاو ڕۆژنامەنوس و نوسەرو زانایانی ئاین و بەڕێوەبەران و هی ترن؟

ئەگەر لەسەر ئەم پێناسەیە ڕێك كەوتین، با هەموومان پێكەوە پرسیار لەو جیاوازییانە بكەین كە لەسەر چەند ئاستێكی جیا جیادا لە نێوانی ئەم پیشانەدا هەیە؟ ئایا جگە لە خوێندن چی تریش كۆیان دەكاتەوە؟ ئەو پایەیەی لە بونیادی چینایەتیدا داگیری دەكەن كۆیان دەكاتەوە؟ ئایا یەك شوێنی دیاریكراو لەو بونیادە چینایەتیەدا، داگیر دەكەن؟

ئایا ڕۆشنبیران ئەوانەن مومارەسەی هونەرێك دەكەن ، لەگەڵ ئەو چالاكییانەدا كە پێویستییان بە سەرفكردنی توانای عەقڵی هەیە، زیاتر لەوەی پێویستییان بە توانای ماسولكەیی هەبێت؟ لەم حاڵەتەدا چی لە سەرمایەداران و پیاوانی كارسازو دەرەبەگ و بەڕێوەبەران و فەرمانڕەوایان جیایان دەكاتەوە؟ بگرە سروشتی پەیوەندیان بە چینە بۆرژوازیەكانەوە چۆنەو هەڵوێستیان لە مەسەلە گشتیەكان چۆن چۆنیە؟ هەروەها چی بیریارێكی خاوەن سامان لەگەڵ یەكێكی تری بێ ساماندا كۆ دەكاتەوە؟

ئایا ڕۆشنبیران ئەوانەن كە بە وشە مامەڵە دەكەن، ئەو كاتەش وتەو كردەوە لەیەك جیا بكەینەوە، وەك چۆن كاری فیكری و كاری دەستیمان لەیەك جیاكردەوە، تا بڵێین ڕۆشنبیران ئەوانەن كە قسە دەكەن و كردەوەیان نیە، یان ئەوە دەڵێن كە جێبەجێی ناكەن، یان ئەوە دەكەن كە نایڵێن و ئەوەش ناكەن كە دەیڵێن وەكو لە سەرنجەكەی دۆستۆیڤسكییەوە[4*] هەڵی دەهێنجین ، لە كتێبەكەیدا چەند سەرنجێك دەربارەی جیهانی خوارەوە، دەربارەی لێكدابڕانی ئەو مرۆڤەی كە تێڕامان دەكات و ئەو مرۆڤەش كە كردەوەی هەیە، لەو كاتەدا دێتە وەڵام ***"بەڕێزان سوێند دەخۆم كە هوشیاری***


دیستۆفیسكی

*نەخۆشیەکی سەختە.. جا کێ دەتوانێت شانازی بە نەخۆشیەکەیەوە بکات... ئێمە بیر دەکەینەوەو بە بیرکردنەوەش نابین بە هیچ ... بە دەگمەن باوەڕمان بە خۆمانە... بەڕێزان ئایا دەزانن، ڕەنگە من تەنیا لەبەر ئەوە خۆم بە مرۆڤێکی زیرەك دابنێم کە بە درێژایی ژیانم نەمتوانیوە هیچ شتێك دەست پێبکەمو هیچ تەواو بکەم .."*[6].

بۆچی هانا ببەین بۆ دۆستۆیڤسکی لە کاتێکدا کە نوسەرێکی عەرەب، کە سەعید تەقیەدینە وتویەتی ڕۆشنبیران ئەوانەن کە ئەوەندە پێگەیشتوون هەتا ڕزیون و بۆگەنیان کردوە؟ ئەگەر ئەم ڕەوتە بگرینە بەر لە پێناسەکردنی ڕۆشنبیراندا ، ئەوا ئێمە لەسەر بناغەی بیرەکانیان تێمان ڕوانیون نەك لەسەر بنەمای کردەوەو کارە کۆمەڵایەتیەکانیان و ڕۆڵیان لە ململانێ کۆمەڵایەتیەکاندا، بەڵام خۆ هەندێك وادەکەن و ئاماژە دەکەن بۆ ڕۆشنبیران بەوەی پیاوانی بیرن، وەك ئەوەی لە خۆراوادا دەوترێت. ڕەنگە لەمەش زیاتر بڕۆین و پرسیار بکەین چ چەشنە بیرێك، بەمەش بچینە ناو جەنگێکی ترەوە لە جەنگەکانی پۆلاندن و بۆمان دەربکەوێت کە ئەهلی بیر دابەشبوون یان ڕاستر پەرت وبڵاو بوونەتەوە بەسەر ئەو کایەو ئاڕاستەو بوارو ڕۆڵانەدا کە بە دەگمەن پێکدەگەنەوە.

ئایا ڕۆشنبیران ئەوانەن کە بە پلەی یەکەم بایەخ دەدەن بە هۆشی کۆمەڵگا لە خۆیداو زانین بڵاو دەکەنەوە، بە زانینی خودو ئەویترو واقیعیشەوە، بایەخ دەدەن بە پێویستیی کۆمەڵگا بۆ ڕوونکردنەوەی ناسنامەکەی خۆی و تێڕوانینی خۆی، بە تەسەوراتەکانی و ڕەمزەکانی و باوەڕەکانی و ئاکارو ئامانجەکانی و خەونەکانی و هیواکانی و ئاڕاستەکانی و نامەکەی و دەسکەوتەکانی، هتد. لێرەشدا دیسان ڕەنگە ڕۆشنبیران لە دیدیاندا جیا جیا بن و هەندێکیان لە چوارچێوەکانی ڕۆشنبیریی باوەوە دەست پێبکەن و هەندێکی تریان لە چوارچێوەی ڕۆشنبیریە لاوەکیەکانەوە. هەندێکی تریش پێوەست دەبن بە دژە ڕۆشنبیریەوە. لەم لایەنەوە دەبینین کە یەك تێڕوانینی تۆکمە پێشکەش ناکەن، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە، دەبینین دەڕواننە هەموو چینەکان و گروپە بەگژ یەکدا چوەکان، ڕاست و نێوەندو چەپ، بۆ کۆمەڵگای بۆرژوازی و کۆمەڵگای سوسیالیست، بۆ جوڵانەوە سەلەفیەکان و جوڵانەوە عەلمانیەکان، بۆ پاریزکاران ولیبراڵ و پێشکەوتن-خوازەکان، بۆ شەڕو ئاشتی و ناشەڕو ناناشتی. ڕەنگە لەبەر ڕۆشنایی ئەم پرسیارانەدا بۆمان دەربکەوێت زۆر گرانە بگەینە دیاریکردنێکی تەواو و سەرانسەریی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە هەوڵێك بدەین.

بە بڕوای من ڕۆشنبیران ئەوانەن کە بە پلەی یەکەم بایەخ دەدەن بە چالاکیە فیکریەکان، سەرقاڵی لێکۆڵینەوەو داهێنان و ڕاڤەکردن و فێرکردن و گـــوزارشت کردن و

بە بڕوای من ڕۆشنبیران ئەوانەن کە بە پلەی یەکەم بایەخ دەدەن بە چالاکیە فیکریەکان، سەرقاڵی لێکۆڵینەوەو داهێنان و ڕاڤەکردن و فێرکردن و گـــوزارشت کردن و دارشتنی ڕەمزەکانن

دارشتنی ڕەمزەکانن بۆ ئامانجە باڵاکان تا تێگەیشتن و زانین و هوشیاریی و نەخشەکێشان و کارکردنیش دەگرێتەوە.

ئەگەر وەك پرەنسیپ ئەم سنورکردنەمان قبوڵ بێت و لەسەر گفتوگۆکەمان بەردەوام بین، ڕەنگە بگەینە ئەنجامێك کە ناتوانین خۆمانی لێ لابدەین، ئەویش بریتیە لەوەی ڕۆشنبیران چینێك یان گرووپێك پێك ناهێنن، بەڵکو بریتین لە توێژ یان پلە. بە پێی زانینی من لە پێشدا، داهێنەران لە زانست و فەلسەفەو هونەرەکاندا بوونیان هەیە، پاشان ڕاڤەکەران و لێکدەرەوەکان و کارگەرانی بواری فێرکردن و بڵاوکردنەوە. پاشان ئەو پیشەوەرانەی سامانیان هەیەو خەریکی ئەو پیشانەن کە پێویستی بە پسپۆڕیی و شارەزایی هەیەو زانینێکی قووڵ و بیرکردنەوەیەکی وردیان پێویستە، وەکو پزیشك و پارێزەرو ئەندازیارو بەڕێوەبەران و ئیداریەکان و پیشەوەرەکانی تر.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم سنورکردنەدا، کە پێویست بوو بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی لێرە بە دواوە توشمان دەبن، دەتوانین بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆتر مەسەلەی ڕەگوڕیشەو ئینتیمای چینایەتی ڕۆشنبیران و کاریگەریان لەسەر بەرهەمی ڕۆشنبیریان چارەسەر بکەین. بۆیە لێرەدا دەپرسین: ئایا ڕۆشنبیران چینێکی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن، یان دەستەو تاقمن، یاخود ڕۆڵ و وەزیفەی کۆمەڵایەتین ، یاخود توێژی جیا جیان لە بونیادی هەرەمی چینایەتیدا؟

ئایا ڕۆشنبیران چینێکی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن، یان دەستەو تاقمن، یاخود ڕۆڵ و وەزیفەی کۆمەڵایەتین ، یاخود توێژی جیا جیان لە بونیادی هەرەمی چینایەتیدا!

## فرەچەشنی و ناکۆکی

وەڵامەکەمان بۆ ئەم پرسیارە، بە دوبارەکردنەوەی وتەی فرەچەشنی و جۆراوجۆری ڕەگوڕیشەی ڕۆشنبیران و ئینتیمایان و شوێنەکانیان و ئەرکەکانیان و ئاراستەکانیان و جێگاکانیان بە نیسبەتی مەسەلە گشتیەکانەوە دەست پێدەکەین. زۆرجار ئەم فرەچەشنیە دەگاتە ئاستی ناکۆکی و ململانێ.

لە ڕووی ڕەگوڕیشەوە دەبینین لە چین و توێژە جیاجیاکانەوە دێن، بەڵام ئێمە دەزانین لە کۆمەڵگای عەرەبیدا، لە سەرەتاکانی سەردەمی بوژانەوەداو بە لایەنی کەمەوە تا دەگاتە دەوروبەری سەربەخۆیی، خوێندن تایبەت بوە بە نەوەی خێزانە بۆرژوازیە گەورەکان و لەناو هەندێك لە گروپەکاندا لەوانیتر بەربڵاوتر بوە. سەرباری کرانەوەی بوارەکانی خوێندن لە بەردەمی چینە جیاجیاکاندا لە دوای سەربەخۆییەوەو بڵاوبوونەوەی فراوانی تا گەیشتە جوتیاران و کۆچەریان وچینە میللیەکان لە شارەکاندا، دەتوانین سوور بین لەسەر ئەوەی کە دیموکراسییەتی خوێندن هەتا ئێستاش لەسەر هەردوو ئاستی چەندێتی و چۆنێتی لە قەیراندایە. لە لێکۆڵینەوە مەیدانیەکان و سەرنجە گشتیەکانەوە دەزانین، پەیوەندیەکی ناچاری هەیە لە نێوانی

ئاستی چینایەتی و چەشنی ئەو پەروەردەیەی کە خوێندکاران وەری دەگرن (تایبەت بێت یان ڕەسمی، نیشتمانی بێت یان بیانی) تەنانەت لەو وڵاتە عەرەبیانەشدا کە خوێندنی ڕەسمی تیایاندا بڵاوە. هەر بۆ وێناندنی ئەوەی وتمان ئاماژە دەکەین بۆ لێکۆڵینەوەیەك کە (سەفییە موحسین)ی زانای ئەنترۆپۆلۆجیا*5 ئەنجامی داوەو بۆی دەرکەوتوە سیستەمی کرانەوە لە میسر هەلی تازەی بۆ ئەو ژنانە ڕەخساند کە دەرچووی ئەو قوتابخانەو زانکۆیانەن، کە پێڕەوی پەروەردەکردنێکی بیانی دەکەن. وەك زانکۆی ئەمریکی لە قاهیرە بۆی دەرکەوت خێزانی بۆرژوازیەکان وایان پێباشترە کچەکانیان بنێرن بۆ پەیمانگاو زانکۆ بیانیەکان، بۆئەوەی تێکەڵاوی ئەوەی چینە میللیەکان نەبن و دەشزانن فرسەتی کارکردن لەگەڵ کۆمپانیا بیانی و نیشتمانیەکاندا بۆ ئەمان زیاترە(9).

هەروەها جێی سەرنجیشە، بە نیسبەتی ئەو ڕۆشنبیرانەوە کە سەر بە ڕەسەنە میللیەکانن، بە زۆریی ڕۆشنبیری شێوازێك لە شێوازەکانی هەڵکەنران دەبێت، چونکە پەیوەندیان بە چینەکانی خۆیانەوە دەپچڕێنن و ئاوێتەی چینە بۆرژوازیەکان دەبن، نکوڵی لە ڕەسەنەکانیان دەکەن. ئەم دیاردەیە دەگاتە ئەوپەڕی بایەخداری، نەك تەنیا لەبەر بڵاو بوونەوەی زانست، بەڵکو بە هۆی فراوانبوونی ڕەوکردن بۆ شارەکان و فراوانبوونی خودی چالاکیە ڕۆشنبیریەکان، کە جاران لە بنەڕەتدا تەنیا زانستە ئاینیەکان و پیشەییەکانی دەگرتەوە، لەم سەدەیەدا گەیشتە فەلسەفەی عەلمانی و زانستە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکان و هونەرە جیاجیاکان. بە واتەیەکی تر، بڵاوبوونەوەی خوێندن و زیادبوونی ڕەوکردن لە لادێوە بەرەو شارو فراوانبوونی بوارەکانی ڕۆشنبیری و گۆڕانی ئەرکەکانیان کە بوو بە هۆی بەرین-بوونەوەی قەبارەی چینە ناوەڕاستەکان و سەرهەڵدانی توێژی نوێ ئەگەر نەڵێین چینی نوێ. ئەوەی لە بایەخی مانای ئەم وەرچەرخانە کۆمەڵایەتیە زیاد دەکات ئەوەیە، زوربەی زۆری ڕۆشنبیران و بە تایبەت ڕۆشنبیرە کاراکان، لە ئەسڵدا سەر بە چینە بۆرژوازیەکانن.

لە ئەنجامی دروستبوونی ئەم توێژە نوێیانەدا لە پاڵ توێژە دێرینەکاندا، چینە نێوەندەکان بایەخێکی ئابوری و ڕۆشنبیریان دەس کەوت و بەمەش بایەخی سیاسییان زیادی کرد هەروەك لە دامەزراندنی پارتە سیاسیە برواییەکان و دامەزراندنی سوپا نیشتمانیەکانەوە دەردەکەوێت، ئەمەش ڕێی خۆش کرد بۆ کودێتا سەربازیەکان کە لە زۆرێك لە وڵاتە عەرەبیەکاندا چینە بۆرژوازیە گەورەکانیان لەسەر حوکم لابردو خۆیان جێیان گرتەوەو پشتیان بەو بیرو تیورانە بەست کە ئەنتلیجنسیای عەرەبی پێشکەشی کرد. ئا لێرەوەیە کە هەندێکجار وای بۆدەچن، کە لە چەند وڵاتێکی عەرەبیدا ڕۆشنبیران فەرمانڕەوان، یان لە پشتی فەرمانڕەوا سەربازیەکانەوەن. دەڵێم وای بۆ

بە نیسبەتی ئەو ڕۆشنبیرانەوە کە سەر بە ڕەسەنە میللیەکانن، بە زۆریی ڕۆشنبیری شێوازێك لە شێوازەکانی هەڵکەنران دەبێت، چونکە پەیوەندیان بە چینەکانی خۆیانەوە دەپچڕێنن و ئاوێتەی چینە بۆرژوازیەکان دەبن


لۆکاش

بیریاران چینێک پێک ناهێنن، بەو مانایەی کە جوتیاران و کرێکاران و پیشەسازان چینی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن، چونکە ڕۆشنبیران لە هەموو لایەکی جیهانی کۆمەڵایەتییەوە دێن

دەچن لەبەرئەوەی لە لایەکی ترەوە سەربازییەکان ڕۆشنبیرانیان کرد بە فەرمانبەر یان ناچاریان کردن لەناو وڵاتدا بێدەنگ بن، یان نەفیان کردن بۆ دەرەوەی وڵات. ئا لێرەوەیە کە من لە وتارێکی ترمدا دەگەمە ئەو دەرەنجامەی بیری عەرەبی کەوتۆتە ژێر قورسایی داگیرکەرانەوە[10].

ئەو دەورانە هەرچییەك بن کە ڕۆشنبیران لە کۆمەڵگای عەرەبیی ئێستادا دەیبینن، هێشتا هەر ڕوونە، خۆیان لە خۆیاندا چینێك پێك ناهێنن. لە دیدێکی مارکسیانەوە دەتوانین بڵێین ئەوانە پلەیەکی نێوەند داگیر دەکەن لە نێوانی دوو چینە سەرەکیە بەگژ یەکدا چووەکەدا، هەندێکیان کار بۆ چەسپاندنی چینە فەرمانڕەواکان دەکەن و بەها بۆرژوازییەکان هەڵدەبژێرن، هەندێکی تریان، خۆیان لە ئینتیماکانیان ڕزگار دەکەن و بەشداری دەکەن لە تیوریزەکردندا بۆ چینە زەحمەتکێشەکان و کار دەکەن بۆ گەشەپێدانی هوشیاریی چینایەتی و ڕێکخستنی لەناو پارتە ڕادیکاڵەکانداو بەمەش دەگۆڕێن لە چینەکانەوە بە خۆیان بۆ چینەکان لە خۆیاندا. جۆرج لۆکاش[6*] دەڵێت خاڵی سەرەتا لە فیکری بۆرژوازیەت و ئامانجەکانیدا، بریتییە لە پاساودانەوەی سیستمی باو[11]. بەڵام توتالیتاریزم[7*] کە بە حوکمی هەڵوێستەکەی ڕاسپێررا بوو بە ئەرکی وەرچەرخاندن و هێنانە شۆڕشی کۆمەڵگا[12]، ئەویش هەر پشت بە ڕۆشنبیران دەبەستێت، لە هەردوو پرۆسەی پێکهێنانی هوشیاریی چینایەتی و ڕێکخستن لەناو پارتە شۆڕشگێڕەکاندا.

جۆزێف سچێمپتەر[8*] پێی وایە "بیریاران چینێك پێك ناهێنن، بەو مانایەی کە جوتیاران و کرێکاران و پیشەسازان چینی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن، چونکە ڕۆشنبیران لە هەموو لایەکی جیهانی کۆمەڵایەتییەوە دێن، بەشێکی گرنگی چالاکیەکانیان لە شەڕەکانیاندایە دژی یەکتریی و پێشڕەوی کردنیان بۆ داکۆکی کردن لە بەرژەوەندیەکانیان. بەمجۆرە گۆشەنیگاو بەرژەوەندی دەستەیی بایەخداریان بۆ دروست دەبێت، ژمارەیەکی زۆریان وا لێدەکات بە جۆرێك ڕەفتار بکەن، بە زۆری وابەستەی زاراوەی چینە کۆمەڵایەتیەکان دەبێت[13] بۆیە ئەوەندە بەس نابێت بەوە دیاریان بکەین، خوێندنی باڵایان تەواو کردووە.

کارل مانهایم[9*] پێی وایە ئەمە ڕۆشنبیران پێکەوە کۆ دەکاتەوەو دەستەو تاقمە جیاجیاکانیان ڕێکدەخات و ململانێکە لە ئاستی بەرژەوەندیە مادیەکانەوە دەگوازێتەوە بۆ ئاستی فیکر. ئا لێرەوەیە کاریگەری فراوانیان لەسەر چینەکان. ئا لێرەدایە گرنگیی داهێنانەکانیان[14]. بۆیە لای مانهایم ئەنتلیجنسیا "دەستەو تاقمی کۆمەڵایەتین، ئەرکی تایبەتییان بریتیە لەوەی لێکدانەوەی جیهان پێشکەشی کۆمەڵگا بکەن"[15]، وەڵێ هەندێکیان تەنیا ئەو ڕاستیانە دەبینن کە لە بەرژەوەندی چینی

دەستەڵاتداردان، هەندێکی تریشیان بە پێچەوانەوە تەنیا ئەو ڕاستیانە دەبینن کە بەشداری دەکەن لە پرۆسەی ڕماندن و وەرچەرخان لە دیوی چین و تاقمە چەوسێنراوەکانەوە. مانهایم بە گروپی یەکەم دەڵێت نوێنەری فیکری ئایدیۆلۆجیی و بە گروپی دوەم دەڵێت نوێنەری فیکری یۆتۆپی[16]، بەلام گروپی ئەنتلیجنسیا لە رووی کۆمەلایەتیەوە وابەستە نابێت ، لە نێوان ڕاستیە گرنگەکانی ژیانی نوێدا "چالاکیی فیکریی تەنیا چینێکی دیاریکراو مومارەسەی ناکات .. بەڵکو توێژێکی کۆمەلایەتی مومارەسەی دەکات کە وابەستە نیە بە هیچ چینێکەوە... ئەمەیە ئەو ڕاستیە کۆمەلایەتیەی کە لە کرۆکدا ناوازەیی فیکری نوێ بڕیاری لەسەر دەدات"[17] ئا لێرەوەیە توانایان بۆ ڕزگاربوون لە ڕیشەکانی خۆیان و تەنانەت لە ئینتیما چینایەتیەکانیشیان و تێپەڕاندنی گۆشەنیگا باوەکان.

## دەوری بونیادی کۆمەلایەتی

لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە لەگەڵ ئیدوارد شیلزی[*10] زانای کۆمەڵناسی ئەمریکیداین لەوەدا کە پێوەستە بە وەسفکردنی ئەرك و وەزیفەی ڕۆشنبیرانەوە، لە کۆمەڵگای عەرەبی تازەشدا زۆربەی ئەو ئەرکانە ڕادەپەڕێنن، وەلێ ئێمە لە سنورکردنی ئەوانەدا پێویستە لەوە دوورتر بڕۆین. ڕاستە بە تێپەڕبوونی کات پەرەدەسێنن بەهۆی وەرچەرخانەکانی بونیادە کۆمەلایەتیەکان، بەقەدەر ئەوەی قەبارەی کۆمەڵگا گەورە دەبێت و ئەو ئەرکانە زیاتر دەبن کە رووبەرووی فەرمانڕەواکانی دەبنەوە، ئەوەندەش پێویستی بۆ ڕۆشنبیران و پەیمانگا ڕۆشنبیریەکان زیاتر دەکات[18]. ئاشکراشە کە ڕۆشنبیران لەناو کۆمەڵگاو لە دەرەوەشیدا پێشڕەوی کۆمەڵگاکانی خۆیانن، وەلێ ناتوانرێت وەکو کۆمەڵێك دەوری ڕۆشنبیری سنور بکرێن، هەروەك زانایەکی کۆمەڵناسی ئەمریکی تر دەڵێت، واتە تالکۆت پارسۆنز[*11][19]. ئەم تەرزە دیاریکردنانە مەیلێك دەردەخەن بۆ تەرکیز- کردنە سەر پەیوەندی نێوان ڕۆشنبیرو دەستەلات. لەسەر حیسابی پەیوەندیەکانی بە کۆمەڵگاوە وەك گشت و لێپرسراوێتیەکانی لە وەرچەرخانی کۆمەلایەتیدا.

ڕەنگە کەس هێندەی ئەو ڕۆشنبیرانەی عەرەب ئاگاداری قەیرانی پەیوەندی ڕۆشنبیر بە دەستەلات و ڕژێمەوە نەبێت کە بەشێکی زۆریان بە هۆی بالادەست بوونی تەواوی دەوڵەتەوە بوون بە فەرمانبەر. لە لێکۆڵینەوەیەکی پێشووترمدا باسی پەیوەندی نوسەری عەرەبم کرد بە دەسەلاتەوەو ئاماژەم کرد بۆ چوار چەشنی ئەڵتەرناتیف لەو پەیوەندیانە: پەیوەندی بێباکی یان جیابوونەوەو بایەخنەدان بە

ئاشکراشە کە ڕۆشنبیران لەناو کۆمەڵگاو لە دەرەوەشیدا پێشڕەوی کۆمەڵگاکانی خۆیانن، وەلێ ناتوانرێت وەکو کۆمەڵێك دەوری ڕۆشنبیری سنوربکرێن

یەکتری، پەیوەندی چەوساندنەوە تا ڕادەی دانانی سنورێك بۆ بیری ڕەخنەیی، پەیوەندی ویسایەت کە بە زۆریی تەواوکەری چەوساندنەوە دەبێت، هەروەها پەیوەندی بەشداریکردنی سەربەستانە[20].

ئەو کاتە گەیشتمە دەرەنجامی ئەوەی کە پەیوەندی ویسایەت لەگەڵ چەوساندنەوەدا پەیوەندی باوە لە وڵاتە عەرەبییەکاندا. دەبینین ئێستا ئەو پەیوەندیە زیاتر چەسپیوە، بەڵام لە ڕووی پەیوەندی ڕۆشنبیر بە کۆمەڵگاوە، واتە بە هێزە ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆحی و کەلتوریەکانەوە لەگەڵ سیاسیەکانیشدا، دەبینین ڕۆشنبیرانی عەرەب وەکو خەڵکی تر دابەشدەبن لە نێوانی پێوەستبوون بە ڕۆشنبیری باوەوەو ڕۆشنبیریە لاوەکیەکانەوەو یاخود ڕۆشنبیریە دژەکانەوە[21]. ڕەنگە ئەوان زیاتر لە خەڵکی تر پێوەست بن بە ڕۆشنبیری دەستەبژێرەوە لەسەر حیسابی ڕۆشنبیری میللی.

دوای خستنەڕووی چەند بیروڕاو پێناسەیەك دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ناتوانرێت ڕۆشنبیران بە تاقمێك یان گروپێکی سەربەخۆ دابنرێن. دەگەینە ئەم دەرەنجامە چونکە ئەو ڕۆشنبیریەی بەدەستیان هێناوەو کاردەکەن بۆ ئەفراندنی و لێکدانەوەی و بڵاوکردنەوەی، پایەیەکی مادیی و مینۆکیی دیاریان دەداتێ و جێگایەکی نێوەندی داگیر دەکەن لە بونیادی هەرەمیی چینایەتیداو پێوەست دەبن بە هێزی بەگژ یەکدا چووەوە. زیاتریش مەیلیان لەوەیە پەیوەست بن بە چینە فەرمانڕەواکان و هێزە سەرکەوتوەکانی کۆمەڵگاوە. قسەکەی تاهیر لەبیبی هاوڕێشمان لێرەوەیە "زۆرینەی ئەهلی زانین وەك سەرهەڵدان و چارەنوسیش پێوەستن بە پەرەسەندنی چینە باڵادەستەکانەوە، لەتوێی تەوزیف بوونیاندا بۆ وەڵامدانەوەی پێویستیەکانی ئەوان[22].

بۆیە دەگەینە ئەوەی کە ئەوانە لە واقیعدا توێژێك یان چەند توێژێك پێکدەهێنن لە هەرەمی چینایەتیدا. ئەگەر بشمانەوێت وردتر بین، ئەمانە ئەو توێژانەن کە بە شێوەیەکی بابەتیانە پێوەستن بە چینە بۆرژوازیە نوێیەکانی کۆمەڵگای عەرەبییەوە.

دوای ئەوەی ئەم سەرنجانەم پێشکەش کرد لەمەڕ پێناسەی ڕۆشنبیران و ناسنامەکانیان، چیتر ماوە زیادی بکەین بۆ پرسیارە گشتیەکەمان دەربارەی پەیوەندی نێوان ڕیشەو ئینتیما چینایەتیەکان و بەرهەمو ئاڕاستەی ڕۆشنبیری؟

هەندێك، هەمیشە گریمانەی ئەوە دەکەن کە ئەو ڕۆشنبیرانەی لە ڕەسەنی میللیەوە هاتوون مەیلیان لەوەیە پێوەست بن بە مەسەلەی زەحمەتکێشانەوەو ئاڵای دژە شۆڕش هەڵبگرن، ئەوانەشی کە سەر بە ڕەسەنە بۆرژوازیە نێوەندەکانن مەیلیان لەوەیە کار

دوای خستنەڕووی چەند بیروڕاو پێناسەیەك دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ناتوانرێت ڕۆشنبیران بە تاقمێك یان گروپێکی سەربەخۆ دابنرێن.

کاتێك باروودۆخە بابەتی و خودیەکان دێنە دی و ڕۆشنبیران و ئەو زەحمەتکێشانە یەکدەگرن کە نامۆیی و بێبەشی و شکەنجەکانیان پێویستی بەو چەشنە شۆڕشە هەیە، ئەوکاتە شۆڕشی چاوەڕوانکراو ڕوو دەدات

بکەن بۆ گۆڕانکاری ڕیفۆرمیستانە لە توێی ڕژێمدا، ئەوانەشی کە دەگەڕێنەوە بۆ ڕەسەنە بۆرژوازیە ژووروەکان مەیلیان لەوەیە پێوەست بن بە ڕۆشنبیریی باوەوە. لێکۆڵینەوەی مەیدانی دروستی و نادروستی ئەم گریمانانەمان بۆ دەسەلمێنێت، لە کۆمەڵگای عەرەبییشماندا زۆرمان پێویست بەو لێکۆڵینەوە مەیدانیانەیە.

تا ئەوەش ڕوو دەدات، ناتوانین بڵێین بە تەواویی دروستن یان هەڵەن. چەند ئاماژەیەك لە ئارادایە بۆ بزری هوشیاری چینایەتی لەناو چینە میللیەکاندا، بەڵام زێدەڕۆیی دەکەین کاتێك دەگەینە ئەوەی کە چینی کرێکاران "ئامرازی وەرچەرخانی شۆڕشگێڕانە" پێك ناهێنێت، بەو حیسابەی کە "شۆڕشەکانی سەدەی بیستەم خۆیان شۆڕشی پرۆلیتاری نەبوون، بەڵکو شۆڕشگەلێك بوون کە ڕۆشنبیرانێك ڕێکیان خستوەو سەرکردایەتیان کردوە کە پشت بە جەماوەر دەبەستن و هاوپەیمانێتیان لەگەڵدا ساز کردوە"(23).

ئەدیم ئەل . بێتار جەختی لەسەر ئەم وتەیە کردوە، تاکو گرنگی دەوری ڕۆشنبیران لە وەرچەرخانە شۆڕشگێڕانەکاندا بسەلمێنێت، بەڵام دەشێت ئاراستەی پێچەوانەش بگیرێتە بەرو توژەر هەوڵ بدات گرنگی دەوری کرێکاران بسەلمێنێت بە هێنانەوەی ڕاستییەکانی بەردەست لە هەموو کۆمەڵگایەکدا، دەری بخات کە زۆرینەی ڕۆشنبیران حەزیان لە کاری ڕیفۆرمانەیە، نەك کاری شۆڕشگێڕانە. پاشان هاندەرەکانی وەرچەرخانی شۆڕشگێڕانە لە قوڵایی شکەنجەکانی چینە زەحمەتکێشەکانەوە دێت بەبێ بەشداریکردنێکی کاریگەریان. بە وتەیەکی تر، ڕۆشنبیران ناتوانن لە جیاتی چینە زەحمەتکێشەکان و بەجیا لەوان و بەبێ بەشداریی ئەوان، شۆڕش و کۆمەڵگای شۆڕگێڕی بهێننە دی. ئایا ئەمە هەڵەیەکی کوشندە نەبوو لە سوسیالیزمی عەرەبیدا؟

کاتێك باروودۆخە بابەتی و خودیەکان دێنە دی و ڕۆشنبیران و ئەو زەحمەتکێشانە یەکدەگرن کە نامۆیی و بێبەشی و شکەنجەکانیان پێویستی بەو چەشنە شۆڕشە هەیە، ئەوکاتە شۆڕشی عەرەبی چاوەڕوانکراو ڕوو دەدات.

هەتاکو ئەو هاوپەیمانێتییەش ڕوودەدات، جەنگی نێوەندی ڕۆشنبیران هەر بە جەنگێکی ڕۆشنبیری دەمێنێتەوە، بەبێ گوێدانە ئەسڵ و فەسڵ و ئینتیمای چینایەتیان.

## سەرچاوەو سەرنجەکان

1. *Albert Hourani Arabic thought in the Liberal Age 1798-1930 Oxford Univiristy press, 1962.*

جێی سەرنجە کە ئەم کتێبە ئاماژە ناکات بۆ زاراوەی چین یان چینە کۆمەڵایەتیەکان.

2. *Hisham Sharabi Arab intellectuals and the west: the formative Years1875-1914. The John Hopkins presses 1970.*

هەندێك هەوڵ دراوە بۆ ڕاڤەكردنی بیری عەرەبی ڕاڤەكردنێكی مادی مێژوویی وەك هەوڵەكانی مەحمود ئەمین العالم، حسین مەروەو تەیب تەیزینی. لەوانەیە بتوانین ئەمانە دابنێین بە ڕێخۆشكەرێك بۆ ئەم تەرزە لێكۆڵینەوانە دەربارەی بیری عەرەبی هاوچەرخ

3- عبدالله العروي ، العرب والفكر التاريخي ، بيروت دار الحقيقة 1973 ، هەروەها كتيبى الايديولوجية العربية المعاصرة، بيروت دارالحقيقة 1970.

4- محمد عابد الجابري، الخطاب العربي المعاصر، بيروت دار الطليعة، 1982 .

5- ادونيس، الثابت والمتحول: بحث في الاتباع والابداع عند العرب، بيروت، دار العودة. 1974، ج1، ص 29،24.

6- هەندێك هەوڵ دراوە بۆ ڕاڤەكردنی بیری عەرەبی ڕاڤەكردنێكی مادی مێژوویی وەك هەوڵەكانی مەحمود ئەمین العالم، حسین مەروەو تەیب تەیزینی. لەوانەیە بتوانین ئەمانە دابنێین بە ڕێخۆشكەرێك بۆ ئەم تەرزە لێكۆڵینەوانە دەربارەی بیری عەرەبی هاوچەرخ.

7. Teodor Distovisky Notes from Under ground, part1, section 1, ii amd v.

8- هەر لەم چەمكەوە زانای ئەمریكی لویس كۆزەر كتێبێكی خۆی دەربارەی ئەنتلیجنسیا ناو نا پیاوانی بیرەكان، تێڕوانینێكی سۆسیۆلۆجییانە.

Liws Coser Man of ideas: A Socialogost View 1965.

9. Safia Muhsin, " New Emages, Old Reflections: Wirking Middle class Wmen in Egept" in E,W Femea Led Wman and th family in the middle East,Austlim:Uneversity of texas press 1985,pp.56-71.

10- حليم بركات " الفكر العربي تحت الاحتلال" النهار العربي والدولي، 25 آذارامارس 1985.

11. George Locas. History and Class Conseonsess, Cambridge The MIT Press , 1971p.48.

12. Ibid, p.61.

13. Josepph Schumpeter. Cqupltalism, Saclalism and Democracy Harper.1942.pp.145-146.

14. Karl Manheim, Idology and Utopia. N.Y: A Harvest Book,1936.

15. Ibid, p. 10.

16. Ibid, p. 40,

17. Ibid, p. 156.

18. Edward Shis, "The intelectuals and the powers: Some Perspectives for Comporative Analysis". In Comparaative Studies un Society and History, Vol.1.No1, October, 1958.

19. Tilcott Parsons. "The intellectual: A Douvle day Ancbor Book.

20- حليم بركات، " الكاتب العربي والسلطة"، مواقف، العدد العاشر، السنة الثانية، 1970.

21- حليم بركات " المجتمع العربي المعاصر : بحث استطلاعي اجتماعي، بيروت، مركز دراسات الوحدة العربية.

22- الطاهر لبيب،" تساؤلات حول المثقف العربي والسلطة"، في المثقف العربي: دوره وعلاقتة بالسلطة والمجتمع، المجلس القومي للثقافة العربية، 1985، ص. 3.

23- نديم البيطار." المثقف و المجتمع" المثقف العربي: في المثقف العربي: دوره وعلاقتة بالسلطة والمجتمع، المجلس القومي للثقافة العربية، 1983، ص. 74. 75.

## پەراوێزی وەرگێڕ

[1]- لیبراڵیزم ,Liberalism بریتیە لەهەڵوێستێکی فەلسەفیی، یاخود جوڵانەوەیەکە کە بنەڕەتەکەی بایەخ دەدات بە پەرەپێدانی ئازادیی شەخسیی و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی. ئەمڕۆ لیبرالیزم یەکێکە لە ڕەوتە دیارەکانی بیرکردنەوەی دوای جەنگی سارد. ئێستا لیبرالیزم و دیموکراسییەت پەیوەندیی بەتینیان لەنێواندا هەیە، بەڵام لە ڕابردوودا زۆرێك لەوانەی بیرکردنەوەی لیبرالییانەیان هەبوو، دیموکراسییەتیان پێباش نەبوو و بەدیاردەیەکی ناتەندروستیان داناوە، چونکە هانی بەشداریکردنی جەماوەرییانە دەدات لە سیاسەتدا. دواجار لیبرالیزم خۆی بەوە پێناسەکرد کە بریتیە لە جوڵانەوەی گۆڕینی ڕەوشی کۆمەڵایەتی بە زیاترو زیاتر بەرینکردنەوەی مەوداکانی دیموکراسی.

[2]- سەلەفییەت ,Fundamentalism جوڵانەوەیەکی کۆنسێرڤاتیڤانەیە. واتە کۆنگەرای دژ بەگۆڕانکاریی، کە لەنێوانی پرۆتستانتەکانی ئەمریکادا سەری هەڵدا. سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە. ئەم ڕەوتە جەخت دەکاتە سەر بناغە بنەڕەتییەکانی مەسیحییەت و لەم باوەڕانەی خوارەوەدا کۆیان دەکاتەوە: پارێزراویی و بێ هەڵەیی کتێبی پیرۆز، لەدایکبوونی یەزدانییانەی عیسای مەسیح لە کچێکی پاکیزەوە، قوربانیدانی مەسیح لەسەر خاچ وەکو کەفارەتێك بۆ هەڵەکانی مرۆڤ، هەروەها زیندووبوونەوەی دووبارەی مەسیح وەکو جەستەو وەکو ڕۆح و مانەوەی بەزیندوویەتی لە دونیادا، هەروەها سەرلەنوێ زیندووبوونەوەی باوەڕداران لە مەلەکوتی یەزدانیدا. هەروەها ئیسلامەکانیش پێرەوێکی سەلەفییان هەیە کە هاوکات و تۆزێك درەنگتر لەوەی مەسیحییەکان دەستی پێکردووە لەبنەڕەتدا پشت دەبەستێت بە بیرکردنەوەی پێشینەکانی ئیسلام کە لەپاڵ قورئان و سوننەتی پەیامبەری ئیسلامدا، ڕەفتاری هاوەڵانی پەیامبەرو بۆچوونی زانایانی ئیسلامیش دەگرێتەوە، بەرادەیەك کە بوو بە بەربەستێك لەبەردەمی هەر تازەکردنەوەیەکی ئایینی ئیسلامیداو خەریکە دەبێت بەو خەتەرەی کە لەناوەوە ئیسلام لەناو دەبات.

[3]- محەمەد عابید ئەلجابری: نوسەرو بیریاری هاوچەرخی عەرەب، لەساڵی 1926 لە مەغریب لەدایکبوە. لەساڵی 1967دا دیبلۆمی فەلسەفەی وەرگرتوە لە کۆلیجی ئادابی زانکۆی ڕیبات و لەساڵی 1970دا دکتۆرای فەلسەفەی تەواو کردوە. ئێستا ئوستادی فەلسەفەو بیری هاوچەرخە لە زانکۆی محەمەدی پێنجەم لە ڕیبات. لەکتێبە ناودارەکانی : ئێمەو کەلتور 1980، بونیادی عەقڵی عەرەبی، لەدووبەرگدا 1982 . 1986، گرفتەکانی بیری عەرەبیی هاوچەرخ 1989.

[4]- دۆستۆیڤسکی، فیۆدۆر میخائیلۆڤیچ ,(Dostoyevsky, Fyodor Mikhaylovich (1821-1881 نوسەرو بیریارێکی ڕوسییە، یەکێکە لە مەزنترین ڕۆماننوسەکانی جیهان. کارەکانی ئەو تێڕوانینە ئایینییەکان،

سەلەفییەت جوڵانەوەیەکی کۆنسێرڤاتیڤانەیە - واتە کۆنگەرای دژ بەگۆڕانکاریی، کە لەنێوانی پرۆتستانتەکانی ئەمریکادا سەری هەڵدا. سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە

ناكارییەكان، سیاسییەكان، لەگەڵ دەروونییەكانی ئەو دەخەنە ڕوو. ڕۆمانەكانی گوزارشت لە دەروون و نەستی مرۆڤ دەكەن و خۆیان دەكەن بە كونجە تاریكەكانی كەسێتی مرۆڤدا ، ژمارەیەكی زۆر ڕۆمانی نوسیوەو سەرجەمی ئەو لاپەڕانەی نوسیونی خۆی دەدات لە بیست هەزار لاپەڕە ، لە دیارترین ڕۆمانەكانی ( تاوان و سزا *1866* ، گەمژە *1868* ، برایانی كارامازۆف *1879* ) .

[5]- **ئەنترۆپۆلۆجی** *Anthropology* بریتیە لە لێكۆڵینەوەی دیاردەكانی ناو ژیان و كەلتوری مرۆڤ، ئەم زانستە لەوە دەكۆڵێتەوە كە مرۆڤەكان چۆن دەژین، بیر لەچی دەكەنەوە، چی بەرهەم دەهێنن، چۆن كارلێك لەگەڵ ژینگەدا دەكەن. ئەنترۆپۆلۆجیستەكان دەیانەوێت ڕێژەیی فرەیی و جیاوازیی مرۆڤەكان تێبگەن، لەگەڵ ئەوەشدا كە مرۆڤەكان بەشێوەیەكی گشتی چۆنن. ئەوانە پرسیاری لەم چەشنە دەكەن: كەی ، لەكوێ، چۆن، مرۆڤ پەرەی سەندوە؟ مرۆڤەكان چۆن لەژینگەی جۆراوجۆردا دەژین؟ كۆمەڵگاكان چۆن لەسەردەمە دێرینەكانەوە پێشكەوتوون بەرەو سەردەمە نوێیەكان؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە یاریدەمان دەدەن لەوە تێبگەین كە پێی دەوترێت مرۆڤ.

[6]- **لۆكاش، جۆرج** *Lukacs, Georgy(1885-1971)* ڕەخنەگرێكی ئەدەبی هەنگارییە، هەروەها تیوریستێكی سیاسییشە، لەبۆدابیست لەدایك بوە، لەدەوروبەری ساڵی *1918*دا، لەوكاتەدا كەپەیوەندیی كردبوو بە پارتی كۆمۆنیستەوە، بەیەكێك لە ڕەخنەگرە مەزنەكانی ئەوروپا لەقەڵەم دەدرا. لەساڵی *1919*دا وڵات جێدەهێڵێت بەرەو ڤییەننا و لەوێ بەردەوام دەبێت لەسەر نوسین. دوای ئەوەی هیتلەر دەسەڵات دەگرێتە بەر، لۆكاش ڕوودەكاتە یەكێتی سۆڤێت و لەوێ لە پەیمانگای فەلسەفەی ئەكادیمیای سۆڤێتی دەسبەكار دەبێت. لەساڵی *1945*دا دەگەڕێتەوە بۆ هەنگاریا و دەبێت بەئەندامی پەرلەمان. لەساڵی *1956*دا بەشداری دەكات لەشۆڕشەكەی هەنگاریادا. دوای هەرەسی شۆڕشەكە، ئیتر كاریگەریی خۆی لەناو پارتی كۆمۆنیستدا لەدەست دەدات، بەڵام ڕێی پێدەدەن بەخانەنشینی لەوڵات بمێنێتەوەو خەریكی نوسینەكانی خۆی بێت. لەنوسینەكانی: مێژووو هوشیاریی چینایەتی *1923*، چەند لێكۆڵینەوەیەك لە واقیعییەتی ئەوروپایی *1948*، هەروەها ڕماندنی عەقڵ *1955*.

[7]- **تۆتالیتاریزم** *Totalitarianism* بریتیە لە زانستێكی سیاسی، سیستمێكی حكومەت و ئایدیۆلۆجیایەك، كە تێیدا هەموو چالاكییە سیاسی ، ئابوری، ڕۆشنبیری، كەلتوری، لەگەڵ چالاكییە ڕۆحییەكاندا، دەكەونە ژێر ئیختیاری سەرۆكەكانی وڵاتەوە. شەش حەوت خەسڵەتی گرنگ تۆتالیتاریزم جیادەكەنەوە: چەشنە ئۆتۆكراسییەتێكی تایبەت بە سەدەی بیستەم، كە لەشێوە كۆنەكانی ڕەهاییەت و پاشكۆیەتی و ستەمكارییەوە پوختە كراوە، لەفۆرمە دێرینەكانی ئۆتۆكراسییدا، خەڵكی بۆیان هەبوو بەشێوەیەكی سەربەخۆ بژین و كاربكەن، هەروەها خەسڵەتە سیاسییەكانی خۆیان پاراستبوو، بەڵام لەتۆتالیتاریزمی مۆدێرندا، ئەوا خەڵك بەتەواوەتی لە خەون و هیواو پێداویستییەكانیاندا، پشت بەپارتێكی سیاسی و سەركردەكانیان دەبەستن. ئۆتۆكراسیزمی دێرین لەلایەنی پادشایەكەوە، یان هەر ئەدرێسێكی تری ئەریستۆكراسەوە بەڕێوە دەبرا، كە بەپێی پرەنسیپی

**تۆتالیتاریزم بریتیە لە زانستێكی سیاسی، سیستمێكی حكومەت و ئایدیۆلۆجیایەك، كە تێیدا هەموو چالاكییە سیاسی ، ئابوری، ڕۆشنبیری، كەلتوری، لەگەڵ چالاكییە ڕۆحییەكاندا، دەكەونە ژێر ئیختیاری سەرۆكەكانی وڵاتەوە**

لە تۆتاڵیتاریزمی نوێدا وڵات لەلایەنی سەرکردەیەکەوە یان بەڕێوەبەرێکەوە بەڕێوە دەبرێت
کە کۆنترۆڵی پارتی سیاسیی دەسەڵاتداری کردوە

مافی لەوینەی یەزدانیی، وڵاتی بەڕێوە دەبرد، بەڵام لە تۆتالیتاریزمی نوێدا وڵات لەلایەنی سەرکردەیەکەوە یان بەڕێوەبەرێکەوە بەڕێوە دەبرێت کە کۆنترۆڵی پارتی سیاسیی دەسەڵاتداری کردوە.

8- **جۆزێف سچێمپێتەر** *Schumpeter, Joseph Alois (1883-1950),* ئابوریزانو تیوریستێکی سوسیالیستی نوسترالیی -ئەمریکییە، لە تاراشی- مۆراڤیا لەدایکبوە ( کە ئێستا بریتیە لە کۆماری چیك)، لەزانکۆی ڤییەننا خوێندویەتی. دوای ئەوەی خوێندنی ئابوری تەواو دەکات، لەساڵی *1907*دا لەبواری یاسادا دەستبەکار دەبێت، چەند ماوەیەکی جیاجیاش لەزانکۆکانی ڤییەننا، جێرنۆڤیست، گراز، لەگەڵ بۆن، ئابوری وتۆتەوە. لەساڵی *1913*دا دەچێتە زانکۆی کۆڵۆمبیاو دەبێتە پرۆفیسۆرو پاشان بۆ زانکۆی هارڤاردو لەوێ دەمێنێتەوە. ناودارترین کتێبی بریتیە لە تیوریی پەرەسەندنی ئابوری *1911*، بازنەی کار *1939*، سەرمایەداریی، سوسیالیزم، دیموکراسیی *1942*، مێژووی شیکردنەوەی ئابوریی، دوای مردنی خۆی لەساڵی *1954*دا چاپکراوە.

*9*- **مانهایم، کارل** *(1947 - 1889) Mannheim,Karl* سۆسیۆلۆجیستێکی بەرەگەز هەنگارییە، پیاوێکی ڕۆشنبیری جولەکەیە کە کەوتبوە ژێر کاریگەریی بیرکردنەوەی مارکسیزمەوە. کاتێك حکومەتە ڕادیکاڵەکەی بلێن کۆن لەهەنگاریا هەرەس دەهێنێت، ڕادەکات بۆ ئەڵمانیا، لەوێ هەتا ساڵی *1926* لە فرانکفۆرت سۆسیۆلۆجیا دەڵێتەوەو پاشان جارێکی تر ناچار دەبێتەوە ڕابکات، ئەمجارەیان لەدەستی نازیەکان. لەماوەی نێوانی *1933 - 1947* لە زانکۆی لەندەن پرۆفیسۆر دەبێت. کارە دیارەکانی بریتین لە: ئایدیۆلۆجیاو یۆتۆپیا *1929*، مرۆڤو کۆمەڵگا *1935*، دیۆجینۆسی سەردەمەکەمان *1943*.

*10*- **شیلز، ئێدوارد** *( -1911) Shils, Edward Albert* سۆسیۆلۆجیستێکی سیاسیی ئەمریکییە، لەساڵی *1940*دا لەزانکۆی پێنسلانیا دکتۆرای وەرگرتوە. بایەخێکی تایبەتی داوە بەپلەو پایەی ڕۆشنبیران لەجیهانی مۆدرێندا، گرنگترین کاری بریتیە لە: ڕۆشنبیران لەنێوان تراديسیۆنو مۆدرێنیتیدا *1961*، ڕۆشنبیرانو دەسەڵات *1972*. بەبڕوای شیلز لەجیهانی نوێدا ڕۆشنبیران زیاتر لەوەوە نزیکن کە بلکێنرێن بەدەزگاو دامەزراوەکانەوە، لەنمونەی حکومەت یان زانکۆ، لەسەردەمانی زووتردا وا نەبوون.

*11*-**پارسۆنز، تالکۆت** *Parsons, Talcott (1902-1979),* سۆسیۆلۆجسیتێکی ئەمریکییە، تیورییەکانی دەربارەی میکانیزمی کۆمەڵگاو پرەنسیپە ڕێکخەرەکان لەپشتی بونیادی کۆمەڵایەتییەوە، کاریگەریی زۆریان لەسەر زانستی سۆسیۆلۆجیا هەبوە. لە نوسینە دیارەکانی : بونیادی جوڵەی کۆمەڵایەتی *1937*، سیستمی کۆمەڵایەتی *1951*، تیورییە سۆسیۆلۆجییەکانو کۆمەڵگای مۆدرێن *1967*.

د . سەمیر ئەمین

# ڕۆشنبیران لە کۆمەڵگای عەرەبی هاوچەرخدا

## چەند تێرامانێك لەمەڕ دەوری ئەنتلیجنسیا لە شۆڕشی نیشتمانیی میللیدا



تابلۆیەکی شێوەکار جیمەن ئیسماعیل

وەرگێڕانی: ناوات ئەحمەد

حەزدەکەم لەم وتارەدا سەرنج بۆ چەند روویەکی گرێکوێرەی پەیوەندی نێوان دەوری " جەماوەر" ( چینە میللیەکان )و دەوری " سەرکردایەتی "(ئەنتلیجنسیا) رابکێشم لەئەنجامدانی " شۆڕشی نیشتمانیی " پێویست، لەنیشتمانی عەرەبیداو لە جیهانی سێیەمی هاوچەرخدا بەشێوەیەکی گشتی.

کەواتە مەبەستی ئەم وتارە دیسان گەڕانەوە نیە بۆ بابەتی ناهاوشانی، لە بەرینبوونەوەی سەرمایەداریی جیهانیی و مۆرکی ئەو سەرهەڵدانەی لێی دەکەوێتەوە. وەڵێ گفتوگۆکردنی سروشتی شۆڕشی نیشتمانی میللیی و

پەیوەندییەکانی بەگرفتی سوسیالیزمەوە[*1] لەلایەك و گفتوگۆی دەوری چینەجیاجیاکان و ئەنتلیجنسیا لەلایەکی ترەوە، پێویستییان بە ڕونکردنەوەی گرنگترینی ئەو خاڵانە هەیە کە شیکردنەوەی فراوانخوازیی سەرمایەداریی جیهانی پێی گەیشتوە. لەبەر ئەوەی مەبەستی من لێرەدا دوبارەکردنەوەی ئەوە نیە کەپێشتر لە چەندان شوێنی تردا بەدرێژی لێی دواوم[1] ئەوا لەبەشێکی یەکەمدا -بە شێوەیەکی یەکجار کورت -گرنگترینی ئەو ئەنجامانە کورت دەکەمەوە کە لەم بوارەدا پێیان گەیشتوم و پێموایە ئامانجی ئەو بابەتە بن کە ئێمە لێرەدا پێوەی خەریکین. پاشان لە بەشی دووەمدا . لەسەر بناغەی ئەزمونی میسر. دەری دەخەم کە بۆرجوازییەتی نیشتمانی ناتوانێت شۆڕشی نیشتمانیی میللی داواکراو ئەنجام بدات. کە ئەمەش وامان لێدەکات لەبەشی سێیەمدا بڕوانینە دەوری ئەنتلیجنسیا لەو شۆڕشەداو پەیوەندیەکانی بە چینە میللیەکانەوە.

## لە نێوان هەڵکشانی نیشتمانیی و پاشکۆیەتیدا

لە نێوەندەکانی چەپی عەرەبیدا، نیمچە هاوڕاییەك لەئارادایە دەربارەی ئەو گەشەکردنە سەرمایەداریەی لەچوارچێوەی هەژموونی داگیرکەراندا، لە وڵاتانی ئێمەدا ڕووی داوە -لەبەر ئەم هۆیە- هێواش و ناکامڵ بوەو ئاڕاستەکانی شێواوە. هەروەها هەموانیش کۆکن لەسەر ئەوەی هەوڵەکانی ڕزگار بوون لەپاشکۆیەتی -بریتین لە چەند هەوڵێك لە ماوەی دووسەدەی ڕابردوودا، لەمێژووی میسردا دووبارە بونەتەوەو تا ئێستا ئەنجامی یەکلاییکەرەوەیان لێ نەکەوتۆتەوە. چونکە هەموو جارێك، قۆناغی داکشان و پاشەکشەکردن، بەدوای ئەو هەوڵانەدا دەهاتن، بۆیە ئاڕاستەکانی پەرەسەندن قڵپ بوونەوەو پێشکەوتنە بەدی-هاتوەکان لە قۆناغی هەڵکشانی نیشتمانی پێشووتردا ڕەت کرانەوە. مێژووی میسر لەم ڕووەوە مێژوویەکی نەسرۆ نیە، بەڵکو پەرەسەندنی هاوشێوەی ئەمە -واتە شەپۆلی یەك لەدوای یەکی هەڵکشانی نیشتمانی و پاشەکشێ و گەڕانەوە بۆ پاشکۆیەتی- لە هەموو هەرێمەکانی نیشتمانی عەرەبدا ، بگرە لە هەموو جیهانی سێیەمدا دەبینین[*2].

وەلێ ئەم هاوڕاییەی -کە منیشی تێدام- پرسیارە هەرە گرنگەکان و بەوەش جیاوازی ڕاو بۆچوون لە چەندان کێشەدا ڕەت ناداتەوە. بەبێ گەڕانەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر "گرفتی پاشکۆیەتی" کە لە شوێنێکی تردا باسم لێوە کردوە، لێرەدا کورتەی ئەو ئەنجامانە دەخەمە ڕوو کە پێیان گەیشتووم:

**یەکەم:** تیورەی پەرەسەندنی ناهاوتای سەرمایەداری لەسەر ئاستی جیهانی ئاماژە دەکات بۆ گرنگی جیاکردنەوەی سەنتەرو کەنارەکانی ئەو سیستمە لە یەکتری.

وەلێ ئەم هاوڕاییەی -کە منیشی تێدام- پرسیارە هەرە گرنگەکان و بەوەش جیاوازی ڕاو بۆچوون لە چەندان کێشەدا ڕەت ناداتەوە. بەبێ گەڕانەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر "گرفتی پاشکۆیەتی"

گەشەسەندنی سەرمایەداری لەسەنتەرەکاندا بارودۆخی گونجاوی دروست کردووە بەجۆرێك کە دەشێت چەشنە "هاوڕاییەکی کۆمەڵایەتی " بڕسکێت. مەبەستمان لەبارودۆخی گونجاو بریتییە لەگەشەسەندنێکی ئابوری تەواوو دابەشکردنی قازانجەکانێتی بەسەر چینە جیاجیاکانی گەلدا. ئەم قسەیەش راستی ململانێی چینەکان پوچەڵ ناکاتەوە، بەڵکو گریمانەی ئەوە دەکات کە هەردوولا "ڕێساکانی گەمەکە" قبوڵ دەکەن. لێرەدا مەبەست لە ڕێساکانی گەمە ئابورییەکەیە، واتە قبوڵکردنی یاساکانی گەشەکردنی سەرمایەداری کە لەسەر هەژمونی موڵکدارێتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان‌و کاری کرێگرتە دامەزراوە.. هتد لەلایەك‌و قبوڵکردنی ڕێساکانی گەمەی سیاسی، واتە مومارەسەکانی دیموکراسییەتی هەڵبژاردن، لەلایەکی ترەوە.

بارودۆخ لە کەنارەکانی سیستمەکەدا جیاوازە، هۆکەشی ناتوانایی گەشەپێدانی سەرمایەدارێتیە لە بەرەو رووبوونەوەی نزمترین ئاستی داواکاریەکانی گەلدا. لێرەدا دەڵێم گەل نەك چینی کرێکاران یاخود پرۆلیتاریا بۆ نمونە. زیاد لەمەش ئەم گەشەکردنە کاتیە شێواوە وا دەکات کریستاڵەبوونی چینەکان لەچەشنی ئەوەی لە سەنتەرەکاندا ڕوودەدات شتێکی مەحاڵ بێت. ئەو گەلەی بەدەستی ئەم گەشەکردنە سەرمایەداریەوە دەناڵێنێت، لە گردبوونەوەیەکی فشەڵی چین‌و دەستەو تاقمی وەها پێکدێت کە هەندێکیان کرێکارن، زسۆرینە، یان جوتیارانی بچوك‌و هەژارن، لەپاڵ تاقمەکانی بۆرجوازیەتی بچوکدا بەمانا فراوانەکەی...هتد.

دووەم: ئەم بارودۆخانە داوای شۆڕشێکی دژ بەسەرمایەداری دەکەن لە کەنارەکاندا، لەگەڵ دواخستنی ئاسۆکانی وەرچەرخانی سوسیالیستی لە سەنتەرەکاندا، ئەو شۆڕشەی لە کەنارەکاندا داوای دەکرێت، دژی سەرمایەداریە، بە مانای ئەوەی دژی گەشەپێدانی سەرمایەداریە، وەك لە ئەزمونی گەلەکانی کەناردا دەردەکەوێت، کە بە زەرورەت سەرمایەدارێتیەکی پاشکۆیەو هاوواتای شۆڕشی سوسیالیستی نیە.

مادام گەشەکردنی تەوەرگرتوو لەدەوری خود (کەمەرجی لەباردابوونی بەرەو ڕووبوونەوەی پێداویستیە مادیەکانی زۆرینەی گەلە) لەکەنارەکاندا مەحاڵە، ئەوا دەبوو گەشەپێکردنێکی تر بگیرێتە بەر، لە دەرەوەی ئەو سیستم‌و مەرجانەی کە دەیسەپێنن. ئەمەیە مانای "هەڵوەشاندنەوەی زەروری پێوەستییەکە" کە مەرجی بەدیهێنانی کۆنترۆڵی نیشتمانیە بەسەر کەڵەکەبووندا، کە ئەویش ناواخنی تەوەرەگرتن لە دەوری خود، دیاری دەکات.

مادام گەشەکردنی تەوەرگرتوو لەدەوری خود، لەکەنارەکاندا مەحاڵە، ئەوا دەبوو گەشەپێکردنێکی تر بگیرێتە بەر، لە دەرەوەی ئەو سیستم‌و مەرجانەی کە دەیسەپێنن

هەروەها من گەیشتبومە ئەنجامێکی تریش، بۆرجوازیەتی لۆکاڵ لە کەنارەکاندا (جیهانی سێیەمی *، هاوچەرخ) ناتوانێت ئەم دەورە رزگاریە ببینێت.

ئەم سەرنجەی دوایی رەچاوکردنی گرفتی سوسیالیزم دەسەپێنێت، چونکە ، پێمان خۆش بێت یان نا ، لە ناوجەرگەی بابەتەکەدایە. ئەگەر بۆرجوازیەت نەتوانێت لە توێی هەڵوەشاندنەوەی پەیوەستیەوە، رزگاری حاسڵ بکات، ئەوا هەر دەبێت دینامیکیەتی جوڵانەوەی میللی ببێتە هۆی پرۆژە میللیەکەو بخرێتە ناو ڕوانینە ئاییندەییەکەوە، کە ناتوانین جگە لەسوسیالیزم ناوێکی تری بۆ بدۆزینەوە. ئەمە بە مانای ئامانجێکی کۆمەڵایەتی کە هێشتا پرۆژەیەکی ئاییندەییە لەبەردەممانداو نمونەیەکی ئامادەی بەدیهێنراو نیە کە هەر بە باسکردنی دابکەوین.

سێیەم: لە هەموو ئەزمونەکانی سوسیالیزمدا ( سۆڤێت *، و چین و هی تریش...) گەشەکردنی هێزەکانی بەرهەمهێنان، لە چوارچێوەی ستراتیجێکی نیشتمانیی نەخشە بۆکێشراوی چەقبەستوو لە دەوری خود، نیش دەکات، کە بێشك شتێکی سەرتاپاگیریشە. بێشك لەم گۆشەیەوە سەرکەوتنی ئەم ئەزمونانە بەرامبەری نوشوستی ئەزمونە سەرمایەداریەکانی جیهانی سێیەم دەوەستێتەوە. ئایا لەمەوە دەگەینە ئەو بەرەنجامەی کە ئەزمونەکانی کۆمۆنیزم لە ڕووی ئامانجە نیشتمانیەکانیەوە سەرکەوتوە، ئەگەرچی لەڕووی بەدیهێنانی ئامانجی کۆمەڵایەتیشەوە ناتەواوە، کە لە بنەڕەتدا بریتیە لەڕەتکردنەوەی چینەکان؟

پێمان خۆش بێت یان نا ،ئەوا ڕەچاوکردنی مانای ئامانجی سوسیالیستی، لێرەدا خۆی دەسەپێنێت. لەم چوارچێوەیەشدا پێویستە پێناسەیەکی نەرێی سوسیالیزم نەکەین، واتە وا دابنێین کە بەتەنیا هەرئەوە بێت کە موڵکایەتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان رەت بکاتەوە، چونکە سوسیالیزم لە ڕەتکردنەوە زیاتری پێویستە، پێویستی بە سانسۆرێکی کۆمەڵگایی دروست هەیە لەسەر بەکارهێنانی هۆیەکانی بەرهەمهێنان و لەمەشەوە پلەیەکی بەرزی کۆنترۆڵکردنی پەرەسەندنی ئاییندەیی، ئەمەش لە توێی جڵەوگرتنێکی دروستی چینە میللیەکانەوە، کە ئەمەش خۆی پێویستی بە دیموکراسیەتێکی سیاسیی کامڵ و پێشکەوتوو هەیە، پێشکەوتووتر لەو دیموکراسیەتە سنوردارەی ئێستا لە سەنتەرەکانی سیستمی سەرمایەداریدا، هەیە. لە ڕاستیدا ئەم مەرجانە لە وڵاتە سوسیالیسەتەکاندا بوونیان نیە. ئەگەر ئەمە ئاوا بێت، ئەوا پرسیارکردن دەربارەی مۆرکی کۆمەڵایەتیی راستەقینەی ئەو سیستمانە پرسیارکردنێکی شەرعیە.

لەم چوارچێوەیەشدا پێویستە پێناسەیەکی نەرێی سوسیالیزم نەکەین، واتە وا دابنێین کە بەتەنیا هەرئەوە بێت کە موڵکایەتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان رەت بکاتەوە

# سێ هێز

لەم بارەیەوە گەیشتومەتە ئەوەی ئەم كۆمەڵگایانە مۆركێكی نیشتمانیی میللییان هەیە، مۆركێكە قۆناغێكی مێژوویی درێژخایەن دیاری دەكات، بۆ گوێزانەوە بەرەو كۆمەڵگای سوسیالیستی. مەبەستمان ئەوەیە كۆمەڵگا سوسیالیستەكان"ئەوانەی ئێستا هەن" وەك دەڵێن هەموویان سەر بەقۆناغی "پاش سەرمایەدارێن"و پێموایە ئەو شۆڕشە سوسیالیستیەی كە لەم دۆخە مێژووییانەدا ڕوویداوە -كە ناشكرێت لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیە روو بدات. قۆناغێكی مێژوویی درێژ ئاوەڵا دەكات، كە ماوەكەی لە ساڵان زیاترە، بگرە لە دە ساڵانیش زیاترە، بە سەركەوتنی سوسیالیزم لەسەر ئاستی جیهانیی كۆتایی دێت (ئەمەش مەسەلەیەكە لە دەرەوەی خشتەی ئەو رووداوانەدا، كە دەشێت لە ئاسۆی بینراودا روو بدەن). لە توێی ئەم قۆناغە مێژووییەوە هێزەكان پشتیوانی یەك دەكەن و بەئاڕاستە جیاجیاكاندا، ناكۆك دەبن. لێرەدا پێموایە ئەو هێزانە سیانو دوان نین (وەك بە زۆری دەگوترێت سوسیالیزمو سەرمایەداریی).

یەكەمیان بریتیە لەو هێزانەی بە ئاڕاستەی پەرەسەندنی سوسیالیستیدا دەمانبەن، سەرچاوەكەشی ئەو چینە میللیانەیە كە لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجە سوسیالیستیەكانو ئایدیۆلۆجیای پێشەنگی ماركسیستدا، لە توێی شۆڕشەوە، تەدارەكی هێزەكانی خۆیانیان كردوە، كە دەوری یەكلاییكەرەوەی هەبوە لەم تەدارەكو هوشیاركردنەوەیەدا.

دووەمیشیان بریتیە لەهێزە پاڵنەرەكان بە ئاڕاستەی بەردەوامی، بەڵكو گەشەپێدانی پەیوەندیی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریانە، لێرەشدا پێویستە ئەو تەمە برەوێنینەوە كە ڕەنگە بەرچاوی هەندێك بگرێت. ئێمە لێرەدا وامان دانەناوە ئەو هێزانە تەنیا پەرچبوونەوەی پاشماوەكانی رابردوون. بەڵكو تێزەكەمان بریتیە لە: گەشەپێدانی هێزەكانی بەرهەمهێنان كە لەو بارودۆخە مێژووییەدا مەحاڵە بتوانێت خۆی لە كردنەوەی بوارێك ببوێرێت، بۆ فراوانكردنی پەیوەندیە سەرمایەداریەكان، بەڵام ئەو فراوانبوونە مانای ئەوەش نیە ملكەچ بێت بۆ پێداویستیەكانی فراوانبوونی سەرمایەداری جیهانی. دەوڵەتی نیشتمانی لێرەدا بوونی هەیە، ڕەگەزێكە دەتوانێت پشتیوانیی هێزە سەرمایەداریە ناوەكیەكان قەدەغە بكات، لەگەڵ ئەو هێزانەدا كە لەسەر ئاستی جیهانی باڵادەستن، بە ڕادەیەك ببێتە هۆی گەڕانەوەی سەرمایەدارێتی پەتی.

لە توێی ئەم قۆناغە مێژووییەوە هێزەكان پشتیوانی یەك دەكەن و بەئاڕاستە جیاجیاكاندا، ناكۆك دەبن. لێرەدا پێموایە ئەو هێزانە سیانو دوان نین (وەك بە زۆری دەگوترێت سۆسیالیزمو سەرمایەداریی).

کەواتە سێیەمیان ئەو دەوڵەتەیە کە ئێستا ئاماژەمان بۆ کرد. بڵاوترین تێز لەمەڕ دەوڵـەت، تـەرکیز دەکاتـە سـەر دەورەکـەی وەکـو هۆکـارێك بـۆ جێبـەجێکردنی بەرژەوەندیی چینایەتی. لەسەر ئەم بنەمایە هەندێك لافی ئەوە لێدەدەن لەناوبردنی موڵکایەتی تایبەت (بەوەش لەناوبردنی چینی سـەرمایەداریی) دەوڵـەتی کـردوە بـە ئامێرێك لە خزمەتی جەماوەردا. لە کاتێکدا هەندێکی تر بە پێچەوانەوە لاف لێدەدەن، واتە ئەو دەوڵەتە خزمـەتی سیستمێکی سـەرمایەداری دەکـات، کـە سـەرلەنوێ بینـا کراوەتەوە، بەڵام ئێمە بەم لافوگەزافانە داناکەوین. لە لایەکەوە ئەو تێزەمان قبوڵ نیە کە دەڵێت ئەو کۆمەڵگایەی سوسیالیستی نەبێت، بە زەرورەت سەرمایەداریە. (لێرەدا سەرقاڵی گفتوگۆکردنی ئەو کێشەیە نابین، کە لە چەندان شوێنی تردا باسمان لێوە کردوە) . لە لایەکی تریشـەوە پێمان وایە کـە دەوڵـەت لـەم بارودۆخـە مێژووییانـەدا دەورێکـی سـەربەخۆ دەبینێـت. بـەڵکو شـێمانەیەکی مێژوویـی گونجـاو لـە ئارادایـە: دەشێت تـەرزێکی کۆمەڵایـەتی نوێ لەمـەڕ هـەژمونی دەوڵـەت سـەرهەڵبدات (بۆیـە ئـەم تەرزەمان ناونا بەدەوڵەت کردن).

ئەو کۆمەڵگا سوسیالیستییانەی لـەئارادان وەکو دەڵێـن، سـەر بـە قۆنـاغی پـاش سەرمایەدارین. ئەو سێ هێزەی باس کران لـەوێدا کاردەکەن و لەگـەڵ یـەکتریدا نـاکۆك دەبن، کەواتـە باهەڵوێستەکەمان ڕوون بێـت. تێزەکـەی ئێمـە ئەمەیـە: ئـەوەی ئێسـتا ڕوویـدا، هاتنـە دەرەوەی ئـەو کۆمەڵگایانـەی باسـکران لـە ناوچـەی سـەروەریی سەرمایەداری، خۆی کارێکی هەتا بڵێی چاکەو دەبێتە هۆی پێشکەوتن. پاشان ئەمە مەسەلەیەکی نامۆ نیە، بەوەی فراوانبوونی سەرمایەدارێتی جیهانیی خۆی لە خۆیدا هاوتا نیە. واتە بە زەرورەت دەبیتە هۆی دابەشبوونی سیستەمە سەرمایەدارییەکان بۆ سەنتەرە سەرمایەداریە بەهەژمونەکان و کەنارە پاشکۆو دواکەوتوەکان، کە ناکۆکیەکان تێیـدا زۆر تونـد دەبێتـەوەو ئـەم شـێوازەی لـە شۆڕشـی دژ بـە سـەرمایەدارێتیان سەپاندوە. لە ڕاستیدا ئەوەی بەدەست هێناوە کە نەدەکرا لە چوارچێوەی سیستمی جیـهانیدا بـەدی بـهێنرێت، لـە تـاودان و خـێراترکردنی گەشـەکردنی هێزەکـانی بەرهەمـهێنان لەسـەر بنەمایـەکی نێشـتمانیی سـەربەخۆ، کـە چـەندان ئاسـۆی سوسیالیستانەی شیاو ئاوەڵا دەکات .

چوارەم: جیهانی سێیەمی هاوچەرخ، خۆیشی پێویستی بە شۆڕشێکی نیشتمانیی میللی هەیە، چونکە هیواکانی ڕزگاربوون لە پاشکۆیەتی و تەواوکردنی گەشەپێدانێکی کـامڵ لـە جـۆری گەشـەپێدانەکەی سـەنتەر، تـەنیا وەهمـەو مێـژووی فراوانبوونـی سەرمایەداریی چەند سەدەیەکە بەدرۆی خستۆتەوە. وەلێ ئەم وەهمانە لەگەڵ هەموو قۆناغێکی تازەی پەرەسـەندنی گشتیدا تازە دەبنەوە. هەروەها ئەو وەهمەش نوێ

فراوانبوونی سەرمایەدارێتی جیهانیی خۆی لە خۆیدا هاوتا نیە، واتە بە زەرورەت دەبێتە هۆی دابەشبوونی سیستەمە سەرمایەدارییەکان بۆ سەنتەرە سەرمایەداریە بەهەژمونەکان و کەنارە پاشکۆو دواکەوتوەکان

دەبێتەوە کە گوایە بۆرجوازیەتی لۆکاڵ دەتوانێت ئەم ئەرکە ڕابپەڕێنێت. لەگەڵ ئەوەدا کە ناتوانایی بۆرجوازیەتی لۆکاڵ مانای ئەوە نیە، کۆمەڵگا ئامادەکراوە بۆ گواستنەوەی خێرا بەرەو سوسیالیزم. لێرەشدا دیسان شۆڕشی نیشتمانیی میللی ماوەیەکی مێژوویی ئاوەڵا دەکات کەمۆرکێکی سەرمایەدارییانەی هەیە. لەگەڵ ئەوەدا کە لێرەدا ئەو هێزانە بەر چەند هێزێکی تر دەکەون کەبەرەو ئاراستەی سوسیالیزم پاڵ دەنێن.

## ئەزمونەکانی جیهانی سێیەم

ئەزمونە سوسیالیستیەکانی جیهانی سێیەمی هاوچەرخ (ناسریی* و هی تریش) لەسەر بناغەی شۆڕشی نیشتمانی میللی دروست دانەمەزراون.. بەڵکو تەنیا بریتی بوون لە تەڵەزگەی** گەشەکردنی ئەو سەرمایەداریەی لەناو سەرمایەداریتی جیهانیدا جێی گرتوە. لە باشترین گریمانەدا ئەو ئەزمونانە ئاماژەیان دەکرد بۆ شێمانەی پەرەسەندن بەرەو سیستمێکی نیشتمانی میللی، لەوە زیاتر نا. لەو بارو دۆخانەدا تەرازووی هێزەکان لە بەرژەوەندیی سەرمایەداریتیدا بوو زیاتر لەو ئەزمونانەی کە دوابەدوای شۆڕشێکی میللی دروست ڕوویان داوە (سۆڤێتو چین ... هتد). ئەمەش خۆی ڕودانی کودێتا خێراکان بەسەر ئەو ئەزمونانەدا، لێکدەداتەوە، لەو کاتەدا کە بارو دۆخە دەرەکیە ناوەکیو دەرەکیەکان بۆیان لەبار دەبن.

مێژووی هاوچەرخی میسر ناتوانایی بۆرجوازییەتی لۆکاڵ دەسەلمێنێت لە ئەنجامدانی ئەرکی ڕزگاریی میللی لەو پاشکۆیەتیەی کەلەتێوەگلانی گەشەکردنی ناوخۆوە لە چوارچێوەی فراوانبوونەوەی جیهانیدا، دروست ببوو. ئەم سەرنجە داوا دەکات سەرلەنوێ بگەڕێینەوە بۆ سەر گفتوگۆکردن لەسەر چەمکی بۆرجوازیەتی نیشتمانی.

هێشتا زۆرکەس دەربارەی کۆمەڵگای میسری دەدوێن لە سەدەی نۆزدەو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، کە گوایە کۆمەڵگایەکی نیمچە فیودالو نیمچە سەرمایەداری بوە ، ئەمە بە پێی گوزارشتە ناسراوەکە. لێرەدا مەبەستمان لەو گوزارشتە باوەیە کە لە بیستەکانەوە لە جوڵانەوەی کۆمۆنیستیی جیهانیدا باوەو بەسەر هەموو ئەو کۆمەڵگا ئاسیاییو ئەفریقیانەدا پیادە کراوە کە داگیر کرابوون یان نیمچە کۆڵۆنی بوون. خۆئەگەر مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم گوزارشتە بریتی بێت لەوەی تەنیا ئاماژەیەك بکرێت بۆئەوەی ئەم کۆمەڵگایانە بەرلەوەی ئیمپریالیزمی خۆراوایی داگیریان بکات، نەچووبوونە قۆناغی سەرمایەداریەوەو دەستەڵاتی ئیمپریالیزمیشتی فرە تەرزو لەونەکانی بەرهەمهێنانو چەوساندنەوەی پێشووی ڕەت

ئەزمونە سوسیالیستیەکانی جیهانی سێیەمی هاوچەرخ (ناسریی* و هی تریش) لەسەر بناغەی شۆڕشی نیشتمانی میللی دروست دانەمەزراون.. بەڵکو تەنیا بریتی بوون لە تەڵەزگەی گەشەکردنی ئەو سەرمایەداریەی لەناو سەرمایەداریتی جیهانیدا جێی گرتوە

نەکردەوە، بەڵکو هێشتنیەوەو گونجاندنی، لە پێناوی بەکارهێنانیان و ئاوێتەکردنیان لە چوارچێوەی ڕەتاندنی سەرمایەداریانەی جیهانیدا کە خۆی (واتە ئیمپریالیزم) بە پلەی یەکەم لێی سودمەند بوو، ئەگەر مەبەست لە بەکارهێنانی گوزارشتەکە ئەمە بێت ئەوا عەیبی نیە، بەڵام زۆرێک ئەم سەرنجە گشتیو دروستەیان بەرەو کۆمەڵێک وتە راکێشاوە کە پێویستیان بە وردبوونەوە هەیە.

یەکێک لەو وتە خێرایانە ئەوەیە کە چینی گەورە موڵکدارانی کشتوکاڵ مۆرکێکی فیۆدالیانەی هەیە. بەڵکو بریتیە لە چینێکی جیا لە چەندان چینی تر کە لە ئەنجامی گەشەکردنی سەرمایەداریدا دروست بوون، ئەگەرچی شێواویش بن. لێرەدا مەبەستمان لە بۆرجوازیەتی کۆمپرادۆرییە لە لایەکەوەو بۆرجوازییەتی نیشتمانی لە لایەکی ترەوە. بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵێک سەرنجی بەرچاوی تایبەت بە وەزعی میسر دەخرێتە پاڵ ئەمە، هەندێکیان لە دیدی مندا راستن و هەندێک لە تێزە سیاسیەکانیش دروستن. یەکێک لەو سەرنجە بەرچاوانە بۆ نمونە، بریتیە لە ڕەسەنی بیانی، ئەگەرچی میسرینراویش بێت. چەند باڵێکی تەواوی بۆرجوازیەتی کۆمپرادۆریی بازرگانیو دراوی. یەکێکیش لە تێزە سیاسیەکان ئەوەیە کە فیودال (بەمانای گەورە موڵکدارە کشتوکاڵیەکان) لەگەڵ کۆمپرادۆرەکاندا (بەمانای ئەو بۆرجوازییەتە بیانیە) هەموویان پایەی بنەڕەتیی سیستمی حوکمیان نواند (ئینگلیزیو پاشان پادشایی) لە کاتێکدا بۆرجوازیەتی نیشتمانی ڕووبەڕووی ئیمپریالیزم بۆتەوەو سەرکردایەتی بەرەی بۆرجوازیی نیشتمانیی کردوە. بەم مانایەش بۆرجوازیەت لە ئەسڵدا نیشتمانیی نەبوو (واتە میسریی راستەقینە) بەڵکە بە مانا سیاسیەکەی نیشتمانی بوو.

پێموایە ئەم تێزە سادەکراوەیە، پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە یان بە لایەنی کەمەوە مشتومالکردن هەیە. من پێشتر سەرنجم داوە[2]:

یەکەم: موڵکایەتی کشتوکاڵیی گەورە (بە هەمان شێوە موڵکایەتی کشتوکاڵیی مامناوەند، واتە موڵکی خانەدانان و کۆلاکەکان) لە ڕەوشی میسردا میراتگری چاخێکی پێشووتری پێش داگیرکاریی سەرمایەداری نەبوو، بەڵکو لە ئەنجامی گەشەکردنی سەرمایەداریی نوێدا پەیدا بوە، لەمەشەوە مۆرکی سەرمایەداریانە لەم موڵکایەتیەداو بەمەش لەو چینانەدا کەپێوەی پێوەستن (گەورە موڵکدارانی نێوەند) بریتیە لە مۆرکی زاڵ تێیدا. کەواتە راست نیە بە گەورە موڵکداران بوترێت فیودال.

دوەم: چالاکیە دراویو بازرگانیەکانی ڕەگەزە کۆمپرادۆریەکان، بە توندیی پێوەست بوە بە بەرژەوەندیەکانی چینی موڵکداریی کشتوکاڵیەوە، هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی هەردوکیانەوە.

یەکێک لەو وتە خێرایانە ئەوەیە کە چینی گەورە موڵکدارانی کشتوکاڵ مۆرکێکی فیۆدالیانەی هەیە. بەڵکو بریتیە لە چینێکی جیا لە چەندان چینی تر کە لە ئەنجامی گەشەکردنی سەرمایەداریدا دروست بوون، ئەگەرچی شێواویش بن

سێهەم: ئەو **دامەزراوە** پیشەسازییانەی لە قۆناغی دواتردا دروست کران، لە ئەنجامی دەپسپێ**شخەری** چەند ڕەگەزێکی گەورەموڵکداریی کشتوکاڵییەوە نەبوو کە ویستبێتیان **بەشێك لەو** زێدەیەی لە بەکارهێنانی زەویەوە دەستیان کەوتوە لە چالاکیی **تازەتردا بەکاری** بهێنن. پاشان سەرمایەی بیانی (بەریتانی و هی تر) و میسری و (**میسرینراو)ی کۆمپرادۆری**، هەر زوو هەموویان بەشدارییان کرد لەگەڵ موڵك و ماڵی **گەورە موڵکداراندا** لەم **چالاکیە تازانەدا**. لەم سەرنجانەوە گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی، **چینی رەتێنەری** لۆکاڵ (ناڵێم نیشتمانی) هەر لە زووەوە لە ڕەوشی میسردا بوە بە **"یەکەیەکی** یەکخراو"، هەروەها مۆرکی هەڵوەشاندنەوەی پێوەستی (واتە هاتنە **دەرەوە لە چوارچێوەی** سیستمی جیهانی). بەمەش مەیلی نیشتمانی لەم بارودۆخەدا **نامانجەکانی** سنوردار دەبن و مەحاڵ دەبێت رزگاربوون لە پاشکۆیەتی رووبدات (کە لە **دیدی مندا** پێویستی بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو پێوەستیەیە کە باسکرا) بگرە **ئەنجامی بابەتییانەی** هەڵوەشاندنەوەی پێوەستیی بۆ هەر دەسکەوتێك لەم چوارچێوەیەدا **تەواو ببێت** هەر لە کۆتاییدا بریتیە لە ڕۆچوون لەناو جیهانێتیداو بەمەش توندتر **بوونەوەی** پاشکۆیەتی. دەشبینین ئەزمونی میسر ئەمە دەسەلمێنێت.

دوەم: ئەم **ڕەوشانە (واتە** ناتوانایی بۆرجوازیەتی کەنارەکان لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە مێژووییەی **بۆرجوازیە**تەکانی سەنتەرەکان ئەنجامیان داوە) دەورێکی مێژوویی دەدات بە **بۆرجوازیەتی بچوك** کە لە **کۆمەڵگا** سەرمایەدارییە پێشکەوتوەکاندا بەرامبەری نیە. **دواتر لە پێناوی** سازاندنی ئەم تێزەدا، دێینەوە سەر ئەم مەسەلەیە.

تاقیکردنەوەی **بانکی میسر** دروستی **قسەکانی** منی سەلماندوە، هەر هیچ نەبێت بەلای خۆمەوە. **ئەم بانکە بە** پارەی ژمارەیەك لە گەورەترین موڵکداری کشتوکاڵی دامەزرێنرا. لە **توێیەوە سەرمایەداریی** میسریی (ناتوانین موڵکایەتی کشتوکاڵیی گەورەی لێ جویێ **بکەینەوە)** هەوڵی دا چەند ریفۆرمێك بەسەر داگیرکەردا بسەپێنێت کە لە بەرژەوەندیی **خۆیدایە. واتە** بۆرجوازیەتی لۆکاڵ. لەگەڵ چەند مەرجێکدا کە لەگەڵ دەسکەوتە **سیاسیە نوێیەکانی** دوای بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لە ساڵی 1922دا، زیاتر دەگونجێن. **بەمجۆرە** لە ساڵی 1920دا تەعریفەی گومرگی دانراو هەندێك دامەزراوەی **پیشەسازی** دروستکران، لە پێناوی تەواوکردنی ئەم هەنگاوەدا سەرمایەداریی **میسری لە** کارەکانی خۆیدا، پێشوازی لە سەرمایە ئیمپریالیستی و کۆمپرادۆریەکان **کرد. لە کۆتاییدا** ئەم تاقیکردنەوەیە سەلماندی کە ئەو دەسکەوتانەی لەم چوارچێوەیەدا **بەدی هاتوون**، مامناوەندیین و نەگەیشتوونەتە نزمترین ئاستی ڕزگاربوون لە **دواکەوتوویی**. بەمشێوەیە ئەو تاقیکردنەوەیە دروستیی ئەو تێزەی سەلماند کە **دەڵێت بۆرجوازیە**کانی **جیهانی** سێیەم دەتوانن گەشەکردنێکی

ئەم ڕەوشانە (واتە ناتوانایی بۆرجوازیەتی کەنارەکان لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە مێژووییەی بۆرجوازیەتەکانی سەنتەرەکان ئەنجامیان داوە) دەورێکی مێژوویی دەدات بە بۆرجوازیەتی بچوك کە لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکاندا بەرامبەری نیە

سەرمایەداریی تەواو بەدەست بهێنن لە شێوەی ئەوەی بۆرجوازیەکانی خۆراوا بەدەستیان هێناوە.

ئەگەر شیکردنەوەی ئەزمونی میسرو دەرکێشانی وانەو دەرس لێیەوە کردەوەیەکی ئاسان بێت، ئەوا مەسەلەکە بە نیسبەتی ناسریەتەوە جیاوازە. بۆیە گومانم نیە لەوەی گفتوگۆکردن لەسەر مەغزای ئەو ئەزمونە بەردەوام دەبێت لە پڕکردنەوەی خشتەی کارەکانی نەوەکەی ئێمە، بگرە بە زۆریی نەوەکانی دواتریش دەگرێتەوە. لەم بابەتەدا سەرنجێکی دەسپێکەرانەم هەیە کە شوێنی پێشەوەی دەدەمێ لەشیکردنەوەکەمدا. ئەو هەموو ئەو شیکردنەوەو حوکمانە ڕاڤە دەکات کە لێرە بەدواوە دێن. کرۆکی ئەو سەرنجەش ئەوەیە کە ڕەوشی شۆڕشی دژ بە ئیمپریالیزم لە هەموو وڵاتەکانی "جیهانی سێیەم"دا. بە وتەیەکی وردتر لە ناوچەکانی کەناری فراوانبوونەوەی سەرمایەداریی جیهانی، دەورێکی تایبەتو بنەڕەتی دەدات بە نەك بۆرجوازیەتی بچوك وەکو چینێك، بەڵکو بە دەستەیەکی کۆمەڵایەتی کە هیچ ناوێکی تری بۆ نادۆزمەوە جگە لە ناوە روسیە ئەسڵیەکە کە ئەویش بریتیە لە ئەنتلیجنسیا.

## لێکۆڵینەوەیەك لەم چەمکەدا

ئەم ئەنتلیجنسیایە چیە؟ یەکەمجار پێویستە ئەم چەمکەو چەمکە باوەکە، بۆرجوازیەتی بچوك، لێك جیابکەینەوە، ئەنتلیجنسیا هاومانای ڕۆشنبیران نیە بەڵکو هاومانای خاوەن بڕوانامە زانکۆییەکانە!! ئەگەرچی بەگشتی ئەنتلیجنسیا سەر بە بۆرجوازیەتی بچوکە، وەکو هەموو دەستەکانی تری ئەو چینە، بەلام بریتیە لە دیاردەیەکی تایبەتی تێیدا. بەلام بۆرجوازییەتی بچووك چینێکە، لەهەموو کۆمەڵگا نوێیە پێشەکوتوو و دواکەوتوەکاندا یەك شتە. بە گشتی دەورێکی یەکلایی کەرەوە یان تەنانەت سەربەخۆو گرنگیش ناگێڕێت. لێرەدا ڕێساکە بریتیە لەوەی ئەم چینە وەکو چینێکی سەرئاو- کەوتووی مۆلەقو پەرتەوازەو دوودڵ لە نێوانی چەپ (هاوپشتیی کردن لەگەڵ چینە میلیەکاندا) و ڕاست (گەڕانەوە بۆ سایەی هێزە بۆرجوازیەکان) دا، تیاماوە، ئیتر بەپێی بارو زروف، بەلام ئەنتلیجنسیا دیاردەیەکی ترە، بە تایبەتی بۆ بارودۆخی کۆمەڵگاکانی سەرمایەدارێتی کەنارەکان. هۆو ڕەگو ڕیشەی ئەم دیاردەیە چیە؟ لێرەدا پێویستە سەرمایەدارێتی سەنتەرو سەرمایەدارێتی کەنارەکان لێك جیابکەینەوە. یەکەمیان بارودۆخی گونجاوی خوڵقاندوە، کە وای کردوە بشێت چەشنە کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی دروست ببێت. وەك پێشتر وتمان لەم بارودۆخانەدا بۆرجوازیەتی بچوك دەورێکی گرنگ نابینێت چونکە جارێك

ئەنتلیجنسیا هاومانای ڕۆشنبیران نیە بەڵکو هاومانای خاوەن بڕوانامە زانکۆییەکانە!! ئەگەرچی بەگشتی ئەنتلیجنسیا سەر بە بۆرجوازیەتی بچوکە، وەکو هەموو دەستەکانی تری ئەو چینە، بەلام بریتیە لە دیاردەیەکی تایبەتی تێدا

دووبەرەکی تێدەکەوێت و جارێك لایەنی چەپ یان راست دەگرێت، بە چەمکە ئینتیخابییەکەی. لە کەنارەکانی سیستمی سەرمایەداریدا مەسەلەکە جیاوازە لە ئەنجامی نەتوانینی سەرمایەداریتی لێرەدا، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی نزمترین ئاستی داواکاریەکانی زۆرینەی زۆری گەل ببێتەوە.

ئەم بارودۆخە داوای شۆڕشێکی دژ بە سەرمایەداریی دەکات وەك لە ئەزمونی ئەم گەلەدا دەردەکەوێت، کە سەرمایەداریتیەکی ناتەواوو شێواوە.. وەك پێشتر وتمان. لێرەدا دەوری تایبەتی تاقمێکی کۆمەڵایەتی تر دەردەکەوێت، کە ئەڵتەرناتیفێك بۆ گەشەکردنی سەرمایەداریتی دەخاتە ڕووو لە پرۆژەیەکی ئایدیۆلۆجی و ڕۆشنبیری و سیاسیی شامیلدا گوزارشت لەم ئەڵتەرناتیفە دەکات و جەماوەری گەل ڕێکدەخات و سەرکردایەتی دەکات. ئەم تاقمە بریتیە لە ئەنتلیجنسیا. ئەگەر ژمارەیەکی زۆری ئەم تاقمە لە ڕیشەیەکی بۆرجوازیی بچوکەوە هاتبن. بە شێوەیەکی ئاسایی، بەڵام ئەم مۆرکە مۆرکی جەوهەرییان نیە. لە هەندێ باردا. چەند تاکێك هەن سەر بە ئەنتلیجنسیان و ڕیشە چینایەتیەکانیان بۆرجوازیەو بگرە ئەریستۆکراتیشە. هەندێکیشیان لە ڕیشەیەکی میللین.

تا ئەو رادەیە دەڕۆم کە گرنگترینی ئەو جوڵانەوانەی لە مێژووی هاوچەرخی میسردا ڕویانداوە ئەم مۆرکەیان هەیە. ڕەنگە باڵەکانی پارتی نیشتمانی کۆن و وەفدیش ئەم مۆرکەیان هەبووبێت (ئێستا ئێمە لێرەدا گفتوگۆ لەسەر ئەم سەرنجە مێژووییە ناکەین). من دەڵێم ڕێکخراوی ئەفسەرە سەربەستەکان و جوڵانەوە کۆمۆنیستیەکان لە بنەڕەتدا ڕێکخراوگەلێك بوون گوزارشتیان لە دیاردەی کریستاڵبوونی ئەنتلیجنسیای میسریی هاوچەرخی دوای جەنگی جیهانیی یەکەم کردوە. ئەوان هەردوکیان، واتە شەپۆلی ئەفسەرە سەربەستەکان و شەپۆلی مارکسیزم، لە قووڵایی ڕەهەندی نیشتمانیدا یەکیان گرتەوە، واتە ڕەتکردنەوەی پایەی میسر لە سیستمی جیهانیدا، بەڵام لە ئینتیمای فیکری و ئایدیۆلۆجییاندا جیابوون و ئەم جیاوازیەش ڕەگ و ڕەهەندی ڕۆشنبیریی و ئایدیۆلۆجیی قووڵی هەیە، کە ئێرە شوێنی گفتوگۆکردنی نیە، بەڵام ڕەوشی میسر هەلی مێژوویی ڕەخساند بۆ ئەو باڵەی دواتر پەرەی سەند بۆ ناسرییەت، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە روسیاو چین رویدا، لەوێ جڵەوی دەسپێشخەریی کەوتە دەستی باڵی کۆمۆنیستی ئەنتلیجنسیاوە.

## ئەزمونی ناسری

بێشك ئەزمونی ناسریەت بە پاڵنەرێکی نیشتمانی قووڵ سەری هەڵداو پەرەی سەند. هێندە بەسە، دوا کتێبی محەمەد حەسەنێن هەیکەل دەربارەی ساڵی

لێرەدا دەوری تایبەتی تاقمێکی کۆمەڵایەتی تر دەردەکەوێت، کە ئەڵتەرناتیفێک بۆ گەشەکردنی سەرمایەداریتی دەخاتە ڕووو لە پرۆژەیەکی ئایدیۆلۆجی و ڕۆشنبیری و سیاسیی شامیلدا گوزارشت لەم ئەڵتەرناتیفە دەکات و جەماوەری گەل ڕێکدەخات و سەرکردایەتی دەکات. ئەم تاقمە بریتییە لە ئەنتلیجنسیا

جەمال عەبدولناسر لە لایەکەوە بلیمەتیەکی بێوێنەو دوربینیو ئازایەتیەکی دەگمەنی هەبوو، لەگەڵ زیرەکیەکی زۆرو زەینێکی ورد. ئەم خەسڵەتانە کردی بە یەکێك لە پاڵەوانە هەرە گەورەکانی مێژووی میسرو جیهانی سێیەمی هاوچەرخ

*1956*بخوێنینەوە، تا دەرك بەوە بکەین[٤] جەمال عەبدولناسر[*] لە لایەکەوە بلیمەتیەکی بێوێنەو دور بینیو ئازایەتیەکی دەگمەنی هەبوو، لەگەڵ زیرەکیەکی زۆرو زەینێکی ورد. ئەم خەسڵەتانە کردی بە یەکێك لە پاڵەوانە هەرە گەورەکانی مێژووی میسرو جیهانی سێیەمی هاوچەرخ.

ئەمەیە لایەنە ئیجابییەکە، بەڵام ئەمە تەنیا نیوەی چیرۆکەکەیە. لایەنێکی تریش هەیە، بریتیە لە لایەنی ئایدیۆلۆجی لە شەپۆلی ناسریدا لە ئەنتلیجنسیادا، یاخود بە گوزارشتێکی وردتر ناتەواویەك لەم بوارەدا. ئەمەش مەسەلەیەکە پێی لێنراوە، ئەوەتا جەمال عەبدولناسر خۆی وتویەتی کە هیچ پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوی پێ نەبوە، بەڵکو بە تاقیکردنەوە فێری بوە. ناتەواویی ئایدیۆلۆجی، هەمیشە گوزارشت لە ئایدیۆلۆجیایەکی ناوەکی دەکات، لەوەدا کورت دەکرێتەوە کە ناسریەت زۆرینەی بیرە باوەکانی ناو کۆمەڵگای میسری بە میرات بۆ ماوەتەوە. ناشڵێم ئەم بیرانە بە شێوەیەکی تایبەتی گوزارشتیان لە ئایدیۆلۆجیای بۆرجوازیەتی بچوك کردوە. ئەگەر گەلی میسری بە هەموو دەستەو تاقمەکانیەوە هەموو ئەم بیرانە تا ئاستێکی زۆر پێکەوە کۆدەکاتەوە کە زۆر بە سادەیی، دواکەوتوویی کەلتوریی کۆمەڵگای میسری وێنا دەکەن. ئەم بیرە دواکەوتوانە وەکو لەمپەرێك لە بەردەمی بیرە نوێیەکاندا ڕاوەستاون. بیرە مارکسیەکانیشیان لەگەڵدا بێت. ئەم بیرانە بوون بە ڕێگرێك لە بەردەمی پێگەیشتنی هوشیاریداو دڵی خۆی بە بیرە وەهمیەکان خۆش کرد لەمەڕ ستەمکاری دادپەروەرو ڕەتکردنەوەی دیموکراسیەت ، دوژمنایەتی مارکسیزمیشی پەرە پێدا...هتد. کەواتە لە کۆتاییدا بریتیە لەو بیرانەی لە واقیعدا بەشی خۆیان هەیە، لە داڕشتنی سنورەکانی ئەزمونی ناسریەتو لاوازکردنیشیدا، بۆیە پێویستە گفتوگۆکردن بەردەوام بێت دەربارەی ڕیشەکانی دواکەوتن لە کۆمەڵگای میسریدا[٥].

دوای ئەو گفتوگۆیە، لێکۆڵینەوەی سروشتی دەسکەوتە ناسریەکان دەست پێدەکات: ئایا هەنگاوێکی سوسیالیستی بوە یاخود گەشەکردنێکی سەرمایەداریانەی پەتی، گەرچی تایبەتمەندێتی خۆیشی هەبووبێت (وەك زاڵیی موڵکایەتی دەوڵەت)؟ ئالێرەوە بیروراو حوکمەکان جیاواز دەبن.

بەبێ گەڕانەوە بۆ وردەکاریەکانی ئەو مشتومڕەی من پێموایە بەردەوامبوونی کارێکی پێویستە، حەزدەکەم بە کورتی رای خۆم لەم خاڵانەی خوارەوەدا بخەمە روو:

یەکەم: ناسریەت ژمارەیەك ریفۆرمی باشو پێشکەوتنخوازی کردوە، کە پێویست بوو لە ڕەوشی ئەوکاتەی میسردا بەئەنجام بگەیەنرانایە. هەندێك لەوانە، هەر لە بنەڕەتەوە بریتین لە چاککاریی کشتوکاڵ، لە خۆماڵیکردنی دامودەزگا میسریو بیانیە گەورەکان. هەر سیستمێکی میللی ئامانجی بیناکردنی کۆمەڵگایەکی

سوسیالیستی خستبێتە بەردەمی خۆی، ناچارە بەم ریفۆرمانە دەست پێبکات، بەڵام هەر سیستمێکی میللی راستەقینە ئەم ریفۆرمانەی لە چوارچێوەیەکدا دەخستە ڕوو کە بەسەر چەند ئاسۆیەکی دوورتردا بکرایەتەوە، یەکەمجار دەیخستە چوارچێوەی هەڵوەشاندنەوەی پێوەستیەوە(واتە رزگاربوون لە کارکردن بەپێی پێوانە سەرمایەداریەکان) دوەمیش بایەخی دەدا بە وەلانانی ئەو مومارەسانەی دەبوونە هۆی بەهێزکردنی رەگەزی دیموکراسی[*]، بە جۆرێکی وەها، کە ئیتر موڵکایەتی دەوڵەت پێش بکەوێتو بە راستی ببێت بە موڵکایەتی گەل. ئەم دوو مەرجە بەدی نەهاتن، بۆیە ئەم ریفۆرمانە مۆرکی سەرمایەدارێتیان وەرگرتو بوونە نوێنەری گواستنەوە لە قۆناغێکی سەرمایەدارێتیەوە بۆ قۆناغێکی تری سەرمایەداریی (لێرەداو لە بارودۆخی میسردا، گوێزانەوە لە سەرمایەدارێتی کشتوکاڵیەوە، بۆ سەرمایەدارێتی پیشەسازی).

دوەم: لە شوێنێکی تردا[6] وتم لێکچوونێك هەیە لە نێوانی ئەزمونی محەمەد عەلی[*] و ئەزمونی ناسریەتدا ئەگەرچی لە بارودۆخی ناوخۆیی و دەرەکیی جیاوازدا روویان داوە. محەمەد عەلی ویستی میسرێکی سەرمایەداری بینا بکات، بێئەوەی پشت ببەستێت بەو چینەی دەتوانێت ئەم ئەرکە مێژووییە رابپەڕێنێت . واتە بۆرجوازیەت، هەرچەندە کۆرپەلەش بێت. بە هەمان شێوە ناسر هەوڵیدا لە سەرەوە سوسیالیزم بینا بکات، واتە بێئەوەی رێگە بدات دەسپێشخەری بگوێزرێتەوە بۆ دەستی گەل کە خۆی تاقە خاوەنی پرۆژەی سوسیالیزمە. بێشك چەند هۆیەکی بابەتی هەن کە تاڕادەیەك ئەم دوو پشکە(خیار) لێکچوە راڤە دەکەن: کۆرپەلەیی بۆرجوازیەت لە سەردەمی محەمەد عەلیدا، دواکەوتوویی کۆمەڵگای میسری لە کۆتاییەکانی سەردەمی شاهانەدا. وەڵێ هۆی ئایدیۆلۆجیشی هەیە کە تەنیا پەرچدانەوەی بارودۆخە بابەتیەکان نین، بەڵکو تا ڕادەیەك سەربەخۆن. مەبەستم لەوەیە کە دواکەوتوویی فیکری میسری بوو بە ڕەگەزێکی گرنگ لەپەککستنی پێشکەوتندا.

سێیەم: ئەم بارودۆخانە بوون بە هۆی ئەنجامدانی چەشنێك لە سیستمی سەرمایەداریی کە بریتیە لە سەرمایەدارێتی بیرۆکراسی، بە پێچەوانەی نمونە تەقلیدیەکەوە، کە تێیدا شکڵەکانی موڵکدارێتی تایبەت بەسەر شکڵە حکومیەکانیدا زاڵە.

هەیە پێی وایە کە دەکرا ئەم سەرمایەدارێتیە بەرەو سوسیالیزم پەرە بسێنێت لە توێی زیادبوونێکی پلەپلەی دەوری گەلەوە. گومانم نیە کە ئەم ئیحتیماڵە شیاو بوو، بە تایبەتی کە نیشتمانپەروەرێتی دروستی رژێمەکەو بەریەك کەوتنە چەندبارەکانی لەگەڵ ئیمپریالیزمدا دەشیا وردە وردە بە ئاڕاستەی پەرەسەندنی سیستمی حوکمو



جەمال عەبدولناسر

لێکچوونێك هەیە لە نێوانی ئەزمونی محەمەد عەلیو ئەزمونی ناسریەتدا ئەگەرچی لە بارودۆخی ناوخۆیی و دەرەکیی جیاوازدا روویان داوە



محەمەد عەلی


محەمەد ئەنوەر سادات

مومارەسەکانی پەرە بسێنێت: بەڵام هەتا دوا ڕۆژی ناسرییەت ئەم شێمانەیە بەدی نەهات.

ئەزمونی ناسریەت (هەروەها چەندان ئەزمونی تری هاوشێوە لە جیهانی سێیەمی هاوچەرخدا) سەلماندوویانە کە سەرمایەدارێتی بیرۆکراسی، تەرزێکی سەقامگیر لە پەرەسەندنی سەرمایەدارێتی وێنا ناکات، یان ئەوەتا قۆناغێکی گواستنەوە بێت کە بە خێرایی بەسەر فۆناغێکی میللیدا دەکرێتەوە (ناڵێم سوسیالیستی)[7]. یاخود لە ژێر فشارەکانی سیستمی سەرمایەدارێتی جیهانیدا دەگۆڕێت بۆ تەرزێکی تەقلیدیی سەرمایەدارێتی دواکەوتوو. هەر ئەمەش بوو لە ماوەی کرانەوەدا لە میسر ڕووی دا.

چوارەم: لەوەی تێپەڕی، دەگەینە ئەوەی بونیادی ناسریەت. بەو سنورە مێژوویيانەوە کە باسکران. هەڵگری پەرەسەندنەکەی دواتر بوو، چونکە ساداتیزم[*10] لە ئەنجامی دژە شۆڕشێکدا نەهات، بەڵکو ئەنجامی داخزانی خودی ناسریەت بوو. پێشتر ئاماژەم کرد بۆئەوەی، کودێتاکەی سادات ڕووی دا، بێئەوەی هەرێمەکە لە ماناکەی تێبگات و بێئەوەی جەماوەری گەل ڕووبەڕووی بوەستێتەوە.[8]

تیورەی " ڕیگای نا – سەرمایەداریی " دەورێکی سلبیی بنەڕەتی بینی لە زیادکردنی ئیلتیباسی دەوری ڕژێم و هیواکانی. ئەم تیورەیە یاریدەی تێگەیشتنی مەرجە پێویستەکانی نەدا تاکو بە ڕاستی کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەم بە ڕاستی بچێتە قۆناغی گواستنەوەی بەرەو سەرمایەداریەوە. ئەم تیورەیە باسی چەمکی هەڵوەشاندنەوەی پێوەستیی نەکرد، بەڵکو بە تەواوی خۆی لێ لادا. هەروەها بە شێوەیەکی جیدی ئیشکالیەتی دیموکراسیەتی گەلی نەوروژاند. بە بڕوای من گومان لەوەدا نیە کەئەو تیورەیە لەوە تێنەپەڕی، کە پاساودانێکی کاتی بێت بۆ مومارەسەکانی دیپلۆماسییەتی سۆڤێتی لە یەکێك لە قۆناغەکاندا. سەرباری ئەوەی کە پشتگیری سۆڤێت بۆ سیستمە بۆرجوازیەکان بەرەو ڕووی دژایەتی ئیمپریالیزم دەبۆوە کە پێویستی پێی نەبوو.

تیورەی " ڕیگای نا - سەرمایەداریی " دەورێکی سلبیی بنەڕەتی بینی لە زیادکردنی ئیلتیباسی دەوری ڕژێم و هیواکانی

هێزە پێشکەوتنخوازە میسریەکان لە کاتی خۆیدا ئەم تیورەیەیان ڕەت نەکردەوە، بگرە گومانی جیدیشیان بەرامبەری دەرنەبڕی. بە داخەوە پێچەوانەکەی زیاتر لە ڕاستییەوە نزیکە. زوربەی زۆری هەموو شەپۆلەکانی چەپ و هێزە پێشکەوتنخوازە میسریەکان پەرۆشیان هەبوو بۆ ئەم قسە ڕوکەشیە کە تەنیا چەند تاکێکی کەم ڕەتیان کردەوە کەئەوانیش قورساییەکی ڕاستەقینەیان نەبوو لە بواری مومارەسەی سیاسیدا.

## پەراوێزەکان

1. رەنگە خوێنەری عەرەب لە گرنگترین کتێبی مندا ( پەرەسەندنی ناهاوتا . دار الطلیعة ـ بیروت . 1974 ) لەگەڵ چین و نەتەوە لە مێژوو قۆناغی ئیمپریالییەتدا . دار الطلیعة ـ بیروت . 1980 بۆچوونەکانی من ببینێتەوە لەمەڕ بابەتی فراوانبوونەوەی سەرمایەداریی جیهانی و پاشکۆیەتی .. هتد .
هەروەها بڕوانە "قەیرانی کۆمەڵگای عەرەبی" ( دار المستقبل العربي ـ القاهرة 1985 نەسکی یەکەم (سەنتەرو کەنارەکان)، دوەم (هەڵوەشاندنەوەی پێوەستی) ، سێیەم (قەیرانیی جیهانیی ئێستا) . هەروەها دەربارەی پاشکۆیەتی و فراوانخوازیی جیهانی سەرمایەداریەت . (المستقبل العربي ـ 11 ـ 1986).
هەروەها لە کتێبێکی تریشدا باسی سوسیالیزم کردوە، بەم زوانە لەدار المستقبل العربي ـ بیروت دەردەچێت لە ژێر ناونیشانی پاش سەرمایەداریی، بەتایبەتی بڕوانە نەسکی چوارەم (ماهیەت و قەیران و سروشتی سوسیلیزم ...) و پێنجەم (هەڵوەشاندەوەی پێوەستی) و شەشەم (چاککردنی سیستمی جیهانی).
2. بڕوانە کتێبەکەم دەربارەی میسری ناسری، لە ساڵی 1962دا بە زمانی فەرەنسی دەرچوە، بە تەواویی لێکۆڵینەوەکەی بەرەکات دەسەلمێنێت (پەرەسەندنی موڵکایەتی کشتوکاڵی لە میسر 1812 ـ 1914 ، دار الثقافة الجدیدة ـ 1977 ـ القاهرة)، لەوێدا هەمان بۆچوونم هەیە، کە لێرەدا داکۆکی لێ دەکەم.
3. ئێرە شوێنی گفتوگۆکردن نیە لەسەر چەمکی هەڵوەشاندنەوەی پێوەستی و ڕەهەندەکانی و ستراتیژەکانی و ناواخنە عەینیەکەی و ...هتد. ئەم بابەتە لە کتێبی (قەیرانی کۆمەڵگای عەرەبی) مندا بخوێننەوە ، نەسکی دوەم .
4. وتارەکانی محەمەد حەسەنێن هەیکەل لە زنجیرەیەکدا بڵاوکرایەوە، لەرۆژنامەی ئەلئەهرامدا دەرچوو ، لە ماوەی مانگی نۆڤەمبەری 1986دا.
5. ئێرە شوێنی درێژکردنەوەی بابەتی ڕەهەندی ڕۆشنبیریی نیە لە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا. لە کتێبی (قەیرانی کۆمەڵگای عەرەبی)دا خۆم لە چەند لایەنێکی ئەم بابەتە داوە (بەتایبەتی نەسکەکانی 5 . 10). هەروەها بگەڕێرەوە بۆ کتێبی (پاش سەرمایەداریی) من نەسکی هەشتەم " نامەی مارکسیزم لە ئاسیاو ئەفریقیا". هەروەها بگەڕێرەوە بۆ وتاری (رەهەندی ڕۆشنبیریی لە گرفتی گەشەپێداندا، چەند تێڕامانێك لە قەیرانی فیکری عەرەبیی هاوچەرخ ) کە بەم نزیکانە لە گۆڤاری فیکری عەرەبیدا دەردەچێت).

6. قەیرانی فیکری عەرەبی ، نەسکی هەشتەم.
7. لێرەدا خەریکی مەسەلەی گفتوگۆکردنی گرفتی سوسیالیزم نابین. هەر ئەوەندە پێمخۆشە ئاماژە بکەم بۆ ئەوەی تێزی من لەم بارەیەوە ئەوەیەکە شۆڕی دژ بە سەرمایەدارێتی قۆناغێکی مێژوویی درێژ

جیهانی سێیەم بریتیە لە ناونانێکی گشتی ئەو دەوڵەتانەی لە ڕووی ئابوریەوە ڕوو لەپێشکەوتن. ئەم زاراوەیە لە ماوەی جەنگی ساردا هاتۆتە کایەوە، ئەوکاتەی کە دووبلۆکی دژ بەیەک لە ئارادا بوون

ناوەڵا دەکات کە خەسڵەتی بەردەامبوونی خەباتی هەیە لە نێوان هێزە سوسیالیستەکانو هێزە سەرمایەدارێتییەکانو چەند هێزێکی سێیەمین کە ناوم ناون (دەوڵەتاندن) واتە مەرکەزیەتی دەوڵەت لە کۆمەڵگاکانی پاش سەرمایەدارێتیدا بڕوانە : پاشکۆیەتیو فراوانخوازیی جیهانیی سەرمایەدارێتی (وتارێکە لە سەرەوە ناوی هێنراوە) لەگەڵ کتێبی پاش سەرمایەداری.

8. بگەڕێرەوە بۆ سەر چەند تێڕامانێک لەمەڕ سروشتی سەرمایەدارێتی لە میسر . الطلیعة *1985*.

## پەراوێزی وەرگێڕ

[1] **سوسیالیزم** *Socialism,* پێڕەوێکی ئابوریو کۆمەڵایەتیو جوڵانەوەیەکی سیاسییشە کە سروشتی لەم پێڕەوەوە وەرگرتوە، هەروەها سیستمێکیشە، کاتێک کە ئەم پێڕەوە کۆمەڵگا بەڕێوە دەبات، پێڕەویی لێدەکرێت. پێڕەوی سوسیالیستی پێدادەگرێت لەسەر ئەوەی کە دەوڵەت خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بێتو کۆنترۆڵی دابەشکردنی سامان بکات.

[2] ئەم خەسڵەتە یەکێکە لە خەسڵەتە هەرەدیارەکانی کوردەواری بەخۆیو ڕۆشنبیرانیەوە. تەنانەت ڕۆشنبیرانی کورد بەشدارییەکی تاوانبارانەشیان هەیە لەم هەڵکشانو داکشانە سیاسیو کەلتوریەی کوردەواریدا، بەحۆرێك کە هەمیشە دوای ماڵ وێرانبوون، ئینجا دەگەڕێنەوەو دەکەونە ڕەخنەگرتن لەو ئەزمونەی ڕابردوو کە خۆیانو ڕۆشنبیرییەکەیان بەشێکی ئۆرگانی بوون تێیدا. ئەمە ئەگەر دان بەوەدا بنێین کە کوردەواری خاوەنی گرووپێکی تایبەتی خۆیەتی لە ڕۆشنبیران، چونکە ئەمانە ، یان زۆربەیان، زیاتر پێناسەی خوێندەواریان بۆ دەگونجێت، تا ڕۆشنبیر.

[3] **جیهانی سێیەم** *Third World* بریتیە لە ناونانێکی گشتی ئەو دەوڵەتانەی لە ڕووی ئابوریەوە ڕوو لەپێشکەوتنن. ئەم زاراوەیە لە ماوەی جەنگی ساردا هاتۆتە کایەوە، ئەوکاتەی کە دووبلۆکی دژ بەیەك لە ئارادا بوون، بەمەش زاراوەکە مانای ئەوەی دەگەیاند کە لە ڕووی ئابوریو تەکنەلۆجیەوە، دەوڵەتانی جیهانی سێیەم لە ئاستی سێیەمدا دێن، دوای ئەو دووبلۆکە بەگژیەکدا چوە. زاراوەکە یەکەمینجار لەلایەنی فرانز فانونی مارکسیستەوە بەکارهاتوەو بە زۆری لە لایەنی ئەو دەوڵەتانەوە کە شمولیان دەکات بە زاراوەیەکی نێگەتیف دانراوەو کەم بەکاریان هێناوە. هەرچۆنێك بێت هەرەسهێنانە ئابوریو سیاسیەکەی یەکێتی سۆڤێت لە کۆتایی هەشتاکانو سەرەتای نەوەدەکاندا، زاراوەکە بە سودمەندی مایەوە بۆ پێناسەکردنی ئەو دەوڵەتانە، چونکە ئەگەر وا نەبێت پۆلاندنیان زەحمەت دەبێت. دەوڵەتانی جیهانی سێیەم، نزیکەی دوو لەسەر سێی دانیشتوانی جیهانیان گرتۆتە خۆیان، دەکەونە ئەمریکای لاتین ، ئەفریقیاو ئاسیاوە. لەڕووی سیاسیەوە ئەم دەوڵەتانە بەزۆری لایەنگیری هیچ کام لەو دوو بلۆکی ڕابردوە نەبوون. حاڵی حازر هەندێك لەو دەوڵەتانە پەیوەندیان کردوە بەجیهانی پێشکەوتوەوەو هەندێکی تریان وەکو خۆیان ماونەتەوەو ژمارەیەکیشیان لە ئاستی خۆیان دابەزیونو پەیوەندیان کردوە بەجیهانی چوارەمەوە.

[4] **یەکێتی سۆڤێت** *Union of Soviet* بریتی بوو لەگەورەترین یەکگرتووی دیکتاتۆرییەتی کۆمۆنیزم، دوژمنی گەورەی سیستەمە خۆراواییەکان بوەو بەشێوەیەکی مەترسیدار ئیدارەی جەنگی ساردی کردوەو کاریگەرییەکی زۆری لەسەر سیاسەتی نێودەوڵەتی هەبوە، هەتاکو هەرەسهێنانەکەی ساڵی *1991*. یەکێتی سۆڤێت گەورەترین وڵات بوو لە جیهاندا، دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی *1917* بە رابەرایەتی لینین، یەکێتیەکە لە دیسەمبەری *1922*دا، دامەزرێنراوە.

[5] مەبەست لەو پێڕەوەیە کە جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر پیادەی دەکردو بەناوی خۆشیەوە ناونراوە، کەسیستمێکی زیاتر سوسیالیستانەی سەربەخۆی نەتەوەییانە بوو.

*6* تەڵەزگە واتە "مازق" ی عەرەبی.

[7] جەمال عەبدولناسر ( *1918 . 1970*) سیاسەتمەدارو پیاوی دەوڵەتی میسریە، لەناوچەی ئەسیوت لەدایك بوە، دامەزرێنەری جوڵانەوەی ئەفسەرە سەربەستەکانە، کە لە ساڵی *1952*دا شا- فاروقیان لەسەر تەخت لابرد. ناسر لە ساڵی *1956*دا، کەناڵی سوێسی خۆماڵی کردوە. لە ساڵی *1958*دا دەبێت بە سەرکۆماری میسر، پاشان هەتا رۆژی مردنی سەرۆکی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو دەبێت، یەك کتێبی بڵاوکراوەی هەیە کە ناوی فەلسەفەی شۆڕشە.

[8] ئەم هەوڵە بە زەقی لە ڕژێمی عیراقی پێش راپەڕینو ئیدارەی دوای راپەڕینیشدا بە زەقی دەبینرێت، کە بەرچاوترین هەنگاوی بریتیە لە فڕێدانەوەی دەزگاو رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیی بۆ ناو حیزبی دەسەڵاتدارو داکۆکیی کردن لەحیزبێتیی ئەوانە بە دەستو بە ددان. نیشانەیەکی تریشی (کە تایبەتە بە کوردستانی پاش راپەڕین) بریتیە لە بانگەشەکردن بۆ دیموکراسیەت لەوشوێنەدا کە دیموکراسییەت بزرەو سەرکوتکردنیشی لەو ئاستەدا کە هەوڵی ئامادەبوون دەدات.. وەکو رێگەدان بەئاخاوتنی ئازاد لەو ساتانەدا کە ئازادیی خەتەرێك نیە بۆ سەر ئەوانو بەپێچەوانەوە رێگرتن لێی.

[9] **محەمەد عەلی گەورە** *Muhammad Ali (viceroy), (1769-1849),* نوێنەری سوڵتانی عوسمانی بوو لەمیسر *,(1849-1805)* بە نازناوی پاشاوە. ریفۆرمێکی بەربڵاوی لەوڵاتدا بەرپاکردو بردیە سەر سنورەکانی ژیانی مۆدرێنو هێنایە ناو سەدەی بیستەمەوە. محەمەد عەلی لە ناوچەی کاڤالا لەدایك بوە (ئێستا ئەم ناوچەیە سەر بە یۆنانە)، دایكو باوکی ئەلبانی نەژاد بوون. لە ساڵی *1799 – 1891* بەشداری چەندان شەڕی کردوە لە میسرو پاشان دژی سوپاکەی ناپلیۆن.

[10] **سادات، ئەنوەر** *Sadat, Anwar al- (1918-1981),* سەرکردەیەکی سەربازیی میسرییە، سەرکۆماری میسریشە *,(1981-1970)*، یەکێکە لەدیارترینی ئەو کەسانەی هەوڵیانداوە ئاشتی لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرکەماڵ ببێت، لەم پێناوەشدا یەکەمین سەرکردەی عەرەبە کە مامەڵەی لەگەڵ ئیسرائیلدا کردوە. سادات لە خێزانێکی هەژارەوە هاتوەو کوڕی پیاوێکی فەرمانبەری بچوك بوە، پەیوەندی کردوە بە ئەکادیمیای سەربازیەوەولەگەڵ عەبدولناسردا بەشداری کردوە لە پیلانی دژی ئینگلیز کە وڵاتی

داگیر کردبوو. لە ماوەی جەنگی جیهانی دوەمدا دووجار زیندانی کراوە لەسەر پەیوەندیکردنی بە ئەڵمانەکانەوە. لە کودێتاکەی ساڵی *1952*دا بەشداری کردوە، کە ئاکامەکەی لەسەر کار لادانی شا فاروق بوو. لە ساڵی *1946 – 1966* جێگری سەرۆك بوە، هەروەها دیسانەوە لە ساڵی *1969 . 1970*دا بۆتەوە بە جێگری سەرۆك.



جیرمی هاوسۆرن

# مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم
# ڕۆمان و تیۆری ئەدەبی




وەرگێڕ: شۆڕش جوانڕۆیی

مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرن سنوری کەلتوریو نەتەوەییو ناوچەیی زیاتر تێپەڕاندوەو ڕەهەندێکی جیهانی لەخۆ گرتوە. چیدی بواری کارکردن و ئامادەیی ئەم دوو جەرەیانە وابەستە نیە بە بوارەکانی هونەرو کۆشکسازیەوە، بەڵکو زۆربەی ڕشتەکان و قەڵەمڕەوی بیرکردنەوە مرۆییەکان لە ڕشتەکانی زانستی کۆمەڵایەتیو مرۆیی کە بریتین لە، فەلسەفە، ڕامیاری، ئەدەبیات، تیۆری ئەدەبی، ڕۆمان و چیرۆك نوسین، کۆمەڵناسی، دەرونشیکاری، مێژوو، ئابوریو.. خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوە.

کارێکی هێندە ئاسان نیە کە پێناس و وەسفی مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم بە شێوەیەکی سەربەخۆ یان جودا لە یەك، بکەین، چونکە مەرزەکانی نێوانیان وێڕای دەستوێژی (کاربرد) وێك نەچووشیان، جیاوازیان لە تەك یەکدیدا هەیە. لەم وتارەی

پۆست مۆدێرنیزمیش وەك تەواوی زاراوەو دەستەواژەكانی دی دوچاری ناجێگیریو لەقبونی مانا بووەو لە ڕاستیدا ئەم ناجێگیریە مانایە وەك ڕوداوێكی هەمیشەیی و هەموو شوێنێ، ئازاری ئەدات!

بەردەستدا لەسەر مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم لە بواری ڕۆمان و چیرۆك نوسیو ڕەخنەی ئەدەبیو تیۆری ئەدەبی، ئەكۆڵینەوە.

هەر بەو شێوەیەی كە وتمان پێناسكردنی ئەم دوو (تەعبیر)ە وێڕای دەستاوێژە جیاوازەكانیان وەك، دیاریكردنی مەرزەكان و وابەستەییو یان مەرزبەندی نێوانیان، كارێكی دژوارو تا ڕادەیەك مەحاڵە. هەر ئەم مەسەلەیە بۆتە هۆی ئەوەی كە زۆرێك لە تیۆریسنەكان پێناسەیەكی دیاریكراوی بۆ نەكەن و بە دەربڕینە گشتی، یان كۆبێژییەكان قەناعەت بكەن. بۆ نمونە هەر بەو جۆرەی كە /ئاندرئاس هۆیسن/ ئەڵێت:

تا ڕادەیەكی زۆر، چیەتیەكی بیٚ فۆرم، شڵەژاو، ناڕێك و پێك و نائاشكراو لە ڕووی سیاسیشەوە ناپایەدار، هەڵاتو (فرار)، ڕەوان و گۆڕاوی پۆست مۆدێرنیزم خودی ئەم دیاردەیەی كردوە بە شتێكی فریودەرو تەمومژئامێزو پێناسەو دیاریكردنی مەرزەكان و چوارچێوەكانی -ئەگەریش نەڵێین مەحاڵ- یەكجار دژوار كردوە. جیا لەوەش، ئەو شتەی كە لە دیدی ڕەخنەگرێكەوە بە پۆست مۆدێرنیزم لە قەڵەم ئەدرێت، لای ڕەخنەگرێكی دیكە بە مۆدێرنیزم دائەنرێت (یان بە پێچەوانەوە)، لە كاتێكدا كە بە تەواوی فۆرمە تازەكانی فەرهەنگی هاوچەرخ (وەك سەرهەڵدانی كەلتورە سەربەخۆو دیاریكراوەكانی گروپە كەمینەكان و هەروەها سەرهەڵدانی ژمارەیەكی زۆرو جۆراوجۆری بەرهەمە فیمینستیەكان لە ئەدەبیات و هونەر)دا، تا ئێستاش بە دەگمەن وەك شێوەكانی پۆست مۆدێرن، قسەوباسیان لەسەر كراوە[1].

لە ڕاستیدا، هەر بەو شێوەیەی كە (ئیهاب حەسەن) قسەی لەسەر ئەكات، ئەتوانین ئەم بیٚ چارەنوسیو نادیاریكردنە لە قاڵبی ئەو فۆرم و دەربڕین و زاراوانەی دیكەی وەك پێشڕەو (ئاوانگارد)دا بخەینەڕوو:

پۆست مۆدێرنیزمیش وەك تەواوی زاراوەو دەستەواژەكانی دی -وەك پۆست بونیادگەرایی، یان مۆدێرنیزم، یان ڕۆمانتیزم- دوچاری ناجێگیریو لەقبونی مانا بووەو لە ڕاستیدا ئەم ناجێگیریە مانایە وەك ڕوداوێكی هەمیشەییو هەموو شوێنێ، ئازاری ئەدات! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە هیچ جۆرە كۆبونەوەیەكی ڕوون و ڕێكەوتنێكی ئاشكرا سەبارەت بە مانای پۆست مۆدێرنیزم لە نێوان لێكۆڵەرەوەو توێژەرەوانەكاندا، نیە.. بەم جۆرە دیدگای هەندیٚ لە ڕەخنەگران لەسەر پۆست مۆدێرنیزم ئەو شتەیە كە بەشێكی دیكەیان بە پێشڕەو (ئاوانگارد) یان پێشڕەوانی نویٚ، ناودێری ئەكەن[2].

بەم جۆرە، (دیڤید هاروی)یش لەو بڕوایەدایە كە جوڵە لە مۆدێرنیزمەوە بەرەو پۆست مۆدێرنیزم، وێكچون و بەردەوامی گەلەك زیاتری لە جیاوازیو لێكدابڕان، تیا بەدیئەكرێت. بە بڕوای (هاروی) پۆست مۆدێرن پیشاندەری قەیرانێكە لەناو

(مۆدێرنیزم)دا کە تیایدا پارچە پارچە بوون، پەرش و بڵاوی، ڕەوانی‌و تێپەڕبوون سەقامگیر ئەبێ‌و یەقین لەخۆ دەگرێت، لە کاتێکدا شێمانەی هەر جۆرە جێگیریەك، پایەداری، یەکێتی، کۆبونەوە (پەرش و بڵاونەبوون)، تاکایەتی، بەردەوامی‌و ئەمری لە ڕادەبەدەر، لەتەك شك و گوماندا تێکەڵ بوە[3].

هەروەها (ئالێکس کالینیکوس)یش لەو بڕوایەدایە کە جیاوازیەکی ڕوون و ئاشکرا لە نێوان مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزمدا نیەو ئەتوانین ئەو باوەڕە، (واتە ئەوەی کە هیچ جیاوازیەکیان نیە) لە ڕێگەی ناڕەزایی‌و ناکامیە سیاسی‌و فەرهەنگیەکانی وەچەی *1968ی* ئەوروپای خۆرئاواو وڵاتە یەکگرتوەکانەوە، ڕوون بکەینەوە[4].

لە نێو ئەو دەستەواژەو دەربڕینانەی کە تا هەنوکە ئامارژەمان پێکردن، پێدەچێت ڕوونترین و ئاشکراترینیان دەستەواژەی پێشڕەو (ئاوانگارد) بێت. ئەم دەستەواژەیە لە وشەو زاراوە سەربازیەکانەوە، وەرگیراوەو مەبەستی گروپێکی بچوکی گاردی پێشڕەو، یان پێشەنگە (*guard advance*) کە ڕێڕەوی بەرەو پێشچوونی سوپا، سوپاییەکان، یان ئەو سەربازانەی کە بە دوایاندا دێن، خۆش ئەکەن، شتێك کە دواتر بە گروپی (دەستوەشێن) یان گروپی هێرشبەر (*Shocktroops*) ناسرا. ئەم واژەیە لەناو دەق و بەرهەمە سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و کەلتوری‌و ئەدەبی‌و هونەرییەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا بە بزاوتگەلێك ئەوترا کە ئامانجیان هێرشکردنە سەر ئەو پێودانگ و دیدگاو تێڕوانینە دەستنیشانکراوانە بوو بە تایبەت لە بواری کەلتورو هونەردا.

لەم ڕووەوە، کوبیسم، فۆتۆریسم، دادائیسم، سوریالیزم و بونیادگەرایی، هەموویان لە ڕوویەکەوە بە بزاوتگەلێکی پێشڕەو (ئاوانگارد) وەسف و پێناسکراون. سەیر ئەوەیە کە زۆرجار پێشڕەو وەك بزاوت و جوڵانەوەکان قسەی لەسەر ئەکرێت. ڕەنگە، تا ڕادەیەك هۆی ئەم مەسەلەیە ئەوە بێت کە بزاوتە پێشڕەوەکان لە بنەڕەتدا پەیامی خۆیان بە بەشێك لە تێکۆشانی کەلتوری -سیاسی بەفراوانتر بزانن کە خۆیان بۆ تێکۆشان لەتەك ڕێساکانی بورژوازی‌و هەروەها نابودکردنیان تەرخانکردوەو هەمیشەش بە ئاشکرا لە ئامادەیی هەمان توخمی سیاسی‌و پراکتیك خوازدا لە زۆرێك لە بزاوتە ئاوانگاردەکاندا وەك پێوەرێك بۆ دانانی جیاوازی لە نێوان ئاوانگاردیسم و مۆدێرنیزمدا، کەڵك وەرئەگیرێت. خودی ناونیشانی پێشڕەو (ئاوانگارد) دەربڕی جۆرە دڵەڕاوکێ‌و نیگەرانیەکە سەبارەت بە کاریگەریەکانی ئاینده یان هەر شتێك کە بڕیارە ڕووبدات، لە کاتێکدا کە زۆرێك لە هونەرمەندە مۆدێرنیستەکان دەرهەق بە شێمانەی ئەوەی کە ڕەنگە بەرهەمەکانیان گۆڕانکاریەکی بەرفراوانی کۆمەڵایەتی یان کەلتوری لێبکەوێتەوە، یەکجار بەدبین بوون. باشترین کارگەلێك کە سەبارەت بە (ئاوانگارد)

جیاوازیەکی ڕوون و ئاشکرا لە نێوان مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزمدا نیەو ئەتوانین ئەو باوەڕە، لە ڕێگەی ناڕەزایی‌و ناکامیە سیاسی‌و فەرهەنگیەکانی وەچەی 1968ی ئەوروپای خۆرئاواو وڵاتە یەکگرتوەکانەوە، ڕوون بکەینەوە



جیمس جۆیس

ئەنجام دراوە بریتیە لە تیۆری ئاوانگاردی (ڕیناتۆپوگیولی)[5] و تیۆری ئاوانگاردی (پیتەر بەرگن)[6].

دەستەواژەی مۆدێرنیزم، لە ماوەی دەیەکانی ڕابردودا، مانایەکی جێگیرو دیاریکراوی بۆ خۆی پەیداکردوە، گەرچی تەقەلادان بۆ دۆزینەوەی ڕیشەی پۆست مۆدێرنیزم لە ڕابردوداو هەروەها لکاندنی ئەم واژەیە بەو بەرهەمە ئەدەبیو هونەریانەی کە پێشتر بە مۆدێرنیست وەسف کرابوون، تا ڕادەیەك ئەم جێگیریی مانابیەی دووچاری لەقبوون کردوە. هەر بەم هۆیەوە جێی خۆیەتی ئاماژە بە هەندێ بەرهەمی وەك (شەپۆلەکان)[7]ی ڤیرجیناڤۆلف و ڕۆمانە بەناوبانگەی جیمزجۆیس، واتە "هەستانەوە لە دوای مەرگ (بێداری) فینگانەکان[8] بکەین کە تا ماوەیەکی زۆر لەتەك (ددانە تیژەکان)دا لە ڕیزی بەرهەمە مۆدێرنیستەکاندا وەسفکرابوون، بەڵام لە دەیەی (1980)دا لە لایەن ژمارەیەکی زۆر لە ڕەخنەگرانەوە (تەعبیر)ی پۆست مۆدێرنیستیان بۆ بەکارهێنراو بە بەشێك لەو بەرهەمانە لەقەڵەم دران.

لە دەستاوێژی (کاربرد) گشتیدا، مۆدێرنیزم دەربڕی هونەرێکە (نەك تەنها ئەدەبیات) کە ڕووبەڕووی ئەو بڕیارانە ئەبۆوە کە بەسەر هونەرو کەلتوری سەدەی نۆزدەهەمدا زاڵبوون، کە ڕەنگە بۆ نمونە گرنگترینی ئەو بڕیارانە، ڕیالیزم یان واقیعگەرایی بێت: هەنوکە، ئیدی هونەرمەندی مۆدێرنیست گرنگترین یان واڵاترین ئەزمونی هونەری خۆی بە ئەزمونی ڕاستنمایی (دروست نمایی، بابەت نمایی *Vensimilitude*) نازانێت. ئەمەش بەو مانایە نیە کە سەرجەم هونەرە مۆدێرنیستەکان وازیان لە هەوڵ و تەقەلا بۆ دەرککردن یان دەربڕینی دونیای بان ئەدەبی هێناوە، بەڵکو بەو مانایەیە کە ڕێساکانی سەدەی نۆزدەی ڕیالیزمان ڕەتکردەوە کە لە قاڵبی بڕیارگەلێکی بێ چەندوچوندا جێگیر ببوون. بە پێچەوانەی ئەمەوە، بەرهەمی هونەری مۆدێرنیستی بۆ خۆی خاوەنی جۆرە توخمێکی (خودئەندێشانە) و (خودکاردانەوە)ییە، بۆ نمونە، کاتێك کە خەریکی خوێندنەوەی چیرۆکی (جین ئاستین) ئەبین، ڕەنگە خۆمان لەناو "دونیای" ئەفسانەی (غرورو دەمارگیری)[9]دا، ونبکەین، بەڵام کاتێ کە ڕۆمانی (یولیسێز)[10]ی جیمزجۆیس، یان شەپۆلەکانی (ڤۆڵف) ئەخوێنینەوە، ڕەنگە تەواو لەوە بە ئاگابین کە خەریکین چیرۆك ئەخوێنینەوە. دروست هەر بەو شێوەیەی کە ڕەنگە تەماشای تابلۆیەکی (تێرنر) بکەین و خۆمان لەناو دیمەنە خوڵقاوو خەیاڵاویەکاندا ونبکەین، بەڵام کاتێ تەماشای تابلۆیەکی (پیکاسۆ) ئەکەین تابلۆبوونی بەرهەمەکە بە ئاسانی خۆیمان بۆ نمایش ئەکات.

ئەتوانین هێرشکردنە سەر پرسپکێو (دیدگا، دیمەن) لە هونەرە تەسویریەکانداو هەروەها هێرشکردنە سەر تونالیتە (ئاهەنگ و تۆمی دەنگ) لە مۆسیقادا لەتەك هەوڵو

دەستەواژەی مۆدێرنیزم، لە ماوەی دەیەکانی ڕابردودا، مانایەکی جێگیرو دیاریکراوی بۆ خۆی پەیداکردوە، گەرچی تەقەلادان بۆ دۆزینەوەی ڕیشەی پۆست مۆدێرنیزم لە ڕابردوداو هەروەها لکاندنی ئەم واژەیە بەو بەرهەمە ئەدەبیو هونەریانەی کە پێشتر بە مۆدێرنیست وەسف کرابوون، تا ڕادەیەك ئەم جێگیریی مانابیەی دووچاری لەقبوون کردوە


پیکاسۆ

تەقەلای نوسەرە جۆراوجۆرە مۆدێرنیستەکان بۆ خۆڕزگارکردن لە کۆت و بەندو کۆسپەکانی دیدگا سونەتیەکان سەبارەت بە کاراکتەر (کەسایەتی) و گەڵاڵەی گشتی (*Plot*)دا هەڵسەنگێنین.

لەم ڕووەوە، مۆدێرنیزم خۆی بە جۆرە لێکدابڕان و جوداییەك لە ڕابردو ئەزانێت کە لە هەندێ ڕووەوە وێکچوە لەتەك هێرشکردنە سەر ئەو بەها (ارزش) سونەتیانەی کە لەگەڵ ڕۆمانتیزمدا تێکەڵبوە، بەڵام، یەکێك لەو تایبەتمەندیانەی کە مۆدێرنیزم لە ڕۆمانتیزم جیائەکاتەوە، بە گشتی ئەو تێڕوانینە بەدبینیو تەنانەت تراژیدیەیە لە بەرامبەر جیهاندا. ڕەنگە،لێرەدا، گشتگیرکردن (تعمیم) بەشێکی ترسناك بێ. پێدەچێت کە مۆدێرنیزمی ئەدەبی ئینگلیزی (کە زۆرێك لەو نوسەرانەی ئینگلیزی نەبوون، ڕۆڵی سەرەکیان لە پێکهاتن و نوسینیدا هەبوە) پلە بە پلە لە مۆدێرنیزمی ئەوروپایی بەدبینانەتر بێت. تایبەتمەندی بەرجەستە بەرهەمەکانی تی. ئێس. ئێلیۆت، ئەرزاپاوەند، فرانتس کافکا، کنوت هەمسون (*Knut Hamsun*) – تەنها ناوی نوێنەرە سەرەکیەکانمان هێناوە –تێڕوانینێکی ڕەشبینانەیە بەرامبەر دونیای مۆدێرن، دونیایەکی بەشبەشکراو، پەرش و بڵاو، ڕو بە خراپەو فەسادی کە تیایدا پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان گەلەك دژوار یان مەحاڵە، دونیایەك کە تیایدا پارەو بەها بازاڕیەکان بە کۆسپێ لە بەردەم بەختەوەری مرۆڤەکان و پێشکەوتنی کەلتوری لە قەڵەم ئەدرێت.

بەگشتی، مۆدێرنیستەکان دەرهەق بەو جەرەیان و پێشکەوتنانەی کە لە زانست و تەکنەلۆژیای هاوچەرخدا بەدەستهاتوە، هەڵوێستی ناحەزانە، یان لانی کەم بەدبینانەیان هەیەو بە گومان و دوودڵییەوە تێیان ئەڕوانن. هەڵبەتە، نابێ ئەم مەسەلەیە بەسەر تەواوی مۆدێرنیستەکاندا گشتگیر (تەعمیم) بکەین بۆ نمونە، بە هیچ شێوەیەك سەبارەت بە (فلادیمیر مایا کۆفسکی) یان فۆتۆریستە ئیتاڵیەکان ڕاستی لەخۆ ناگرێت، بەڵام، وەك دەڵێن ئەم ڕوداوانە بەرلەوەی مۆدێرنیست بن، بە ئاوانگارد لە قەڵەم ئەدرێن.

لە زۆر حاڵەتدا، ڕاستەوخۆ ئەم گومان و بەدبینیە لە بەرامبەر زانست و تەکنەلۆژیادا لەوەوە هەڵقوڵاوە کە تەکنەلۆژیا لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا، گۆڕا بە ئامرازی کوشتنی بە کۆمەڵی ملیۆنەها کەس لە مرۆڤەکان و زۆرجار لە تەك جۆرە نەفرەتێك دەرهەق بە بازاڕیبوونی پەیوەندیەکان، سازگارەو بە یەکێك لە ئاشکراترین و بەرچاوترین ڕێگەکان جیاکردنەوەی مۆدێرنیزم لە پۆست مۆدێرنیزم دائەنرێت.

لێرەدا، پێویستە بڵێین کە تەنها دەرگیربوون لە شۆڕشێکی کەلتوریو هونەریدا مانای پێشکەوتنی سیاسی لەخۆ ناگرێت: بەرهەمەکانی کنوت هەمسان، تی. ئێس.

بەگشتی، مۆدێرنیستەکان دەرهەق بەو جەرەیان و پێشکەوتنانەی کە لە زانست و تەکنەلۆژیای هاوچەرخدا بەدەستهاتوە، هەڵوێستی ناحەزانە، یان لانی کەم بەدبینانەیان هەیەو بە گومان و دوودڵییەوە تێیان ئەڕوانن

ئیلیۆت، ئەزرا پاوەند، لوئیجی پیراندلۆ، دی. ئێچ. لارس و ویلیام باتلەریش بە بەرهەمی تەوەری (محور) مۆدێرنیزم لە قەڵەم ئەدرێن، بەڵام، ئەو دیدە سیاسی- کۆمەڵایەتیەی کە دەکرێ لەو بەرهەمانەدا هەڵبێنجین، دیدێکە زیاتر دواکەوتوە وەك لەوەی لە ئایندە بڕوانێت و بەدەربڕینی سیاسی، زیاتر کۆن پارێزانەیە تا پێشکەوتوخوازو پێشڕەو.

ئەم خاڵە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەزمونە هونەریو کەلتوریەکان، داهێنان، ئەفراندنو دژایەتیکردن لەتەك نەریتخوازیدا، بە باشی ئەتوانن شانبەشانی نەریتخوازی سیاسی، کۆنپارێزیو تەنانەت فاشیزمیش هاودەنگ بن و لەتەکیا بڕۆن: (پاوەند) و (هەمسان) بۆ ماوەیەکی یەکجار درێژخایەن کۆیلەی فاشیزم بوون و (لانی کەم لەسەر بنەمای ئەو توێژینەوەو لێکۆڵینەوانەی کە کراون) تەنانەت بە ئاشکرابوونی هۆڤێتیو دڕندەیی نازیەکانیش لە ماوەی جەنگی جیهانی دووهەمدا، بێدار نەبوونەوە. لە بەرامبەردا، نوسەرێکی گەورەی مۆدێرنیستی وەك ڤێرجیناڤۆڵف، بەڵێن بەستو بوو بە جۆرە لیبرالیزمێکی سازگارو دوور لە ناکۆکی کە لە ماوەی ساڵەکانی دەیەی *1930*دا پشتیوانی لە پارتی کرێکاران ئەکردو وەك نوسەرە گەورەکانی دیکەی مۆدێرنیست هیچ کاتێك و لە هیچ زەمانێکدا دەستی لە تێکۆشان لە دژی فاشیزم هەڵنەگرت.

ڕەنگە، ئاماژەکردن بە (ڤۆڵف) وەبیرهێنەوەی ئەو خاڵە بێت کە ڕەوەندی کامڵبوونی مۆدێرنیزم پەیوەستە بە جۆرێ لە (نێرینەسازی) هونەرەوە: بە بەراورد لەتەك هەڵوێستی زاڵی ژنانی نوسەر لە سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەبێ ژنان ماوەیەکی زۆر تێپەڕێنن تا بتوانن سەرلەنوێ دوای شۆڕشێکی مۆدێرنیستی ئەم هەڵوێستە باڵاو زاڵەی خۆیان بەدەست بهێننەوەو بیپارێزن. هەر بەو شێوەیەی کە (ڤۆڵف) (لە باسێکی جیاواز)دا لە وتاری (ژورێك لەناو خودی خۆ)دا، باسی لێکردوە، ڕەنگە بەشێك لە ڕونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە بگەڕێتەوە بۆ گرێدانی مۆدێرنیزم لەتەك جموجوڵی کۆمەڵایەتیو جوگرافیابیو هەڵبژاردنی شێوە ژیانێکی قەرەجانەو کۆچەرانە کە بۆ ژنان پلە بە پلە لە پیاوان سەختر دەرئەکەوێت.

تەنها لە پشت بەدبینی مۆدێرنیستیدا ئەم دۆزینەوە (تەجروبی)یە شاراوە نیە کە پێی وایە بەرقەرارکردنی پەیوەندی لە نێوان مرۆڤەکاندا کارێکی سەختە، بەڵکو باوەڕێکی دیکەی فەلسەفی تر شاراوەتەوە لەسەر ئەو بنەمایەی کە گەرچی مومکینە جیهان یەك پارچە بێت و قابیلی ناسینیش بێت، بەڵام تەنها لە پارچەو بەشی بچوکتردا قابیلی تێگەیشتنە.

دیڤید هاروی لەو بڕوایەدایە کە مۆدێرنیزم، پرسپکتیویسم و ڕێژەگەرایی چەند لایەنەی وەك بنەمای مەعریفەناسی (خود) هەڵبژاردوە، نەك چییەتی ڕاستەقینەی تاکە

ڕەنگە، ئاماژەکردن بە (ڤۆڵف) وەبیرهێنەوەی ئەو حاڵە بێت کە ڕەوەندی کامڵبوونی مۆدێرنیزم پەیوەستە بە جۆرێ لە (نێرینەسازی) هونەرەوە: بە بەراورد لەتەك هەڵوێستی زاڵی ژنانی نوسەر لە سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەبێ ژنان ماوەیەکی زۆر تێپەڕێنن تا بتوانن سەرلەنوێ دوای شۆڕشێکی مۆدێرنیستی ئەم هەڵوێستە باڵاو زاڵەی خۆیان بەدەست بهێننەوەو بیپارێزن


فرۆید

واقیعێکی بنچینەیی و هاوڕێك و یەك پارچەو لە هەمان کاتیشدا ئاڵۆزییەکی ئاشکرا کردوەو خستۆتیەڕوو. (هاروی، *1989*، ل *30*). بە پێچەوانەوە، پۆست مۆدێرنیزم وێڕای خواستی بۆ پاراستنی ڕێژەییگەرایی، بڕوای بە واقیعیەتێکی تاك و بنچینەیی نیەو ڕەتینەکاتەوە. لەم ڕووەوە (هاروی) جەخت لەسەر پێناسەکەی لیوتارد ئەکات لەسەر پۆست مۆدێرنیزم، واتە (ناباوەڕیو بێئیمانی بەهەر جۆرە بان ڕیوایەتێك)، (هاروی *1989*، ل *45*) پێناسێك کە (خود) بە شێوەی پارادۆکسێك بە جۆرە بان ڕیوایەتێك لە قەڵەم ئەدرێت. لێرەدا بە تەواوی وێکچوونی نێوان پۆست مۆدێرنیزم و بنەما شکێنی دەرنەکەوێت، کەواتە لە ڕوانگەی تاکی مۆدێرنیستدا مرۆڤەکان مەحکومن بەوەی کە لە بارودۆخی بەشبەشبوون و پەرشوبڵاوی کۆمەڵایەتیو تەنانەت وجودیدا بژین، لە کاتێکدا (بە پێچەوانەی پۆست مۆدێرنیستەکان)ەوە کە ئەیانەوێ بە نائارامییەوە لەو بارودۆخە هەڵبێن. لێرەدا، ڕەنگە کاریگەری (فرۆید) گەلەك زیاتر بێت چونکە زۆرێك لە نوسەرانی والیکرد کە زیاتر بایەخ بە دەروون و ئەزموونە زەینیەکان بدەن، نەك بە دونیای دەرەکیو سەراپاگیر. ئەم مەلەسەیە، لە لایەکەوە بوە هۆی پەرەسەندن و پالاوتنی تەکنیکەکان و شێوە گرنگە تازەکان: پەرەسەندن و پەرەپێدانی تەکنیکی (مۆنۆلۆگی) دەروونیو جەرەیان هۆشیاری لە لایەن (ڤۆڵف) و (جۆیس)ەوەو پالاوتنی مۆنۆلۆگی دراماتیك لە لایەن (ئیلیۆت)ەوە، لە لایەکی دیکەشەوە لەگەڵ جۆرە باوەڕێکی بەدبینانەشدا گرێی خواردبوو لەسەر ئەو بنەمایەی کە کەلێنی نێوان ئەزموونی زەینیو دونیای (عەینی) توانای چاککردنەوەو پڕکردنەوەی نیە، ئەم باوەڕەی کە: "**شتێکی مەحاڵە کە بە تەواوی بتوانم بڵێم کە مەبەستم چیە!**" جیا لەوەش، کاریگەرییەك کە ئەم لەخۆنامۆبوونە هەیەتی، بریتیە لە ئاڵۆزکردن و خولقاندنی کێشەیەك کە پەیوەندی بە شوناس و تاکایەتی مرۆڤەکانەوە هەیە.

(بەرنارد) یەکێك لە کەسایەتیەکانی ڕۆمانی (شەپۆلەکان)ی (ڤۆڵف) پرسیار ئەکات کە من کێم؟ لە ڕاستیدا، ئەم پرسیارەی بە نیشانەی سەرهەڵدانی کێشەیەکی تازە بۆ هونەرمەندانی مۆدێرنیست دێتە ئەژمار. لەم ڕووەوە، یەکێك لەو بڕیارنامانەی کە کەوتۆتە بەر شالاوی نوسەرە مۆدێرنیستەکانەوە، بڕیارنامەی کاراکتەر یان کەسایەتیە لە چیرۆکەکاندا کە تیایاندا کەسایەتی یان کاراکتەر، دەبێ دەربڕی یان نوێنەری کەسێکی تاك، سەقامگرتوو، پایەدار، سازگارو دوور لە هەر جۆرە ناکۆکیەك بێت کە، هەم بۆ خۆیو هەم بۆ ئەوانی دی ناسراوو قابیلی ناسینیش بێت. هەر بەو جۆرەی کە بەرنارد (قارەمانی داستانی ڤۆڵف) نازانێت کێیە، یان دڵنیا نیە لەوەی کە کێیە، هەر بەو جۆرە (ك) قارەمانی چیرۆکی (قەڵا)[12]ی کافکاش لەوە تێنەگات کە ناتوانێت وەسفێکی وردو جێگیر دەربارەی کەسایەتی کلام (*Klamm*) بخاتەڕوو، واتە دەربارەی

> لە ڕوانگەی تاکی مۆدێرنیستدا مرۆڤەکان مەحکومن بەوەی کە لە بارودۆخی بەشبەشبوون و پەرشوبڵاوی کۆمەڵایەتیو تەنانەت وجودیدا بژین، لە کاتێکدا (بە پێچەوانەی پۆست مۆدێرنیستەکان)ەوە کە ئەیانەوێ بە نائارامییەوە لەو بارودۆخە هەڵبێن

کەسایەتیەك کە خەڵکانی جۆراوجۆر بە شێوەیەکی جیاواز (ئەو) ئەبینن و لە دیدی جیاوازەوە وەسفی ئەکەن، یان تەنانەت لە سەردەمی جۆراوجۆردا خەڵکانی دیاریکراوو بگرە تەنهاش بە شێوەی جیاواز وەسفی ئەکەن. ڕەنگە لە ئەدەبیاتی مۆدێرنیستیدا لەناو هەندێ لە شانۆگەرییەکانی (لوئیج پیراندلۆ)دا، وابەستەبوون یان پشتبەستن بە شوناسی دیاریکراو تا ڕادەی زێدەڕەوی پەیجوری بکرێت و بە ئاشکرا لەناو هەندێ فەلسەفەی جۆراوجۆری وەك (خۆ بە تەنها زانین) یان (خۆ بە تەوەر زانین) (*Solipsissm*) کۆتایی دێت. دەبێ ئەوەش بڵێین کە لەم دیدگایەوە بەرهەمێکی وەك (یولیسین)ی (جۆین) تا ئەندازەیەك بە قەراردادی دێتە بەرچاو.

بۆ یەکەمین جار، (ئیهاب حەسەن) نیشانە یان ڕیشەی مێژوویی واژەی پۆست مۆدێرنیزم لە دەستوێژی (کاربرد) خۆیدا بە شێوەی (پۆست مۆدێرنیسمۆ) (*Postmodernismo*) بە هۆی (فردریکۆ دۆ ئۆنیس)ەوە لە کتێبی "هەڵبژاردنی هۆنراوەگەلی ئیسپانیۆلی‌و ئەمریکای باشوردا (هیپانۆ- ئەمەریکایی)(*13*) ئەدۆزێتەوە، بەڵام ئەم واژەیە تەنها لە ساڵەکانی دەیەی *1950*داو بە شێوەیەکی بەرجەستە تەنها لە دەیەی *1960*دا چوە ناو قەڵەمڕەوی گوتاری ڕەخنەگرانەی ئینگلیزی -ئەمەریکاییەوە. پێدەچێت، بۆ یەکەم جار ئەم واژەیە بە ڕەواڵەت دەربڕی دەورەبەندی‌و دابەشکردنی مێژوویی یان قۆناغێکی تایبەتی مێژوویی بێت: هونەر یان کەلتوری پۆست مۆدێرنیزم بریتیە لە، هونەر یان کەلتورێك کە لە ماوەی ساڵەکانی پاش جەنگی جیهانی دووهەمدا بە کۆمەکی تەکنیکەکان و بڕیارە مۆدێرنیستەکانەوە پەرەی سەند، یان تەنانەت لێیان دوورکەوتەوەو لێکجیابوونەوە بێ ئەوەی کە بۆ جێگا ڕیالیستی یان پێش مۆدێرنیستیەکەی بگەڕێتەوە. بەڵام، لەم چەند دەیەی دواییدا ڕەخنەگران کەڵکیان لەم واژەیە وەرگرت بۆ ئامادەکردن یان گەڕانەوە بۆ تایبەتمەندیگەلی تایبەتی کەلتوری، هونەری‌و کۆمەڵایەتی. لەم نێوەدا، دەستاوێژی واژەی "کۆمەڵایەتی" بایەخێکی تایبەتی هەیە: ئاشکرایە کە پۆست مۆدێرنیزم بە مانایەکی بەرفراوانترو گشتگیرتر لە مۆدێرنیزم، بەکارئەهێنرێت و هەر بەو جۆرەش ئاماژە بە بارودۆخی مرۆڤ بە گشتی و یان بە کۆمەڵگا لە ئاستی گشتی‌و بەرفراوانداو هەروەها بە هونەر یان کەلتور ئەکات (دەستاوێژێ کە لیوتار لە کتێبی "بارودۆخی پۆست مۆدێرن"دا بە گوزارشێك دەربارەی زانین پێناسەی کردوە). بەم جۆرە، ئەتوانین ئەمڕۆ پۆست مۆدێرنیزم بە شێوەی جۆراوجۆرو جیاواز بەکاربهێنین:

*1*-ئاماژەکردن بە ئەدەبیات و هونەری ناڕیالیستی‌و ناسونەتی سەردەمانی دوای جەنگی جیهانی دووهەم.

هونەر یان کەلتورێك کە لە ماوەی ساڵەکانی پاش جەنگی جیهانی دووهەمدا بە کۆمەکی تەکنیکەکان و بڕیارە مۆدێرنیستەکانەوە پەرەی سەند، یان تەنانەت لێیان دوورکەوتەوەو لێکجیابوونەوە بێ ئەوەی کە بۆ جێگا ڕیالیستی یان پێش مۆدێرنیستیەکەی بگەڕێتەوە

پۆست مۆدێرنیزم، ئایدیالیزمی زەینی مۆدێرنیزمی تا ڕادەی (خۆ تەنها گەرایی) یان (خۆ بە تەوەر زانین) ئەگەیەنێت، بەڵام توخمە ترازیدیو بەدبینیەكانی مۆدێرنیزم ڕەتئەكاتەوە

2-ئامارژەكردن بە هونەرو ئەدەبیاتێك كە هەندێ لە تایبەتمەندی دیاریكراوی مۆدێرنیستەكان بە چڵەپۆپەی زێدەڕەوی ئەگەیەنێت.

3-ئاماژەكردن بە هەندێ لایەنی بارودۆخی گشتی مرۆیی لە دونیای سەرمایەداری درەنگ وەختا، ساڵەكانی دوای دەیەی *1950*، ئەو لایەنانەی كە كاریگەرییەكی هەمەلایەنەو فراوانی لەسەر ژیان، كەلتور، ئایدیۆلۆژیاو هونەر هەیە.

4-بە گشتی، ئاماژەكردن بە جۆرە تێڕوانینێكی ئیجابی (پۆزەتیف) دەرهەق بەو لایەنانەی ناومانبرد (هەڵبەتە لە بەشێك لە كاربوردەكانی ئەم واژەیەدا نەك هەموویان).

بەم جۆرە، ئەو دەستەیە لە تایبەتمەندی مۆدێرنیستەكان كە لە زێدەڕەوترین دەستاوێژی خۆیدا ئەتوانێ ببێتە هۆی دروستبوونی پۆست مۆدێرنیزم، بریتیە لە:

1-ڕەتكردنەوەی سەرلەنوێ ئاشكراكردن بە قازانجی گەڕانەوە بۆخود /خود ارجاعی/ بە تایبەت لە جۆری تەنزئامێزو ناجدیو ئابونیادیەكەیدا.

2-ڕەتكردنەوەی كەشوهەوا یان بۆن بەرامەی هونەریو ڕەتكردی بەرهەمی هونەری وەك (گشت)ێكی ڕێكوپێك (گەرچی دیڤید هاروی پێیوایە كە هونەری مۆدێرنیستی بە پێچەوانەی هونەری پۆست مۆدێرنیستەوە، لە بنەڕەتدا هونەری بۆن و بەرامەو ئارەزومەندیە (هاروی *1989*، ل*22*).

3-ڕەتكردنەوەی كاراكتەر (كەسایەتی) و بن واتا (مۆتیف) یان گەڵاڵەی ئەسڵی (*Plot*) لە چیرۆكەكاندا، وەك هەندێ چەمك یان بڕیاری مانادار، یان لە ڕووی هونەرییەوە شیاوی داكۆكیكردن بێت.

4-ڕەتكردنەوەی پێكەوەبوون و هاوكاری یان ڕێكەوتن لەتەك خوێنەرداو، بە پێچەوانەشەوە ڕوبەڕووبوونەوەو دژایەتیكردنی خوێنەرو دڵشكاندن و ئازاردانی.

5-تەنانەت ڕەتكردنەوەی خودی (مانا) وەك جۆرە وەهمێكی نائومێدانەو وڕێنەیەكی پوچ بە پێی ئەو باوەڕەی كە هەر جۆرە هەوڵ و تەقەلایەك بۆ تێگەیشتن و ناسینی جیهان كارێكی پوچ و بێبەهاو بێكەڵكە، یان بڕواكردن بەو وڕێنەگەلەی كە "دیاردەیەك هەیە بەناوی جیهان كە، دەبێ لێی تێبگەین و بیناسین".

پۆست مۆدێرنیزم، ئایدیالیزمی زەینی مۆدێرنیزمی تا ڕادەی (خۆ تەنها گەرایی) یان (خۆ بە تەوەر زانین) ئەگەیەنێت، بەڵام توخمە ترازیدیو بەدبینیەكانی مۆدێرنیزم ڕەتئەكاتەوە، خۆ ئەگەر نەتوانرێت بەم لێكدانەوەیە بەرگری لە سوتانی ڕۆما بكرێت، لانی كەم ئەتوانرێت بە كەمتەرخەمیەوە چاودێری یان تەماشای كارەساتە ناخۆشەكان بكرێت و كەڵكی لێوەربگیرێت. بە ئاسانی ئەم جۆرە پێناسەو هەروەها پێناسە گشتیو بەرفراوانەكانی دی لەسەر پۆست مۆدێرنیزم ئەوەمان بۆ ئاسان ئەكات تا زۆرێك لە



میشێل فۆکۆ

بەرهەمە ئەدەبی‌و هونەریەکانی ساڵە سەرەتاییەکانی ئەم سەدەیە، یان تەنانەت سەدەی ڕابردو کەم تا زۆر وەك بەرهەمگەلێکی پۆست مۆدێرنیزم بزانین:

چیرۆکە خەیاڵیەکانی (کافکا)، (برسێتی)[14] بەرهەمی (کنوت هەمسان)، (سرودەکان)[15]ی (عەرزا پاوەند)و تەنانەت (تریتسرام شندی)[16] بەرهەمی (لارنس ئستین). بەم جۆرە پێناسە ناوبراوەکان ئەوەمان بۆ ئاسان دەکات کە توخمە پۆست مۆدێرنیستەکان لە بەرهەمی ژمارەیەکی جۆراوجۆری نوسەران، تیۆرسێن و، ڕەخنەگرانی (پۆست بونیادگەرا) و (بنەما شکێنی) وەك (ژاك دریدا، میشێل فۆکۆ، ژاك لاکانیشدا، بەدیبکەین.

لە زۆر ڕووەوە، تایبەتمەندی بەرجەستەی پۆست مۆدێرنیزم بە تێڕوانینێکی باشەوە لەتەك دونیای مۆدێرندا، هاوڕایەو لەم دیدگایەوە کە دونیای ناوبراو بە قەڵەمڕەوی لەتلەت بوون و پەرشوبڵاوی‌و بەرفراوانی‌و ڕوو لە زیادبوون، دونیای زاڵبوون فشارگەلی ئابوری، دونیای بێدەسەڵاتی مرۆڤەکان لە ڕوبەڕووبوونەوەی لە بەرامبەر تەکنەلۆژیادا بە نابینا ئەزانێ، هەر بۆیە هیچ مشتومڕو ناکۆکیەك لەتەك مۆدێرنیزمدا بەدی ناکات. بەڵام لەبەر ئەوەی کە مۆدێرنیستە گەورەکان لە پەسەندکردن و تێگەیشتنی ئەم ڕاستیانەدا بە ترس و نائومێدیەوە ڕەفتاریان ئەکرد، هەر بۆیە ئەتوانین لە دیدێکی تایبەتەوە بڵێین کە تەنها پۆست مۆدێرنیزمە کە بە شێوەیەکی کراوەو ڕاحەت (ئاسودە) بەم ڕاستیانە قایل ئەبێ‌و دانیان پیائەنێت. بەم جۆرە، حەقیقەتی مەسەلەکە، یان قبوڵکردنی، بوە بە یەکێك لە تایبەتمەندیە بەرجەستەکانی پۆست مۆدێرنیزم و بە جۆرێك لە مۆدێرنیزمی جیائەکاتەوە. (دیڤید هاروی) پێی وایە کە پۆست مۆدێرنیزم خەمزەو لاساییکردنەوەی هاوکێشەگەلی کۆمەڵایەتی، ئابوری‌و سیاسی ئەو کۆمەڵگایانەیە، کە خودی (پۆست مۆدێرنیزم) تیایاندا سەرهەڵئەدات. ئەو، زیادبوونی ژمارەی خەڵکی یان دونیا جیاوازو لێکدابڕاوەکان، یان داسەپاندنی ئەوانە بەسەر زۆرێك لە ڕۆمانە پۆست مۆدێریستەکاندا، بە "ڕەوەندی ڕوو بە پەرەسەندنی شوێنی نیشتەجێی کەمینەکان" /گتوسازی/، بێهێزکردنی دەسەڵات، پەراوێزکردنی هەژاری‌و خەڵکە کەمینەکان لە شارە ناوەندیەکانی بەریتانیاو وڵاتە یەکگرتوەکاندا، بەراورد ئەکات (هاروی *1989*، ل*13*). هەر بەو جۆرە، ئەو هەندێ بەراوردی ئاشکرا لە نێوان بونیادی ڕێکخراوە تازەکان لە سیستمی سەرمایەداری پۆست فۆردی (دابەشکردن و پەرش و بڵاوی بەرهەمهێنان لە کەنار چڕبوونەوەی سەرمایە)و ئایدیۆلۆژیای پۆست مۆدێرنیستیدا، ئەکات.

پۆست مۆدێرنیزم خەمزەو لاسایکردنەوەی هاوکێشەگەلی کۆمەڵایەتی، ئابوری‌و سیاسی ئەو کۆمەڵگایانەیە، کە خودی (پۆست مۆدێرنیزم) تیایاندا سەرهەڵئەدات

هەروەها، لەناو سێهەمین دەستاوێژی (کاربرد) پۆست مۆدێرنیزمیشدا دەشێ ئەو مانایە شاراوە بێت کە جیهان لە سەرەتای ساڵەکانی ئەم سەدەیەدا دوچاری گۆڕان و وەرگۆڕان (تحول)ی زۆر بۆوە. لە وڵاتە پەرەسەندووەکاندا (سەرمایەداری درەنگوەخت) گەشەکردن و پەرەسەندنی پەیوەندیەکان و پیشەسازیە ئەلکترۆنیەکان، شۆڕشێکی گەورەیان لە ژیانی خەڵکی‌و کۆمەڵگا مرۆییەکاندا، بەرپاکردوە. پۆست مۆدێرنیستەکان لە بری ئەوەی کاردانەوەیەك لە بەرامبەر ئەو وەرگۆڕانانەدا پیشان بدەن، کەچی بە شێوەیەك وەك کرێکارە وێرانکەرەکانی سەدەی نۆزدەهەم - لەبەرئەوەی کە پێییان وابوو، ئامێر ئەبێتە هۆی بێکاربوونیان، دەستیانکرد بە تێکشکاندنی ئامێری کارخانەکان- کەوتنە ستایش و پیاهەڵنانی ئەو دۆخەو پێشوازیان لێئەکرد: واتە، ستایش و پیاهەڵنان لە (غیبا)ی فەزا یان دۆخێکی هونەری کە هەڵقوڵاوی ئەو شتە بوو کە (ڤاڵتەر بنیامین) (کە زۆرێك لە نوسەران بە گەورەترین پێغەمبەری پۆست مۆدێرنی ئەزانن) بە (سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئامێری) ناودێری ئەکرد.

بەم جۆرە، تابلۆکانی (ئەندی وارهول) یان (ڕوی لیخن ئیشتاین) (کە بە زۆری بە پێشەنگی هونەری پاپ و هونەری مۆدێرنیستی لە قەڵەم ئەدرێن و لە هەمان کاتدا، هەندێ کەسی دی بە بەشێك لە هونەرمەندانی پۆست مۆدێرنیستیان ئەزانن) هانمان ئەدات تا بە وردی‌و هوشیارییەکی زیاترەوە تەماشای لایەن و ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی کەلتوری بازرگانی سەردەمەکەمان بکەین. لە ڕاستیدا، ئەم بەرهەمانە بە جۆرێك دەربڕی کارە هونەریەکانی (مارسل دۆشان)ە کە لە ساڵی *1919*دا پێشانگایەکی بۆ بەرهەمە زۆرەکانی کردەوە بە تایبەت ئەو دەفرە (فلتەری)یە داهێنەریەی کە وەك پەیکەرێك دەرئەکەوت. بەرلەوەی، پۆست مۆدێرنیستەکانیش وەك زۆرێك لە شەپۆلە ئاوانگاردەکانی ڕابوردو لە تەکنەلۆژیا بێزاربن، زیاتر شیفتەو شەیدای بوون و هونەر بە (گشتی) وەك هونەرێك کە لە دووتوێی بەرهەمانیاندا جێی گرتوە، ڕەتناکەنەوەو زیاد لە پێویست بیر لە کاریگەری هەنوکەیی‌و دەرئەنجامی خێرایی بەرهەمەکانیان ئەکەنەوە: چاپ و بڵاوکردنەوە، زیاتر هەنگاوێکی ستراتیژیە وەك لەوەی هەوڵ و تەقەلایەك بێت بۆ نەمری. ئالێکس کالینیکوس، پێیوایە کە ئەم جۆرە بیروڕاو هەڵسەنگاندنانە هەوڵ ئەدەن پەیوەندی نێوان زۆرێك لە (مۆدێرنیستە واڵاو پێشکەوتوەکان) و (کەلتوری خەڵکی عەوام) وەك شتێکی بێبەها پیشانبدەن و بۆ نمونە، ئاماژە بە حەزی لە ڕادەبەدەری تی. ئێس. ئیلیۆت بە هۆڵەکانی مۆسیقای مەردومی‌و قەرزار بوونی ستراڤینسکی بە (رگتایم)[17] ئەکات (کالینیکوس *1989*، ل *15*).

بەم جۆرە، تابلۆکانی (ئەندی وارهول) یان (ڕوی لیخن ئیشتاین) هانمان دەدەن تا بە وردی‌و هوشیاریەکی زیاترەوە تەماشای لایەن و ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی کەلتوری بازرگانی سەردەمەکەمان بکەین


بۆرخس

ڕەنگە لە بواری ئەدەبیاتدا بتوانین بە دەرگیرییەکی کەمترەوە ئەم نوسەرانەی لای خوارەوەو بەرهەمەکانیان لە ڕیزی نوسەران و بەرهەمە پۆست مۆدێرنەکاندا، دابنێین: ساموئێل بێکت، ئۆژێن یونسکۆ، جان بارث، جان شبری، تۆماس پینکن، دونالد بارتێلمە، ویلیان باروز، ڤالتەر ئابیش، ئالان ڕۆب گری، پیتەر هنکە، کارلۆس فوێنتس و خۆرخە لویس بۆرخس

هەڵبەتە، ڕەنگە لە بواری ئەدەبیاتدا بتوانین بە دەرگیرییەکی کەمترەوە ئەم نوسەرانەی لای خوارەوەو بەرهەمەکانیان لە ڕیزی نوسەران و بەرهەمە پۆست مۆدێرنەکاندا، دابنێین: ساموئێل بیکت، ئۆژێن یونسکۆ، جان بارث، جان شبری، تۆماس پینکن، دونالد بارتێلمە، ویلیان باروز، ڤالتەر ئابیش، ئالان ڕۆب گری، پیتەر هنکە، کارلۆس فوێنتس و خۆرخە لویس بۆرخس. لە کۆتاییدا، ئەبێ ئاماژە بە دوو دەستەواژە بکەم کە بە جۆرێك لە جۆرەکانی بە دەربڕی چیرۆکە پۆست مۆدێرنیتسەکان لە قەڵەم ئەدرێن.

ئەفسانەسازی، یان ئەفسانە هۆنینەوە (*Fabulation*) و یان خەیاڵی (*Surfiction*). لە بواری مەسەلە نائاشکراکاندا، ئەم دوو (تەعبیر)ە دەربڕی ڕاڤەو فراوانبوون، یان زیادبوون و هەڵمەتبردنێکی گەلەك چالاکن کە تیایدا نوسەر لەبری ئەوەی بۆ وەسفکردنی واقیعیەتی بان خەیاڵی یان دروستکردنی پەیوەندی کەڵکی لێوەربگرێت، بە پێچەوانەوە لە هونەری نوسین یان نوسەرێتی چێژ وەرنەگرێت و شیفتەو شەیدای ئەبێت.

## پەراوێزەکان

*1-Andreas Huyssen, After the Great Divide: Modernism, Mass Culture og Postmoderisme (London: Macmillan, 1988) PP. 58-9.*

*2-Ihab Hassan, "the Cultuer of Postmodernisme" in Theory, Culture og Society, 2 (3), 119-131, 1985, P, 121.*

*3-David Harvey, The Condition of Postmodernity, (oxford: Blackwell, 1989) P. 116.*

*4-Alex Callinicos, Against Postmodernism (London: Polity Press, 1989).*

*5-Renato Poggilio. The Theory of the Avant- Garde trans- by Gerald Fitzgerald (New York: Harpere og Row, 1971).*

*6-Peter Burger, Theory of avant- Gard, trans, by Michael shaw (Minneapolis: University of Minnesota Press, 1984).*

7-شەپۆلەکان (*The Waves*) ڕۆمانێکی (ڤێرجینا ڤۆڵفە) کە لە ساڵی 1931دا بڵاوبۆتەوە، یەکێکە لە تەجروبیترین بەرهەمەکانی ڤۆڵف کە لە سەر ژیان و سەرگوزشتەی شەش کەسایەتی سەرەکی ئەم چیرۆکە ئەکۆڵێتەوە: بیرنارد، سۆزان، ڕودا، نێویل، جیمی‌و لۆبیز. دیارە بە شێوەی هەندێ (مۆنەلۆگ)ی نێوان ئەم کەسایەتیانە کە بەسەرهاتی ژیانی خۆیان هەر لە منالیەوە تا پیری ئەگێڕنەوە.

8-بێداربوونەوەی فینگانەکان (*Finnegans Wake*) ڕۆمانێکی تەجروبی (جیمس جۆین)ە کە ساڵی 1939 بڵاوکراوەتەوە. (جوێن) ئەم ڕۆمانەی لە ساڵی 1922دا دەستپێکردو، هەندێ لە بەشەکانی بە شێوەی جیاجیا لە ماوەی 17 ساڵ نوسیندا چاپ و بڵاوکردەوە. ئەم بەرهەمە دواهەمین‌و شۆڕشگێڕانەترین بەرهەمی (جۆین)ەو دەربڕی جدیترین و زیندەڕەوترین ئەزمونێتی لەمەڕ ڕوبەڕوبونەوەی لەتەك زمانداو لەو پەیوەندیەشدا کەڵکێکی زۆر لە جەرەیانی هۆشیاری وەرئەگرێت.

9-غرورو دەمارگیری: ڕۆمانێکی (جین ئاستین)ە کە ساڵی 1769 دەستی بە نوسینی کردو ساڵێك دواتر لەژێر ناوی (کاریگەریە سەرەتاییی)یەکان تەواوی کرد بەڵام پەخشکەرەوەکەی ڕەتیکردەوەو

"قەڵا" ڕۆمانێکی تەمسیلی فرانتس کافکایە کە دوای مەرگی بە زمانی ئەڵمانی لە ساڵی 1926دا بڵاوکرایەوە

بڵاوینەکردەوە. سەرئەنجام ساڵی *1813* دوای هەندێ پیاچونەوەی ڕێکوپێك و دروست و بە ناوێکی تازەوە، چاپ و بڵاوکرایەوە.

*10*–یۆلیسیز (*Ulysses*) ڕۆمانێکی (جیمس جۆیس)ە کە ساڵی *1922* لە پاریسدا بڵاوکراوەتەوە. هەندێ بەشی ئەم ڕۆمانە لە چاپەمەنی (*Littlereviwv*) لە ئەپریلی *1918*ەوە تا دیسامبەری *1920* چاپ بوو، تا ئەوەی کە لەو مانگەدا چاپەمەنی ناوبراو بە هۆی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەندێ بابەتی ناشیرین و خراپ، داخرا.

*11*–(ژورێك لەناو خودی خۆی)دا (*A room of onesown*) باسێکی (ڤێرجینا ڤۆڵف)ە کە لەسەر بنەمای دوو گوتار کە لە ئەنجومەنی هونەری کۆلیژی نیون هام (*Newnham*) و ئۆدتا (*Odtaa*) لە کۆلیژی گیرتۆندا (*Girton*) لە کامبریج لە ئۆکتۆبەری *1928*دا خراوەتەڕوو. ئەم وتارە ساڵی *1929* چاپ و بڵاوکرایەوە.

*12*–قەڵا (*Thecastle*) ڕۆمانێکی تەمسیلی فرانتس کافکایە کە دوای مەرگی بە زمانی ئەڵمانی لە ساڵی *1926*دا بڵاوکرایەوە.

***13-Frederico de onis, Antologia de la Poesia Espanola His panoamericana.***

*14*–برسێتی (*Hunger*) ڕۆمانێکی کنوت هەمسان، ناوی موستەعاری کنوت پیدرسۆن (***Knut Pederson***)، نوسەر، شاعیرو شانۆنوسی نەرویجی (*1859*ز– *1925*) وەرگری خەڵاتی نۆبڵ، و ڕێبەری بزاوتی ڕۆمانتیکی نوێ لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا. بۆ یەکەم جار ئەم چیرۆکە لە ساڵی *1890*دا بڵاوکرایەوە.

*15*–سرودەکان (*The Cantos*) لە بەرهەمە بەرجەستەکانی (عەزراپاوەند)ە کە بە گشتی بە یەکێك لە گرنگترین و کاریگەرترین بەرهەمە شیعریەکانی سەدەی بیستەم لە قەڵەم ئەدرێ. یەکەمین سرودەکان، یان کانتۆکان ساڵی *1919* لە کۆمەڵەیەکدا بە ناوی (*Quiapauperamari*) چاپ و بڵاوکرایەوە.

*16*–تریسترام شندی (*Trist Shandy*) ڕۆمانێکی (لارنس نسترن) *1768–1713*ە. ناوی تەواوی ئەم بەرهەمە "ژیان و ئەندێشەکانی تریسترام شندی"یە.

*17*–ڕگتایم (***Ragtime***) جۆرە مۆسیقایەکی ڕەمەکیانەی ئەمەریکیە کە نزیك بە ساڵەکانی *1890* تا *1920* شان بە شانی سەرهەڵدانی مۆسیقای (جاز) پەرەیسەندو گەشەیکرد. زادگای ئەم جۆرە مۆسیقایە ئەگەڕێتەوە بۆ گۆرانیەکانی کۆیلە ڕەشپێستەکانی باشوری ئەمەریکا.

**سەرچاوە**

پست مدرنیتەو پست مردنیسم، ترجمه تدوین: حسینعلی نوذری


کافکا

د. موسا ئیبراهیم

# شارل دی مۆنتسکیۆ
## (1755-1689)



و: شوان ئەحمەد

### بەرایی

سەدەی حەڤدەهەم لە بەریتانیا بەسەرکەوتنی سستمی پادشایی دەستوری کۆتاییهات، دوای ئەوەی ئەو وڵاتە ژمارەیەکی زۆر جەنگ و شۆڕشی بەخۆیەوە بینیو دەسەڵاتی حوکمڕانی بنەماڵەی "ستیوارت" لەناوبرا. لە سەروبەندی ئەم گۆڕانکاریانەشدا ژمارەیەکی زۆر بیرمەندو فەیلەسوفی سیاسی هاتنە ئاراو تیۆری گونجاو و لەباریان بۆ ئەو هەلومەرجە تازەیە دۆزیەوە، ئەگەرچی سەرەنجامی تیۆریەکانیان لەگەڵ یەك جیاوازبوو.

"تۆماس هۆبس" و "جۆن لوك" گەورەترین فەیلەسوفی سیاسی ئەو سەدەیە بوون. سەرەڕای ئەوەی فەلسەفەی مافی سروشتیو پەیمانی کۆمەڵایەتی سەرچاوەی

هەردووكیان بوو، بەڵام لە یەكدی جیاوازبوون، چونكە "هۆپس" لایەنگری دەسەڵاتی ڕەهاو "جۆن لوك"یش لەگەڵ دەسەڵاتێكی سنوردار داربوو.

بە كۆتاییهاتنی سەدەی حەڤدە سستمی سیاسی بەریتانی بەرەو ئەوە دەچوو ببێتە سستمێكی پادشایی دەستوری پەرلەمانی، بە تایبەت دوای ئەو ماڵوێرانیەی دووچاری ئەو وڵاتە هات بە هۆی سەركەوتنی شۆڕشی ئەمریكیو دروستبوونی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا. لە پای ئەمە بەریتانیا ناچاربوو شەڕی كۆلۆنیالی نوێ لە دژی فەرەنسا دەستپێبكات، سەدەی هەژدەش بە سەدەی شەڕی كۆلۆنیالی نێوان ئەم و فەرەنسا ناوزەد دەكرێت. بەریتانیا بە هۆی ئارامی بارودۆخی ناوخۆییو سەختی خاكەكەی (وەك دوورگەیەك) لە بەرامبەر هێرشی دەرەكیدا، بووە گەورەترین و بەهێزترین وڵاتی كۆلۆنیالی.

فیكری سیاسی سەدەی هەژدە دەنگدانەوەی بیروبۆچوونە دەستوریە لیبرالیەكانی "جۆن لوك" بوو، هاوكات بە ئاڕاستەی پشتیوانیكردنی ئەو سستمی دەسەڵاتە كاریدەكرد كە لە ئارادا بوو. بەریتانیا لە سەدەی هەژدەدا بە پێچەوانەی سەدەی پێشووەوە بیریاری سیاسی مەزنی وای بە خۆیەوە نەبینی، تا بتوانن تیۆری سیاسی لەو وڵاتەدا پاوان بكەن. ئەوروپا پاش ئەوەی لە سەدەی هەژدەدا هەلومەرجێكی ناهەمواری بەخۆیەوە بینی، سەرلەنوێ فیكری سیاسی هاتەوە ئاراو بیریارە سیاسیەكانی ئەوێش دەستیانكرد بە ڕێكخستنەوەی ئەو واقعە ناهەموارە، لە ڕێی هێنانە ئارای هەلومەرجێكی تازەو دامەزراندنی دامودەزگای نوێ، بە جۆرێك لەگەڵ پێشكەوتن و هەلومەرجی تازەو هێزە كۆمەڵایەتیە مۆدێرنەكاندا بگونجێت.

لە بەریتانیا، پراگماتیزم لە بواری ئاكارو لێكبوردن لە ئایندا و حكومەتی دەستوریش لە بواری سیاسیدا باڵادەست بوون، لە بواری ئابووریشدا دەوڵەت بوو بە خزمەتكاری بازرگانی. لەم قۆناغەدا شەڕەكانی دەوڵەت زیاتر لە پێناوی بازاڕدا بوو. دوای ئەم گۆڕانكاریانە شارنشینەكان ڕۆڵێكی بەرچاویان لە ژیانی سیاسیدا گێڕاو بە شێوەیەكی یەكجاری، مەڵبەندی سەروەت و سامان لە لادێوە گواسترایەوە بۆ شارەكان. لێرەوە بازرگانە كارامەكان پێویستیان بە چاودێری پادشا نەبوو، بەڵكو ئەوە بەرژەوەندی ئەوان بوو ئاڕاستەی كۆشكی شاهانەی دیاریدەكرد.

فكری ئابووری- بازرگانی بە جۆرێك گەشەی كردو بەهێزبوو، تا وایلێهات كۆنترۆڵی فیكرو سیاسەتی ئابووری لە بەریتانیادا كرد.

لەگەڵ ئەو گۆڕنكاریانەی ناو بەریتانیا، هەلومەرجی سیاسیش لە كیشوەری ئەوروپا گۆڕانكاریی بەسەردا هات، بە تایبەت دوای ئەوەی دوو دەوڵەتی بەهێزی وەك (ڕوسیاو پروسیا) پەیدابوون. ئیتر دەسەڵات هەر بە تەنها بۆ ئیسپانیاو فەرەنساو نەمسا پاوان نەبوو، یاخود گۆڕان و بەرەوپێشچوون خەسڵەتی ئەوروپای خۆرئاوا


جۆن لۆك

فیكری سیاسی سەدەی هەژدە دەنگدانەوەی بیروبۆچوونە دەستوریە لیبرالیەكانی "جۆن لوك" بوو، هاوكات بە ئاڕاستەی پشتیوانیكردنی ئەو سستمی دەسەڵاتە كاریدەكرد كە لە ئارادا بوو

نەبوو، بەڵکو ئەوروپای ناوەڕاست و خۆرهەڵاتیشی گرتەوەو لەم ڕووەوە بوونە ڕکابەری ئەوروپای خۆرئاوا.

سەرەڕای تێکچوون و گۆڕانی هاوسەنگی هێز لە سەدەی هەژدەو دواتریشدا، بەڵام فەرەنسا وەك سەرچاوەی سەرەکی فیکری سیاسی لە ئەوروپادا مایەوە. هەرچەندە ئەڵمانیا ژمارەیەك بیریاری تێدا دەرکەوت، بەڵام ئاستی داهێنانیان نەگەشتە ئاستی داهێنانی فیکری فەرەنسی. فەرەنسا لە سەدەی هەژدەدا کەوتبووە ژێر فشاری بیروبۆچوونە تازەکان و سستمی کۆن لەو وڵاتەدا لە بەردەم هەڕەشەی ئایدیا نوێیەکاندا بوو. دەسەڵاتی پادشایی ڕەها کە لەسەر مافی خودایی‌و ستەمکاری دامەزرابوو، خەون و خولیای دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێك بوو، ئەم خەونە فەرەنسای لە شەڕێکی بێشومارەوە گلاند، هەر لە ئەوروپاوە تا کیشوەری نوێی ئەمریکاو هندستان لە ئاسیا.

هەرچەندە سستمی پاشایەتی لە سەرەتاوە توانی سەرکەوتن بەدەستبێنێت، بەڵام دواجار ڕووبەڕووی زنجیرەیەك شکست بووەوە. لە لایەکی ترەوە هاوڵاتیانی فەرەنسا بەدەست باج و گەندەڵی‌و بەرتیلەوە دەیانناڵاندو داهاتی دارایی وڵات گەیشتە نزمترین ئاستی خۆی. هەریەك لە چینی ناوەڕاست و خانەدانەکان دادو بێدادیان بوو لە دەست دەسەڵاتی پاشایەتی‌و مانەوەی ئەویان بە کۆسپێك دەزانی لە بەردەم پێشکەوتنی خۆیاندا.

گرنگترین ئەو دیاردانەی لە ژیانی کۆمەڵایەتی فەرەنسادا جێگەی ناڕەزایی خەڵك بوو، بریتی بوون لە:

*1-* سستمی پلەوپایە دابەشکردن: ئەم سستمە بە جۆرێك بوو ناهەقیەکی زۆری تێدابوو، هەموو پلەو پایە بەرزە سەربازی‌و مەدەنیەکانی دەوڵەت تەرخان بوو بۆ خانەدانەکان و لە دانی باج و سەرانەش بەخشرابوون. ئەمە پرۆسەی کۆمەڵگای دووکەرت کردبوو. خانەدانەکان ژیانێکی شاهانە دەیانگوزەراند، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە کارێکی وا بکەن کۆمەڵگە سوودی لێ ببینێت.

*2-* کڵێسا: کڵێسا خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆرو زەوەند بوو، ئەم سامانە زۆرەشی لە داهاتی ئەو زەوی‌و زارانە دەستدەکەوت کە *0.2* خاکی فەرەنسای دەگرتەوەو لە پێدانی باج و سەرانەش بە دەوڵەت بەخشرابوو. هاوکات پیاوانی کڵێسا دەسکەوت و پلەوپایەی زۆریان پێدرابوو، سەرەڕای دەسکەوتنی داهاتێکی گەورە لە پارەو پوڵی ئەو خزمەتگوزاریانەی تەنها بەسەر خەڵکی ڕەش و ڕووتدا سەپێنرابوو. ئەم پارەو پوڵانەش بۆ هەژاران و خەڵکانی نەداروودەست کورت خەرج نەدەکرا، بەڵکو تەنها گەورە پیاوانی کڵێسا مافی سەرفکردنیان هەبوو، ئەوانیش وەکی گەورە خانەدانەکان دەیانگوزەراند.

سەرەڕای تێکچوون و گۆڕانی هاوسەنگی هێز لە سەدەی هەژدەو دواتریشدا، بەڵام فەرەنسا وەك سەرچاوەی سەرەکی فیکری سیاسی لە ئەوروپادا مایەوە. هەرچەندە ئەڵمانیا ژمارەیەك بیریاری تێدا دەرکەوت، بەڵام ئاستی داهێنانیان نەگەشتە ئاستی داهێنانی فیکری فەرەنسی

3-بێبەشکردنی خانەدانەکان لە دەسەڵاتی سیاسی: سەرەڕای پلەوپایەی خانەدانەکان، پادشاکان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون ڕێگریان لێبکەن و نەهێڵن هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی بگرنە دەست. سەرەنجامی ئەم کارەش بووە مایەی ئەوەی خانەدانەکان دژایەتی دەسەڵاتی ڕەهای پادشا بکەن.

4-سستەمی کشتوکاڵی: سستەمی کشتوکاڵی ڕێگەی بە جوتیاری فەرەنسی نەدەدا سەرمایە دروستبکات، لەبەرئەوەی دەسەڵاتی خانەدانەکان و سستەمی دارایی‌و باج سەندن ڕێگربوون لە بەردەمیدا. ئەمە پێچەوانەی ئەو بارودۆخە بوو کە لە بەریتانیادا هەبوو.

5-سستەمی باج وەرگرتن: سستەمی باج بە شێوەیەکی عادیلانە نەبوو، ئەوەی قورسایی زۆری لە سەرشان بوو خەڵکی ڕەش و ڕووت بوو. لەگەڵ زیادبوونی پێداویستیەکانی دەسەڵات، باجیش زیادیدەکرد. ئەوانەشی باجیان کۆدەکردەوە لە مەزندەکردن و ڕێژەی باجدان و ئەو بڕە پارەیەی بەر هەریەکێك دەکەوت، ناهەقیەکی زۆریاندەکرد.

6-چینی ناوەند: چینی ناوەند بە شێوەیەکی تایبەت لە شارەکاندا کۆبووبوونەوە، ئەمانە بە چاوێکی سوك سەیری هەریەك لە خانەدانەکان و پیاوانی کڵێسایان دەکرد، پێیان وابوو ئەوانە مشەخۆرن و بێ ئەوەی خۆیان بڕەنجێنن لەسەر ئەرك و ماندوویی خەڵکانی تر دەژین. چینی ناوەند وەك کۆسپ و ڕێگرێك لە بەردەم ئازادی کاری پیشەسازی‌و بازرگانیدا، سەیری سستەمی پلەوپایەو بەخشین و سستەمی باجیان دەکرد. هەلومەرجی باویشیان بە لەمپەرێك دەزانی، لە بەردەم توانای پێشکەوتن و بەرەو پێشچوونی خۆیاندا. هاوکات خۆیان لە کەسانی دی بە شایستەی پلەوپایەو پۆستە باڵاکانی دەوڵەت دەزانی، چونکە سەروەت و سامان و زانستی پێویستیان لە بەردەستدا بوو بۆ بەڕێوەبردنی وڵات. لە وەها هەلومەرجێکدا چەند نوسەرێك لە فەرەنسا پەیدابوون و داوای ڕامالینی سستەمی پادشایی ڕەهایان دەکرد، هاوکات تێدەکۆشان بۆ بەرقەرارکردنی یەکسانی‌و لێکبوردنی ئایینی، لەگەڵ چارەسەرکردنی قەیرانی ئابوری‌و هەڵگرتنی کۆت و بەندەکانی سەر بواری پیشەسازی‌و بازرگانی.

سیاسەتمەدارانیش لای خۆیانەوە پێیان وابوو سستەمی پلەوپایە بەخشین و فەرمانڕەوایی ڕەها، دژی یەکسانی‌و بەها ئینسانیەکان. لەم ڕووەوە نووسینەکانی "جۆن لوك"، کاریگەریەکی گەورەیان بەسەر کۆمەڵگەی فەرەنسیەوە بەجێهێشت. نووسەرانی فەرەنسا فیکری سیاسی ئینگلیزیان کردە بنەمایەك، بۆ دەسپێکی کارەکانیان لە پێناو فەرەنسایەکی نوێدا. لێرەوە ئەو قەناعەتە هاتەگۆڕێ کە بوونی حکومەت لە پێناو دابینکردنی ئازادی‌و ئاسایش و پاراستنی مافی موڵکایەتیدایە، بە

نووسەرانی فەرەنسا فیکری سیاسی ئینگلیزیان کردە بنەمایەك، بۆ دەسپێکی کارەکانیان لە پێناو فەرەنسایەکی نوێدا

واتایەکی دی پێویستە کۆمەڵگایەك بهێنرێتە ئارا کە تیایدا هەوڵ و چالاکی تاکەکەس ببێتە کلیلی دەستخستنی دەسەڵات و ماڵ و سامان.

فیکری سیاسی فەرەنسی بە شێوەیەکی ڕەها پشتی بە فەلسەفەی یاسای سروشتی نەبەست، بەڵکو گوڕێکی ئەقڵانی- پێشکەوتووی تازەی پێبەخشی. لەم ڕووەوە زانستە سروشتیەکان و دۆزینەوە تازەکانی ئەو بوارە، کاریگەریەکی گەورەیان هەبوو. تایبەتمەندی فیکری کۆمەڵایەتی لە سەدەی هەژدەدا بریتی بوو لە بڕوابوون بە توانای پێشکەوتن و دەستەبەرکردنی بەختەوەری لە سایەی ڕۆشنایی‌و ڕێنوماییەکانی ئەقڵدا، فەیلەسوفەکان ئەقڵیان وەك چەکێکی ڕەخنەیی بەکارهێنا، تا بیسەلمێنن کە ئازادی بنەمای هەموو خێرو چاکەیەکە. بەوپەڕی هۆشیاریشەوە هەوڵیان دەدا هەموو ئەو کەندوکۆسپانە ڕاماڵن کە ڕێگر بوون لە بەردەم ئەوەی فەرد بتوانێت ژیانی ئاسایی‌و تایبەتی خۆی بژی.

ئەم هەلومەرج و بارودۆخە دەستیان هەبوو لە زەمینە خۆشکردن بۆ شۆڕشی ساڵی *1789*، ئەو شۆڕشەی پایەگاکانی دەسەڵاتی پاشایەتی ڕەهای هەڵتەکاندو بووە مەشخەڵی ڕێگای زۆر لە میللەتان بۆ ئازادی‌و سەرفرازی.

## ژیانی "مۆنتسکیۆ" و هەلومەرجی کۆمەڵگەی فەرەنسی

سەدەی حەڤدەهەم کێشەیەکی گەورەی لە نێوان لایەنگرانی سستەمی پاشایەتی‌و لایەنگرانی سستەمی پەرلەمانیدا بەخۆوە بینی. ئەوەبوو لە بەریتانیاو دوای شۆڕشی *1688* سیستەمی پەرلەمانی هاتەئارا، بەڵام لە فەرەنسا دەسەڵاتی پادشایی ڕەها چەسپی‌و توانی بەسەر هەموو نەیارەکانیدا سەربکەوێت، بە تایبەت پەرلەمان خوازەکان.

بیریارە سیاسیەکانی فەرەنسا بەو سستەمە سیاسیەی سەرسام بوون کە لە بەریتانیا هاتبووە ئارا، ئەو سستەمە لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی ئازادی سیاسی‌و لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و ڕەتکردنەوەی ستەمکاری و زوڵم و زۆر دامەزرابوو. هەر بۆیە زۆر لە بیریارانی سیاسی‌و ئەدیبان و هونەرمەندان ڕوویانکردە ئەو وڵاتە. "ڤۆلتێر" یەکێك بوو لەوانەی چووە ئەوێ، ماوەی سێ ساڵێك لەوێدا مایەوەو بەو کەش و هەوا ئازادی‌و دیموکراسیەی ئەوێ سەرسام بوو. پاشان "مۆنتسکیۆ" ڕووی لەوێکرد، تا بە چاوی خۆی‌و لە نزیکەوە ئەزموونی بەریتانیا ببینێت. "مۆنتسکیۆ" ساڵی *1689* لە هەرێمی (بۆردۆ)، لە بنەماڵەیەکی خانەدان و ئۆرستۆکرات هاتۆتە دنیاوە. لە قۆناغی لاویەتیدا، فەرەنسا ڕووداوی زۆر گرنگی بەخۆیەوە بینی، لەوانە مردنی "لویسی چواردەهەم" لە ساڵی *1715*. هاوڵاتیانی فەرەنسا دوای مردنی ئەو

بیریارە سیاسیەکانی فەرەنسا بەو سستەمە سیاسیەی سەرسام بوون کە لە بەریتانیا هاتبووە ئارا، ئەو سستەمە لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی ئازادی سیاسی‌و لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و ڕەتکردنەوەی ستەمکاری دامەزرابوو

ستەمکارە ئومێدەوار بوون دەرگای سەردەمێکی تازەیان لێبکرێتەوە. هەر لەو ماوەیەداو دوای مردنی لویس بوار لە بەردەم سەرجەم ئاقارە سیاسیی و فەلسەفیی و ئاینیەکاندا کرایەوە، بۆ ئەوەی دوای سەردەمێك لە سەرکوتکردن و چەپاندنی دوورو درێژ گوزارشت لە خۆیان بکەن.


لویسی چواردەهەم

شەش ساڵ دوای مردنی "لویسی چواردە" نامە فارسیەکانی *Lettres Persanes* "مۆنتسکیۆ" بڵاوکرایەوە. ئەم بەرهەمە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو، لەبەر گرنگیەکەشی چوار جار لە چاپ درایەوە. هەرچەندە نامەکان ناوی نووسەرەکەی لەسەر نەبوو، بەڵام خەڵکی لە ڕێی ئەو شێوازەی کتێبەکەی پێنووسرابوو خاوەنەکەیان ناسیەوە. دوای سەرکەوتنی یەکەمین بەرهەمی، قەناعەتی بەوە نەما لەناو چوار دیواری ژوورەکەی دانیشێت و دەربارەی وڵاتانی دی بنووسێت. هاوکات حەزی زۆریشی لە سەفەرکردن، هانیدا سەردانی زۆر وڵات بکات. لەو وڵاتانەی سەردانی کردن: هەنگاریاو ئیتاڵیاو ئەڵمانیاو هۆڵەندا. لە کۆتایی ساڵی *1729* لە هۆڵەنداوە ڕوویکردە بەریتانیاو تا بەهاری ساڵی *1731* لە وڵاتەدا مایەوە. لەم سەفەرانەیدا بە فۆرمی جیاجیای حوکمکردن و بە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی گەلان ئاشنابوو، لێرەوە گەیشتە دەرەنجامی ئەوەی ژینگە چ کاریگەریەکی لەسەر دانیشتوانەکەی هەیە. "مۆنتسکیۆ" بە زانیاریەکی بێشومارەوە گەڕایەوە پاریس، هەموو ئەوانەشی لە کتێبەکەیدا (سەبارەت بە شکۆمەندیو ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی) تەوزیفکرد. ئەو کتێبەی لە ساڵی *1734*دا بڵاوکردەوە. ڕاستیەکەی ئەم بەرهەمەی سەرەتایەك بوو بۆ کتێبە بەناوبانگەکەی (ڕۆحی یاساکان)، کە ساڵی *1748* لە دوو بەرگدا لە شاری جنێف چاپکرا. ئەم کتێبە وەکی نامە فارسیەکان ناوی نووسەرەکەی لەسەر نەبوو، بەڵام هەر زوو خوێنەران بە نووسەرەکەی ئاشنابوون.

شەش ساڵ دوای مردنی "لویسی چواردە" نامە فارسیەکانی "مۆنتسکیۆ" بڵاوکرایەوە. ئەم بەرهەمە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو، لەبەر گرنگیەکەشی چوار جار لە چاپ درایەوە

## ڕۆحی یاساکان

"مۆنتسکیۆ" دەڵێت: "کاتێك قوتابخانەم جێهێشت کەسێك هاتوو کتێبێکی لە بارەی یاساوە خستە بەردەستم، بەو مەبەستەی بکەومە سۆراخی ڕۆحی یاساکان"[1]. ئەمەش وایلێکرد ساڵی *1748* کتێبە بەناوبانگەکەی (ڕۆحی یاساکان) *L'esprit des lois* بنووسێت. نووسینەوەی ئەو کتێبە بیست ساڵ لە هەوڵی بێوچانی ویست، کاتێکیش تەواویکرد تەمەنی گەیشتبووە شەست ساڵان. لەم بارەیەوە دەڵێت: "هێندەی نەمابوو ئەم کتێبە بمکوژێت"[2].

ئەم پرۆژەیەی زۆر گەورە بوو، چونکە باسی لە هەموو ئەو دام و دەزگایانە کردبوو کە مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوو هێنابوونیە ئاراوە. هەروەها بە وردی باسی لە یاساو تراديسیۆنە جیاجیاکانی تەواوی میللەتانی دنیا کردبوو، بۆ ئەوەی هۆکارەکانیان

دەستنیشان بکات و سەرچاوەو ناوەڕۆکیان ئاشکرا بکات. "مۆنتسکیۆ" دوای سەفەرێکی دوورو درێژ بۆ چەندین وڵات، گەیشتە دەرەنجامی ئەوەی کۆمەڵگەکان بە شێوەیەکی خۆڕسك یان هەرەمەکی دروست نابن و نایەنە ئاراوە، بەڵکو دروستبوون و دەرکەوتنیان پابەندە بە یاساگەلێکی نەگۆڕو هەمیشەییەوە. مێژووی هەر میللەتێکیش دەنگدانەوەی ئەو یاسا نەگۆڕانەیە. لەم بارەیەوە دەڵێت: "هەموو یاسایەکی تایبەت وابەستەی یاسایەکی دیکەیە، یاخود پەیوەستە بە یاسایەکی سەراپاگیرو گشتی ترەوە"[3].

واتە دەیەوێت بڵێت: یاساگەلێکی گشتی هەیە، کۆنترۆڵی دیاردە سروشتیەکان و ژیانی کۆمەڵایەتی دەکات.

ئەم یاساگەلەش بەمجۆرە پێناسە دەکات: "بریتیە لەو پەیوەندیە پێویستانەی لە سروشتی شتەکانەوە دروستدەبێت"[4]. ئەگەرچی ئەم پێناسەیە تەمومژاویە، بەڵام دەیەوێت بڵێت: بریتیە لەو بنەمایەی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی مرۆڤ کۆنترۆڵ دەکات و دەبێت مرۆڤ گوێڕایەڵی بێت. هەرچەندە مرۆڤ زۆر جار دەیەوێت پابەند نەبێت پێیانەوە. چونکە ئەستەمە مرۆڤ وەکی بوونەوەرێکی ئاقڵ پابەندی یاسا نەگۆڕو هەمیشەییەکان بێت، وەك ئەوەی جیهانی سروشتی پابەندە پێیانەوە. مرۆڤ بەوپێیەی بوونەوەرێکی ئاقڵە بەردەوام ئەو یاسایانە پێشێل دەکات کە یەزدان دایناون، هەروەها ئەو یاسایانەش دەسکاری دەکات کە لە یاسا یەزدانیەکانەوە کەوتوونەتەوە. چونکە ئەو یاسایانەی لەگەڵ خەسڵەتی مرۆڤدا دەگونجێن، تەواو جیاوازە لەو یاسایانەی ئاراستەی بوونەوەرە سروشتیەکان دەکات[5].

ئەم یاساگەلە گشتیەی حوکمی تەواوی گەلانی سەرزەوی دەکات، ئەستەمە بەسەر هەموو کۆمەڵگایەکدا جێبەجێ بکرێت، چونکە بە پێی هەلومەرجی تایبەتی هەر کۆمەڵگەیەك دەگۆڕێت. "یاسا بە شێوەیەکی گشتی بریتیە لە ئەقڵی مرۆڤایەتی ئەو شتەو کۆنترۆڵی تەواوی گەلانی سەرزەوی دەکات. یاسا سیاسیو مەدەنیەکانی هەر میللەتێك دەبێت تایبەت نەبن بە خۆی، واتە یاساکە لەگەڵ ئەو میللەتانەدا بگونجێت کە بۆی دانراوە، چونکە ڕێکەوتێکی سەیرە گەر یاسای میللەتێك بۆ میللەتێکی تر دەست بدات"[6].

"مۆنتسکیۆ" پێیوایە هەموو فۆرمە جیاجیاکانی دەوڵەت و ئەو یاسایانەی خەسڵەتی دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانی دەستنیشان دەکەن، بەرەنجامێکی سروشتی مەرجە تایبەتیەکانی هەر نەتەوەیەکە. گەر ئەو مەرجانە گۆڕانیان بەسەرداهات، ئەوا فۆرمی دەوڵەت و یاساکانیشی دەگۆڕێن.

"مۆنتسکیۆ" پێیوایە هەموو فۆرمە جیاجیاکانی دەوڵەت و ئەو یاسایانەی خەسڵەتی دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانی دەستنیشان دەکەن، بەرەنجامێکی سروشتی مەرجە تایبەتیەکانی هەر نەتەوەیەکە. گەر ئەو مەرجانە گۆڕانیان بەسەرداهات، ئەوا فۆرمی دەوڵەت و یاساکانیشی دەگۆڕێن

ئەو هۆکارانەی مەرجە تایبەتیەکانی هەر نەتەوەیەك دیاریدەکەن، بریتین لە هۆکارە سروشتیەکانی وەك: ئاووهەواو تۆبۆگرافیاو خاك لە لایەك و ئەو هۆکارە

کۆمەڵایەتیانەی ڕەفتاری خەڵك لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دەستنیشان دەکەن لە لایەکی ترەوە.

سەبارەت بە هۆکارە سروشتیەکان، "مۆنتسکیۆ" پێی وایە ڕۆڵێکی گەورە لە دەستنیشانکردنی سروشتی یاساکان و فۆرمی حوکمڕانیو ئەقڵیەتی نەتەوایەتیو هونەرو ترادسیۆن و هەڵسوکەوتی خەڵکیدا دەگێڕن. بەمجۆرە دانیشتوانی هەرێمە ساردەکان بەهێزو چاونەترسن، بەڵام خەڵکی ناوچە گەرمەکان لاوازو ترسنۆکن(7). هەروەها ڕوبەری جوگرافی هەردەوڵەتێك شێوەی حکومەتەکەی دیاریدەکات. سستمی کۆماری لەگەڵ ڕوبەری مام ناوەندیدا دەگونجێت و سستمی دیسپۆتزمیش لەگەڵ جوگرافیا پان و پۆڕەکاندا(8). هاوکات سروشتی خاك، خەسڵەتی ئەقڵیەتی نەتەوایەتی دەستنیشان دەکات. (ئەگەر زەویەکە بۆ کشتوکاڵکردن لەبار بوو، ئەوا ئەقڵیەتی ملکەچیو پاشکۆیەتی باڵادەست دەبێت، هەرچی ئەقڵیەتی ئازادیخوازیشە لەو هەرێمانەدا گەورە دەبێت کە کشتوکاڵی نین)[9].

دەبێت لەوەش ئاگادارین کە ڕۆحی گشتی هەر نەتەوەیەك تەنها هۆکارە سروشتیەکان دیاری ناکەن، بەڵکو ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتیانەش دیاریدەکەن کەلە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا باڵادەستن، وەکی: ئایین، فۆرمی حکومەت، ڕووداوەکانی ڕابردوو، عادات و ترادسیۆن، ئادابی هەڵسوکەوت. بەمجۆرە هۆکارە سروشتیو کۆمەڵایەتیەکانی پێکەوە بەشدارن لە دروستکردنی ڕۆحی گشتی نەتەوەدا کە بریتین لە ڕۆحی یاساکان.

دەبێت لەوەش ئاگادارین کە ڕۆحی گشتی هەر نەتەوەیەك تەنها هۆکارە سروشتیەکان دیاری ناکەن، بەڵکو ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتیانەش دیاریدەکەن کە لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا باڵادەستن

## سستمەکانی فەرمانڕەوایی
## لای "مۆنتسکیۆ"

"مۆنتسکیۆ" فۆرمەکانی حوکمڕانی بەسەر سێ جۆری سەرەکیدا دابەشدەکات، پێشی وایە هەر جۆرەو پرانسیپی تایبەتی خۆی هەیە. واتە هیچ سستمێك ناتوانێت بەپێی بنەماکانی سستمەکانی تر هەڵسوکەوت بکات، یاخود لەسەر هەمان ڕیتمی ئەوان بجوڵێت و ئامێرو ئامرازەکانی ئەوانی تر بەکاربهێنێت.

*1*-سستمی کۆماری: لێرەدا دەسەڵات و سەروەری بۆ تەواوی گەل یاخود بۆ بەشێکی دەبێت، گەر دەسەڵات بۆ سەرجەم هاوڵاتیان بوو، ئەوا دیموکراسی دەبێت. گەر لە دەست گروپێکی بچکۆلەو کۆمەڵە خەڵکانێکدا بوو، ئەوا ئۆرستۆکراتی دەبێت. حوکمڕانی کۆماری دیموکراسی بە (فەزیلەت) درێژە بە تەمەنی مانەوەی خۆی دەداتو لە ڕێی ڕێزگرتنی هاوڵاتیانی لە یەکتری دەمێنێتەوە. سەرباری ئەمانە، دەبێت هەمووان ئامادەیی ئەوەیان تێدابێت ڕێزی یاسا بگرن. هەرکاتێکیش فەزیلەت و خۆشەویستیو گوێڕایەڵیکردنی یاسا نەما، ئەوا دیموکراسیەت هەرەس دێنێت.

هەرچی حوکمی کۆماری ئۆرستۆکراتیە، پێویستی بە یەکێك لەم دوو شتەیە هەیە: یان بوونی (فەزیلەتێکی مەزن) بە جۆرێك خانەدانەکان لەگەڵ تەواوی خەڵکدا یەکسان و وەك یەك بن، بۆ ئەوەی جەماوەر لە خاوەن دەسەڵاتەکان ڕانەپەڕن و نەکەونە سەنگەری دژایەتیکردنیانەوە، یاخود (فەزیلەتێکی بچووك) لە ئارادا بێت. ئەمەش جۆرێکە لە دادپەروەری‌و دەبێتە مایەی ئەوەی خانەدانەکان لانی کەم لە نێوان خۆیاندا یەکسان بن و جیاوازی لە نێوانیاندا نەبێت، بەمەش مانەوەیان مسۆگەر دەبێت. گەر تەباو یەکگرتوو بوون بەهێزدەبن، گەر ناتەباش بوون ئەوا دەسەڵاتیان نامێنێت، چونکە دادپەروەری‌و یەکسانی ڕۆحی کۆماری ئۆرستۆکراتیە(*10*).

*2*–سستمی پاشایەتی: لە سایەی ئەم سستمەدا تاکە کەسێك بە پێی یاساگەلێکی نەگۆڕ حوکم دەکات، هاوکات پێویستە دامودەزگاو دەسەڵاتی دیکە هەبێت کە لەناو خۆیاندا دەسەڵات بەشکەن و ڕێگا لە ستەمکاری بگرن. ئەو دەسەڵاتە لۆکاڵیانەی دەبنە لەمپەرێك لە بەردەم ستەمکاریدا، بریتین لە: دەسەڵاتی چینی خانەدانەکان و پیاوانی ئاینی‌و دەسەڵاتی شارەکان.

پرانسیپی حوکمڕانی پاشایەتی بریتیە لە (شەرەف) و ئەوەی پێویستی پێیەتی بەهێزکردنی هەستی شەرەفە لەلای هاوڵاتیان (ئەویش خودنەڤینی‌و خانەدانییە) کە دەبێتە مایەی جوانترین کارو کردەوە، نەك پێویستی بە فەزیلەت و چاکەی هاوڵاتیان هەبێت.

*3*–سستمی ستەمکاری: لێرەدا تاکە کەسێکی ستەمکار حوکمدەدات و حوکمکردنەکەشی بەبێ یاساو بەبێ هیچ بنەمایەکە، واتە هەموو شتێ بە پێی خواستو ئارەزووی خۆی دەباتبەڕێوە. ئەمجۆرە سستمە تەنها لە ڕێی تیرۆرو تەقاندنەوە دێتە سەرکارو درێژە بە مانەوەی خۆی دەدات. پرانسیپی ئەم فۆرمی حوکمڕانییە لەوەدایە، هاوڵاتیان ترسێکی زۆریان هەیە ملکەچی دەسەڵاتی فەرمانڕەوای ستەمکارن. هەرچەندە "مۆنتسکیۆ" ڕەخنەی لە حوکمی ستەمکاری دەگرت، بەڵام چاوی لەسەر حوکمڕانی ستەمکارانەی هەریەك لە "ڕیشیلیۆ" و "لویسی چوارده" بوو کە توانیان، دەسەڵاتە لۆکاڵیەکان و سستمی پەرلەمانی‌و دەسەڵات و دەسکەوتی خانەدانەکان ڕابماڵن و لەناویانبەرن.

نمونەی باڵای ئەو، حوکمی دیموکراسی بوو کە لە کۆماری ڕۆمانیدا بەرجەستە بووبوو، بەڵام پێی وابوو ئەم فۆرمی حوکمڕانییە، تەنها لە چوارچێوەی وڵاتە بچووکەکاندا بەرقەرار دەبێت. سستمی پاشایەتیش لەگەڵ وڵاتە مامناوەندەکاندا دەگونجێت، هەرچی حوکمی ستەمکاریشە ئەوا بۆ دەوڵەتە گەورەکان دەستدەدات.

سەرەڕای ئەوەی حوکمی دیموکراسی نمونەی بەرزی ئەو بوو، بەڵام دەتوانین لەناو نووسینەکانیدا پەی بەوە بەرین کە "مۆنتسکیۆ" ئەو سستمی پاشایەتیەی پێ باش

سستمی ستەمکاری: لێرەدا تاکە کەسێکی ستەمکار حوکمدەدات و حوکمکردنەکەشی بەبێ یاساو بەبێ هیچ بنەمایەکە، واتە هەموو شتێ بە پێی خواستو ئارەزووی خۆی دەباتبەڕێوە



ئەرستۆ

بووبێت کە لە بەریتانیادا هەبووە. پێی وابووە گەر بێتو ئەو سستمە لە فەرەنسادا کارپێبکرێت، ئەوا دەتوانێت ئازادی سیاسی دەستەبەر بکات.

"مۆنتسکیۆ" وەکی "ئەرستۆ" پێی وابوو سستمی حوکمڕانی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکەو لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر، بە پێی (سروشتی جوگرافی، مێژوو، ڕووبەرو هەلومەرجی ئەو وڵاتە) دەگۆڕێت.

ئەوەی ڕاستی بێت "مۆنتسکیۆ" سەبارەت بە شێوازەکانی حوکمڕانیکردن، شتێکی تازەی نەهێناوەتە ئاراوە جیاواز لەوەی بیریارانی پێش خۆی باسیان لێکردووە. تەنها شتێك ئەو هێنابێتی پەیوەندی بە سستمی پادشایەتیەوە هەبوو کە لەسەر پرانسیپی (شەرەف) درێژە بە تەمەنی مانەوەی خۆی دەدات. هەروەها تەئکیدی لەوە دەکردەوە کە پێویستە پلەوپایەیەکی شایستە بە خانەدانەکان بدرێت، لە هەردوو کایەی سیاسیو کۆمەڵایەتیدا. لەم بارەیەوە دەڵێت: "چینی خانەدانەکان، چاکترین هێزێکن بۆ بەرگرتن لە ستەمکاری. بێ بوونی پادشا هەرگیز خانەدانەکان نابن و بێ خانەدانەکانیش ئەوەی دەبێت هەرگیز پادشا نییە، بەڵکو فەرمانڕەوایەکی ستەمکارە"[11].

## ئازادی سیاسیو<br>لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان

گرنگترین شتێك بەلای "مۆنتسکیۆ"وە، سۆراخکردنی ئازادی بوو. سستمی سیاسی بەریتانیاش بەلای ئەوەوە، تەنها ڕێگایەك بوو بۆ هێنانەدی ئازادی سیاسی کە هەموو ئازادیەکانی دیکەی وەك ئازادی بیروڕاو فیکرو خاوەندارێتی پێوە بەستراوە. ئازادی سیاسی مانای ئەوە نییە مرۆڤ هەرچییەکی ئارەزوو کرد بیکات، بەڵکو مافێکە لە کردنی ئەو شتانەی ئارەزووی دەکات، بەڵام لەو چوارچێوەیەدا کە یاسا ڕێگەی پێدەدات. واتە نە ناچار دەکرێت شتێك بکات خۆی ئارەزووی لەسەر نەبێت، نەڕێی پێدەدرێت کارێك بکات یاساغ بێت.

هەر هاوڵاتیەك توانی ئەو شتانە بکات کە یاسا ڕێگایان پێنادات، ئەوا ئازادی خۆی لە دەستدەدات، چونکە ئەوانی تریش هەمان مافی ئەوەیان هەیە سنورشکێنی بکەن[12]. ئازادی لە سایەی سستمە حوکمڕانە میانڕەوەکاندا هەیەو بەکارنەهێنانی دەسەڵات لە لایەن فەرمانڕەواوە، مەرجێکی سەرەکی بوونی ئازادیە، بۆ مسۆگەرکردنی ئەمە، پێویستە دەسەڵاتەکان لە یەکدی جیابکرێنەوەو هەموویان نەدرێنە دەستی یەك کەس. "مۆنتسکیۆ" ستایشی سستمی پادشایەتی بەریتانی دەکردو لە سستمی پادشایەتی ڕەهای بە چاکتر دەزانی، لە ڕێی تاوتوێکردنی سستمی پاشایەتی بەریتانیاوە، تیۆریاکەی لەمەڕ لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان هێنایەئارا. لێك

"مۆنتسکیۆ" وەکی "ئەرستۆ" پێی وابوو سستمی حوکمڕانی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکەو لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر، بە پێی (سروشتی جوگرافی، مێژوو، ڕووبەرو هەلومەرجی ئەو وڵاتە) دەگۆڕێت

جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە یەکتری وادەکات هاوسەنگی لە نێوانیاندا هەبێت، بەمەش ئازادی بوونی دەبێت. بە بڕوای ئەو لە هەموو دەوڵەتێکدا سێ جۆری دەسەڵات هەیە:

*1*-دەسەڵاتی یاسادانان: ئەرکی ئەم دەسەڵاتە دانانی یاسایە، واتە دارشتن یان دەسکاریکردن یان هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاساو ڕێسایانەیە کە کۆمەڵ ڕێکدەخەن و جڵەوی هەڵسوکەوتی تاکەکەس دەکەن.

*2*-دەسەڵاتی جێبەجێکردن: ئەرکی ئەم دەسەڵاتە جێبەجێکردن و ڕاپەڕاندنی ئەو یاسایانەیە کە لە دەسەڵاتی یاسا دانانەوە بڕیاریان لەسەر دەدرێت و تایبەتن بە پاراستنی ئاسایش لەناوخۆو پاراستنی وڵات لە هێرش و پەلاماری دەرەکی لەگەڵ باش جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکان لەگەڵ وڵاتانی دیکە.

*3*-دەسەڵاتی قەزائی: ئەرکی ئەم دەسەڵاتە ڕاپەڕاندنی تەواوی ئەو مەسەلانەیە کە یاسای مەدەنی ڕێکیان دەخات، وەکی یەکلاییکردنەوەی کێشەکان و جێبەجێکردنی یاسا لەو کێشانەی لە نێوان خەڵکدا دروست دەبێت، هەروەها سزادانی هەریەکێك کە سەرپێچی یاسا بکات.

لە ڕێی تاوتوێکردنێکی وردو بەرفراوانی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، "مۆنتسکیۆ" ڕادەی مەترسی کۆکردنەوەی هەموو دەسەڵاتەکانی لە دەستی تاکە کەسێکدا خستەڕوو. ئەو پێی وایە هەرچی کاتێك دەسەڵاتی (یاسادانان و جێبەجێکردن) کەوتە دەستی یەك کەس، ئەوا ئازادی هاوڵاتیان ڕووبەڕووی هەڕەشەو مەترسی دەبێتەوە، چونکە یاساگەلێك دادەنرێت کە بە خواست و ویستی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی ستەمکاربێت.

هاوکات گەر بێتو هەمان کەس دەسەڵاتی (یاسادانان و جێبەجێکردنی) کەوتە دەست، ئەوا ئەو مەترسیە هەر لە ئارەدا دەبێت، لەبەرئەوەی حوکمی قەزائی بە جۆرێك دەردەچێت کە چاوپۆشی لە کردەوەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بکات و ڕێگایان پێبدات، بەڵام گەر دەسەڵاتی قەزائی و دەسەڵاتی یاسادانان پێکەوە کۆکرانەوە، ئەوا دادوەر دەبێتە یاسادانەر، بەمەش زەمینە لەباردەبێت بۆ هاتنە ئارای سستمێکی ستەمکاری.

لە لایەکی دیکە گەر بێتو تەواوی دەسەڵاتەکان لە دەستی تاکە کەسێك یان تەنها کۆمسیۆنێکدا کۆبۆوە، ئەوا سروشتی مرۆڤ و مەیلی بۆ دەست بە سەراگرتن و ستەمکاری، لە باریاندایە حوکمکردن بگۆڕنە سەر سستمێکی دیسپۆتیزمی.

بۆیە گەر بمانەوێت زۆرترین بڕی ئازادی دەستەبەربکەین، ئەوا پێویستە دەسەڵاتەکانی بەسەر زیاد لە دەستەیەکدا دابەش بکەین. بە جۆرێك هەریەکەیان ڕێگا لەوی تر بگرێت و نەهێڵێت بەرەو ستەمکاری بچێت. (بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەتوانێت

گەر بمانەوێت زۆرترین بڕی ئازادی دەستەبەربکەین،
ئەوا پێویستە دەسەڵاتەکانی بەسەر زیاد لە دەستەیەکدا دابەش بکەین

دەسەڵات خراپ بەکاربهێنێت، پێویستە بە دەسەڵات ڕێ لە دەسەڵات بگیرێت، ئەویش بە حوکمی ڕیزبەندی شتەکان"[13]. سەربەخۆیی هەر دەسەڵاتێك پێویستە لە هەشوهەوایەکی پڕ هاوکاریو هارمۆنیدا بێت لەگەڵ دوو دەسەڵاتەکەی تر. هاوسەنگی نێوان هەرسێ دەسەڵاتەکەو مافی هەریەکەیان بەرامبەر ئەوانی دی، سەرەنجام ئاڕاستەی دەسەڵاتەکان مسۆگەر دەکات، بە جۆرێك کە خێرو چاکەو ئازادی هاوڵاتیانی تێدابێت.

هەر بۆ زیاتر پێداگرتن لەسەر هاوسەنگیو یەکسانی، "مۆنتسکیۆ" پێی چاکە کە لەناو یەك دەستەشدا کاروبارەکان دابەش بکرێن. بۆ نمونە دەستەی یاسادانان بەسەر دوو ئەنجومەندا دابەش بکرێن و هیچ یاسایەکیش بێ ڕەزامەندی هەردوولایان دەرنەکرێت. ئەو دوو ئەنجومەنەش بریتین لە: ئەنجومەنی گشتیو لەو نوێنەرانە پێکدێت کە لە لایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێن، لەگەڵ (ئەنجومەنی لۆردەکان) کە ئەندامەکانی لەناو چینی خانەدانەکاندا دەستنیشاندەکرێن. لە ڕێی ئەم دابەشکردنەوە، "مۆنتسکیۆ" دەیەوێت هەماهەنگیەك لە نێوان بەرژەوەندی میللەت و دەسکەوتەکانی چینی خانەدانەکاندا دروستبکات.

سەبارەت بە دەسەڵاتی جێبەجێکردنیش، "مۆنتسکیۆ" دەیەوێت جیاکاری لە نێوان پادشاو وەزیرەکاندا بکات. لای ئەو (پادشا) ڕەمزی ئەو شانشینە ئازادەیەو بەمپێیەش ناچێتە ژێرباری دادگاییکردنەوە لە بەردەم دەسەڵاتی یاسادانانەدا. بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەبێت (پادشا) دەوڵەت لە ئەگەری ستەمی دەسەڵاتی یاسادانان بپارێزێت. هەرچی وەزیرەکانە کە دەزگای جێبەجێکردن پێکدەهێنن، دەشێت لە لایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە پەلکێشی دادگا بکرێن و سزا بدرێن، گەر هاتو دەسەڵاتی خۆیان خراپ بەکارهێنا یاخود پەیڕەوی ڕێنومایییەکانی پادشایان نەکرد. بە پێی دەستور، پادشا مافی ڤیتۆ (*Veto*)ی هەیە بۆ بەرگرتن لە دەسەڵاتی یاسادانان. لە بەرامبەر ئەمەدا دەسەڵاتی یاسادانانیش بە تایبەت (لیژنەی میللی) دەتوانێت سنورێك بۆ دەسەڵاتی جێبەجێکردن دابنێت، ئەویش لە ڕێگای: (خولی کۆبوونەوەی ئیجباری، بڕیاردان لەسەر بودجەی ساڵانە، چاودێریکردنی جێبەجێکردنی یاساکان و مافی تاوانبارکردنی ئەو وەزیرانەی لە پادشاوە نزیکن).

بەمجۆرە دەسەڵاتێك سنور بۆ دەسەڵاتێکی تر دادەنێت، بەبێ ئەوەی ڕەوتی حوکمڕانی تێکبچێت.

شایانی باسە تیۆری "مۆنتسکیۆ" دەربارەی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە "جۆن لۆك"ی فەیلەسوفی بەریتانی وەرگیراوە. لێکجیاکردنەوەی ئەو دەسەڵاتانەی "مۆنتسکیۆ" داوایدەکات، کەم تا زۆر هەمان ئەو شتەیە کە "جۆن لۆك" باسیدەکات، بەڵام "لۆك" دەسەڵاتی قەزائی بەست بە دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە، ئەگەرچی

لێکجیاکردنەوەی ئەو دەسەڵاتانەی "مۆنتسکیۆ" داوایدەکات، کەم تا زۆر هەمان ئەو شتەیە کە "جۆن لۆك" باسیدەکات، بەڵام "لۆك" دەسەڵاتی قەزائی بەست بە دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە

دەسەڵاتی قەزائی وەك دەسەڵاتێکی سەرەکی لە قەڵەم دەدا. "مۆنتسکیۆ" بە دابەشکردنی دەسەڵاتەکان و دەستنیشانکردنی مەوقعیەتی هەریەکێکیان، شتێکی زۆر تازەی نەهێناوەتە ئارا. لەبەرئەوەی مەسەلەی دابەشکردنی دەسەڵات و ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوانیاندا، پێشتر لە فیکری سیاسیو لەسەر زەمینەی واقیع زۆرکات لە ئارەدا بووە، بەڵام دەتوانین بڵێین "مۆنتسکیۆ" ئەو بیریارە سیاسیەیە کە توانی بنەمایەکی مۆدێرن و پێشکەتووتر بۆ ئەو مەسەلەیە بێنێتە ئارا.

لەبەرئەوە تیۆری لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بەناوی ئەوەوە پەیوەستە. ئەگەرچی ئەم مەسەلەیەی لە "لۆك" وەرگرتووە، بەڵام لەو زیاتر ڕوون و ڕەوانتر قسەی لێکردووە.

## دیموکراسیەت
## لای "مۆنتسکیۆ"

"مۆنتسکیۆ" بڕوای بە ئازادی هەبوو، لە بەرامبەریشدا دژی هەموو تیۆریاو ئایدیایەك بوو کە باس لە ڕەوای کۆیلایەتی بکات و بە لایەوە دیاردەیەکی سروشتیو ئاسایی بێت. لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەرستۆ پێی وابوو کۆیلە هەیەو ئەمەش شتێکی سروشتیە، بەڵام نەیتوانی ئەوە بسەلمێنێ"[14]. ئەو پێی وایە مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداری ئازادی خۆی بێت یاخود ئازادی خۆی بفرۆشێت. ئایا دەبێت مرۆڤ بە چ نرخێك ئازادی خۆی بفرۆشێت؟

لەبەرئەوە "مۆنتسکیۆ" هەر بە تیۆری لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەوە نەوەستا بۆ دەستەبەرکردنی ئازادی، بەڵکو دیدو بۆچوونی دیکەی خستەڕوو، بۆ ڕێگرتن لە زوڵم و ستەمکاری دەسەڵات. لەم پێناوەشدا هەندێك بەربەستی دروستکرد کە ڕێ لەوە دەگرن و بواری مومارەسەکردنی ئازادی بەرتەسك ناکەنەوە، ئەو بەربەستانەش بریتین لە:

*1*- گروپەکانی ناوەند: ئەمانە لە خانەدان و پەرلەمانە ناوچەییەکان و ئەکلیرۆس (کە بە ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتیو مەعنەوی هەڵدەستێت لە دەوڵەتدا)، پێکدێن. "مۆنتسکیۆ" لەم بارەیەوە دەڵێت: "لە هەر شانشینێکدا دەسکەوتە تایبەتیەکانی گەورە دەرەبەگەکان و ئەکلیرۆس و خانەدانەکان نەمان، ئەوا هێندە نابات دەوڵەتێکی ستەمکاری دێتەئارا"[15].

سەبارەت بە خانەدانەکان "مۆنتسکیۆ" زیاد لە پێویست زیادەڕۆیی کردووە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پلەوپایەی خۆیو پلەوپایەی خانەدانەکان لە بەریتانیا. تەنانەت چینی خانەدانەکانی بە چاکترین پاڵپشتی سستمی پاشایەتیو باشترین پارێزەری ئازادی دەزانی، ئەوانی بە چاکترین هێزی دژ بە ستەمکاری دەدایە قەڵەم:

ئەرستۆ پێی وابوو کۆیلە هەیەو ئەمەش شتێکی سروشتیە، بەڵام نەیتوانی ئەوە بسەلمێنێ. ئەو پێی وایە مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداری ئازادی خۆی بێت یاخود ئازادی خۆی بفرۆشێت

ئەوەتا دەڵێت "بێ پادشا هەرگیز خانەدانەکان نابن و بێ خانەدانەکانیش ئەوەی دەبێت پادشا نییە، بەڵکو ستەمکارێکە"[16].

2- نامەرکەزیەت: پێی وابوو ئەوە هۆکارێکی بەهێزە بۆ بەرگرتن لە ستەمکاری، لەبەرئەوەی ئازادیەکی گەورەتر لە هەڵسوکەوتکردن و سەربەخۆیەکی مەزنتر لە خۆبەڕێوەبردن. دەداتە هەرێمەکان.

3- ئاکار: "مۆنتسکیۆ" حەقیقەتی پەرەسەندن و چاکسازی لە کۆمەڵگەدا، لە ئاکاردا دەبینێتەوەو پێی وایە لە کاتێکدا ئاکار توانای ئەوەی هەبێت گەشەو بەرەوپێشچوون بهێنێتە ئارا، ئەوا پێویست بە بوونی یاسا ناکات.

سەرەڕای باوەڕی زۆری بە ئازادی، بەڵام "مۆنتسکیۆ" نەیتوانی خۆی لەژێر باری ئەو پۆلێنکردنەی سستەمی چینایەتی قوتاربکات کە بە هۆی ڕەچەڵەك یاخود سەروەت و سامانەوە، جیاوازی لە نێوان ئینسانەکاندا دەکات و بە هۆی ئەو شتانەوە فەزڵی چینێك بەسەر چینێکی تردا دەدات.

ئەگەرچی بانگەشەی بۆ دیموکراسیەتی نوێنەرایەتیکردن دەکردو پێی وابوو هەر نوێنەرێك زمانحاڵی تەواوی نەتەوەکەیەتی نەك تەنها ئەوانەی لە ناوچەکەی خۆیدا دەنگیان داوەتێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی وابوو نابێت دەوڵەمەندو هەژار لە پرۆسەی دەنگداندا وەك یەك وابن، بەڵکو ژمارەیەکی زۆرتر دەنگی دایە دەوڵەمەندەکان، بە جۆرێك لەگەڵ بڕی سامان و داهاتی هەریەکێکیاندا بگونجێت. بەمجۆرە بڕێکی گەورەتری لە مومارەسەکردنی حوکم بەخشی بە دەوڵەمەندەکان، بە شێوەیەك کە لەگەڵ بەرژەوەندیە ئابوریەکانیاندا بگونجێت. لەگەڵ ئەمەدا "مۆنتسکیۆ" هەژاران لە مافی دەنگدان و هەڵبژاردن بێبەش دەکات، لەبەرئەوەی پێی وایە ئەوانە خاوەن ئیرادەی ئازاد نین. هەروەها ئەو بۆخۆی باوەڕی بە مافی دەنگدانی گشتی نەبوو بەڵکو پرۆسەیەکی وای بە مافی ئەوانە دەزانی کە هەیانەو پارەدارن. دوای شۆڕشی فەرەنسی، سیاسەتمەدارانی ئەو وڵاتە کار بەم بۆچونەی "مۆنتسکیۆ" دەکەن و بڕە پارەیەکی دیاریکراو دەکەنە مەرجێك لەسەر هاوڵاتیان، بۆ ئەوەی بەشداری پرۆسەی دەنگدان بکەن.

لە لایەکی ترەوە داوای ئەوەی دەکرد، لەسەر ئاستی یاسادانان هەندێك دەستکەوت بدرێتە خانەدانەکان. پێویستە خانەدانەکان دەستەیەکی یاسادانانی تایبەت بە خۆیان هەبێت و ئەم دەستەیەش مافی ڤیتۆکردنی ئەو بڕیارانەی هەبێت کە لە لایەن لیژنەی نوێنەرانی میللیەوە دەردەچێت، هاوکات پێویستە دەستەی خانەدانەکان بۆماوە بێت. هەروەها "مۆنتسکیۆ" داوادەکات خانەدانەکان لە لایەن هاوچینەکانی خۆیانەوە دادگایی بکرێن، ئەمەش بە ڕێگرتن لەوەی نەك حوکمی ناڕەوایان دەرهەق بدرێت.

سەرەڕای باوەڕی زۆری بە ئازادی، بەڵام "مۆنتسکیۆ" نەیتوانی خۆی لەژێر باری ئەو پۆلێنکردنەی سستەمی چینایەتی قوتاربکات کە بە هۆی ڕەچەڵەك یاخود سەروەت و سامانەوە، جیاوازی لە نێوان ئینسانەکاندا دەکات و بە هۆی ئەو شتانەوە فەزڵی چینێك بەسەر چینێکی تردا دەدات

چونکە ناکرێت ئەوان لەبەردەم دادگایەکی ئاساییدا لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکرێت، بەڵکو دەبێت لە بەردەم دەستەیەکی تەشریعیدابێت کە ئەندامەکانی لە خانەدانەکان پێکهاتبن.

## کۆتایی

"مۆنتسکیۆ" گەورەترین و قوڵترین کاریگەری لەسەر نەوەکانی ڕۆژگاری خۆیو نەوەکانی دواتریش بەجێهێشت. لە ماوەی کەمتر لە دوو ساڵ شاکارە مەزنەکەی (ڕۆحی یاساکان) زیاد لە بیست جار لە چاپ درایەوە. دەستبەجێش وەرگێڕدرایەوە سەر زمانی ئینگلیزیو ئەڵمانیو ئیسپانیو ئیتاڵیو چەندین زمانی بیانی دیکە. هەروەها تەواوی ڕۆشنبیران سەریانکردە سەر خوێندنەوەیو دواتریش دەستیانکرد بە لێکدانەوەو تاوتوێکردن و ڕەخنەلێگرتن و شرۆڤەکردنی[17].

ناوەڕۆکی کۆی بەرهەمەکانی خەسڵەتێکی جیهانگەراییو بەردەوامیتیان هەبوو[18]، لەبەرئەوەش زۆر لە بیروڕاو دیدوبۆچونەکانی تا ئەمڕۆ بەردەوامن و بە سەرتاسەری دنیادا بڵاوبوونەتەوە.. هەریەک لە (ئازادی سیاسی، تیۆری لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، تیۆریەکەی دەربارەی ڕۆحی یاساکان وفۆرمەکانی حوکمڕانی)، هەر هەموویان تا ئێستاو بەردەوام بابەتی گفتوگۆی گەرم و بەرفراوانن لە تەواوی دنیادا. تا ئەمڕۆش دەستوری زۆر لە وڵاتان پشت بە بۆچون و تیۆریەکانی ئەو دەبەستێت. سەبارەت بە ڕۆڵی گەورەی ئەو، "داننج" *Dunnig* دەڵێت: "پلەوپایەی مۆنتسکیۆ وەک فەیلەسوفێکی سیاسی، دەگەڕێتەوە بۆ بواری توێژینەوەکانیو بۆ میتۆدە وردو مەحکەمەکەیو بۆ تیۆریەکەی سەبارەت بە ئازادی"[19].

ناوەڕۆکی کۆی بەرهەمەکانی خەسڵەتێکی جیهانگەراییو بەردەوامیتیان هەبوو، لەبەرئەوەش زۆر لە بیروڕاو دیدوبۆچونەکانی تا ئەمڕۆ بەردەوامن و بە سەرتاسەری دنیادا بڵاوبوونەتەوە

## سەرچاوەکان

1- د. ابراهیم دسوقی أباظة، د. عبدالعزیز غنام: تاریخ الفکر السیاسی- دار النجاح، بیروت- 1973، ص 227.

2- جان جاك شوفالیە: تاریخ الفکر السیاسی، ص 406.

3- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص 407.

4- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص 407.

5- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص 408.

6- اندریە کریسوف: تیارات الفکر الفلسفی من القرون الوسطی حتی العصر الحدیث- ترجمة: نهاد رضا- عویدات، ص 239.

7- ف. فو لغین: فلسفة الانوار - ترجمة: هنرییت عبودي- دار الطلیعة، بیروت- 1981، ص 52.

8- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص 52.

9- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص 52.

*10-Marcel prelot: histoire des Idees Politiques; 2 eme edition, Dalloz, 1967, pp. 389- 394.*

**11–جان جاك شوفالييه: تأريخ الفكر السياسي من المدنية لدولة الى الدولة القومية– ص 420.**

**12–ابراهيم دسوقي أباظة، د. عبدالعزيز غنام: تأريخ الفكر السياسي– ص (237، 238).**

**هەروەها بڕوانە: جان جاك شوفالييه: سەرچاوەی پێشو - ل 425.**

**13–جان جاك شوفالييه: تأريخ الفكر السياسي– ص 425.**

*14-Montesaquieu: The Spirit of laws, p. 240.*

**لە د. علي عبدالمعطي محمد: الفكر السياسى الغربي– ص 289 وەرگیراوە.**

**15–جان جاك شوفالييه: تأريخ الفكر السياسى– ص 421.**

**16–هەمان سەرچاوەی پێشوو– ص 420.**

*17-Maxey: Political Philosophies, p. 288.*

**18–د. علي المعطي محمد: الفكر السياسى الغربي– ص 292.**

*19-Dunning: Ahistory of Political Theories, Book II, P. 428.*

**19–د. موسى ابراهيم: معالم الفكر السياسى الحديث و المعاصر– مؤسسة عزالدين للطباعة و النشر، بيروت– الطبعة الاولى، 1994.**



*Georges Braque*

بابەكی ئەحمەدی

# تیۆرەی هاوپەیوەندیو زمان




و. ڕێبین هەردی

## بەشی دووهەم

هابرماس لە ساڵی *1981*دا كتێبی تیۆرەی كرداری هاوپەیوەندی بڵاوكردەوە. ئەم كتێبە ڕەهەندێكی تازەی فكری هابرماسی پیشانداو بە قسەی زۆرێك لە ڕەخنەگرانی بەرهەمەكانی، دەستپێكی قۆناغێكی تازەی كاری فكری ئەو بوو. ئەڵبەتە زۆرێك لە كێشە تیۆریو فەلسەفیەكانی قۆناغی سەرەتای بەرهەمەكانی، هەروا لە كتێب و نوسینەكانی دواییدا مانەوە، بەڵام كێشەی تازەش سەریانهەڵداو ئەو سەرنجی لە مەسەلەگەلێكی تازە دا. ئەو بەرهەمانەی كە لەم قۆناغەی دووهەمدا نوسی، هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەی تیۆرەی كرداری هاوپەیوەندی، هەر لەبەر ئەمەش، ئەم كتێبە بایەخێكی تایبەتی لە تاوتوێكردنی بیرەكانیدا هەیە. گرنگترین

بەرهەمەكانی قۆناغی تازە، بریتین لە هۆشیاری ئەخلاقیو كرداری هاوپەیوەندی *1983*، گوتاری فەلسەفی مۆدێرنە *1985*، بیری پاش میتافیزیك *1988* و تێكست و زەمینە *1991*.

تیۆرەی كرداری هاوپەیوەندی كتێبێكی قەبارە گەورەیە لە دوو بەرگدا، ناونیشانی بەرگی یەكەمی بریتیە لە "ئەقڵباوەڕی كرداریو ئەقڵباوەڕی كۆمەڵگا" ئەم بەرگە لە چوار بەش پێكهاتوە. بەشی یەكەم "بەرەو كێشەی ئەقڵباوەڕی" كە باسی چەمكی ئەقڵباوەڕی لە كۆمەڵناسیدا دەكات و ڕەخنەیەكە لە بۆچوونەكانی چەند كۆمەڵناسێك لەم بارەیەوە، لە كۆتایی ئەم بەشەدا "كێشەی ناسین" و بە تایبەتی تێڕوانینی هێرمۆنتیكی مۆدێرن و ڕێژەگەری، باسكراون. لەم بەشەدا یەكەم پێناس بۆ "كرداری هاوپەیوەندی" پێشكەشكراوە. لە بەشی دووهەمی بەرگی یەكەمدا، هابرماس باسی چەمكی ئەقڵباوەڕی لە بیری ماكس فیبەردا كردوەو لە بەشی سێیەمیشدا باسی چەمكی كرداری بە تایبەتی لە بیری فیبەردا كردوەو لە بەشی چوارهەمدا كە دوابەشی بەرگی یەكەمە، باسەكەی بریتیە لە پەیوەندی ئەقڵباوەڕی بە "بەشتبوونەوە" لە تێڕوانینەكانی لۆكاچ و ئادۆرنۆدا.

ناونیشانی بەرگی دووهەمی كتێبەكە تیۆرەی كرداری هاوپەیوەندی "بەرەو ڕەخنەكردنی ئەقڵی كرداری"یە. ئەم بەرگەش لە چوار بەش پێكهاتوە. لە بەشی یەكەمی ئەم بەرگەدا كە لە ڕاستیدا بە پێنجەم بەشی سەرجەم كتێبەكە دەژمێرێت، باسی چەمكی "نمونە" لە بەرهەمەكانی دۆركایم و میددا كراوە. لە بەشی دووهەمدا باسی چەمكی "ژیانگا" و بە تایبەتی جێگەی لە بیری هێرمۆنتیكیدا و لە بەشی سێهەمدا باسی چەمكی سیستەم لەم بەرهەمەكانی پارسنۆزدا كراوەو تیایدا بە شێوەیەكی تایبەت سەرنج لە مۆدێرنە دراوە. لە دوا بەشدا گەڕانەوەیەك بۆ سەرچاوەی باسەكە دەستپێدەكات. لە پارسنۆزەوە بەرەو ماركس دەگەڕێینەوەو لەم ڕەوتەدا بە شێوەیەكی تایبەت، ئاگاداری لە تێڕوانیی فیبەر بۆ مۆدێرنە، پەیدادەكەین. ئەمە لیستی فەسڵەكانی كتێبێكە كە بە قسەی زۆربەی ڕەخنەگران، بە گرنگترین بەرگریكردن لە مۆدێرنە دەژمێرێت، بێ ئەوەی كەموكووڕییەكانی مۆدێرنەو بە تایبەتی بەشتبوونی پەیوەندییە مرۆییەكانی فەرامۆش كردبێ. كتێبەكە هەوڵی بیریارێكە بۆ زاڵبوون بەسەر دژایەتیەكانی مۆدێرنیزم و ناكۆكیەكانی ژیانی مۆدێرن: لە دەستدانی ماناو لە دەستدانی ئازادی كە دەرئەنجامی ئەقڵباوەڕی مۆدێرنەیە، بەڵام هابرماس هەوڵیداوە تا بە هۆی ناوەڕۆكی لۆژیكی وتوێژی ئەم ئەقڵباوەڕیەوە، كلیلی ڕزگاری بدۆزێتەوە.

ئەقڵی هاوپەیوەندی كە هابرماس ناوی دەنێ *Kommunikative vernunft*، پشت ئەستوورە بە لۆژیكی وتوێژ. شێوەیەكی غائی نیە كە چاوەڕێی دەركەوتنی لە ئایندەدا بكەین. لە هەموو شێوە كردارێكی مرۆییدا، شێوەیەكی یان (ناوك یان


ماركس

تۆوێكی) دەدۆزرێتەوە. بناغەكەی پشتئەسورە بە ئەقڵانیەت و ئەقڵباوەڕی، واتە لە جەوهەری قسەی ئەقڵانیدا هەیە، بەڵام ئەم بناغە سەرەكیەی ئەقڵانیەت یان بە زمانی فەلسەفی ئەم جەوهەرە ئەقڵباوەڕانەیە، هەمیشە دیارنیە. واتە تاكەكان لێی بەئاگا نین. زۆرتر /ئەم بناغە عەقڵانیە/ "لە خزمەتی بەرژەوەندیەكی تایبەتدا" لە ڕێساگەلێكدا تەفسیر دەكەن كە ناوەڕۆكە عەقڵانیەكەی دەسڕێتەوە، بەڵام چەمكی ڕەوایەتی سیاسی پیشانیدەدا كە شێوەی سەرەتای ئەم عەقڵانیەتە تەنانەت لە سیاسەتی ڕۆژانەشدا، هەیە. بە تایبەتی ئەم خاڵە لە "قەیرانی ڕەوایەتی"دا ئاشكرا دەبێت.

هابرماس لە زانین و بەرژەوەندیدا دەنوسێ كە ئێمە بەردەوام واقع لە سێ ڕوانگەی تراسندنتالی جیاواز یان (سێ زانینی مومكینەوە) دەناسین: زانیاریەكان كە باسی دەستگەیشتنی تەكنیكی ئێمە بە ئوبژێكتەكان دەكات، ڕاڤەكردن كە توانای ئاراستەوەرگرتنی چالاكیەكانی ئێمەیە لە چوارچێوەی نەریتە هاوبەشەكاندا، دواجار شیكردەوە كە لە حوكمی پەیوەستبوونی زانینەكانی ئێمەدایە بە زانینەكانی پێشووەوە. ئەم سێ شێوەیەی دانایی (یان ئەبستیم) پەیوەستن بە كۆمەڵێكی ئاڵۆزی بەرژەوەندیەوە كە لە كار، زمان و دەسەڵات (*Herrschaft*)دا دەردەكەون. هەر وتەزایەكی دانایی واتە زانیاریەكان و ڕاڤەكردن و شیكردنەوە، لە چوارچێوەی زانستگەلێكدا شكڵ وەردەگرن كە بەستراوە بەو كۆمەڵە بەرژەوەندیەوە.

*1*-زانستە ئەزموونی- شیكاریەكان كە ڕەگیان لە "زانستی سروشتی" ڕۆشنگەریدایە، خەسڵەتی سەرەكیان تیۆریو ئستقرائیی یان پێوەریەو هەر لەبەر ئەمەش شیكارین. ئەم زانستانە تەنها پشتیان بە تاقیكردنەوە بەستوە هەر لەبەرئەمەش ئەزمونین. ئەم زانستانە كە نمونەی سەرەكیان فیزیایە، زانیاری لە بارەی جیهانی دەرەوە بە ئێمە دەدەن و بنەمای سەرەكیان ڕونكردنەوەی دراوە دەرەكیەكانە. دیدی تراسندنتالانەی ئەم زانستانە، دەسەڵاتی تەكنیكیە بەسەر شتەكاندا.

*2*-زانستە مێژوویی- هێرمۆنتیكیەكان كە ڕەگیان لە "زانستە مەعنەویەكانی" ڕۆشنگەری یان بە زمانی ئایدلیالیزمی ئەڵمانی ڕەگیان لە *Geistwissenchaften* دایە. ئەم زانستانە بە مێژوویی ناودەبرێن لەبەرئەوەی بابەتی سەرەكیان نەریتە مێژووییەكانەو هەروەها بە هێرمۆنتیكی ناو دەبرێن لەبەرئەوەی میتۆدەكەیان لە بنەڕەتدا لەسەر بناغەی وەرگێڕان دامەزراوە. ئەم زانستانە لەسەر بناغەی ڕاڤەكردن و تەفسیركردن دامەزراون و خولقێنەری ڕاڤەكردنی تازەن. نمونەی ئەم زانستانە ؟زمانناسی مێژوویی یان *Phiologie*یەو بنەمای سەرەكیان تێگەیشتنە لە ماناو مانای خۆیان لە بواری زمان و بەرژەوەندی پراكتیكیدا پەیدادەكەن. ئەم زانستانە دەتوانن ڕاڤەگەلێك لە بارەی

هابرماس لە زانین و بەرژەوەندیدا دەنوسێ كە ئێمە بەردەوام واقع لە سێ ڕوانگەی تراسندنتالی جیاواز یان (سێ زانینی مومكینەوە) دەناسین: زانیاریەكان كە باسی دەستگەیشتنی تەكنیكی ئێمە بە ئۆبژێكتەكان دەكات، ڕاڤەكردن كە توانای ئاراستەوەرگرتنی چالاكیەكانی ئێمەیە لە چوارچێوەی نەریتە هاوبەشەكاندا، دواجار شیكردەوە كە لە حوكمی پەیوەستبوونی زانینەكانی ئێمەدایە بە زانینەكانی پێشووەوە

پەیوەندی نێوان زیهنیەکانەوە پێشکەش بە ئێمە بکەن. دیدی ترساسندنتالانەی ئەم زانستانە تێگەیشتنی عەمەلیە لە ژیانی پراکتیکیدا.

3-زانستە سیستماتیك و ڕەخنەگرەکان ڕەگیان لەو شتەدا هەیە کە لە سەدەی نۆزدەدا پێی دەگوترا *Hanlungwisens- chaften*. هەندێکجار ئەم زانستانە ناودەنێن *Parareologique*، چونکە ئیمکانی چالاکیە سیستماتیکەکانی مرۆڤ وەك سیاسەت و ئابوریو بە گشتی کۆی زانستە مرۆیی یان کۆمەڵایەتیەکان دەدەن. ئەم زانستانە بە ڕەخنەگرانە ناودەبەین، چونکە بابەتەکانیان دیاردەگەلێکی گۆڕاوە کە جگە لە ڕێگەی ڕەخنەوە نەبێت ناگەڕێنرێتەوە بۆ ڕەگ و پێشنیارەکانیان. نمونەی ئەم زانستانە بە بڕوای هابرماس دەرونشیکاریە. بنەماکەیان شیکاریە، بەڵام بە مانایەکی تایبەت و لە سنوری دەسەڵاتدا مانا پەیدا دەکەن. ئەم زانستانە خاوەن "بەرژەوەندی ڕزگاری"ن. دیدی ترسندنتالیان ڕزگاربوونە لە پەیوەندیگەلێك کە لە ڕواڵەتیدا، سروشتی دەردەکەون.

سێ بەرژەوەندی زانینەکان، واتە بەرژەوەندیە تەکنیکیەکان، پراکتیکیەکان و ڕزگاریخوازەکان، لەسەر سێ شێوەی جیاوازی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیو سێ شێوەی جیاوازی بەکارهێنانی هێزی کار، زمان و دەسەڵات ڕاوەستاون. کەوابوو سێ بواری زانستی پەیدا دەبێت: زانیاریانە کە پەرەپێدەری چاودێری تەکنیکیە لە بواری کاردا، ڕاڤەیی کە چالاکی دەبەستێتەوە بە سیاقی زمانەوەو شیکاری کە دەتوانێ هۆشیاری لە حیجابی ئایدیۆلۆژی ڕزگاربکات. لەهەر یەك لەم سێ بوارەدا بەر جۆرێکی تایبەتی چالاکی دوولایەنە دەکەوین.

ڕەنگە بکرێ بە هۆی چەمکی چالاکی دوولایەنەوە دەستمان بە "زانستێکی پشتبەستوو بە لۆژیکی وتووێژ" بگات. بەڵام چەند خاڵێك، کێشە لەم ئاراستەیەدا دروستدەکەن. دەکرێ یەکەمینی ئەم کێشانە ناوبنرێ "فەقیری فەلسەفی"، واتە لە بەردەستدا نەبوونی ئەو ڕێساو چەمکە فەلسەفیانەی کە ڕەهەندی "سروشتیانەی" بیرکردنەوە شیکاریو هێرمۆنتیکیو ڕەخنەگرانەکان، "وەك وتووێژ" ڕوون دەکەنەوە. هابرماس هەوڵیدا لەسەر بناغەی چەمکێك کە ڕۆژگارێك فیختە هێنابوویە ئاراوە، واتە *Mundigkeit*یان سەربەخۆیی تەواو، ئەلگۆیەکی پراگماتیکی هەمەکی بخوڵقێنێ کە بە پێی ئەم نمونەیە پەیوەندی، پشتنەستور بێت بە "ئەگەری دانایی یان تێگەیشتنی موحتەمەل". نمونەی ئەم ئەلگۆیە، وتوێژە. هابرماس بە زمانێك کە بیرهێنەرەوەی نوسینەکانی گادامێرە. دەڵێت کە ئیدی نابێ بگوترێ کە نمونەی دانایی بینینە، بەڵکو دەبێ دان بەوەدا بنرێ کە ئەم نمونەیە وتوێژە، وتوێژ بە مانای کۆمەڵایەتی (لە ئاستی فەزای گشتیدا) لە ئارادایە.

سێ بەرژەوەندی زانینەکان، واتە بەرژەوەندیە تەکنیکیەکان، پراکتیکیەکان و ڕزگاریخوازەکان، لەسەر سێ شێوەی جیاوازی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیو سێ شێوەی جیاوازی بەکارهێنانی هێزی کار، زمان و دەسەڵات ڕاوەستاون

لێکتێگەیشتنی زماننا‌سیانە (و سەلاحیەتی زمانی) پیشان دەداو ڕێگەخۆشکەرە بۆ تێگەیشتنی دوولایەنەو لێکتێگەیشتنی هاوپەیوەندیانە (سەلاحیەتی پراگماتیکی).

هابرماس چەند ساڵ پێش نویسنی وتاری "پراگماتیکی گشتی چیە؟"، باسی زمانی کردبوو، بۆ نمونە لە زانین و بەرژەوەندیدا زمانی بە هۆکارێکی سەرەکیو گشتی زانیبوو کە فۆرمەلەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکات، ئەگەرچی پاشتر هابرماس ئەو خاڵەی ڕەدکردەوە کە زمان ئامێری گشتی پەیوەندی بێت، بەڵام خاڵێکی گرنگ لە هەمان ئەو باسە سەرەتاییەدا شاراوەیە: شێوەی کۆمەڵایەتیو کلتوری ژیان بە هۆی سیستەمێکی پەیوەستی دوولایەنەوە دەناسرێ کە خۆی شێوەیەکی ڕەمزی هەیەو کامڵ دەبێ. بەڵام تێگەیشتن لە کارکردنی ئەم هۆکاری پەیوەندیە، کاتێك دەبێت کە لە دیدی پراگماتیکی گشتیەوە سەرنجی لێبدەین، واتە لە ڕوانگەیەکی فراوانتر لە زماننا‌سیەوە، ڕوانگەیەك کە هەموو شێوەکانی پەیوەندی لەبەرچاو بگرێو تەنانەت لەمەش گرنگتر هەموو ئەو شێوە پەیوەندیانەی کە باویان نەماوە، بخاتە ژێر سەرنجەوەو هەموویان ڕوون بکاتەوە.

دیدی هابرماس بۆ زمان لایەنیکەم لە هەنگاوی سەرەتای دروستبوونیدا، پشت ئەستورە بە باسەکانی کارل بۆهلەر. لە باسکردنی شیکاری سیمۆلۆجیانەی زماندا، سێ وەزیفەی ئاماژەکان لە یەك جیادەکاتەوە:

*1*)وەزیفەی مەعریفی (*Cognitive*): ئاماژە وەك ڕەمز یان نیشانەی واقع.

*2*)وەزیفەی بەیانی (*expressive*): ئاماژە وەك نیشانەیەك بۆ ئەزموونی دەروونی نێنەری پەیام.

*3*)وەزیفەی ناونان (*appelative*): ئاماژە وەك نیشانەیەك بۆ ئەم نەخشەیەی بۆهلەر زیادەکات:

*1*)شیکاری نەحویانەی ئەو یاسایانەی کە باڵادەستن بەسەر پێکهاتەی ڕستەکاندا.

*2*)شیکاری ماناناسیانەی پەیوەندی نێوان ماناو ڕاستگۆیی (دروست یان نادروستی ڕستەکان).

کارناپ پێش هابرماس، ڕستەی بە یەکەم هەڵگری مانا زانیبوو. ئەو نوسیبووی کە ڕستەکان بۆ ئەوەی مانایان هەبێت دەبێ ڕێسا وێنەکانی پێکهاتەی ڕێزمانی زمانیان تێدابێت و مانا، وەزیفەی بونیادە ڕێزمانیەکانە. خاڵێك کە لە لایەن فرگەو فینگشتاین و ئەمرۆ لە لایەن دیڤیدسونەوە، سەلمێنراوە. فینگشتاین بە هێنانە ئارای ئەوەی کە مانای ڕاست بەستراوە بە بەکارهێنانی ڕۆژانەیەوە (واتە بەستراوە بەو ڕێسایانەوە کە حاڵەتێکی تایبەتی بە بەکارهێنانی کۆمەڵایەتیو قبوڵکراویان دەبەخشێ)، لە ڕاستیدا مانای لە چوارچێوەی ڕێساکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتیو چالاکیە کۆمەڵایەتیەکاندا هێنابۆوە ئاراوە. لێرەوە پاش ئەو، وتوێژی لایەنگرانی کە

کارناپ پێش هابرماس، ڕستەی بە یەکەم هەڵگری مانا زانیبوو. ئەو نوسیبووی کە ڕستەکان بۆ ئەوەی مانایان هەبێت
دەبێ ڕێسا وێنەکانی پێکهاتەی ڕێزمانی زمانیان تێدابێت و مانا، وەزیفەی بونیادە ڕێزمانیەکانە

هابرماس لە ڕەخنەگرتنیدا لە فرۆید دەنوسێ کە دەبێ نمونەی پەیوەندی ڕاست و تەندروست هەڵبژێرین، بۆ ئەوەی بتوانین نمونەی خراپ بناسینەوە

لە بارەی "چالاکی ئاخاوتن" هاتبوە ئاراوە، لە مەرجی ڕاستیبوون (ماناداربوون)ەوە بەو سنوری مانانانسی هاوپەیوەندی ڕۆیشت و ئەمەش ئەو ئاراستەیەیە کە هابرماس لە ڕێگەیەکی دیەوە دواجار پێیدەگات. لەم مانانسیە هاوپەیوەندیەدا، ڕستە زماننناسیەکان ناوەڕۆکێکی ڕەخنەگرانەیان هەیە، واتە لەو پەیوەندیەدا دەناسرێنەوە کە بەو ڕێسایانەوە هەیانە کە فۆرمەلەیان دەکات. لێرە بەدواوە سێ وەزیفەی جیاوازیان فۆرمەلە دەبێت کە دواجار لە هەریەکێکیاندا، مانا لە پەیوەستبوونیدا بە زەمینەی بابەتیەوە دروستدەبێت و دەناسرێنەوە. هابرماس ئاماژە بۆ پەرەسەندنی باسەکەی بۆهلەر ناکات، بە تایبەتی ناوردبینە بەرامبەر بە تیۆرەی پەیوەندی ڕۆمان یاکۆبسن، لە کاتێکدا سەرنجدان لەو تیۆرەیە، بە کەڵکی وردکردنەوەی تیۆرەی کاری هاوپەیوەندیی ئەو دێت.

پراگماتیکی گشتی لە بەرهەمەکانی هابرماسدا هەندێجار بە مانای "تیۆرەی هەمەکی پەیوەندیە" هابرماس لە ڕەخنەگرتنیدا لە فرۆید دەنوسێ کە دەبێ نمونەی پەیوەندی ڕاست و تەندروست هەڵبژێرین، بۆ ئەوەی بتوانین نمونەی خراپ بناسینەوە. تەنها لە ڕێگەی تێگەیشتن لە پەیوەندی بە مانای هەمەکیەوەو لە ئاستی پراگماتیکی گشتیدا دەتوانین، نادروستیەکانی پەیوەندی زماننناسیانە بناسینەوە. لە کاتێکدا کە مانەوە لە سنوری پەیوەندیەکدا کە بە هەر شێوەیەك بێت کەموکوڕە لە ڕووی زمانیەوە، ناتوانێ ڕێخۆشکەر بێت بۆ تێگەیشتن لە تیۆرەی هەمەکی پەیوەندی. کەوابوو دەبێ سەرنج لە گوتارو لێرەوە لە "چالاکی ئاخاوتن" بدرێ کە دەریدەخات شێوازگەلێك (ی لە ناوەڕۆکدا سستماتیك) هەن کە تاکە کەسە کامڵەکان بەکاریدەهێنن بۆ ئەوەی وتار لە ناو دەقی گوتاردا دابنێن. مناڵ نەك یاسا ڕێزمانیو نەحویو دەنگیەکان فێردەبێ، بەڵکو هێواش هێواش فێری سەرجەم ڕێساکانی پەیوەندیش دەبێت، ڕێساگەلێك کە تیایاندا (و بە هۆیانەوە) چالاکی ئاخاوتن مومکین دەبێت. مناڵ بە هۆی زانین و بەکارهێنانی ئەم ڕێسایانەوەیە کە دەتوانێت لەگەڵ ئەوانی دیدا پەیوەندی کامڵ ببەستێ، ئەو بەمشێوەیە واقعی دەرەکیو ئاخاوتن بە یەکەوە گرێدەدات. چالاکی ئاخاوتن، گوزارە یان ڕستەیەك بە جیهانی دەرەکی (جیهانی ئۆبژێکت و ئەو ڕوداوانەی کە دەکرێ لە ڕێی حوکمدانی دروست یان هەڵەوە باسیان بکرێ) و بە واقعی دەروونی (جیهانی ئەزمونەکانی سۆبژێکت) و بە واقعی سروشتی کۆمەڵگاوە (ژیانی کۆمەڵایەتی ئێمەو بەها هاوبەشەکانی نێوان ئێمەو ئەوانی دی) گرێدەدات.

ئێستا دەتوانین لە گرنگی زمان لە تیۆرەی چالاکی هاوپەیوەندی هابرماس، وردبینەوە. بۆ ئەم مەبەستە با جارێکی دی سەرنج لە چەمکی پێوەری ڕەخنەکاری بدەین. ئەگەر پێوەری ڕەخنەکاری پراکتیك بێت، بەو شێوەیەی کە هیگڵ و

هۆرکهایمەر پیشانیان داوە، ئەوا ئەم پێوەرە بە ناچاری بەستراو دەبێ بە چەمکی ئامانجەوە، کە دەتوانێ وەك شێوەیەك خەیاڵیو یۆتۆپیا دەرکەوێت (زۆربەی جاریش هەروا دەردەکەوێت). کەوابوو بە هۆی وێنایەك بۆ ئایندەوە، ڕەخنە لە هەلومەرجی هەنوکەیی دروستدەبێت. لە کاتێکدا هەر ئەم ڕەخنەکاریە بانگەشەی ئەوە دەکات کە خۆی بنەمای ناسینی ئێمەیە بۆ ئایندە. ئەمە ناکۆکیەکە کە لە ڕۆژگاری هیگڵەوە تا ئەمڕۆ لە بەردەم ڕەخنەگراندایە. هابرماس هەوڵدەدات بە هۆی پرۆژەی چەمکی چالاکی ئاخاوتن و بە شێوەیەکی تایبەت بە هۆی "ڕێساکانی زمانناسیەوە"، کێشەکە چارەسەر بکات. لە یەکەم قۆناغی کاری فکریدا، زمان پێبەپێی کارو دەسەڵات، یەکێکە لە ئامێرە گشتیەکان کە بە هۆیەوە ژیانی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت. چالاکی دوولایەنەو چالاکی هاوپەیوەندیش، چەمکگەلێکی گرنگن کە لەم قۆناغە سەرەتاییەدا لە بەرهەمەکانی هابرماسدا بەکارهاتوون، بەڵام بە ڕاستی گرنگی سەرەکیان لە قۆناغی دووهەمدا دۆزرایەوە. لەم قۆناغەدا بوو کە چالاکی هاوپەیوەندیو چالاکی دوولایەنە بە هاوکاری چەمکە کۆنەکانی زمان و کارەوە، وردکرانەوە. هەر شێوەیەکی کۆمەڵایەتی -کلتوری بەم چەمکە تازانە، واتە بە هۆی ئامێرەکانی پەیوەندی مرۆییەوە دەناسرێتەوە. تەنها لە چوارچێوەی پراگماتیکی گشتیدا دەتوانرێ هەموو شێوەکانی پەیوەندی (و لەمەش گرنگتر، ئەگەری لە ناوچوونی پەیوەندیەکان) بدۆزرێتەوەو ڕوون بکرێتەوە.

وەك بینیمان بناغەو ڕوانگەی هابرماس لە بارەی چالاکی هاوپەیوەندیەوە، لێکۆڵینەوە تازەکانی فەلسەفەی شیکاری زمانەو گرنگترین بناغەی ئەم باسەش "چالاکی ئاخاوتن"ە کە تیایدا گریمانەیەکی گرنگ هەیە: پەیوەندی زمانی، تەنها کاتێك دروستدەبێ کە کەسێك چالاکی ئاخاوتن ئەنجامبدات. واتە بێژەرێك یان نوسەرێك یان نوێنەرێك، گوزارەیەك بۆ وەرگرێك بنێرێو ئەم کارەش لەناو زەمینەیەکی کلتوری -کۆمەڵایەتی، سیاسی تایبەتدا ئەجامبدرێو گوزارەکەش لە چوارچێوەی ڕستە یان ڕستەگەلێکداو لە چوارچێوەی هێماگەلێکی دیاریکراوی زمانێکی تایبەتدا، پێشکەش بکرێ، هابرماس دەپرسێ کە چۆن دەکرێ لە "لادان (ئینحراف) لە باس" یان لە نەبوونی لێکتێگەیشتنی سیستیماتیك، تێبگەین؟ هەر گوزارەیەك لە چوارچێوەی گوتاردا دروستدەبێت و مانا پەیدادەکات. کام پێوەرە، دروستی گوتار یان نامومکینی تێگەیشتنی، دەستنیشان دەکات؟ چەمکی هەقیقەتی گوتار، ئێمە دەگەیەنێت بە چەمکی ئاراستەکردنی گوتار یان ئاراستەکردنی پێوەری ڕاستی گوتار. پێوەرێك کە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتەکانی گوتار، ئەو سروشتانەی کە هەمیشەو هەموو کات بە ناچار بە "ڕێکەوتنی هەموو ڕوانینەکان یان بە نێوکۆیی" (*Consensus*) ناگات، بەهەرحاڵ ڕێکەوتن و کۆبوونەوە لەسەر ڕایەك ناتوانێ پێوەری هەقیقەت بێت. ئەم

بناغەو ڕوانگەی هابرماس لە بارەی چالاکی هاوپەیوەندییەوە، لێکۆڵینەوە تازەکانی فەلسەفەی شیکاری زمانەو گرنگترین بناغەی ئەم باسەش "چالاکی ئاخاوتن"ە کە تیایدا گریمانەیەکی گرنگ هەیە: پەیوەندی زمانی، تەنها کاتێک دروستدەبێ کە کەسێک چالاکی ئاخاوتن ئەنجامبدات

پرسیارە سادەیە دەمێنێتەوە. لە کام هەلومەرجدا ڕێکەوتن هەقیقیە، واتە ڕاستە؟ ئەگەر پێوەری دەستنیشانکردنی دروست لە نادروستی، خۆی پێویستی بە ئاراستەکردنی قسەبێژێکی دیە، ئایا لەناو بازنەیەکی داخراودا گیرمان نەکردوە؟ لێرەدا هابرماس پێشنیاری ئەوە دەکات کە پەنا بۆ "هێزی بەڵگاندنی باشتر یان بەڵگەی بەهێزتر" بەرین، واتە پەنا ببرێ بۆ پێوەرێکی کاتی کە توانای تێگەیشتنی سروشتەکانی گوتار (وەك ماناناسیو نەحوی زمانی) نیە، بەڵام مەترسی کەوتنە ناو ئەو ناکۆکیانەشی لەگەڵدا نیە کە باسمانکرد. ئەم پێوەرە کاتیە، لە چوارچێوەی پراگماتیکی گشتیدا. هەر ئەوەندەی دەچینە ناو وتووێژەوە، واتە قبوڵیدەکەین کە ئەگەری ڕێکەوتن هەیە، ئەگەری گەیشتن بە هەقیقەتێك کە بە شێوەیەکی هاوبەش بێژەرو گوێگر، پێیبگەن ئەگەر ئێمە قبوڵی نەکەین کە ئەم ڕێکەوتنە مومکینە، ئەوکات نەك هەر وتوێژ بەڵکو گوتاریش بێ مانا دەبێت. دەرئەنجام ئەوەیە کە ئێمە قبوڵیدەکەین "ملکەچی لۆژیکی باشتر یان بەڵگاندنی بەهێزتر" بین. دەکرێ ئەم قبوڵکردنە بە شێوەیەکی وێنەیی، واتە لە بونیادێکی پراگماتیکی گشتیدا دەربڕین: یەکسانی ئەو کەسانەی سەرقاڵی وتوێژن، مافی یەکسان و توانای یەکسان بۆ هەر یەکێك لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی وتوێژدا. بەڵام ئەم یەکسانیە لە وتوێژدا لەو شوێنەدا مومکینە کە "یەکسانی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا" بەدەست هاتبێ. کەوابوو هەقیقەت ناتوانێ لە چەمکی چاکە (لێرەدا ئازادی، دادپەروەریو..) جیابێت. لە ڕاستیدا لە هیچ وتوێژێکدا (بەهەر شێوەیەك بچێتە پێشێ) ناتوانین لافی ئەوە لێبدەین کە هەلومەرجێکی یۆتۆپیانە ئامادەکراوە، بەڵام دەتوانرێ هەوڵ بۆ باشترکردنی هەلومەرج بدرێ. هەلومەرجە یۆتۆپیەکانی چالاکی ئاخاوتن، ئەزموونی نیە، دەکرێ ئەو هەلومەرجانە بخوازرێ یان پێشبینی بکرێ.

## ئەخلاق و پەیوەندی

بێگومان پشتبەستنی هابرماس بە عەقڵ، بیرهێنەرەوەی کانت و پەیوەستبوونێتی بە نەریتی ڕۆشنگەریەوە، بەڵام هابرماس فەلسەفەی تراسندنتاڵی کانت لە بەرامبەر عەقڵی مێژوییدا دەبینێ کە هەمیشە -بە شێوەیەکی ناچاری- پەیوەستە بە زەمینەوە. هابرماس ڕۆڵی دێرینی فەلسەفە "کە لە ناو زانستەکانی دابەشکرندا کاری دەکرد"، قبوڵناکات، ئەو لە کتێبی هوشیاری ئەخلاقیو کرداری هاوپەیوەندیدا دەنوسێ کە "سەردەمێك کانت دەورێکی مەزنی بە فەلسەفەی بەخشیبوو بۆ ئەوەی بڵێت کە لە بواری عەقڵی پراکتیکیدا چ شتێك جێگەی دەبێتەوەو لە بواری هێزی داوەریکردنیشدا چ شتێکی دی، بەڵام ئەم ڕۆڵەی دوا داوەری کلتور، چیدی لە ئەستۆی فەلسەفە نیەو فەلسەفە ناتوانێ چیدی جێگەی هەر زانستێك دیاریبکات.

بێگومان پشتبەستنی هابرماس بە عەقڵ، بیرهێنەرەوەی کانت و پەیوەستبوونێتی بە نەریتی ڕۆشنگەریەوە، بەڵام هابرماس فەلسەفەی تراسندنتاڵی کانت لە بەرامبەر عەقڵی مێژوویدا دەبینێ کە هەمیشە -بە شێوەیەکی ناچاری- پەیوەستە بە زەمینەوە

بە پێچەوانەی ریچارد رۆرتیەوە، هابرماس لەم خاڵەوە ئەو دەرئەنجامە وەرناگرێ کە دەبێ واز لە ئەقڵباوەڕی بهێنرێ: "ئەقڵ مەرجی پێویستە. بۆ هەموو شێوەیەکی مرۆڤانە لە ژیانی هاوبەشدا. ڕێسا ئەخلاقیەکان لەم ژیانە هاوبەشەوە سەرهەڵدەدەن، هەروەها ڕێساکانی ئەقڵانیەتیش.

هابرماس لە دژی کانت قسە دەکات و بەو دەرئەنجامە دەگات کە "لە ژیانی ڕۆژنەدا ئەخلاق ڕاستەوخۆ پێویستی بە فەلسەفە نیە". ئاراستەکردن و نکوڵیکردن لە ڕەوایەتیو.. لە پێویستیەکانی پراگماتیکی ژیانی ڕۆژانەوە بەدەستدێن، نەك لە ڕێسا نەمرەکانی ئەخلاقەوە. ئەم هەڵسەنگاندنە تا ڕادەیەك نزیکە لە باسەکەی جاك لاکانەوە لە وتاری "کانت لەگەڵ ساد"دا. لەو وتارەدا لاکان ئەخلاقی لەو پەیوەندیەدا هێناوەتە ئاراوە کە بە "یاسای غەریزەوە" هەیەتی و دەستنیشانکردنی ڕێسا بنەڕەتیەکانیشی لە دەرەوەی ئەستۆی فەلسەفە زانیوە. ئایا ئەم نکوڵیکردنە لە یاسای هەمەکیو. گشتگیرو گەردوونی، خۆی نکوڵیکردن نیە لە یەکێك لە بنەما یان بانگەشەکانی مۆدێرنە؟ ئایا مۆدێرنە کە "نمونەی ڕەهای تەنانەت لە زەمینەی ئەخلاقدا" لە چنگدایە، بەم دژایەتیەی هابرماس لەگەڵ کانتدا، ناچێتە ژێر پرسیارەوە؟ لە ڕاستیدا هابرماس بەو ڕەخنەیە ناگات بە هەڵوێستی پۆستمۆدێرنیستەکان، واتە بە نامومکین بوونی نمونەی ئەخلاقیو پێویستی قبوڵکردنی هەمەڕەنگی لە سروشت و شێوازەکاندا. ئەوەی باسمانکرد نیشانەیەك نیە بۆ بێ بایەخی ئەخلاق لە بیری هابرماسدا، ئەو بە نکوڵیکردنی دەسەڵاتی فەلسەفە لە بواری ئەخلاقدا، ئەخلاقی پەیوەست کردوە بە ژیانی ڕۆژانەو چالاکی دوولایەنەو ژیانگاوە. بەڵام لێرەشدا وەك بابەتی زمان، بڕوای وایە کە دەکرێ بە سروشتە هاوبەش یان هەمەکیەکان بگەین. تیۆرەی هابرماس لە بارەی کۆمەڵگاوە لە بنەڕەتدا خۆی ئەخلاقیە، واتە پێویستی بە "ئەخلاقی هاوپەیوەندیە". بەڵام ئەم ئەخلاقە "بە شێوەیەکی پێشینەیی لە چوارچێوەی بنەماو ڕێساکاندا نیە"، بەڵکو هاوتای چالاکی هاوپەیوەندی دروستدەبێت. بناغەی فەلسەفی ئەم ئەخلاقە لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان جیا نیە. کارل ئاتۆ ئاپل، بیریاری ئەڵمانیو نوسەری کتیبی بەرەو گۆڕینی فەلسەفە (*1972*) لە ڕەخنەکردنی ئەم تێڕوانینەی هابرماسدا دەنوسێ کە ئەخلاق بەهەرحاڵ لە یەك بناغەی فەلسەفیو بە وردی لە "فەلسەفەی تراسندنتاڵی بلندکەرەوە" جێگەی دەبێتەوەو وەك کانت دەریخستووە هیچ دەربازبوونێك لەمە نیە، ئاپڵ لە وتارێکدا "بابەتی پێشئەزموونی لە کۆمەڵگای هاوپەیوەندیو بنەماکانی ئەخلاق"دا کە ناونیشانی دوەمی بریتیە لە "مەسەلەی بناغەی ئەخلاق، دەکرێ سەرنج لە لایەنە کۆمەڵایەتیەکەی بدرێ. ئاپڵ پێویستی هابرماس بە هێنانە ئارای پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بە "گەڕانەوە بۆ ئەو تیۆرە فەلسەفیانە" دەزانێ "کە هێشتا

**هابرماس لە دژی کانت قسە دەکات و بەو دەرئەنجامە دەگات کە "لە ژیانی ڕۆژنەدا ئەخلاق ڕاستەوخۆ پێویستی بە فەلسەفە نیە"**

هیچ لە ڕەهەندی ترسندنتالی بیر نازانن". بە زمانی کانت واتە گەڕانەوە بۆ ئەو تیۆرانەی کە پێش ڕەخنەگرانەن، بەڵام هابرماس دەنوسێ کە لە تیۆرەی پشت ئەستور بە پراگماتیکی هەمەکیدا، دەتوانرێ (و دەبێ) کە لە نێوان چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان (کە دیارە بە شێوەیەکی ئاقڵانە قابیلی ڕونکردنەوەیە) و ڕەهەندە تراسندنتالیەکانی زیهندا، ئاشتکردنەوەیەك دروست بکرێ. کاتێك ئەو لە وتاری "پراگماتیکی گشتی چیە؟"دا باسی چوار بنەمای سەرەکی ئەقڵانیەتی دەکرد، ئاماژەی بۆ ئەم خاڵە دەکرد. ئەو دەیگوت کە هیچ گوتارێکی ئەقڵانی توانای دەرچوونی لەم بنەمایانە نیە: بنەمای هۆشیاربوون (*Verstandichkeit*) یان دەربڕینی ئەقڵانی خاڵەکان، بنەمای هەقیقەت (*Warheit*) بنەمای دادپەروەری (*Richtigkeit*) و دواجار بنەمای ڕاستی یان دروستی (*Warhaftigkeit*) ئەم ڕێسایانە دەتوانن وەك بنەماکانی ئەخلاق بوونیان هەبێت. لەهەر گوتارێکی ئەقڵانیدا بنەماگەلێکی ئەخلاقی هەیە، بێ ئەم بنەمایانە، گوتار نەدەزانرێت و نە ڕەخنە دەکرێت. ڕەوایەتی پەیوەندی جگە لە قبوڵکردنی ئەم بنەما ئەخلاقیانە مومکین نیە. ئاپل دەنوسێ کە هەمەکیو گشتی بن، بەڵام بەو شێوەیە نین، هەندێك بنەمای یۆتۆپین کە "وتوێژ تەنها لە باشترین هەلومەرجدا لەبەرچاو دەگرن". دیارە کە ئەم هەلومەرجە یۆتۆپیەی وتوێژ پەیوەستە بە بنەما ئەخلاقیەکانەوە، بەڵام مەسەلەکە لەوەدایە کە ئەو بنەمایانە لەم هەلومەرجەوە نازانرێن و ناناسرێن و لە لایەکی دیشەوە لە ژیانی ڕاستەقینەدا کە ئەوەندە جێی سەرنجی هابرماسە ئەم هەلومەرجە وەك ئاوارتنێك دەردەکەوێت، نەك وەك ڕێسایەك. لێرەوە بناغەی حوکمەکەی هابرماس ئەگەرچی بێگومان بەهایەکی تیۆری هەیە (شایستەی ناسینەو بیر دەوروژێنێ)، بەڵام لە ڕێی ڕێساکانی قیاس و ئیستقراوە بەدەست نایەن و ڕەهەندێکی پراکتیکی وەرناگرێ. وەك چۆن هایدگەر ڕەخنەی لە سۆبژێکتی بەردەوام هۆشیاری دیکارتو هوسرل گرتوەو بە هۆی نمونەگەلێك لە ژیانی سادەی ژیانی ڕۆژانەوە دەریخستوە کە سۆبژێکت بێ بیری ترانسندنتالی، بێ سەرنجدان و ناهۆشیارانە، چالاکی بەرەو پێشەوە دەبات، ئاپلیش لە ڕەخنەکردنی هابرماسدا دەریخستوە کە سوبژێکتەکانی پەیوەندی (هەردوو لایەنی وتوێژ) بە ناچار هەمیشە بە پێی بنەمای تێگەیاندن و لێکتێگەیشتن کارناکەن و هیچ وتوێژێکیش لە هەموو ساتەکانی خۆیدا یۆتۆپی و کامڵ نیە. بنەما ئەقڵانیەکانی بەڕێوەبردنی وتوێژ، هەمیشە بەکارناهێنرێن و لەو جێگەیانەشدا کە بەکاردەهێنرێن، بە ناچار بە هەقیقەت ناگەن، ئەگەرچی چەند مەرجێکم بۆ دۆزینەوە. بە کورتی ڕێسا ئەخلاقیەکان لەم چالاکیانەوە نازانرێن، تەنانەت گەر وەك هابرماسیش قبوڵیبکەین کە لەوانەوە فۆرمەڵە دەبن. ئاپل لەم ڕەخنە نوێ کانتیەی خۆیەوە بەو دەرئەنجامە دەگات کە هابرماس دواجار وەك مارکس بڕوای بە بیرۆکەیەکی سادە هەیە: ئێستا کە سەرچاوەی

هیچ گوتارێکی ئەقڵانی توانای دەرچوونی لەم بنەمایانە نیە: بنەمای هۆشیاربوون یان دەربڕینی ئەقڵانی خاڵەکان، بنەمای هەقیقەت، بنەمای دادپەروەری و دواجار بنەمای ڕاستی یان دروستی ئەم ڕێسایانە دەتوانن وەك بنەماکانی ئەخلاق بوونیان هەبێت

مەعنەویەت و ئەخلاقمان بە ژیانی مادی زانیوە، کەوابوو با بنەماکانیشیان هەر لەو ژیانەوە هەڵێنجێنین، بەڵام ئەم ژیانە مادیو کۆمەڵایەتیە، لەسەر بناغەی ئەو ئەزموونە فەردیانە ڕاوەستاون کە دەتوانن لە وتوێژدا بخرێنە بەرباس و بێگومانیش یارمەتی لێکتێگەیشتنی نێوان ئەزمونکەران دەدەن، بەڵام ناکرێ لەو توانایەوە بەو دەرئەنجامە ڕەهایە بگەین کە هەمیشە ئەزمونەکانی یەکێکی دی قابیلی تێگەیشتنە.

چەندان ساڵ پێش ئەمە تی. سی. ئەلیوتی شاعیر، لە وتارێکی فەلسەفیدا (کە زۆر کەم خوێندراوەتەوەو منیش نەمخوێندۆتەوەو لە سەرچاوەیەکی "دەستی دووهەمەوە" دەیگوێزمەوە) نووسیبووی: "یەکەم هەنگاوی ئێمە دەبێ دۆزینەوەی ئەوە بێت کە ئەزموون چی نیە و بۆچی لە بنەڕەتدا ئەزموون قابیلی پێناسکردن نیە". بە گشتی لە هەمان ئەو کاتەدا کە ڕەخنەگری شارەزا ئەمەی دەنوسی، نوسەرێکی مۆدێرنیستی دی نووسی: "ئەزموونە مرۆییەکان قابیلی پەیوەندیکردن نیەو ئەمەش هۆی سەرەکی تەنیایی ئێمەیە". گوتەی ئەلیوت و حوکمەکەی ڤێرجینیاوۆڵف، نکوڵیکردن نیە لە گرنگی وتوێژو لێکتێگەیشتن. کەم نوسەر لە سەدەی بیستدا وەك ئەم دوانە هەوڵی دا تا لە بارەی ئەزمونە مەعنەویو دەرونیەکانی خۆیەوە بڵێت و بنوسێو بە دڵنیاییشەوە کەم نوسەر وەك ئەم دوانە لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا بەوشێوەیە سەرکەوت، بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدایە کە ئەو وتوێژە، ئەو لێکتێگەیشتن و هاودڵیە، بە شێوەیەکی ڕەها بە ئەنجام ناگات و هیچ ئاشنایيەك لەگەڵ کەسێکی دیدا، کامڵ نیە. بگەڕێینەوە بۆ باسەکەی هابرماس، ئەو لە وەڵامدانەوەی ئاپلدا باسی یەك "گریمانەی پێشئەزموونی" دەکات. گریمانەیەك کە بەر لە هەر جۆرە کارو پراکتیکێك دێتە پێشەوە: مەرجی بایەخی زانستی و گەڕان بە دوای هەقیقەتی وتوێژێکدا ناتوانێ شتێك بێت جگە لەو بنەمایانەی کە ئاپڵ بە "یۆتۆپی"ی ناوناوە. ئەم بنەمایانەی گوتاری ئەقڵانی هەر ئەوەندەی بنەما ئەخلاقیو کۆتاییەکانی ئاپڵ و کانت یۆتۆپیە، بەڵام ئەم پێشگریمانەیە خۆی مانای نیە، ئەگەر وتوێژێکی نایۆتۆپی (واقعی و ناکامڵ) دروست نەبێت. ئەمەیە ڕەهەندی تراسندنتاڵی ئەخلاقی هاوپەیوەندی: وتوێژ وەك پراکتیك. ئێستا بەرلەوەی دەستبکەین بە هەڵسەنگاندنی ئەم باسە، ڕاست وایە سەرەتا لە بەهاکەی تێبگەین. هابرماس خۆی لە وتارێکدا دیدگای ئەخلاقی ئاپڵی بە "درەوشاوە" ناوبردوەو باسی "جازبیەتی مەزنی" ئەو دیدگایەی کردوە کە "خۆی لە خۆیدا ئەخلاقی هاوپەیوەندی لەناودا حەشاردراوە". لە ڕاستیدا گرنگی وتارەکەی ئاپڵ دەرخستنی "ناکۆکی" نێوان "هەقیقەت" و "ڕەهەندی کۆمەڵایەتی چالاکیە"، واتە ماوەی نێوان ڕەهەندی گشتیو لۆژیکی، لەگەڵ ڕەهەندی هاوپەیوەندیدا، بەڵام ئەم باسە ئەخلاقیە لەناو هەمان ڕەوتی باسەکەی کانتدا نیە کە فەزای ژیانی مرۆیی

"یەکەم هەنگاوی ئێمە دەبێ دۆزینەوەی ئەوە بێت کە ئەزموون چی نیە و بۆچی لە بنەڕەتدا ئەزموون قابیلی پێناسکردن نیە"

چەندان ساڵ پێش ئەمە تی. سی. ئەلیوتی شاعیر، لە وتارێکی فەلسەفیدا نووسیبووی:

بکاتە هاوڕێی ئەو یاسا یان دەستوری کارە زامنکراو و لە هەمانکاتدا سنوردارانەی ئازادی، بەڵکو ئەخلاقێکە کە پەیوەستە بە چالاکی (پراکتیکی)ەوە.

وتارەکەی ئاپل بەم ڕستە سادەو ڕاشکاوو بێ پێشەکیانە، ناوەڕۆکی مەسەلەکە دەخاتەڕوو:

"هەر کەسێك بیری لە پەیوەندی نێوان زانست و ئەخلاق لە کۆمەڵگای پیشەسازی جیهانی مۆدێرن کردۆتەوە، بە بڕوای من ڕووبەڕوی هەلومەرجێکی ناکۆکی ئامێز دەبێتەوە. لە لایەکەوە پێداویستی بە ئەخلاقێکی گشتی، واتە ئەخلاقێك کە بە شێوەیەکی ناچاری پەیوەستە بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە وەك هەمەکیەك، هەرگیز ئەوەندەی ئەم سەردەمەی ئێمە پێویست و زیندوو نەبوە، سەردەمێك کە خەسڵەتەکەی شارستانیەتیەکی جیهانیە کە خۆی بەرهەمی دەرئەنجامەکانی تەکنەلۆژیای زانستە. لە لایەکی دیەوە ئەرکی فەلسەفی بناغەی ئەقڵباوەڕی پشتئەستور بە ئەخلاقی گشتی، هەرگیز ئەوەندەی هەنوکە، واتە ڕۆژگاری (دەسەڵاتی) زانستی، ئەستەم و دوور دەست نەبوە. هۆی ئەمە ئەوەیە کە لە سەردەمی ئێمەدا زانست بۆتە هاوڕێی ئەو پێشداوەریانەی کە بە ڕووکەش وەك بیرۆکەی پەیوەندی نێوان زیهنەکان دەردەکەوێت: بە تایبەتی بیرۆکەی زانستی بێلایەن یان ڕەهەندی بابەتیو ڕەها لە بەهاکانی زانست".

پاشان ئاپل ڕونیدەکاتەوە کە ئەخلاق ناتوانێ لە پەیوەندیەکانی نێوان گروپە بچوکەکانەوە دەست پێبکات، بەڵکو ناچارە لە سەردەمی دەسەڵاتی تەکنەلۆژیای زانستدا، ئەخلاقێکی گشتی بێت و لەسەر بناغەی ڕێسا هەمەکیەکان دامەزرابێ. دیارە ئەو پلەیەی کارایی ئەخلاقی (ئەخلاقی عەمەلی) ڕێك بەو مانایەی کانت دەیهێنایە پێشێ، هەروا بەردەوام لە سنوری یەکە کۆمەڵایەتیە بچوکەکاندا دیاریدەکرێت (بۆ نمونە شێوە هەمەڕەنگەکانی ئەخلاقی جنسی لە کۆمەڵگایەك و تەنانەت لە چینێکدا)، بەڵام ئەخلاق وەك سیستەمی ڕێکخەری چالاکیو سروشتە کۆمەڵایەتیەکان، بە ناچار دەبێ لە پانتاییەکی فراوانتردا (چەندان جار گەورەتر لە نەتەوەیی) دیاری بکرێ، بەڵام "پێشداوەریەکان بەرهەمی پەرەسەندنی زانست"، ئەگەری ئەنجامدانی ئەمکارە نادەن. ئاپل نمونەیەکی بەناوبانگ دەهێنێتەوە: بۆمبی ئەتۆمی کە مانای جەنگ ( و ڕێکخەرە ئەخلاقیەکان پەیوەستن پێیانەوە) گۆڕی. نمونەیەکی دی کە ئەمڕۆ زۆر زیندوە مەسەلەکانی ئەکەلۆژیك (قەیرانی ژینگەیە). وردبوونەوە لەم دوو نمونەیە بەسە بۆ ئەوەی ئاشکرابێت کە دەرئەنجامەکانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو زانست "هەڕەشەیەکی ئەخلاقیە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی". شارستانێتیی زانستیو تەکنیکی، کێشەگەلێکی دروستکردوە کە سنوری نەتەوەو کلتورو ڕەگەزەکانی بڕیوەو بۆ یەکەمجار مرۆڤ ناچار بوە بەرپرسیارێتی کۆیی لە بەرامبەر دەرئەنجامەکانی

ئاپل ڕونیدەکاتەوە کە ئەخلاق ناتوانێ لە پەیوەندیەکانی نێوان گروپە بچوکەکانەوە دەست پێبکات، بەڵکو ناچارە لە سەردەمی دەسەڵاتی تەکنەلۆژیای زانستدا، ئەخلاقێکی گشتی بێت و لەسەر بناغەی ڕێسا هەمەکیەکان دامەزرابێ

چالاکیەکانی خۆی لە پانتایی جیهانیدا، قبوڵبکات. ئەم گشتیبوون و هەمەکیبوونە، هێشتا لە پەیوەندی نێوان تاکەکانەوە، واتە لە پەیوەندیە نێوان زیهنەکانەوە بەدەست نەهاتووە، کەوابوو نەگەیشتوە بە بناغەی ڕێسا ئەخلاقیەکان. لەبەرئەوەی کە پەیوەندی نێوان زیهنەکان خۆی بەستراون بە پێشداوەریەکانی بابەتیبوونی زانستیەوەو لە پانتایی زانستە وێنەیی -لۆژیکی- ماتماتیکیەکاندا، جێگەیان بۆتەوە، بەڵام ڕێسا ئەخلاقیەکان کە لە قیاس و ئیستقرارەوە بەدەستدێن، کاراییان نیە. لێرەوەیە کە ئاپڵ بناغەی ڕێسا ئەخلاقیەکان (ئەخلاقی هاوپەیوەندی) ئەگەر بیانەوێت کە لە پانتایی "زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا" بەکاربێن و هەر لەو پانتایشەوە هەڵێنجێنرێن، بە نامومکین دەزانێ: "ئەخلاقی جێی بایەخی گشتی، واتە ئەخلاقێکی کۆمەڵایەتی یان نێوان زیهنەکان کە بەسترابێت بە بەرپرسیارێتیەکی نێوکۆییەوە، هەم پێویستەو هەم ناموومکینە". ئاپڵ ئاماژە بۆ فینگشتاین دەکات: "ئەم باوکەی بیری پۆزەتیڤیزمی نوێ لە وتاری لۆژیکی- فەلسەفیدا پاش ئەوەی سەرەتا ئیمکانی گوزارە ماناادارەکان لە بواری زانستە سروشتیەکاندا، سنوردار دەکات، لە پارچەی *6042*دا دەنوسێ: لێرەوە هیچ گوزارەیەکی ئەخلاقی -ئینتیکیش ناتوانێ بوونی هەبێت. گوزارەکان ناتوانن هیچ شتێکی باڵاتر دەرببڕن". ئاپڵ دەنوسێ کە فینگشتاین لە نامەیەکدا بۆ لۆدڤیك فون فیکر لە *1919*دا، سەرجەم وتاری لۆژیکی -فەلسەفی *(1921)*ی بەم شێوەیە پێناسکردوە:

"مانای ئەم کتێبە ئەخلاقیە. سەردەمێك دەمویست خاڵێك بۆ پێشەکیەکەی زیادبکەم کە ئەم کتێبە لە دوو بەش پێکهاتوە، یەکێکیان ئەو بەشەی کە لێرەدا ناسێنراوەو ئەوی دیشیان ئەو بەشەی کە هێشتا هیچم لێ نەنوسیوە و ئەم بەشەی دووهەمیشە کە گرنگە.. دڵنیام کە بە بێدەنگ مانەوەی، شتێکم پێناسکردوە کە ئەمڕۆ خەڵکێکی زۆر لە بارەیەوە درێژدادڕی دەکەن".

ئاپل لێکچونێك لە نێوان ئەم بێدەنگیەی فینگشتاین لە بواری ئەخلاقداو چەمکەکانی فەلسەفەی بوونی کێرکجۆردو کارل باسپرسدا، دەدۆزێتەوە؟

هابرماس لە وتارێکدا "پاداشتێکی وروژێنەر لە بارەی بناغەی ئەقڵانی ئەخلاق" کە وەك بەشی سێهەمی کتێبی هۆشیاری ئەخلاقیو کرداری هاوپەیوەندی چاپکراوە، لە بارەی ئەو شتەوە کە خۆی ناوی دەنێ ئەخلاقی باس (*Diskursethik*)، نوسیوێتی، پێشتر لە فەسڵی دووهەمی کتێبەکەدا، واتە لە "تیۆرەی ئەخلاقی هاوپەیوەندی"دا تێگەیشتن لە ئەقڵانیەتی چالاکی هاوپەیوەندیی بەستبۆوە بە تێگەیشتن لە گوتاری پشتئەستور بە بەڵگاندن. ئەو هەر لەم باسەدا چەمکی گوتار یان لۆژیکی کۆتایی ماناناسیانە کە لە ناوجەرگەی ئەو گوزارانەدا هەن و بە مانا (یان ڕاڤەکردن) دەژمێرێن، تا ئاستی وتوێژ، بەرزکردبۆوە، بە پێی ئەم باسە دەکرێت

ئاپل لێکچوونێك لە نێوان ئەم بێدەنگیەی فینگشتاین لە بواری ئەخلاقداو
چەمکەکانی فەلسەفەی بوونی کێرکجۆردو کارل باسپرسدا، دەدۆزێتەوە؟

لایەنگری هێرمۆنتیکی زانستە مرۆییەکانە، بەڵام سەرقاڵی سەرەکی بونیادنانی "پایەیەکی ئەخلاقیە" بۆ ئەم زانستانە. مەبەستی لەم پایە ئەخلاقیە بەر لەوەی ڕێساو سروشتە هەمەکیەکان بێت، شێوازێکە کە بتوانێ یارمەتی وردکردنەوەی مەبەستەکان بدات. ئەم وەسوەسەیە لە کتێبی گرنگی لۆژیکی زانستە مرۆییەکان بە دواوە، لە هەموو بەرهەمەکانیدا دەرکەوتوە: زانستی مرۆیی وەك پەرەسەندنی ئەخلاق.

لە کۆتایی ئەم باسەدا خراپ نیە ئاماژە بۆ ڕەخنەی یەکێك لە گرنگترین بیریارانی قوتابخانەی هێرمۆنتیك، لە تیۆرەکەی هابرماس لە بواری ئەخلاقدا بکەم. پۆڵ ریکۆر لە کتێبی خود وەك ئەوی دی *(1990)* ڕەخنەی لە دژایەتیەك لە ڕوانگەی هابرماسدا بۆ "ئەخلاقی هاوپەیوەندی" گرتوە. سروشتەکان و ڕێساکانی چالاکی هاوپەیوەندی لە ڕوانگەی ئەخلاقەوە بە ڕێکخەرێك هەڵدەسەنگێنرێ‌و قبوڵ و ئاراستە دەکرێ (و یان ڕەد دەکرێتەوە) کە خۆی لە پراکتیکی پەیوەندیەوە بەدەستهاتوە. هەر لەبەرئەمەش لێرەدا ئەخلاق کورت دەبێتەوە بۆ زەمینەی پراکتیك و پەیوەندی. ریکۆر کە جەخت لەسەر بنەمای کانتی پێویستی سەربەخۆی ڕێکخەرەکان دەکات، لەگەڵ "سەربەخۆیی چارەنوسسازی" فەسڵی سێهەمی کتیبەکەی هابرماسدا واتە "لە بارەی بناغەی ئەقڵانی باس"دا نیە، ئەم "پراگماتیکەی بە شێوەیەکی وێنەیی دەربڕاوە" هەمیشە دەکەویە داوی دژایەتیەوە.

پۆڵ ریکۆر لە کتێبی خود وەك ئەوی دی *(1990)* ڕەخنەی لە دژایەتیەك لە ڕوانگەی هابرماسدا بۆ "ئەخلاقی هاوپەیوەندی" گرتوە.

## بواری گشتی

ئێستا بەرلەوەی کە لە چالاکی هاوپەیوەندی‌و ئەخلاقی هاوپەیوەندیەوە بگەین بە مەسەلەی گرنگی سیاسەت وەك پراکتیك، دەبێ بۆ باسەکەمان لەسەر چەمکێکی تیۆری گرنگ لە بیری هابرماسدا، ڕابوەستین. ئەم چەمکە ناچارمان دەکات تا لە دوا بەرهەمەکانی هابرماسەوە کە جێگەی باسمان بوە، بگەڕێینەوە بۆ کارە سەرەتاییەکانی ئەو. چەمکی جێی باس *(Offentlichkeit)*ە (بە ئینگلیزی ***Public Sphere***ە) کە من بە "بواری گشتی" یان "فەزای گشتی" وەرمگێڕاوە. باسەکەی هابرماس لە یەکەم کتێبیدا واتە لە گۆڕانی بونیادیی لە بواری گشتیدا هاتوە. کتێبەکە کە لە ساڵی *1962* چاپکراوە، پاکنووسی دەقی نامەی زانکۆی هابرماسە کە بە ڕێنمایی ولفانگ ئابندۆرس ئامادەکراوە.

هابرماس باسی بوار یان فەزایەکی کۆمەڵایەتی دەکات کە لە نێوان "دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا ڕادەوەستێ" و کارکردنی چالاکی کۆمەڵایەتی ئەم بوارە بەستراوە بە جیاوازی درزی نێوان ئەو دوانەوە. ئەم بوارە کۆمەڵێك چالاکی‌و خەسڵەتی کلتوریە کە دیارە خاوەن دەورێکی تایبەتی سیاسی، کۆمەڵایەتی‌و تەنانەت ئابوریشن. ئەم کارکردنانە ڕەهەندێکی گشتیان هەیە کە لە باشترین حاڵەتدا لە دەست دەسەڵاتی

هێزو دەزگـا دەوڵەتیـەکان، سـەربەخۆو پـارێزراون. لەهـەمانکاتدا دەزگاکـانی بـواری گشـتی خـاوەن "ئـەو سـەربەخۆییەی ژیـانی شەخسـیو تایبەتیـە نـین کـە تایبـەتی کۆمـەڵگای مـەدەنین". بـواری گشـتی فـەزای ڕادەربڕیـن (و بـە شـێوەیەکی یۆتۆپـی ڕادەربڕینی ئازادانە)، وتوێژو باس و دۆزینەوەی ڕێگەچارەیە لە مەسەلە گشتیەکاندا. هەموو کەسێك بە زەبر، ماف و دەسەڵاتی بەشداریکردنی لەم فەزایەدا هەیەو دیسان بە شێوەیەکی تیۆرىو یۆتۆپی، هـی کـەس لـەم فەزایـەدا لـەوی دی ئیمتیـازی زیـاتر نیە. هەلومـەرجێکی وا کـە دەوری دەوڵـەتداران یـان سـەرمایەدارو دەسـەڵاتداران دەکاتـە هاوتـای دەوری "هاوڵاتیـانی ئاسـایی"، تەنـها لەسـەر هـەمان درزی نێـوان دەزگـا سیاسیەکان و کۆمـەڵگای مـەدەنی ڕاوەسـتاوە. باسـەکەی هابرمـاس بـە شـێوەیەکی تایبـەتی لـە بـارەی بـواری گشـتی بـۆرژوازی یـان مۆدێرنەوەیـە کـە "لـە ڕوانگـەی مێژووییەوە لەسەر ناکۆکیەك ڕاوەستاوە کە کۆمەڵگای مەدەنیو دەوڵەت لە بەرامبەر یـەکدا دادەنێـت". لـە ڕووی تیۆریـەوە دەکرێ بوتـرێ کـە لـە چوارچێـوە ئـابوری-کۆمەڵایەتیەکانی پێشوشدا ئەم فەزا سەربەخۆیە تا ڕادەیەك هەبوە. هابرماس لە یەکەم فەسڵی کتێبەکەیداو بە پێی پێویست هەندێکجار ئاماژەی بۆ هەندێك نمونە کردوە. بۆ نمونە باسی ئەو "بوارە گشتیەی کردوە کە لەسەر بناغەی نوێنەرایەتی میرەکان یان شاکان لـە ڕۆژگاری فیۆدالیزمدا دامـەزرابوو". بـەڵام شـێوەی کـامڵی بـواری گشـتی، بەرهەمی ئـەم سـەدانەی دواییە کـە لـە ئینگلـتراو فەرانسـاو ئـەڵمانیاو ئـەو وڵاتانـەدا دروستبوە کە تیایاندا ڕەهـەندی بەرهەمهێنانی کاڵایی پـەرەی دەسـەندو پەیوەندیـە کۆمەڵایەتیـەکانی سـەرمایەداری، کـامڵدەبوو. لـە کتێبەکـەی هابرماسـدا زۆرتـر لێکۆڵینەوەکە لەسەر ژیانی کلتوریو کۆمەڵایەتی سێ وڵات چڕبۆتـەوە کە لە سەرەوە ناومان هێنان، دەزگاکانی بواری گشتی بۆرژوازی لە لایەن تاکەکانەوە دروستکراوە نەك لە لایەن دەوڵەتەکانەوە. هەرچەندە لە ڕووی ڕوانگەی مێژووییەوە هەمیشەو لە هەموو حاڵەتێکدا ناتوانرێ باسی ڕووبەڕووبونەوەی بواری گشتیو دەوڵـەت بکرێت، و لـە هـەندێك حاڵـەتی-نـەك هێنـدە زۆردا- دەوڵەتـەکان بـە پێـی پێویسـتیەکان یـان پێداویستیەکان یان بەرژەوەندیەکان، یارمـەتی پەرەسـەندنی فـەزای سیاسـی کـراوەو ئیمکانی وتوێژ لە بواری گشـتیاندا، داوە. بەهـەرحاڵ ئـەم خاڵـە گرنگـە جێگەیـەکی ناوەندی هەیـە کـە دەزگاکـانی بـواری گشـتی لـە بنـەڕەتدا کلتوریـین و لـە نێـوان بەرژەوەندیـــە تایبەتیـــەکان و دەســـەڵاتی گشـــتیدا، فەزایـــەکی تایبـــەت بـــە خۆیان دروستکردوە.

بڵاوکراوەو ڕۆژنامـەکان گرنگترین دەوریـان لـە بـواری گشـتیدا هـەبوە. هابرمـاس باسی ئەم دەورەی لە باسێکی کورت بەڵام ورددا کردوە. ئەو دەریخستوە کە بە پێی بەرژەوەندیە ئابوریەکان (پێویستی پڕوپاگەندەو ناساندنی کاڵاو خزمەتەکان) چەنـد

دەزگاکانی بواری گشتی لە بنەڕەتدا کلتوریین و لە نێوان بەرژەوەندیە تایبەتیەکان و دەسەڵاتی گشتیدا، فەزایەکی تایبەت بە خۆیان دروستکردوە

بڵاوکراوەیەك -بە تایبەتی لە ئینگلترا- دروستبوون کە زۆر زوو وەزیفەی تایبەتی خۆیان وەرگرت. جگە لە بڵاوکراوەکان دەکرێ باسی کۆمەڵێ دەزگای تر بکرێ وەك یانەکان، ئەنجومەنە کلتوریەکان، ڕێکخراوەکان کە لەسەر بناغەی بەرگریکردن لە مافی گروپە خوێندەوارەکان دروست دەبوون و بە خێرایی‌و ئازادی ڕادەربڕینیان لەناو دەستوری کاری خۆیاندا دەدۆزیەوەو تیایاندا "هەلومەرجێکی کلتوری جیاواز خۆی ئاشکرا دەکرد"و هەروەها یەکەکانی بڵاوکردنەوە، قوتابخانە تایبەتیەکان و.. هەموو ئەمانە دەزگا گەلێك بوون کە لە سەرەتای بواری گشتی مۆدێرندا دەورێکی کاریگەرو گرنگیان لە ئەستۆدا بوو".

دەوری سەربەخۆی دەزگاکانی بواری گشتی بە مانای وردو کامڵی خۆی بەرهەمی کلتوری ڕۆشنگەری سەدەی هەژدەهەمە. واتا ئەو کاتەی کە باسی ڕەخنەگرانە لە بارەی "بیروڕای گشتیەوە" دەستپێکردو بیروڕای تاك و "بیروڕای گشتی" یان ئەوەی بە ڕای گشتی دەزانرێت، نابێ ببێتە هۆی سەرکوتکردنی ئازادی باوەڕو ڕادەربڕین. پێشنیارە سەرەکیەکانی ئەم ئازادیە بەمشێوەیە بوو: باوەڕ، هەرچەند ناکۆك بێت لەگەڵ بیروباوەڕی گشتیدا، بەرهەمی "ژیانی کۆمەڵایەتی و کلتوریی ئەمڕۆ"یەو ناتوانێ لە داوی بەها باڵادەستە کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی، دینی‌و سیاسیەکان، ڕزگاری بێت. گوێگرتن لە بیروڕاکانی تازە تا ڕادەیەك وەك گوێگرتنە لە سەدایەکی دی. ڕاستە کە بیروڕای هەموان بەرزتر لە خواست و پێداویستی‌و ئارەزوو و باوەڕە فەردیەکانە، بەڵام ناکرێ بە ناویەوە قبوڵی سەرکوتکردنی بیروڕا فەردیەکان بکرێ، بەڵکو دەبێ بەهاگوزاری بکرێن و هەڵسەنگێنرێن. ئەم خواستە حەماسیەی ئازادی دەربڕین کە ڕۆشنگەران هەریەکەیان بە شێوازێك و تا ڕادەیەك لایەنگریبوون و بانگەشەیان بۆ دەکرد، بوە هۆی دروستبوونی لۆژیکێکی تازە: لۆژیکی گفتوگۆ لە سنوری دەزگاکانی بواری گشتیدا. هابرماس گوتوێتی کە تا سەدەی هەژدە وشەی *Publique* بە مانای وەرگر بوو. خوێنەری کتێب و بڵاوکراوەکان، سەیرکەرو بیسەری بەرهەمە هونەریەکان، بە "پۆبلیك" دەژمێرران و لە ڕاستیدا ئەم وشەیە بە مانای "مەسرەفکەری کلتور" دەهات، بەڵام لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا وشەکە بە مانایەك بەکارهات کە تا ئەمڕۆش هەر هەمان مانای هەیە: هەموان، یان "زۆربەی خەڵك".

ئاڵۆزی باسکردنی فەزا یان بواری گشتی لێرەدایە کە هەرچەند لە سنوری پێناسی سەرەتاو دەستپێکردنی لێکۆڵینەوەدا، باسی کارکردنی دەزگاکان دەکەین، بەڵام فەزای گشتی تەنها کۆمەڵێك دەزگا نیە. چالاکی تاك لە ڕادەربڕین لە شوێنی کاردا، یان لە چوارچێوەی پەروەردەدا، یان لە نێوان هاوڕێیان و ئەندامانی خێزاندا، چرکەیەکە لە بواری گشتی. ئەم خاڵە بە تایبەتی کاتێك ئاشکرا دەبێت کە هەوڵبدەین ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتی‌و گشتی بە بیروڕاکانمان بدەین. بواری گشتی زنجیرەیەکە لە شێوەکانی

چالاکی تاك لە ڕادەربڕین لە شوێنی کاردا، یان لە چوارچێوەی پەروەردەدا، یان لە نێوان هاوڕێیان و ئەندامانی خێزاندا، چرکەیەکە لە بواری گشتی

"چالاکی هاوپەیوەندی" کە هەرچەندە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا شێوەیەکی دەزگایی بەخۆیەوە دەگرێ، بەڵام لە هەندێك حاڵەتی گرنگی تردا وا نین. ناکرێ "بیروڕای گشتی" کورت بکرێتەوە بۆ دەزگاکانی بواری گشتی، هەرچەندە کۆی کارکردنەکان بە گرنگترین ڕەگەزە دەستنیشانکەرەکانی بیروڕای گشتی دەژمێرێت. یەکێك لە بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، فردریش پۆلۆك لە ساڵی *1955*دا وتارێکی بڵاوکردەوە بە ناوی "لێکۆڵینەوەی ئەزموونی بیروڕای گشتی". ئەو لەم وتارەدا گرنگی "شێوازە تازەکانی ئیستنتاجی بیروڕای گشتی" خستە ژێر باسەوە. ئەو تا ڕادەیەك چەمکی مۆدێرنی بیروڕای گشتی بە قابیلی بەراوردکردن دەزانی لەگەڵ چەمکی "ئیرادی گشتیدا" کە ڕۆسۆ بە بەرزتر لە "ئیرادەی کۆی تاکەکانی کۆمەڵگا" پێناسی کردبوو. پۆلۆك بیروڕای گشتی بە "جەوهەری ڕۆحی ئۆبژێکتیڤ" زانی کە ڕەنگدانەوەی "پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و نەخشەی دەسەڵات و تەنانەت شێوەکانی هۆشیاریشە". هابرماس بە پێناسکردنێکی چوونیەك، بیروڕای گشتی کورت نەکردەوە بۆ کارکردنی دەزگا کلتوریەکان (لەوانەش کارکردنی دەزگاکانی بواری گشتی). ئەو جەختی لەو خاڵە کرد فەزای گشتی کە لە نێوان ژیانی تایبەتیو ژیانی گشتیدا دروستکەری بیرە، بایەخێکی تایبەتی هەیە: لێرەدا گوتاری عەقڵانی لە بارەی کلتورەوە دروستدەبێ، کەوابوو دەتوانرێ بگوترێ کە ئەم فەزایە "بواری دەسەڵاتی گشتیە". چەمکی دەسەڵات لە سنوری گوتاری سیاسیدا دێتە پێشێ. هابرماس لە وتاری "زانستبوونی سیاسەت/ بیروڕای گشتی" باسی نمونەیەکی کردوە، نمونەی "زانستیبوونی سیاسەت یان پرۆسەی گۆڕانی سیاسەت بۆ زانست" کە سیاسەت دەکاتە بوارێکی پسپۆڕیو دوور لە دەستی هەموان ڕایدەگرێ و بە مانای وردی وشەکە لە حوکمی "سیاسەت داماڵینە لە بیروڕای گشتی". لە ڕاستیدا سەردەمانێك بواری گشتی بە مانای سیاسیبوونی هۆشیاری بوەو هەنوکە لەو "هەلومەرجی بواری سیاسیە" دوورکەوتۆتەوە.

پێبەپێی ئاڵۆزتربوونی شێوەکانی بەرهەمهێنان و پەرەسەندنی تەکنیك، دەزگاگەلێکی تازە لەسەر بناغەی کارکردنی کلتوری تازە، دەرکەوتوون. پەرەسەندنی هۆیەکانی پەیوەندی، تازەو ڕاگەیاندنی گشتی کە هاوکات بوو لەگەڵ پەرەسەندنی خوێندەواریدا (فراوانبوونی خوێنەران، کتێبەکان، بڵاوکراوەکان، دەرکەوتنی بڵاوکراوە پۆسپۆڕیەکان، فراوانی کاری دەزگاکانی زانکۆو پەروەردەو..) لە ڕووی لۆژیکیەوە دەبوو سەنگینی و بایەخێکی تایبەتی بە بواری گشتی بدەن. یەکێك لە ئامانجە گرنگەکانی کتێبەکەی هابرماس دۆزینەوەی وەڵامێکە بۆ ئەم پرسیارە: بۆچی وانەبوو؟ باسکردنی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی جێگەیەکی تایبەتی لە کتێبەکەدا هەیە (پارچەی بیستەم لە فەسڵی شەشەمی کتێبەکە لە بارەی بڵاوکراوەکان، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی، مەسەلەکانی پڕوپاگەندە یان "کارکردنی تازەی بواری

پەرەسەندنی هۆیەکانی پەیوەندی، تازەو ڕاگەیاندنی گشتی کە هاوکات بوو لەگەڵ پەرەسەندنی خوێندەواریدا، لە ڕووی لۆژیکیەوە دەبوو سەنگینی و بایەخێکی تایبەتی بە بواری گشتی بدەن

گشتی"ە). دیارە لەم ساڵانەی دواییدا بە تایبەتی پاش "شۆڕشی ئەنفۆرماتیك" لێکۆڵینەوەی گرنگ لەم زەمینەیەدا هاتۆتە پێشێو باسەکە لە کتێبی هابرماس بەرەو پێشتر چوە. ئەو خۆی لە وتارێکدا کە لە ساڵی *1989*دا چاپیکرد، باسی ئەم خاڵەی کرد.

لاوازیو لە ناوچوونی دەسەڵاتی بواری گشتی لەم سەدەیەی دواییدا، خاڵێکی زۆر گرنگە لە باسەکەی هابرماسدا. لە کۆتایی سەدەی هەژدەداو سەرجەم سەدەی نۆزدەدا بە هۆی دەسەڵاتی سیاسیو ململانێی فراکسیۆنەکانی بۆرژوازییەوە، فەزای گشتی دەسەڵات و گرنگیەکی زۆری هەبوو. لە لایەکەوە ڕوبەڕووبوونەوەی سیاسی (لەسەر بناغەی بەرنامەی جیاواز)ی ئەم فراکسیۆنانەو لە لایەکی دیەوە خەباتی بەشێك لە چینی کرێکار کە لەسەر تەختی خەباتی دیموکراتی بەرەو پێش دەچوو، زامنی دەسەڵاتی بواری گشتی دەکرد. دەکرێ لە هەندێك لە نوسینەکانی مارکسەوە ئەو دەرئەنجامە وەربگیرێ کە ئەو بڕوای وابوو فراکسیۆنەکانی چینی فەرمانڕەوا لە ڕێی کارکردنی سیاسیانەوە دەناسرێن و پێناسەدەکرێن. بۆ نمونە مارکس لە وتاری "توریەکان و ڤیگەکان"دا (نوتی *1852*) نوسیویێتی کە "ڤیگەکان وەك توریەکان فراکسیۆنێك لە مولکدارە گەورەکان پێکدەهێنن". بەهەرحاڵ ڕەوایەتیو سەلاحیەتی بڕیارە دەولەتیەکان پێویستی بە "لێکۆڵینەوەیەکی فراوان" بوو کە نەیدەتوانی کورتبێتەوە بۆ پەرلەمان. ئەم بڕیارانە دەبوو بخرێنە بەر تاقیکردنەوەی وتوێژو قبوڵکردنی "خەڵکی". لێرەوە ڕادەربڕینی ئازادانەو ڕەخنەگرانە، دەبوو مومکین بێت، هەرچەندە ئەم ئازادیە بە هیچ شێوەیەك کاڵ و دوور لە دەستدرێژیکردن نەبوو، بەڵام لە ناوخۆیدا ناوەڕۆکێکی "ڕەخنەگرانەی" پەروەردە دەکرد. لەگەڵ پەرەسەندنی سەرمایەدار پیشەسازیدا، بەرژەوەندی بەشەکان یان فراکسیۆنەکانی بۆرژوازی چونیەکتر بوو، فراکسیۆنەکانیش ململانێکەیان کورت کردەوە بۆ تاقیکردنەوەی بەرنامەکان لە سنوری دەزگا "یاساییەکان"دا (بە تایبەتی پەرلەمان). دەزگاکانی بواری گشتی -بە تایبەتی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی- کارکردنێکی "ناسیاسی"و دواجار "هەلومەرجێکی ڕاوێژکاریان"، وەرگرت. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بواری گشتی تەنها بوە "ڕەنگدانەوە" و تەبێژی تێڕوانینەکانی حیزبە سیاسیەکان کە لە سنوری دەزگا یاساییەکاندا چالاکیان دەنواند. حیزبەکان بە ناوی "ڕای گشتی" یان "خواستی گشتی"ەوە لە قۆناغی تایبەتدا -هەڵبژاردن یان قەیرانە سیاسیەکاندا- سودیان لە دەزگاکانی بواری گشتی وەردەگرت. هابرماس نوسیویێتی کە "لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا بیروڕای ناگشتی نابن بە بیروڕای گشتی، مەگەر ئەوکاتە نەبێت کە حیزبەکان ئەو بیروڕایانە دووبارە فۆرمەلە بکەنەوە".

لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بواری گشتی تەنها بوە "ڕەنگدانەوە" و تەبێژی تێڕوانینەکانی حیزبە سیاسیەکان کە لە سنوری دەزگا یاسایەکاندا چالاکیان دەنواند.

لە لایەکی دیەوە پرۆسەی ئینفیعالی بواری گشتی، هاوکات بوو لەگەڵ دەستتێوەردانی ڕوو لە زیادی دەوڵەت لە بەرهەمهێناندا، وتوێژەکانی پەرلەمان زۆرتر ڕەهەندێکی "تەکنیکی" بە خۆیەوە گرت. لە ڕاشکاوی دەربڕینی سیاسیو لێکۆڵینەوە لە بونیادەکانی بیروڕا، کەمبۆوە. بواری گشتیش یان بۆ ئاراستەکردنی چالاکیەکان و بەرنامەکانی دەوڵەت لە زەمینەی ژیانی ڕۆژانەدا بەکارهات، یان لە سەردەمی قەیرانەکان و بە تایبەتی جەنگەکاندا بە شێوەیەکی ئاشکرا سنوری کارەکانی بە تەواوی سنوردار بوو (نمونە: هەلومەرجی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا لە جەنگی کەنداودا لە ساڵی *1991*دا). دەکرێ وەك ڕەوتێکی درێژخایەن و مێژوویی ئەوە ببینرێ کە لەم سەدەیەدا (واتە سەدەی بیست) لە توندی ڕوبەڕوبوونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی کەمبۆتەوەو کارکردنی بواری گشتی کە لەسەر بناغەی ئەو ڕوبەڕوبوونەوەیە دامەزرابوو، گۆڕانی بەسەردا هات.

هابرماس لەم ئاستەدا باسی "دووبارە فیوداڵبوونەوەی بواری گشتی" کردوە. ئامانجەکەی بۆ کارکردنی سنووردارو کۆنترۆڵکراو و ناسیاسی، فەزای گشتیە. کارکردنێك کە بەر لە پەیدابوونی بواری گشتی بۆرژوازی، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، هەبوو. دەکرێ بگوترێ کە لە ڕۆژگاری ئێمەدا چاودێریکردنی تەکنەلۆژی (لەسەر بناغەی تەکنیك یان نەخشەیەك کە دەبێ جێبەجێ بێت) هاوپەیوەندی پراکتیکی (چالاکی دوولایەنە یان پەیوەندی لەسەر بناغەی وتوێژو دۆزینەوەی ڕێگەچارە)ی تێکشاندووە. هەنوکە خاڵێکی گرنگ لە پێشماندایە: ئایا چالاکی هاوپەیوەندی یان چالاکی دوولایەنە توانای سەرلەنوێ بونیادنانەوەی بواری گشتی هەیە؟ هابرماس لە دوا نوسینەکانیدا پیشانیداوە کە ئەم پرسیارە تەنها سیاسی نیە، بەڵکو لە جەوهەری خۆیدا پرسیارێکی ئەخلاقیە.

بونیادنانەوەی ئەم وشەیە دەربڕی بیرۆکەیەکە کە پەیوەندی بە سەرجەم بیری فەلسەفیو سیاسی -ئەخلاقی هابرماسەوە هەیە. کاتێك کە ئەو باسی "پێویستی پێشخستنی پرۆژەی ناتەواوی مۆدێرنە" دەکات، نەریتی ڕەخنەگرانەی ڕۆشنگەری درێژە پێدەدات. وشەی بونیاد لە کتێبی گۆڕانی بونیادی بواری گشتیدا زۆرتر "هەلومەرجێکی مێژوویی" دەکات کە "قابیلی گۆڕانە". ئەو دەریخست کە بونیادی هەبووی بواری گشتی -بەستراوە بە پەرەسەندنی سیاسی لەسەر زەمینەی چوارچێوەیەکی تایبەت- هەنوکە تەنها هەقیقەتێکی کۆمەڵناسیانەیەو ناتوانرێ بە بنەما دابنرێت.

هابرماس لەم ئاستەدا باسی "دووبارە فیوداڵبوونەوەی بواری گشتی" کردوە. ئامانجەکەی بۆ کارکردنی سنووردارو کۆنترۆڵکراو و ناسیاسی، فەزای گشتیە. کارکردنێك کە بەر لە پەیدابوونی بواری گشتی بۆرژوازی، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، هەبوو

# سیاسەت وەك چالاكی هاوپەیوەندی

بـواری گشـتی لەسـەر بناغـەی ئـازادی بـیروڕا، ئـازادی ڕادەربڕیـن، لێکۆڵینـەوەو قبوڵکردنـی لۆژیکـی وتوێـژ، دامـەزراوە. هـەموو ئەمانـە کـەم تـا زۆر لـە کۆمـەڵگای مۆدێرندا بەدەستهاتوون (نەك بە ئاسانی، نەك بە شێوەیەكی كامڵ و هەروەها نەك بەو مانایەی كە چیدی مەترسیان لەسەر نیە). بەهەرحاڵ ئەم بونیادە دیموکراتیانە، بە خواستی ڕەوا دەزانرێن و هـەروەها لـە گرنگترین پێوەرەكانی ڕەوایـەتیو سـەلاحیەتی سیاسین. هابرماس كارەكەی خۆی بە ناسینی ئەو بوار یان فەزایە دەزانێ كە ئازادیو ڕەوازانی تیا ڕەچاو دەكرێ. كاری هابرماس لـە دۆزینـەوەی "پەرەسەندنی بونیادی بواری گشتی" تا ڕادەیەك لە كای هانا ئارنێت دەچێت. ئارنێت لە كتێبی هەلومەرجی مرۆییدا باسی بوارێكی كردوە كە تیایدا لیكۆڵینەوەی ئەقڵانیو ڕەخنەگرانە بـەرەو پێشەوە دەچێت، نمونەی ئارنێت دەوڵەت -شاری یۆنانی كلاسیك بوو، وە تا ڕادەیەك ئەو دەرئەنجامەی وەردەگرت كە بواری گشتی لـە "باشترین شێوەی خۆیدا" لەگـەڵ دەوڵەتدا دەبێت بە یەك شت، دەوڵـەتێك كە هیچ درزێك لـە كۆمـەڵگای جیا ناكاتـەوە. ڕونكردنـەوەی هابرمـاس بـۆ گۆڕانـە مێژوویـیـەكانی چـەمكی سیاسـەت (و دواجـار باسەكەی ئەو، لە بارەی چالاكی هاوپـەیوەندیو بواری گشتی) چەندان لێكچونێكی لەگەڵ باسەكەی ئارنێتدا هەیە، بەڵام لە خاڵێكی گرنگدا لێی جیادەبێتـەوە: هابرماس دەوڵەت -شاری یۆنانی بە شێوەیەكی یۆتۆپی ژیانی سیاسی نازانێ. هانا ئارنێت لە وتارێكدا لە بارەی ڤالتەر بنیامینـەوە نوسیوێتی: "*Polis* یـان دەوڵـەت -شاری یۆنانی درێژە بە بوونی خـۆی لـەناو قوڵایـی ژیـانی سیاسـیدا دەدات، واتـە لـە قوڵایـی ئـەم دەریایەدا. تا ئەوكاتەی ئێمە وشـەی *Poloitque* بە مانـای سیاسـەت بەكاردەهێنین، ئەو بوونە درێژە بە خۆی دەدات". لـەم ڕوانگەیـەدا هیچ جۆرە سۆزێكی شاعیرانە بوونـی نیە، بـەڵكو ڕاشـكاوترین شـێوەی دەربڕینـی تـێڕوانینی هەمـەكی ئارنێتـە لـە بـارەی فعلیەتی بیرۆكەی یۆنانی ئازادی سیاسی، بەڵام هابرماس ئەگەرچی گرنگی گوتاری سیاسی یۆنانی كلاسیك قبوڵدەكات، لە "نمونەی مۆدێرنی" ڕەهەندی گشتی ژیانی بۆرژوازیەوە دەستپێدەكات، نەك لە "نمونەی كلاسیك" یان بواری گشتی دەوڵەت-شاری یۆنانیەوە"، خاڵی گرنگ بۆ ئەو، بنەماكانی كلاسیك نیە، بەڵكو فكری سیاسی مۆدێرنەیەو بیر لە دوالیزمی گشتی/ تایبەتی، دەوڵەت/ كۆمەڵگا، هاوڵاتی/ مـرۆڤ، دەكاتەوەو، ڕەخنەیەكی هیومانستی لە پێشنیارەكانی ژیانی سیاسی دەگرێت. ئەم شێوازە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆشنگەریو لێكۆڵینەوەكانی "مافە سروشتیەكان".

بواری گشتی لەسەر بناغەی ئازادی بیروڕا، ئازادی ڕادەربڕین، لێکۆڵینەوەو قبوڵکردنی لۆژیکی وتوێژ، دامەزراوە. هەموو ئەمانە کەم تا زۆر لە کۆمەڵگای مۆدێرندا بەدەستهاتوون

"شـێوازی كلاسـیك" ناونیشـانێكە كـە هابرمـاس بـۆ تـێڕوانینی یۆنانیـەكان بـۆ سیاسـەتی دانـاوەو لـە وتـارێكدا بـە ناونیشـانی "شـێوازی كلاسـیكی سیاسـەت لـە

پەیوەندیدا بە فەلسەفەی کۆمەڵایەتیەوە، باسی کردوە. ئەم شێوازە لە دوو لایەنەوە گۆڕانی بەسەردا هاتوەو دواجار گەیشتوە بە ڕۆژگاری ئێمەو زانستە کۆمەڵایەتیە مۆدێرنەکان: لە ڕوانگەی میتۆدۆلۆجیەوەو لە ڕوانگەی ناوەڕۆکەوە. زانینی ئەم گۆڕانکاریە بۆ ئێمە پێویستە. بە بڕوای هابرماس بیریارێکی وەك لیۆ شتراوس لەبەرئەوەی نەیتوانیوە لە "جیاوازی بیری کلاسیکیو بیری مۆدێرن" بگات، بە دەرئەنجامی هەڵە گەیشتوە. ئەو خاڵەی کە ئەو لەبەرچاوی نەگرتوە ئەوەیە کە ڕەوایەتی دەوڵەت لە هەریەك لەم دوو نمونەیەدا، لە یەك جیاوازە. بە بڕوای هابرماس یۆنانیەکان سیاسەتیان وەك "بابەتێکی ئەخلاقی" لەسەر بناغەی ئەخلاق دادەمەزراند. ئەوان سیاسەتیان لە ڕێسا بنەڕەتیەکانی جیاوازی نێوان چاکەو خراپە بە جیا نەدەزانی. لە شێوازی کلاسیکدا سیاسەت وەك پراکتیك (بە مانا ئەرستۆییەکەی) لە ئارادا بوو، نەك وەك چالاکیەکی مەبەستدار. واتە سیاسەت بریتی بوو لە چالاکی هاوبەشی (*Praxis*) خەڵکی کە پاش وتوێژو باسکردن (*Lexis*) لە نێوان هاوڵاتیان دەوڵەت- شاردا (*Polis*) لە جێگەیەکی گشتیدا (*agora*) کە بە دەرئەنجامی عەمەلیش دەگەیشت و لە بونیادی خۆیدا لەسەر بناغەی تەکنیك (تخنە - *tekhne*) نەبوو. تەکنیك یان تخنە لە تەفسیری هابرماسدا واتە خوڵقاندنی دەرئەنجامێك بە هۆی ئامێرگەلێکەوە کە نوخبەکان هەڵیبژێرن. ئەوان هەوڵدەدەن بە ئامانجێکی لە پێشەوە دیاریکراو بگەن، بێئەوەی هەستبکەن پێویستیان بە وتوێژ لەگەڵ هاوڵاتیاندا هەیە. بەم شێوەیە فەلسەفەی سیاسی یۆنانیەکان بە مانای وردی وشەکە، زانست نەبوو، واتە نەدەکرا ناوی بنێین ئەپستیم *episteme*، بەڵکو جۆرێك دیدی ئەخلاقی بوو کە بەسترابوو بە بڕوای خەڵکیەوە کە بە شێوەیەکی ئازادانە دەردەبڕا.

جیاوازی سەرەکی نێوان تێڕوانینی شێوازی کلاسیك یان یۆنانی بۆ سیاسەت و تێڕوانینی مۆدێرن، لە جیاوازی ماناکانی تیۆرەو چالاکیو مانای پەیوەندیە دەرونیەکانی نێوانیانە. بۆ یۆنانیەکان سیاسەت وەك دیدێکی ئەخلاقی، "شێوازی ژیانی چاك" بوو، لەو ڕەوشەوە کە پەیوەست بوو بە ژیانی هاوڵاتیانەوە، پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە بیروڕای ئەوانەوە هەبوو، جۆرێك دانایی (*phronesis*) بوو لە ڕێگەی دۆزینەوەی لۆژیکی هەمەڕەنگیەوە، بەڵام تێڕوانینی مۆدێرن بۆ سیاسەت یان "زانستی سیاسەت" ئەخلاقی نیە، لە دوای میکاڤیلیەوە هونەری باشترو ئاسانتر ژیانە، نەك لەسەر بناغەیەکی ئەخلاقی، واتە ئەخلاقی دروستکارو چاك ژیان. لە لایەکی دیەوە چەمکی تازەی سیاسەت، چەمکێکی تەکنیکیە لە خزمەتی ئامانجێکی کەم تا زۆر دیاریکراو و لەسەر بناغەی "فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی" کە لەسەر بناغەی ئەقڵباوەڕی ڕێگا بۆ "زانستی سیاسەت" دەکاتەوە. لە ماوەی نێوان ئەم دوو تێڕوانینەدا دەکرێ تێگەیشتنی سەدەکانی ناوەڕاستی بۆ سیاسەت بدۆزێتەوەو

جیاوازی سەرەکی نێوان تێروانینی شێوازی کلاسیك یان یۆنانی بۆ سیاسەت و تێروانینی مۆدێرن، لە جیاوازی ماناکانی تیۆرەو چالاکیو مانای پەیوەندیە دەرونیەکانی نێوانیانە

نمونەی بەرجەستەی لە بەرهەمەکانی تۆماسی قەدیسدا، بە نمونە بهێنرێتەوە. ئەم لاهوتیە مەسیحیە تێڕوانینی ئەخلاقی بۆ سیاسەت پاراست، بەڵام ئەخلاقەکەی لەسەر بناغەی ڕێسای وتوێژو باسکردن بۆ گەیشتن بە شێوەی چاك ژیان، نەبوو. لە کارەکانی ئەودا تێڕوانینێکی غایبانە لە بری لۆژیکی وتوێژ دانرا، واتە تێگەیشتنێکی تەکنیکی سەریهەڵدابوو کە بە سەرنجدان لە حوکمەکانی شەریعەت، وتوێژی تاکەکانی مرۆڤی بە یاخدار یان لایەنیکەم بە پێوەرێکی سەرەکی نەدەناسی. ئەم دیدە لە جەوهەری خۆیدا ئیستبدادی بوو، چونکە دەستنیشانکردنی بەرژەوەندی لە ئەستۆی ئەو نوخبانە دادەنا کە ئاشنابوون بە نهێنیەکانی کتێبی پیرۆز. ئەو مافە ئیستبدادیەی کە یۆنانیەکان بۆ سەرداری خێزانیان دادەناو پێیان دەگوت *Oikos* و جەختیان لەوە دەکرد کە جگە لە چوار دیواری ماڵ (ژیانی خێزانی‌و پەیوەندی بە کۆیلەکانەوە) کارایی نیە، بە پێی تێڕوانینی تۆماس قەدیس لە پەیوەندی نێوان فەرمانڕەوایان و کۆمەڵگادا دەرکەوت.

لە تیۆرەی سیاسی پاش ڕێنسانسدا، ئەم دیدە ئەخلاقی -ئیستبدادیە، گۆڕا. لە لایەکەوە فەیلەسوفانێك بە پشتبەستن بە واقعبینیەکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی، باسی سیاسەتیان وەك ڕێسایەکی باشترو ئاسانتری ژیان دەکرد (میکاڤیلی) و لە لایەکی دیەوە فەیلەسوفانێك ڕەهەندی ئەخلاقی ژیانی سیاسیان لە سنوری گوتارێکی یۆتۆپیدا، دەهێنایە ئاراو لە ڕێگەیەکی دیەوە بە دەرئەنجامی عەمەلی ژیانی سیاسی وەك هەوڵێك بۆ بەدیهاتنی نەخشەیەکی تایبەت، دەگەیشتن (تۆماس مۆر). ئەو دوو فەیلەسوفەی ناومان هێنان لە دوو ڕێگەوە گەیشتن بە بەرگریکردن لە سودەکانی هاوڵاتیبوون. یەکەمیان بە هێنانە پێشێی بەرژەوەندی‌و سودی میرو دووهەمیان بە یارمەتی دیدێکی یۆتۆپی. لەگەڵ لیڤیسان *(1651)*ی تۆماس هۆبزدا، ئاراستەی زانستی -تەکنیکی سەرکەوت. هەرچەندە هەندێکجار دەنگی ناڕەزایی بەرامبەر بەم سەرکەوتنە بەرگوێ دەکەوێت. هابرماس وەك نمونەیەکی کامڵ باسی بەرهەمەکانی جیان باتیستا ڤیکۆ دەکات کە لە "مەترسی تێگەیشتن لە سیاسەت وەك زانستێك" ئاگادارمان دەکاتەوەو باسی پێویستی "دەستپێکردنی لێکتێگەیشتنی تاکەکانی کۆمەڵگا" دەکات.

بە بڕوای هابرماس ڤیکۆ تا ڕادەیەك وتەبێژی بیرۆکەی سیاسەت بوو وەك وتوێژ. ئەمەش یەکێکە لە خاڵەکانی جیاوازی تێڕوانینی نێوان ئەو و هانا ئارێنت. چونکە ئارێنت ڤیکۆی بە "دەربڕینی ڕۆحیەتی تەکنیکی" دەناساند، هابرماس جەخت لەوە دەکات لە هەر شوێنێکدا ڤیکۆ ئاماژە بۆ سیاسەت دەکات، مەبەستی هەمان *phronesis*ی یۆنانیە کە پێویستی باسکردن و گەڕانی گشتی بە دوای چارەسەریدا لەناوخۆیدا هەڵگرتوە.. ڕەگی ئەم تێڕوانینە "پێشکەوتنی زەمینەی پێشزانستی

لە تیۆرەی سیاسی پاش ڕێنسانسدا، ئەم دیدە ئەخلاقی -ئیستبدادیە، گۆڕا. لە لایەکەوە فەیلەسوفانێك بە پشتبەستن بە واقعبینیەکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی، باسی سیاسەتیان وەك ڕێسایەکی باشترو ئاسانتری ژیان دەکرد (میکاڤیلی) و لە لایەکی دیەوە فەیلەسوفانێك ڕەهەندی ئەخلاقی ژیانی سیاسیان لە سنوری گوتارێکی یۆتۆپیدا، دەهێنایە ئاراوە

هابرماس لە زانین و بەرژەوەندیدا ئاماژە بۆ بیری فرۆید دەکات. دەتوانین لە تیۆرەکانی فرۆیدەوە زۆر شت فێر بین، چونکە لە ڕاستیدا تیۆرەگەلێکن لە بارەی "پەیوەندی کە بە شێوەیەکی سیستیماتیک کەموکوورە". لەم تیۆرانەدا هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی مانا، دەبێتە هۆی دۆزینەوەی پەیوەندیە نادروستەکان. لە ڕاستیدا ئێمە لێرەدا سەروکارمان لەگەڵ "تێکست گەلێکدایە" کە نوسەری ئەو تێکستانە بە شێوەیەکی سیستماتیک خۆهەڵخەڵەتێنەرە. فرۆید باسی "هێرمۆنتیکی قوڵایی" کردوە کە بە کەڵکی ناسینی ئەم "ناوچە نەناسراوە دەرونیە" دێت. بناغەی تیۆری ئەم هێرمۆنتیکە، بە شێوەیەکی کامڵ لە بەرهەمەکانی فرۆیددا نەخراوەتە ژێر باسەوە. تاوتوێکردنی وردو کامڵ و بەردەوامی ئەو هێرمۆنتیکە، تەنها کاتێك دەشێ کە تیۆرەی هەمەکی پەیوەندی، بە سروشتی (بێ کەموکوڕ) بزانرێت. تەنها لەم حاڵەتەدا دەتوانرێ بە وردی، وێرانی پەیوەندی بزانرێت. فرۆید لە بەرهەمەکانیدا سەرچاوەکانی وێرانی پەیوەندی لە ساڵەکانی منداڵیدا تاوتوێکردووە. "ئایکۆنی ڕاڤەکردنی" فرۆید (ناونیشانێك کە دروستکراوی خودی فرۆیدە) شێوەی مێژوویەکی هەمەکیو سیستیماتیك" بە خۆیەوە دەگرێت، مێژووی پەرەسەندنی دەروون یان نەخۆشی دەروونی). شێوازی فرۆید لە شێوازی پێشنیارکراوی تیۆرەی ڕەخنەگرانە دەچێت. ئەویش لە ئایکۆنێکی گشتیەوە دەستی پێدەکرد کە وەك خۆی دەڵێت "تەرجومە" دەکرێت بۆ هەر هەلومەرجێکی تایبەتی. ئەو ئایکۆنە هەمەکیە بەسەر هەلومەرجی تایبەتی هەر نەخۆشێکدا دەسەپا، کەوابوو دەکرا بۆچێتی نەخۆشی دەروونی بەهۆی چۆنێتی پەیدابوونیەوە، هاوکات بزانرێ. لێرەدا یاسای سروشتی لە هەموو مەسەلەیەکی تایبەتدا سەلماندنی خۆی نادۆزێتەوە، بە پێچەوانەوە ژمارەی بێ نەژماری ژیان و بەسەرهاتەکان "لە ڕێگەی ڕەمزی زیهنەوە" دەتوانن خۆیان ئاشکرا بکەن. چالاکیە دوولایەنەکانی منداڵ وەك "هۆکارێکی ڕەوا" بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی بەسەرهاتی (مێژوو) ژیانی هەر چالاکیەك، بنوسرێتەوە. مۆدێرنەو دوژمنەکانی.

بە بڕوای هابرماس کۆمەڵگای بۆرژوازی یەکەمین چوارچێوەی کۆمەڵایەتی، ئابوریە کە بە گێڕانەوەی خۆی بۆ عەقڵباوەڕی پێوەرە بایەخدارە ئەقلانیەکان، خۆی بە ڕەوا پیشاندەداو سەلاحیەتی خۆی لە نەریتە دۆگماییەکانەوە بەدەست ناهێنێت و پشت بە هیچ بناغەیەکی ئەقلانی سەدەکانی پێشوو، نابەستێ. هەر لەبەرئەمە لە هەلومەرجی قەیرانی ڕەوایەتیدا واتە کاتێك سەلاحیەتی بەڕێوەبردنی سیاسیو ئابوری کۆمەڵگا لە لایەن بۆرژوازیەوە دەچێتە ژێر پرسیارەوە، ڕەخنەگرانی دەبێت جەخت لەسەر ئەو بەها عەقڵانیانە بکەن، وردیان بکەنەوەو دەریبخەن کە سیستەمی سەرمایەداری توانای پشتبەستن بەو بانگەشانەی نیە کە ڕایدەگەیەنێت و توانای بەدەستهێنانی کۆی ئەو دەستکەوتانەی بۆ ژیانێکی باشترو ئازادتر، لە ڕێی ئەو

بە بڕوای هابرماس کۆمەڵگای بۆرژوازی یەکەمین چوارچێوەی کۆمەڵایەتی، ئابوریە کە بە گێڕانەوەی خۆی بۆ عەقڵباوەڕی پێوەرە بایەخدارە ئەقلانیەکان، خۆی بە ڕەوا پیشاندەداو سەلاحیەتی خۆی لە نەریتە دۆگمایەکانەوە بەدەست ناهێنێت و پشت بە هیچ بناغەیەکی ئەقلانی سەدەکانی پێشوو، نابەستێ

ئەزموونی فاشیزم و هەنوکەش ئەزمونی پارێزگارانی نوێو بەهێزبوونی حیزبە ڕاستڕەوە توندڕەوەکان، دەریخستوە کە سەرمایەداری هیچ باکی لە هەڵبژاردنی ئەم ئەڵتەرناتیڤە نیە

پێوەرە ئەقڵانیانەوە نیە، بەڵام ئەگەر کەسانێك پەیدابوون کە لە دژایەتی ئەم سیستەمەدا، بە شێوەیەکی کامڵ نکوڵی لە ئەقڵباوەڕیو پێوەرە ئەقڵانیەکان بکەن، تەنها یارمەتی سەرمایەداری دەدەن بۆ ئەوەی نەچێتە ژێرباری بەرپرسیاری بانگەشە ئایدیۆلۆژیەکانی خۆیەوە و خراپتر لەمەش ڕوویکاتە خراپترین ڕێگەچارەسەرەکان. ئەزموونی فاشیزم و هەنوکەش ئەزمونی پارێزگارانی نوێو بەهێزبوونی حیزبە ڕاستڕەوە توندڕەوەکان، دەریخستوە کە سەرمایەداری هیچ باکی لە هەڵبژاردنی ئەم ئەڵتەرناتیڤە نیە. کەوابوو ئەو کەسانەی پرۆژەو بەرنامەی ئەقڵباوەڕی ڕۆشنگەری دەخەنە ژێر پرسیارەوەو نکوڵی لە بنەما سەرەکیەکانی مۆدێرنە دەکەن، لە ڕاستیدا ئەو پارێزگاریو نەریتخوازانەن کە لە بارودۆخی قەیرانی ڕەوایەتیدا، ئەگەری دەستگەیشتن بە نائەقڵانیترین ئامێرەکان، پیشانی ڕژێمی فەرمانڕەوا دەدەن و لەم ڕێگەیەشەوە یارمەتی مانەوەی دەدەن. هەرچەندە لافی ئەو کەسانە بریتیە لە دژایەتیکردنی دەسەڵات و کلتوری سەرمایەداریو بەرگریکردن لە ئازادی، بەڵام لە ڕاستیدا دژایەتی ئەوان بۆ ئەقڵباوەڕیو ئەوەی کە نەیانتوانیوە جیاوازی نێوان ئەقڵباوەڕی ئامێرییو ئەقڵباوەڕی هاوپەیوەندی بکەن و ڕاستەوخۆ نکوڵیان لە ئەقڵ کردوە، لە حوکمی پارێزگاریەکی کامڵدایە. هابرماس لە نێوان ئەم بیریارانەدا بە تایبەتی پەنجە بۆ بەرهەمەکانی بیریارانی پۆستمۆدێرنیست، ڕادەکێشێ، بەڵام ئەو نوسەرانەش ناوی پارێزگاری بە هابرماس دەبەخشن. بۆ نمونە پۆرتۆگزی لە کتێبی پۆستمۆدێرن (*1977*)دا کە لە بارەی تەلارسازی پۆستمۆدێرنەوەیە، ڕەخنە لەو "پارێزگارە نوێیانە دەگرێت کە بڕوایان وایە "پرۆژەی ناتەواوی مۆدێرنە" دەتوانرێ بە ئەنجام بگەیەنرێت و نەیانزانیوە کە "نوێهێنان" و "تازەبوون" خۆیان بوون بە نەریت. هابرماس لە وتوێژکردنی لەگەڵ بیریارانی پۆستمۆدێرندا بەردەوام جەختی لەو خاڵە کردوە کە خاڵی گرنگ ململانێی نوێهێنان و نەریتەکان نیە، بەڵکو خاڵی گرنگ خەتکردنە لەسەر ئەقڵانیەت و بنەمای ئەقڵانیەتی چالاکیەکان(*89*). بڕواشی وایە کە بە نەفیکردنی عەقڵباوەڕی، دەگەین بە نکوڵیکردن لە خودموختاری، هۆشیاری، تاکێتی و ئازادیە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان. دیارە کە لە کاری پێشکەوتنی ڕۆژگاری مۆدێرندا هەندێك ماوەو ڕاوەستان ڕوودەدات و بێگومانیش ئەم ڕۆژگارە بۆتە هۆی دروستبوونی قەیرانەکان و هیچ شتێکیشی بەدەر لە ڕەخنەگرتن نیە، بەڵام پەیمانی بیریاران دەبێت یارمەتیدانی پێشکەوتنی کۆمەڵگاو سەرکەوتن بێت بەسەر کەموکووڕیو ڕاوەستانەکاندا.

هابرماس پشت بە پێوەری ئەقڵباوەڕی هاوپەیوەندی دەبەستێ بۆ ئەوەی جەنگ لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای بۆرژوازیدا بکات کە لەسەر بناغەی ئەقڵباوەڕی ئامێری ڕاوەستاوە. لێرەدا هەندێکجار داوای گەڕانەوە دەکات بۆ ئەو بنەمایانەی کە لە

سەردەمی ڕێنسانس و بە تایبەتی لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا، ڕادەگەیەنران، بەڵام بە شێوەیەکی کامڵ جێبەجێ نەکراون کەوابوو هابرماس بەرگری لە "میراتی پراکتیکی ڕۆشنگەری" و بیرو تیۆرەی ڕەخنەگرانە لە بەرامبەر "نائەقڵانیەتی بیری هاوچەرخدا" دەکات. هەرچەندە وشەی مۆدێرنە پێشینەی بەکارهێنانێکی دوورو درێژی هەیە، بەڵام ئەوەی هابرماس ناوی ناوە "بەرنامەی مۆدێرنە" یان "پرۆژەی مۆدێرنە"، لە ڕاستیدا زادەی سەدەی ڕۆشنگەریە. ئەو پرۆژەیە کە هابرماس هێناویەتیە ئاراوە، هەمان هوڵی سەرسوڕهێنەرو ئازایانەی بیریارانێکە کە بە مەبەستی دۆزینەوەی "ڕەهەندی ئەقڵانی بیرو چالاکی زانستی"، ململانێیان لەگەڵ نەریتەکاندا کردبوو. ئەم "کەڵەکەکردنەی زانین"ە لە بەرهەمی ڕۆشنگەراندا، تەنها یەك ئامانجی کۆتایی هەبوو: ڕزگاری مرۆڤ و دروستکردنی خۆشبەختی لە ژیانی ڕۆژانەدا. دیارە ئەم پرۆژەیە زۆر خۆشبینانە بوو، بەڵام ناوەڕۆکی سەرەکی پرۆژەکە لەو ڕووەوە واقعی بوو کە ئەقڵی پراکتیکی بە هەمان پەیوەندی مرۆیی لە ژیانگادا، دەزانی. هابرماس جەخت لەوە دەکات کە ناسین و کۆنترۆڵکردنی دنیا کە ڕۆحی بەرنامەکە بوو، لەسەر بناغەی گریمانەی جۆرێك ژیانی ئەقڵانی دامەزرابوو. ئاژاوەی "یان ناڕێکی" زیهنی ڕەد دەکردەوەو ئەگەری ژیانی ئەقڵانی مرۆڤی، دەهێنایە پێشێ. ئەمە سەرەتای بەرنامەی مۆدێرنە بوو، نەك دوا قسەی، بەڵام لە پراکتیکدا گەلێك کێشە پەیدابوون، ململانێی چینەکان، دەرکەوتنی تەقینەوەی ئەو هێزانەی کە مۆدێرنە ڕەهای کردبوون مانەوەی نەریتەکان و خورافاتەکانی سەدەکانی پێشوو، جوڵەی سیاسی سەرمایەداری بەرەو تەمەرکزکردن کە هاودەم بوو لەگەڵ پەیدابوونی پاوانکردنی ئابووریدا، هەموو ئەمانە پیشاندەری ئەو کێشانە بوون. نمونەی ئاشڤێتز کە سەرەتا ئادۆرنۆ پێی لەسەر دادەگرت و هەنوکەش پۆستمۆدێرنەکان (بە تایبەتی لیوتار) وازی لێناهێنن، نە قابیلی نکوڵی لێکردنەو نە دەتوانرێ بگوترێ کە بێ هۆ ڕووی داوە. هەموو ئەمانە کێشەکانی مۆدێرنە پشاندەدەن (چ کەسێکیش گوتوێتی کە هیچ کێشەیەك سەرهەڵنادات؟)، بەڵام دەلیلێکی وا نادات بە دەستەوە تا قبوڵبکەین کە لۆژیکی ڕۆشنگەری لۆژیکی سەرکوتکردن و دەسەڵات بوە. ئەو نمونەیەو نمونەی کۆلاگ، هێرۆشیما، ڤێتنام و جەنگە ناوچەییەکان و قەیرانە کۆمەڵایەتیەکانی ئەمڕۆ، بە باشی پیشانیدەدەن کە خۆشخەیاڵی ڕۆشنگەران عەمەلی نەبوو، بەڵام هەموو ئەمانە ناوەڕاستی بناغەی کارەکەی ئەوان ناسەلمێنن. لە بەرامبەر ئەم بەڵگاندنانەدا (وەك لە دوو فەسڵی داهاتووی ئەم کتێبەدا دەیبینین) بیریارانی وەك فۆکۆ، دێریدا، لیوتارو دۆلۆز دەڵێن کە ئەمە چاوپۆشینە لە واقیع و لە دەرئەنجامدا وەك ئادۆرنۆ دەیگوت، قبوڵکردنی دەسەڵاتە. کێشەکانی مۆدێرنە، قەیرانگەلێکن کە ناکۆکیەك لە بناغەی بانگەشەکانیدا، پیشاندەدەن. لە نێوان ئەو "نمونە گشتگیر" و ئەو "ئەقڵانیەتە پۆلاییە" و ئەم

هابرماس جەخت لەوە دەكات كە ناسين و كۆنترۆلكردنى دنيا كە رۆحى بەرنامەكە بوو، لەسەر بناغەى گريمانەى جۆرێك ژيانى ئەقلانى دامەزرابوو

کارەساتانەو ئەو کارەساتانەی بەڕێوەن پەیوەندیەك هەیە کە قابیلی نکوڵیکردن نیە. بەڵام بەر لەم وەڵامە یان باشتر بڵێین هێرشی پۆستمۆدێرن، باشترە باسی تێگەیشتنی هابرماس بۆ ڕۆژگاری نوێ بکەین.

یەکەم ئاماژەی هابرماس بۆ ناتەواوی ڕەخنەگرتنی مۆدێرنە دەگەڕێتەوە بۆ سێپتەمبەری *1980*و ئەو وتارەی کە لە کاتی وەرگرتنی "خەلاتی تیۆدۆرۆ. و . ئادۆرنۆ"دا پێشکەشیکرد. لەو باسەدا هابرماس باسی ڕەگە مێژووییەکان و پەیدابوونی چەمکی مۆدێرنە دەکات. ئەو دەریدەخات کە بۆ پێشکەوتووخوازترین و رادیکالترین ڕەخنەگرانی نەریت، مۆدێرنە بە مانای ململانێیە، هەم دژی نەریت و هەم دژی سەردەمی خۆیان. کاری بۆدلێر نمونەیەکە کە پیشانیدەدات کە نوێهێنان و ئاڤانگاردیزم، دژایەتیە لەگەڵ ڕۆحی زەمانەدا. "مۆدێرنە هەر بە تەنها ڕاپەڕینێك نەبوو دژی کارکردنێك کە نەریتەکان بە شتی سروشتی پیشاندەدا، بەڵکو لە بنەڕەتدا لە ئەزمونێکدا دەدۆزرایەوە کە ڕاپەڕینی دژی هەر شتێکی ڕێکخراو، ئاراستە دەکرد". هابرماس جیاوازی نێوان مۆدێرنیزم "وەك هەلومەرجێکی ستاتیکی" و مۆدێرنە وەك "ناوەڕۆکێکی هەمەکی جوڵەی فەلسەفی و مێژوویی" نەکردوە، بەڵام مۆدێرنیزم سەلاحیەتی خۆی بەر لەهەر شتێك لە بواری کلتوردا دەدۆزێتەوە، خاڵەکەش لێرەدایە کە مۆدێرنە سنورەکانی ئەم بوارە دەستنیشان دەکات. بناغەی بەڵگاندنەکەی هابرماس ئەوەیە کە ناکرێ مۆدێرنیزمان بوێت، بەڵام لەگەڵ مۆدێرنەدا نەبین. ئەمەش نهێنی کێشەی کاری ئادۆرنۆیە کە لەگەڵ دەستکەوتەکانی مۆدێرنەو ڕۆشنگەریدا دەجەنگا، بەڵام لە مەسەلەی هونەریەکاندا لایەنگرو خوازیاری مۆدێرنیزم بوو. ئەو دیدەی کە لە زەمینەی ژیانی ڕۆژانەدا، کێشەکان لە نوێبونەوەیاندا دەبینێ، خۆی لە خۆیدا پارێزگارەو ناتوانێ بە شێوەیەکی دروست و ڕادیکاڵ تاهەتایە لە بواری هونەردا بەرگری لە مۆدێرنیزم بکات. دەتوانرێ ئەوە پیشان بدرێ کە بەرگریکردنی ئەو بیریارانەی خاوەن ئەو تێڕوانینەن، بە ڕاستی ناکۆکە لەگەڵ پایە فکریەکانیاندا. هابرماس دەڵێت بۆ ناسینی جیهانی خۆمان (جیهانی مۆدێرن) دەبێ بتوانین بەو شێوەیەی کە ماکس فیبەر پێشنیاری کردوە، مۆدێرنە لە سێ بواردا بپشکنین، سێ بوار کە لە یەك جیاوازن: زانست، ئەخلاق و هونەر. نوێبونەوە یان مۆدێرنیزەکردن لە هەریەك لەم سێ بوارەدا کێشەگەلێکی تایبەتیی دروستکردوە، بەڵام دواجار ڕێخۆشکەری ڕێگەگەلێکی تازەش بوە. هەقیقەت وەك "مەسەلەیەکی ئەبستمۆلۆجی" لە سنوری زانستە سروشتیو فیزیاییەکاندا، بناغەی ئەخلاقیو هقوقی چالاکی لە سنوری ئەخلاقداو ڕەگەزەکانی دەستنیشان کردنی ڕەسەنایەتی لە سنوری ستاتیکادا، دێنە پێشەوە. عەقڵباوەڕی ئامێری لە سنوری یەکەمدا شێوەی کارکردنە، عەقڵی عەمەلی بناغەی کارکردنە لە سنوری دووەمداو ئەزموونی ستاتیکیو

یەکەم ئاماژەی هابرماس بۆ ناتەواوی ڕەخنەگرتنی مۆدێرنە دەگەڕێتەوە بۆ سێپتەمبەری *1980*و ئەو وتارەی کە لە کاتی وەرگرتنی "خەلاتی تیۆدۆرۆ. و . ئادۆرنۆ"دا پێشکەشیکرد

هاوپەیوەندی، بناغەی کارکردن لە سێهەم بواردا دەستنیشان دەکات. دەکرێ لە ڕێگەی وردبوونەوە لە دەستکەوتەکانی مۆدێرنە، باسی هەریەك لەم سێ بوارەدا بکرێت. پەیدابوونی یاسا سەربەخۆکانی هەریەك لەم سێ بوارە، لە ڕۆژگاری مۆدێرندا مومکین بوو. نابێت ڕێگە بدرێت باسەکە ئەوەندە بچێتە پێشێ کە یاسای هەمەکی جوڵەی مۆدێرنە فەرامۆش بکرێ. هابرماس دەڵێ دەبێ لەمڕووەوە لە گۆشەیەکی تازەوە تەماشای ڕۆژگاری ڕۆشنگەری بکەین، ئەمە سەردەمێك بوو کە یاسای هەمەکی جوڵەی مۆدێرنەی نووسیەوە. لەم ڕۆژگارەدا بوو کە بۆ هەریەك لەو سێ بوارە ڕێگەیەك پێشنیار کرا بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە ڕێکخستنی ئەقڵانی ژیانی ڕۆژانە، مومکین بێت. لێرەوە دەتوانرێ نهێنی سەربەخۆی هونەری بدۆزرێتەوە. سەربەخۆییەك کە پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم. لەو ڕۆژگارەدا بوو کە بەرهەمی هونەری بێ نیازبوو لە پەیوەندی بە هەقیقەتەوە (کە لە زانستدا دەرکەوت) و لە پەیوەندی بە چاکەوە (کو لە ئەخلاقدا دەبینرا). ڕەنگە باشترین بەڵگە لەم ئاستەدا حوکمەکەی کانت بێت لە کتێبی هەڵسەنگاندنی هێزی داوەری (*1970*). کانت ئیجازەی سەربەخۆیی هونەری مۆدێرنی دەرکرد. هونەر لە بواری مەعریفەو ئەخلاق جیابۆوەو جوانیی لە کاراییو سودمەندی. بە جیابوونەوەی هونەر لە بابەتی باڵا، هونەر بوو بە ئامانجێك بۆ خۆی. لێرەوە جوڵە بەرەو مۆدێرنیزم دەستپێکرد. لە ڕوکەشدا پێدەچێ ئەم سەربەخۆییە هیچ دژایەتیەکی لەگەڵ مژدەی خۆشبەختیدا نەبێت کە ڕۆژگاری ڕۆشنگەری دەیدات. هونەر دەتوانێت:

*1*–گشتی ببێ، واتە هەموو کەس کاری هونەری بکات.

*2*–ئاراستەوەرگرتنی ئێمە سەبارەت بە پەیوەندیە مەعریفیو زانستیەکان لە لایەکەوەو سەبارەت بە سروشت و ڕێسا ئەخلاقیەکان لە لایەکی دیەوە، بگۆڕێت.

هابرماس نمونە لە ڕۆمانی پترڤایس دەهێنێتەوە، ڕۆمانێك بە ناوی ستاتیکای بەرگری (لە سێ بەرگدا *1975–1981*) کە تیایدا کرێکاران دەتوانن لە کاری ڕۆژانەی خۆیانەوە، پەنا بۆ داهێنانی هونەری بەرن. جۆرێك "کەماڵی بەرنامەی ڕۆشنگەری" کە بەرهەمهێنانی بە شێوەیەکی ستاتیکی دەویست و جیابونەوەی بواری کلتوری لە بوارەکانی تری ژیان بە ناشرین دەزانی. وەك ئەوەی بڵێیت هابرماس قبوڵیدەکات کە "شانسی سەرکەوتن لە کاملکردنی ئەم بەرنامەیەی مۆدێرنەو ڕۆشنگەریدا، ئەمڕۆ ئەوەندە زۆر نیە" بەڵام بە پێچەوانەی حوکمی ئەو بیریارانەوە کە ناویان دەنێت "پارێزگارانی نوێ"، ئەم ئەگەرە وەلاوە نانێت، دەستپێکردنی قەیرانی مۆدێرنیزەبوونو مۆدێرنە چ لە بواری کلتوروو هونەرو چ لە بواری زانست و تەکنەلۆژیدا، دەبوو هاودەم بێت لەگەڵ بیرۆکەی گۆڕانکاریو بڵندبوونەوە، نەك تەنها بکەوێتە بەر ڕەخنەگرتن. نەبوونی ئەم بیرۆکەیە، یان لە دەستدانی نزیکی زانست و هونەرو

دەستپێکردنی قەیرانی مۆدێرنیزەبوون و مۆدێرنە چ لە بواری کلتورو هونەرو چ لە بواری زانست و تەکنەلۆژیدا، دەبوو هاودەم بێت لەگەڵ بیرۆکەی گۆڕانکاریو بڵندبوونەوە، نەك تەنها بکەوێتە بەر ڕەخنەگرتن

پراکتیك، پارێزگارە کلاسیکیەکان دەکاتە هاوڕێی کەسانێك کە بەهەر لە دەستدانی نزیکی زانست و هونەرو پراکتیك، پارێزگارە کلاسیکیەکان دەکاتە هاوڕێی کەسانێك کە بەهەر شێوەیەك باسی دژی مۆدێرنە دەکەن و ئەمڕۆ خۆیان ناودەنێن "پۆستمۆدێرن". ئەوان لە دژایەتی ئەقڵنامێری و دەرئەنجامەکانیدا پشت دەکەنە ئەقڵی هاوپەیوەندیو چالاکی دوولایەنەو پەنا بۆ بێئەقڵی، ئاژاوە، بێمانایی، هەست و /جۆرێك دیدی سواو/ دەبەن. گرنگترینیان لە ژۆرژ باتایەوە تا میشل فۆکۆو ژاك دێریدا، ناچار بواری بەرپرسیاری کۆمەڵایەتی ڕەها دەکەن و لە بواری ژیانی گروپە زۆر بچوکەکاندا بۆ ئازادیو ئەخلاقی نوێ دەگەڕێن. بەمشێوەیە ڕەخنەی هابرماس لە ئادۆرنۆ کە مۆدێرنەی ڕەد دەکردەوەو خوازیاری مۆدێرنیزم بوو، دەگات بە بیری پۆستمۆدێرنەکان.

بەرلەوەی باسی کتێبێك بکەین کە ئەو خاڵانەی سەرەوەی بە شێوەیەکی وردترو هەمەلایەن ڕونکردۆتەوە، تەنها دەبێ ئەو خاڵە ڕونبکرێتەوە کە دژایەتی ئادۆرنۆ لەگەڵ مۆدێرنەو ڕۆشنگەریدا بە وردی بە هۆی بێ توانایی پرۆژەی ڕۆشنگەریەوەیە لە نوێهێناندا. ئادۆرنۆ -وەك لە فەسڵی چوارهەمدا بینیمان- لە کتێبێکدا کە لەگەڵ هۆرکهایمەردا نوسیویێتیو تیایدا بێتوانایی پرۆژەی ڕۆشنگەری سەلماندوە، واتە لە دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا دەری خستووە کە نەریتەکان، دیدی ئەفسانەییو باڵادەستی بیری مردوو بەسەر بیری زیندوودا، لە ڕۆشنگەریدا لەناونەچوو، بەڵکو چەندانجار بەهێزتر لە جاران دەرکەوت. کەوابوو لافی ڕۆشنگەریو "بەرنامەی مۆدێرنە" بۆ نوێهێنان، قابیلی قبوڵکردن نیە. ئادۆرنۆ هاوڕێی نوێهێنان بوو، لێرەوە لە هونەری مۆدێرندا ( لە شۆنبرگەوە تا بیکیت) ئەنجامدانی شتێکی دەبینی کە ڕۆشنگەری ڕایدەگەیاند، بەڵام بە ئەنجامی نەدەگەیاند. بە سەرنجدان لەم خاڵە ناکرێ ڕەخنەی هابرماس لە ئادۆرنۆ قبوڵبکرێ. ئەم خاڵە نەك بە شێوەیەکی کامڵ، بەڵکو تا ڕادەیەك لە بارەی پۆستمۆدێرنیشەوە ڕاستە. ئەمان دەریانخستووە کە لافی مۆدێرنە بۆ "بونیادنانی نمونەیەکی بێهاوتا کە مانای تازە بخوڵقێنێ و مانا کۆنەکان بێ بایەخ بکات" (لیوتار) تا چ ئەندازەیەك بێ بناغەیە. لە بەرامبەردا هونەری مۆدێرن کە زانیویەتی مانایەکی تازە لە ئارادا نیە، تا چ ئەندازەیەك پێشکەوتوخوازە. هەنوکە بگەڕێینەوە بۆ باسەکەی هابرماس.

بناغەی ڕەخنەی هابرماس لە "دوژمنانی مۆدێرنە" لە کتێبێکدا هاتوە بەناوی گوتاری فەلسەفی مۆدێرنە: دوانزە کۆنفرانس. ئەم کتێبە کە لە ساڵی *1985* بڵاوکرایەوە، کۆمەڵە وانەیەکە کە هابرماس لە زستانی *1983*دا پێشکەشی کردوە. کتێبەکە کە وەرگێڕانی فەرەنسی *500* لاپەڕەیە، لەم بەشانە پێکهاتووە: پێناسی مۆدێرنە، چەمکی مۆدێرنە لای هیگڵ و گرنگی سوبژێکتیڤ لە پێناسی مۆدێرنەدا،

دژایەتی ئادۆرنۆ لەگەڵ مۆدێرنەو ڕۆشنگەریدا بە وردی بە هۆی بێ توانایی پرۆژەی ڕۆشنگەریەوەیە لە نوێهێناندا

سێ ڕوانگەی سەرەکی مۆدێرنە لە سەدەی نۆزدەدا کە هیگڵیە ڕاستڕەوەکان و هیگڵیە چەپڕەوەکان و نیچە باسیانکردوە، ڕەخنەی هایدگەر لە ئەقڵباوەڕی ڕۆژئاوایی، ڕەخنەی دێریدا لە میتافیزیکی ئامادەبوون، باسەکەی باتای لە بارەی ئیرۆتیزم و ئەوەی ناوی نابوو "ئابوری هەمەکی" ڕەخنەی فۆکۆ لە زانستە مرۆییەکان و سێ فەسڵی کۆتایی لە بارەی تیۆرەی دەسەڵات، ئەقڵی هاوپەیوەندی و تێگەیشتنی هەمەکی ئەمرۆیی بۆ مۆدێرنە.

بەرگریکردن لە ئەقڵباوەڕی مۆدێرن و بە تایبەتی ڕەگەزی پەیوەست بە ئەقڵی هاوپەیوەندیەوە تیایدا، شتێك نیە کە هابرماس لە سەرەتای سەدەی دەیەی *1980*و لە باسی پۆستمۆدێرنەکاندا پێیگەیشتبێت. ئەو لە یەکێك لە وتارە سەرەتاییەکانیدا کە بڵاویکردەوە، واتە لە "ئایدیالیزمی ئەڵمانیو بیریارە یەهودیەکانی"دا دەخوێنینەوە کە قەرزاری ڕۆشنبیرانی یەهودی بۆ کانت، ڕەگی لە باسی کانتدا بۆ ئەقڵباوەڕی ڕەخنەگرانەدا هەیە و هەر لەبەرئەوەش مرۆڤخوازی کانت، مانایەکی تازەی هەیە. هابرماس لە نێوان "هێرمۆنتیکی تێکستە پیرۆزەکان و ئەقڵباوەڕی کانتیدا" جۆرێك لێکچوونی دۆزیەوەو لە دەمی سیمیلەوە هێنایەوە کە بۆ تێگەیشتنی دروست لەو شۆڕشەی کانت لە فەلسەفەدا بەرپای کردوە، دەبێ سود لە نوسینەکانی مایستەر ئۆکهارت وەربگرین. ئەم سەرچاوە لۆژیکیەی هاوپەیوەندیش کە لە بەرهەمەکانی کانتدایە، دروست هەمان شتە کە بە بڕوای هابرماس ئەمڕۆ ناناسرێت. هابرماس لە هەڵسەنگاندنی وتوێژی فەلسەفی بەناوبانگی هایدگەرو کاسیرەردا (داوس، *1929*) دەنوسێ کە "سەرکەوتنی گومانلێکراوی هایدگەر" لە ڕاستیدا پێشاندەری بێتوانایی بەرگریکردنە لە ڕۆشنگەریو مۆدێرنە، نەك هێزی هێرش کردنە سەری. باسەکەی هایدگەریش دواجار وەڵامی ئەم خاڵە سەرەکیەی نەداوەتەوە: "ئایا ڕۆژگاری مۆدێرنە کۆتایی هاتوە یان نەء؟". بێزاری هابرماس لە ئەنتۆلۆجیای بنەڕەتی هایدگەر -و ئەم خاڵە کە پێ لەسەر پێویستی ڕەدکردنەوەی "دیدی فاشیستی هایدگەر لە بوون و زەماندا" دادەگرێت- ڕەگی لە دژایەتی هایدگەردا هەیە بۆ ئەقڵباوەڕی. لە ڕاستیدا ململانێی هابرماس لەگەڵ دوای بونیادگەریو پۆسمۆدێرنیزم، درێژەپێدانی ململانێی هابرماسە لەگەڵ هایدگەردا کە لە گوتاری فەلسەفی مۆدێرنەدا بە ڕەخنەگری نازی مۆدێرنەی دەزانی کە "ئامانجی سوپەرمانی لاوی هیتلەریە".

ناونیشانی پارێزگاری کە هابرماس بە پاش بونیادگەرانی بەخشیوە، سەرسوڕهێنەرە. فەیلەسوفانی پۆستمۆدێرنیست، بیروڕای سیاسیو کۆمەڵایەتی ڕادیکاڵیان هەیە، فۆکۆ تەمەنێك دژی دەسەڵات لە هەموو شێوەیەك دەرکەوتنیدا خەباتی کردوە، لیوتار لە دوو دەیەدا لەناو حیزبێکی چەپڕەوی توندڕەودا چالاکی دەکرد، دێریدا دیدێکی زۆر پێشکەوتووی لە بارەی ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی ژنان

لە ڕاستیدا ململانێی هابرماس لەگەڵ دوای بونیادگەریو پۆسمۆدێرنیزم، درێژەپێدانی ململانێی هابرماسە لەگەڵ هایدگەردا کە لە گوتاری فەلسەفی مۆدێرنەدا بە ڕەخنەگری نازی مۆدێرنەی دەزانی کە "ئامانجی سوپەرمانی لاوی هیتلەریە"

و.. هتد هەیە. ئەوان دژی شتگەلێکن کە هابرماسیش دژیانە: (دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتە موتەمەرکیزە مۆدێرنەکان، چاودێری بیرۆکراتیانە بەسەر بەرهەمهێناندا، گەشەسەندنی ئابوری بە بەهای وێرانی ژینگە، توانەوەی کلتورە بچوکەکان لە کلتورێکی باڵادەستدا کە ڕووی تەکنیکی -زانستیەوە بەهێزترە، ڕەگەزپەرستی، پارێزگاری نوێی ئەورووپیو..) کەوابوو چۆن دەتوانری بناغەی بیری ئەوان بە پارێزگاری ناوبنرێ؟ هابرماس خۆشی دوو لقی سەرەکی لە بیری پۆستمۆدێرندا لە یەك جیاکردۆتەوە. بە بڕوای ئەو ئەم دوو لقە لە "دوو پلەی جیاوازی پارێزگاریدا"، واتە بە دوو شێوەی جیاواز کاردانەوەی نیگەتیڤ بەرامبەر بە گۆڕانکاری ڕادیکالانەی کۆمەڵگاو بیر، پیشاندەدەن. یەکێکیان ئاراستەیەکە کە بەرهەمەکانی ئارنۆلد گلن نمونەیەکی کاملێن: ئەو بەها کلتوریانەی کە هاوکاتی مۆدێرنەو نوێهێنانی کۆمەڵایەتی دروستبووبوون، لە ئازادی فەردیو سوبژێکتڤیزمەوە بیگرە تا مافی دیاریکردنی چارەنوس و سەربەخۆییە سیاسی -کۆمەڵایەتیەکان، ئەمڕۆ لەناوچوون و هەندێکجاریش بەر لە گەشانەوە، هەڵوەریون، بەڵام دەرئەنجامە سیاسی- کۆمەڵایەتیەکان ماونەتەوە: پێشکەوتنی خێرای تەکنەلۆژیا، گەشەسەندنی ئابوری کە بە جیا لە قەیرانە دەوریەکان، بەهەر شێوەیەك درێژەیان هەبوە.

هابرماس دەڵێت هەر ئەم خاڵە کە دەرئەنجامەکان ماونەتەوە، بەدبینی گلن و بیریارانی پارێزگاری کلاسیکی، بێ بایەخدەکات. دەستەی دووەم " پارێزگارانی لاو"ن (زاراوەیەك کە هابرماس لە بەراوردکردن بە هیگلیە لاوەکان، دروستیکردوە). ئەمانە جیاوازی لە نێوان ڕۆشنگەری کلتوریو ئەقڵانیەتی کۆمەڵایەتی -ئابوریدا ناکەن، هیوایەکیان بە پەیدابوونی ئازادی لە پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیدا نیە. لە ڕاستیدا پەیوەندیەك لە نێوان نەبوونی ئازادیە فەردیەکان و ئەقڵانیەتی تەکنەلۆژیو ئەقڵنامێریدا دەدۆزنەوەو بڕوایان وایە کە دواجار تاکێتیو ئازادی لە بەرامبەر ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەدا، توانای دەرکەوتنیان نابێت.

هابرماس بڕوای وایە کە هەردوو ڕێبازەکە تاك بە کۆیلەی سیستەمی پێشکەوتن دەبینن. سیستەمێك کە لە ڕەهەندە ئابوری، تەکنیکی، ئیداریەکاندا، دەرکەوتوە. بەڵام ئەم خاڵە نەیاری هابرماس نیە لەگەڵ ئەواندا، تەنانەت دەبێ بگوترێ کە ئەو خۆشی دان بەم "کۆیلەیەتیەی مرۆڤی مۆدێرندا" دەنێت. جیابوونەوەی هابرماس لەو دوو ڕێبازەی کە جیای کردۆتەوە لەوێدا دەردەکەوێت کە ئەوان ئەنجامگیری لە قەیرانەوە دەکەن. بە بڕوای ئەو هەردوو ڕێبازە پارێزگارەکە، هیوایان بە ئازادی لە دەستداوە. یەکێکیان نزیکبۆتەوە لە بیرەکانی پێش مۆدێرنەو ئەویدیان لە ڕەخنەکاری دژ بە ئەقڵی نیچەوەو لێرەوە بڕوایان بە نهیلیزم هێناوە. بۆ تێگەیشتن لە تێڕوانینەکانی

لە ڕاستیدا پەیوەندیەك لە نێوان نەبوونی ئازادیە فەردیەکان و ئەقڵانیەتی تەکنەلۆژیو ئەقڵنامێریدا دەدۆزنەوەو بڕوایان وایە کە دواجار تاکێتیو ئازادی لە بەرامبەر ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەدا، توانای دەرکەوتنیان نابێت

ڤالتەر بنیامین بوو توانی لە نێوان هیگڵ و بۆدلێردا پردێك دروستبكات و دەربیخات كە هەردووكیان تێگەیشتنێكی تازەیان بۆ بكەری بناس، بەستوتەوە بە نوێبونەوە یان نوێكردنەوەی جیهانەوە

هەردوو دەستەكە دەبێ دووبارە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ (بكەر، ناسەر یان سۆبژێكت) و عەقڵانیەت، وردبینەوە. چونكە بناغەی بەڵگاندنی هەردوو دەستەی بیریار، دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنێكی نادروست لەم پەیوەندیە. هابرماس بۆ تێگەیشتنی ورد لەم پەیوەندیە لە هیگڵەوە دەستی پێكردوە. كتێبەكە بە باسكردنی "فەیلەسوفی مۆدێرنە" واتە هیگڵ دەستپێدەكات. ئەو دەڵێت كە هیگڵ ڕەوایەتی سەردەمی مۆدێرن لە "نوێبونەوە"وە بەدەست دێنێت، بەڵام خودی ئەم سەردەمەی بە هۆی ڕۆڵی تازەی سۆبژێكتەوە دەناسی. ڕۆڵێك كە چیدی سوبژێكت كورت ناكاتەوە بۆ سنوری "ڕەنگدانەوەی بەكاریانەی تێگەیشتنی جیهانی". ئەوە سۆبژێكتە كە نوێبۆتەوەو لەگەڵ خۆیدا جیهانێكی نوێو گوتارێكی تازەی دەوێت و دەخولقێنێ. بە بڕوای هابرماس ئەو بیریارەی كە ئەم خاڵەی پاش هیگڵ بە وردی ناسی، ڤالتەر بنیامین بوو. بنیامین توانی لە نێوان هیگڵ و بۆدلێردا پردێك دروستبكات و دەربیخات كە هەردووكیان تێگەیشتنێكی تازەیان بۆ بكەری بناس، بەستوتەوە بە نوێبونەوە یان نوێكردنەوەی جیهانەوە. عەقڵی مۆدێرنە نەیدەتوانی نوێكردنەوە بە جیا لە ڕەخنەكاریو ڕادیكاڵانەی ستاتیكی، بهێنێتە ئاراوە. لێرەوە شاعیری مۆدێرنیست "وەزیفەی تازەی بۆ جوانی" ژمارد، وەك چۆن فەیلەسوف بەر لەو، وەزیفە تازەكانی سۆبژێكتیڤی مۆدێرنی ناساندبوو. ئەم جەختكردنە لەسەر "سۆبژێكتی مۆدێرن" بابەتی دوا فەسڵی كتێبەكەی هابرماسیشە، واتە فەسڵێك كە پاش باسی دوورو درێژی بیریارانێك هاتوە كە هەریەكەیان بە شێوەیەك "سۆبژێكتیان بە بێبایەخ زانیوە. هەر لەبەرئەمەش ڕەخنەگرتن لە ئەقڵباوەڕیان گۆڕیوە بۆ ڕەخنەگرتن لە میتافیزیكیاو ڕەخنەگرتن لە دەسەڵات.



تابلۆیەكی شێوەكار سەردار سنجاوی

هاشم سالّح

# وەرگێڕان و زانستە مرۆڤایەتییەکان

## (محەمەد ئەرکۆن وەك نموونە)



محەممەد ئەرکۆن

و: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

پاش ئەوەی بابەتی وەرگێڕان بۆ پتر لە سیانزە ساڵ چووە ناو بایەخدانەکانی منەوە، ئێستا ئەو کارەم بەلاوە شتێکی نامۆ نیە. ئەوکاتەی لە پاریس خۆم بۆ کارنامەی دکتۆرا ئامادە دەکرد، بۆم ڕەخسا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆو هەستپێکراو و بۆ یەکەمین جار تێکەڵ بە زانست و ڕۆشنبیریی خۆرئاوا بم. وەك کەسێکی سووری کە دەرچووی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی دیمەشقم و ڕۆشنبیریم لەوکاتەدا ڕۆشنبیرییەکی تەواو عەرەبی بوو، خاڵی بوو لە هەر کارتێکەرێکی دەرەکی تەنها هەندێ وەرگێڕانی پەرت و بڵاوی ئێرەو ئەوێ نەبێ. بیرم دێ کاتێ کتێبێکی وەرگێڕراوم دەست دەکەوت هەستم بە ئازارو ناڕەحەتی دەکرد، زۆرجار تێنەدەگەیشتم ئەو کتێبە بەدیاریکراوی چی دەڵێ، ئەگەرچی دانەرەکەی زانایەکی گەورەی خۆرئاوا یان خۆرهەڵات بوو. لەگەڵ خۆمدا دەمووت: یان من توانای

تێگەیشتنم نیە، یان وەرگێڕەکە توانای گواستنەوەی نیە. بەڵام پتر بۆ ئەگەری دووەمیان دەچووم، چونکە زمانەکەی، بە شێوە عەرەبی بوو، بەڵام لە پێکهات و ناوەڕۆکدا تاریک و تەمومژاویو لەق بوو. دواتر تێگەیشتم بۆچی خوێنەری عەرەبی دەمودەست کتێبی وەرگێڕراو تووڕدەدات، بۆچی بە چاوێکی پڕ لە گومانەوە سەیری دەکات. بۆم دەرکەوت ئەو خوێنەرە هەقێتی. پاشان خۆم چوومە نێو دنیای وەرگێڕانەوەو دەستمکرد بە گواستنەوەی بابەتی فیکری لە زمانی فەرەنسییەوە بۆ زمانی عەرەبی. ئیدی بارستایی ئەو ناستەنگ و زەحمەتییانەم بۆ دەرکەوت کە دوچاری هەموو وەرگێڕێکی زانستە مرۆڤایەتیەکان دەبێت، پاشان لە مانای وەرگێڕان و لە قەبارەی ئەو بەرپرسیارییە تێگەیشتم کە خراوەتە سەرشانی وەرگێڕەکان، ئەمە ئەگەر بیانەوێ بە شێوەیەکی چاك و جیدی کارەکەیان ئەنجامبدەن، بگرە گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی بڵێم پرۆسەی وەرگێڕان بەر لە هەر شتێك بریتیە لە بەرپرسیارییەکی ئەخلاقی. ئیدی وەرگێڕانی خراپ (یان وەرگێڕانی خێراو بە پەلەو تەمومژاوی)م وەك خیانەتێك لە قەڵەم دەدا لە بەرامبەر خوێنەری عەرەب و خودی زمانی عەرەبی. کەواتە وەرگێڕان بریتیە لە مەسەلەی ناپاکی یان دەستپاکی (خیانەت یان ئەمانەت) و دەبێ یەکێکیان هەڵبژێرێ (بەو مانایەی وەرگێڕان مەسەلەیەکی ئەخلاقیی کەسییە).

فیکری هاوچەرخی عەرەبی تا ئێستا لە ڕووی لۆکاڵیەوە، لە هەندێ بەشی زۆر کەمدا نەبێ، فیکرێکی نابەرهەمهێنەرە. زۆربەی میتۆدو بیرە نوێیەکان بەم یان بەو شێوەیە لە دەرەوە هێنراون، ئینجا خۆتان مەزەنەی قەبارەی ئەو زیانە گەورانە بکەن کە لە پرۆسەی وەرگێڕان و لە وەرگێڕەکانەوە بەرهەم دەهێنرێن. ئەم زیانە گەورانە دەبنە مایەی شێواندنی سەرجەمی نەوەیەك و سەرجەمی ڕۆشنبیرییەك، ئەمە لە ڕاستیدا بەرپرسیارییەکی نەتەوەییە لە بەرامبەر وەچە عەرەبیەکانی مەغریب و مەشریقدا. وەختە گرەنتی ئەوە بدەم و بڵێم ڕێنیسانسی داهاتووی عەرەب تا ئەندازەیەکی گەورە لەسەر ڕادەی سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی پرۆژەی وەرگێڕان ڕادەوەستێ. هەمووشمان دەزانین وەرگێڕان لە چەرخی کلاسیکیدا چ دەورێکی گرنگی هەبوەو چۆن خرابوە ناو کرۆکی پرۆژەی ژیاری عەرەبیی ئیسلامییەوە.

وتم وەرگێڕان مەسەلەی دەستپاکی یان ناپاکییە، بێگومان دەبێ ئەوەیشی بۆ زیادبکەم کە وەرگێڕان مەسەلەی مەعریفە یان نەبوونی مەعریفەیە. نەزانیو بێئاگایی ناتوانێ وەرگێڕانێکی ڕاست و دروست بەرهەمبهێنێ. وەرگێڕی بابەتی فیکری (یان وەرگێڕی فیکر) دەبێ خۆیشی ڕووناکبیر بێت یان پرۆژەی ڕووناکبیر بێت، دەنا پێویست ناکات بچێتە نێو دنیای وەرگێڕانەوە. وەرگێڕان -بە تێڕوانینی من- پرۆسەیەکی نێگەتیڤی هەڵچوو نیە، بەڵکو پرۆسەیەکی پۆزەتیڤی کاریگەرە. ئێمە

وتم وەرگێڕان مەسەلەی دەستپاکی یان ناپاکییە، بێگومان دەبێ ئەوەیشی بۆ زیادبکەم کە وەرگێڕان مەسەلەی مەعریفە یان نەبوونی مەعریفەیە. نەزانیو بێئاگایی ناتوانێ وەرگێڕانێکی ڕاست و دروست بەرهەمبهێنێ

هەر لە ئێستاوە تا ساڵانێکی دوورو درێژی دیکە پێویستمان پێیەتی مادامەکی بەرهەمی خۆمان بۆ فیکر تا ئێستاش سنووردارە. لەو باوەڕەشدا نیم وەرگێڕان بەپێی خواست و پێویست سەرکەوتوو بێت تەنها ئەوکاتە نەبێ کە کۆمەڵێ سێنتەری توێژینەوەو وەرگێڕانی نوێ دابمەزرێو توێژەران و وەرگێڕەکانیش بە تەواوی‌و بۆ ساڵانێکی زۆر خۆیانی بۆ تەرخان بکەن. عەرەب لەم بوارەدا زۆر کەمدەست و بێباکن، من نازانم چۆن دەشێ فیکرێکی نوێی عەرەبی سەرهەڵبداو گەشەبکات ئەگەر بەو قۆناغە سەرەتاییەدا نەڕوات. ئێمە لەم بوارەدا کەموکورتیمان گەلێ زۆرەو لە وەرگێڕاندا زۆر هەژارین ئەگەر خۆمان بە وڵاتێکی بۆ نموونە وەکو ژاپۆن بەراورد بکەین، ئەو وڵاتەی بە گەورەترین وڵاتی وەرگێڕی دنیا دادەنرێ‌و ئێمە ئاستی ڕابوون و گەشەکردنی خێرای ئەو وڵاتە دەزانین کە چۆن ڕکابەریی وڵاتانی ئەورووپاو خۆرئاوا دەکات و لە هەموو ئاستەکاندا هەڕەشەیان لێدەکات کە پێشتر شتی لێوەردەگرتن و بۆ ماوەیەکی درێژ لاسایی دەکردنەوە.

لێرەدا باسی زانستە وردەکان یان زانستە سروشتییەکان ناکەم کە چەندە پێویستمان بە وەرگێڕانیان هەیە، بەڵکو تەنها باسی بواری وەرگێڕان دەکەم تایبەت بە زانستە مرۆڤایەتیەکان یان بەشێك لە زانستە مرۆڤایەتیەکان. ئەم باسەش لە خۆیدا لە تواناو وزەی من گەورەترەو ناشێت لەم کورتە نووسینەدا لە هەموو لایەنەکانی بدوێم.

سەرەتای دەستپێکردن و یەکەمین کاری من بریتی بوو لە وەرگێڕانی کارەکانی محەمەد ئەرکۆن لە بواری فیکری ئیسلامیدا، یان ئەوەی لە زمانە خۆرئاواییەکاندا بە "ئیسلامۆلۆژی" ناودەبرێ. ئەم هەڵبژاردنەش بە هۆی گرنگی بابەتەکەو بایەخی زۆری سەبارەت بە کۆمەڵگا عەرەبی‌و ئیسلامیەکان، خۆی دەسەپێنێ. ئەوکاتەی بەر لە سیانزە ساڵ دەستم بە وەرگێڕانی محەمەد ئەرکۆن کرد، ڕووبەڕووی چەندین زەحمەتی و ئاستەنگ بوومەوە، بۆ نموونە: چۆن دەکرێ زاراوەکانی زانستە مرۆڤایەتییە نوێیەکانی وەك (سۆسیۆلۆژیا، زانستی مێژوو، ئەنترۆپۆلۆژیا، زانستی زمانەوانی، سیمیۆلۆژیا، ئیپستیمۆلۆژیا، زانستی بەراوردکاریی ئاینەکان، سۆسیۆلۆژیای ئاینەکان، فەلسەفەو.. هتد) بگوازرێنەوە بۆ گۆڕەپانی (ستادیۆمی) زمانی عەرەبی؟

ئاشکرایە خۆرئاوا شۆڕشێکی مەعریفی گەورەی بەخۆوە بینی‌و ئەم شۆڕشە وای لە خۆرئاوا کرد سنورەکانی تازەگەریی کلاسیکی یان پۆزەتیڤیزم (الوضعية) جێبهێڵێ تا بچێتە نێو قۆناغی تازەگەریی نوێوە یان قۆناغی پاش تازەگەری (پۆست مۆدێرنیزم) (ئەگەر ئەم وشەیە مانایەکی هەبێت، چونکە پۆست مۆدێرنیزم خودی

لەو باوەڕەشدا نیم وەرگێڕان بەپێی خواست و پێویست سەرکەوتوو بێت تەنها ئەوکاتە نەبێ کە کۆمەڵێ سێنتەری توێژینەوەو وەرگێڕانی نوێ دابمەزرێو توێژەران و وەرگێڕەکانیش بە تەواوی‌و بۆ ساڵانێکی زۆر خۆیانی بۆ تەرخان بکەن

مۆدێرنیزمە). لە دوای جەنگی دوەمی جیهانیو کۆتایی قۆناغی داگیرکاری (ئیستیعمار) پرۆسەیەکی ڕەخنەیی گەورەو سەرلەنوێ پێداچوونەوەیەکی سەرجەمگیرو فراوان دەستیپێکرد بۆ ئەزموونی کلاسیکیی خۆرئاوا بە هەموو لایەنە چاك و خراپەکانیەوە. ئەمەش لە فەلسەفەو لە زانستە مرۆڤایەتیەکاندا ڕەنگی دایەوە (ڕەخنە لە عەقڵی خۆرئاوایی، ڕەخنە لە سێنترالیزمی ئیتنیی ئەورووپی، ڕەخنە لە لادانی عەقڵی ڕۆشنگەری لە ڕێچکەکەی خۆی، هەڵوەشاندنەوەی میتافیزیکیای خۆرئاوایی، داماڵینی ئارکیۆلۆژیایی ڕیشەی ژیاری ئەورووپیو دەرخستنی ڕێژەگەریو مێژووگەریی ئەو ژیارە..).

وام هەستدەکرد لە هەڵوێستێکی دژوارو قورسدام: منێکی عەرەبی مەشریقی کە هێشتا لە بنەماکانی تازەگەریی کلاسیکی ئەورووپی تێنەگەیشتووم کە بە عەمەلی لە سەدەی شانزەهەمەوە دەستیپێکردووە (واتە ساتەوەختی دیکارت لە بواری زانستدا یان ساتەوەختی لۆثەر لە بواری ڕیفۆرمی ئاینیدا) و پاشان لە چەرخی ڕۆشنگەریو لە سەدەی هەژدەیەمدا بەردەوام بوەو درێژبۆتەوە بۆ چەرخی پیشەسازیو پۆزەتیڤیستی سەدەی نۆزدەهەم و هەتا کۆتایی جەنگی دوەمی جیهانی، میللەتانی داگیرکردووە، دەڵێم منێکی عەرەبی مەشریقی چۆن دەشێت لە زاراوەو میتۆدەکانی تازەگەریی نوێ (یان پۆست مۆدێرنێتیو پۆست مۆدێرنیزم) تێبگەم لە کاتێکدا زاراوەکانی تازەگەریی کلاسیکی (یان مۆدێرنێتی)م هەرس نەکردوە؟ ئەمە سەبارەت بە ڕۆشنبیریی عەرەبی چ مانایەکی هەیە؟ من هاوچەرخی چیم؟ هاوچەرخی کێم؟ من لە کوێم؟ باوەڕم وایە ئاشنایەتیم لەگەڵ محەمەد ئەرکۆن لەم ئاستەدا شتێکی یەکلاکەرەوە بوو. ئەم پیاوە موسڵمانەو سەر بە وڵاتێکی ئیسلامیە، سەرجەمی توێژینەوەو کێشە مەعریفیەکانی لە بارەی ئیسلامەوەیە، ئیسلام وەك ئایین و وەك کولتوورو وەك ژیار. پاشان ئەویش -بەر لە من- ناچار بوە بە هەمان ئەزموونداتێپەڕیو هەمان ڕێچکە ببڕێ. هیچ بیریارێکی ئەورووپی- هەرچەندێ ئاستێکی بڵندیشی هەبوایە- نەیدەتوانی بە قەدەر محەمەد ئەرکۆن یارمەتیم بدات لە چوونە نێو ئەو ئەزموونەوە، چونکە بیریاری ئەورووپی سەر بە یەك کەلەپوورە نەك دوو کەلەپوورو یەك کێشەی هەیە نەك دوو کێشە. تەنانەت خۆرهەڵاتناسێکیش نەیدەتوانی لەم بوارەدا یارمەتیم بدات، چونکە ئەگەر زۆر بە چاکیش ئاگاداری کەلەپووری ئیسلامی بێت بەڵام کێشەی ئەو کێشەیەکی ئیسلامی و عەرەبی نیە. پێویستیم بە کەسێکی دیکە هەبوو کە بە ئاگری ئەو ئەزموون و کێشەیە سووتابێت و مانای نامۆبوونی لە خود زانیبێو چووبێتە ناو خودێکی دیکەوە بەرلەوەی -لە پاش دابڕان- بگەڕێتەوە ناو خودی یەکەمی خۆی. بەڵام کاتێ کارم لەسەر محەمەد ئەرکۆن کردو دەستم بە

منێکی عەرەبی مەشریقی چۆن دەشێت لە زاراوەو میتۆدەکانی تازەگەریی نوێ (یان پۆست مۆدێرنێتیو پۆست مۆدێرنیزم) تێبگەم لە کاتێکدا زاراوەکانی تازەگەریی کلاسیکی (یان مۆدێرنێتی)م هەرس نەکردوە؟

ئاشکرایە سەرکەوتوویی هەر زاراوەیەك بەوە دەپێورێ کە چەندە توانای کارکردنی لەسەر فراوانترین ناوەندا هەیە، سا ئەگەر ئەو زاراوەیە تەنها بۆ ژینگە ئەسڵیەکەی خۆی بگونجێو تەنها لەناو کەلەپوورەکەی خۆیدا پراکتیزە بکرێ، ئەوا بایەخ و گرنگییەکی سنورداری دەبێت

وەرگێڕانی کرد، هەستم بە غوربەتێکی زۆر نەکرد چونکە من دواجار لەسەر کەلەپووری خۆم کاردەکەم و هەواو عەتری مێژوویی ئەو کەلەپوورە هەڵدەمژم. بەمجۆرە توانیم لەسەر دەستی ئەرکۆن و لە میانی ئەوەوە بچمە نێو کەشوهەوای زانستە مرۆڤایەتیە نوێیەکانەوەو بۆم ڕەخسا بە بەردێك لە دوو چۆلەکە یان زیاتر بدەم:

1-من یەکەمجار لەنێو خۆم دەردەچم و دەچمە ناو نادیاریی ئەزموون و سووچە تاریك و قووڵەکانی فیکرەوە.

2-ئاشنایەتی لەگەڵ میتۆدو کەرەستەو چەمکی زانستی پەیدا دەکەم، ئەوانەی سەر بە گشت ئەو بوارانەن کە پێشتر ناوم هێنان.

3-ئاشنایەتیم لەگەڵ زاراوەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکان لە میانی پراکتیزەکردنیانەوە بەسەر کەلەپوورو زمان و ئایینەکەی خۆمدا.

4-قەبارەی ئەو دەستکاریو ڕاستکردنەوانەم بۆ ئاشکرا دەبێت کە ئەرکۆن بەسەر ئەو زاراوانەدا دەیانهێنێ بۆ ئەوەی لەگەڵ کەلەپوورێکی دیکەی غەیری کەلەپووری ئەوروپی- مەسیحی بێ یان عەلمانیکراو- بگونجێت.

زۆرجاریش تێدەگەیشتم ئەو زاراوانە تەنها سوودبەخش نەبوون بۆ تێگەیشتن و ڕۆشنکردنەوەی کەلەپووری ئیسلامی، بەڵکو کەلەپووری عەرەبی ئیسلامیش بە دەوری خۆی سوودبەخش بوە بۆ زانستە مرۆڤایەتییە نوێیەکان و دەوڵەمەندکردنیان، بە تایبەتی ئەو کاتەی سنووری میسداقیەتیان دەردەکەوێ کاتێ دەخرێنە سەر مەحەکی ئاینێکی دیکە یان ئەزموونێکی مێژوویی دیکە. ئاشکرایە سەرکەوتوویی هەر زاراوەیەك بەوە دەپێورێ کە چەندە توانای کارکردنی لەسەر فراوانترین ناوەندا هەیە، سا ئەگەر ئەو زاراوەیە تەنها بۆ ژینگە ئەسڵیەکەی خۆی بگونجێو تەنها لەناو کەلەپوورەکەی خۆیدا پراکتیزە بکرێ، ئەوا بایەخ و گرنگییەکی سنورداری دەبێت. بەمجۆرە من چوومە ناو پرۆسەیەکی مەعریفی ئاڵۆزو بەنێو یەکداچووەوە کە نە سەرەتای هەیە نە کۆتایی.

دەقەکانی ئەرکۆن دەمبەنە سەر دەقەکانی زانایانی مێژوو و کۆمەڵایەتیو زمانەوانیو ئایینەکان و لە میانی ئەو کارە پراکتیزەییانەی کە ئەرکۆن لەسەر کەلەپووری ئیسلامیدا ئەنجامیان دەدات، تەفسیرو تێگەیشتنم بۆ زانستە مرۆڤایەتیەکان دەبێت. بەمجۆرە مەبەست و خاڵی بنەڕەتی خۆم دۆزیەوە لە پێناوی چوونە نێو پرۆسەیەکی مەعریفی گەورەوە کە تا ئەم ساتەوەختەش لە ناویدا دەژیم.

دەمودەست بۆم دەرکەوت بۆ خۆخستنە نێو ئەم ئەرکەوە دەبێ بە سێ قۆناغی بنەڕەتیدا تێپەڕم کە سەرەتا وا دەردەکەوێ ئەو سێ قۆناغە پێکەوە بەستراوو بەنێو یەکدا چوون، بەڵام هاوکات جیاوازیشن:

1- تێگەیشتن لەهەر زاراوەیەك لەناو سەرزەمینی خۆیو لە شوێنی لەدایکبوونی خۆیدا (سا ئەو زاراوەیە سەر بە زانستی زمانەوانی بێت یان سەر بە سیمیۆلۆژیا، یان سۆسیۆلۆژیا، یان زانستی مێژوو بە ڕێگەی قوتابخانەی حەولیات و مێژووی عەقڵیەتەکان، یان زانستی بەراوردکاریی ئایینەکان، یان زانستی ئیپستیمۆلۆژیا، یان ڕەخنەی ئەدەبی..).

ئەم زانستە مرۆڤایەتیانە بە هەموو زاراوەو پێکهاتەکانیانەوە بەرهەمی ئەزموونی تایبەتی خۆرئاوان یان بەرهەمی کۆششی تایبەتی خۆرئاوان بەسەر خودی خۆیداو بە درێژایی ئەم چەند سەدەیەی دوایی یان ئەم چەند دەیەی دوایی کاری لەسەر کردوون. ئەگەرچی ئەمانە مۆرکێکی تەواو مەعریفییان هەیە بەڵام ناشێت بە تەواوی لەو کۆنتێکستە (سیاقە) تایبەتییەی جیابکەینەوە کە بەرهەمی هێناون (مەبەستم سیاقی سیاسیو کۆمەڵایەتیە). لێرەوە ئەم پرەنسیپە ئیپستیمۆلۆژیە گرنگە سەرهەڵدەدات: زانستە مرۆڤایەتیەکان زانستی وردکاری نین، سەرباری زانستیبوون و وردبوونیان بەڵام زانستییەکی ڕێژەییو وردبینیەکی ڕێژەییان تیایە. ڕاستە زانستە مرۆڤایەتیەکانی ئایدیۆلۆژیا نین -بە مانای نێگەتیڤی وشەی ئایدیۆلۆژیا- بەڵام ئەگەرو شیانی ئەوەیشیان هەیە لەلایەن ئایدیۆلۆژیاکان و بەرژەوەندیەهەنوکەییەکان و نیازە نەتەوەییو شەخسییەکانەوە دیودەرە بکرێن و سوودیان لێ وەربگیرێ.

2- تێگەیشتن لە چۆنێتی گواستنەوەی ئەو زاراوەیە لە زمانە ئەسڵیەکەیو لە ژینگەکەی خۆیەوە (کە لێرەدا زمانی فەرەنسیو ژینگەی ئەوروپیە) بۆ زمانێکی ترو ژینگەیەکی تر (ئەمەش لێرەدا زمانی عەرەبیو کەلەپووری ئیسلامیە). لە کاتی پرۆسەی گواستنەوەو چاندنی ئەو زاراوەیەدا -وەك پێشتر وتم- زاراوەکە دوچاری دەستکاریو گۆڕانکاری دەبێت بۆ ئەوەی لەگەڵ ژینگە نوێیەکەیدا بسازێت و وا دەرنەکەوێ کە بە زۆر هێنراوە.

3- دانانی وشەیەکی عەرەبی یان زاراوەیەکی دروست و سەرکەوتوو لە بەرامبەر ئەو زاراوانەی لە زمانەکانی دیکەو لە کەلەپوورەکانی دیکەوە هێنراون و بەسەر زمانو کەلەپووری ئێمەدا پراکتیزە دەکرێن (دەشێت ئەم زاراوەیە -بە عەرەبی- یەك وشە بێت یان ڕستەیەك یان پێکهاتێکی زمانەوانی بێت). هەندێجار تێگەیشتنی تەنها زاراوەیەك بۆ من چەند ساڵێکی خایاندووە، هەمان شێوە سەبارەت بە زاراوەکانی فۆکۆش کە دواتر دێمە سەری.

دان بەوەدا دەنێم کە وەرگێڕانی کارەکانی ئەرکۆن ناچاری کردم سەفەرێك بەناو سەرجەم زانستە مرۆڤایەتیو کۆمەڵایەتیەکاندا بکەم. هەندێجاری تریش ناچاری دەکردم لە دەرسەکانی ئەو مامۆستاو بیریارانە ئامادەبم کە لە یەك کاتدا (فیکـــــر) و

دان بەوەدا دەنێم کە وەرگێڕانی کارەکانی ئەرکۆن ناچاری کردم سەفەرێك بەناو سەرجەم زانستە مرۆڤایەتیو کۆمەڵایەتیەکاندا بکەم

له میانی ئەزموونی خۆمەوە بۆم دەرکەوت ئەگەر وەرگێڕان حەرفی بێت (واتە وەرگێڕانی وشە بە وشە) مومکین نییە وەرگێڕانێکی سەرکەوتوو بێت (بەو مانایەی وەرگێڕ نەچێتە قووڵایی ئەو فیکرەی وەریدەگێڕێ)

(زاراوە)یش دروست دەکەن. بێگومان هیچ فیکرێکی نوێ بەبێ زاراوەیەکی نوێ بوونی نابێت (تەنها گەورە بیریاران دەتوانن بگەنە گەلاڵەکردنی چەند زاراوەیەکی نوێی تایبەت بە خۆیان. بەڵام بیریارە ئاساییەکان ئەوا تەنها شان دەدەنە بەر زاراوەی کەسانی دیکە). ئەمە مانای وایە سەردەمی (فیکری گشتی) کە دەڵێ "هەموو شتێ لە بارەی هیچ شتێ یان هیچ شتێ لە بارەی هەموو شتێ" تەواوبوە یان خەریکە لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی عەرەبیدا کۆتایی پێدێت. (هەر فیکرێك پشت بە زاراوەیەکی ورد نەبەستێ کە بشێ کۆنترۆڵ بکرێ، ئەوا لە دەرەوەی بازنەی فیکردایە).

لە میانی ئەزموونی خۆمەوە بۆم دەرکەوت ئەگەر وەرگێڕان حەرفی بێت (واتە وەرگێڕانی وشە بە وشە) مومکین نییە وەرگێڕانێکی سەرکەوتوو بێت (بەو مانایەی وەرگێڕ نەچێتە قووڵایی ئەو فیکرەی وەریدەگێڕێ)، بەڵام بە داخەوە زۆر درەنگ زیانەکانی وەرگێڕانی حەرفیم بۆ دەرکەوت و لە قۆناغی یەکەمی کارکردنمدا نەمدەتوانی خۆمی لێ دووربخەمەوە (ئەمەش بوە هۆی ئەوەی سەرەتای کاری وەرگێڕانم مۆرکێکی حەرفی پێوەبێت، ئێستا هەوڵدەدەم بەهەر شێوەیەك بێت خۆمی لێ ڕزگاربکەم).

بێگومان دەبێ وەرگێڕیش -وەك دانەر- شارەزاییەکی فراوانی هەبێت و توانای تێگەیشتنی لە وردترین تیۆرو زاراوە زانستیەکانیدا هەبێت، دەنا وەرگێڕانەکەی سەرکەوتوو نابێت هەتا ئەگەر زۆر بە چاکیش شارەزایی لە هەردوو زمانی عەرەبیو فەرەنسیش هەبێت. واتە زانینی زمان بە تەنها بەس نیە، وەرگێڕانی وشە بە وشەش بە مسۆگەری بەرەو وێرانیی دەبات. گەورە وەرگێڕەکانی ئێمە لە چەرخی کلاسیکیدا لەم مەسەلەیە تێگەیشتبوون، بۆ نموونە (حەنین بن ئیسحاق)، ئەم وەرگێڕە مەزنە دەیوت وەرگێڕانی یەك دەقی یەك ڕووناکبیر ناچاری دەکرد بەرلەوەی دەقەکەی وەربگیرێ، بە هەموو نووسینەکانی تریدا بچێتەوەو بیانخوێنێتەوە، چونکە دەیویست ڕۆحی دەقەکە بگرێ نەك تەنها فۆرم و قاڵبە دەرەکییەکەی. ئەمەش لە پەنسیپی بنچینەیی زانستی هاوچەرخی وەرگێڕاندا هەیە: دەبێ دەقی وەرگێڕراو بە جۆرێ دەربکەوێ کە وەرنەگێڕراوە، واتە وەك ئەوەی ڕاستەوخۆ بەو زمانە نووسرابێت کە بۆی وەردەگێڕرێ و نابێ بە هیچ جۆرێ ئاسەواری وەرگێڕانی پێوە دیاربێت. ئەمەش لە وەرگێڕانی ئەو کتێبە فیکرییانەدا دەبینین کە لە زمانی ئەڵمانی یان ئینگلیزییەوە وەردەگێڕرێنە سەر زمانی -بۆ نموونە- فەرەنسی، ئەوەی کە ئێمە تا ئەمڕۆش بە حەسرەتین بۆیو ئێمە تا ئێستاش دوورین لە بەدیهێنانی ئەم ئامانجە. بارودۆخی وەرگێڕان لە لای ئێمە تەواو پێچەوانەی بارودۆخی وەرگێڕانە لە فەرەنسە، لەوێدا زۆربەی کتێبە گرنگەکان لە زمانە بیانیە زیندووەکانەوە وەردەگێڕرێن. داخۆ هۆی


میشێل فۆکۆ

ئەمە چی بێت؟ لە ڕاستیدا هۆی ئەمە -بە بۆچوونی من- ناگەڕێتەوە بۆ دواکەوتوویی زمانی عەرەبی یان ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زمانی ئێمە توانای وەرگرتن و ئیستیعابکردنی زانستەکانی سەردەمی نیە وەك هەندێ کەسی فریودراو و فریودەر دەیانەوێ وامان تێبگەیەنن، بەڵکو هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەزانیو پاشکەوتوویی ئەو کەسانەی ئەم کارە ئەنجام دەدەن و لە شارستانیەتی نوێ دابڕاون و نەیانتوانیوە بە درێژایی چەندین سەدە بە شێوەیەکی پێویست و گونجاو خزمەتی ئەم پرۆسەیە بکەن. مومکین نییە هیچ فیکرێکی عەرەبیی نوێو بەرپرس لە داهاتوودا ڕابێت و بکەوێتە سەرپێ تەنها ئەوکاتە نەبێ کە زمانی ئەو فیکرە عەرەبی بێت و بە عەرەبی نووسرابێت. ئەمە ڕاستییەکە ناشێت بە هیچ جۆرێ قسەو گفتوگۆی لەسەر بکرێ.

بۆ ئەوەی قسەکانم مۆرکێکی گشتیو موجەڕەدیان نەبێت، چەند نموونەیەك لە بارەی ئەو ئاستەنگ و زەحمەتیانە دەهێنمەوە کە لە ساتەوەختی پرۆسەی وەرگێڕاندا ڕووبەڕووم دەبوونەوەو چۆن هەوڵم دا وردە وردە چارەسەریان بکەم و چۆن لە ماوەی ساڵانی کارکردنمدا شێوەی هەندێ لەو چارەسەرانەم گۆڕی یاخود دەستکاریم کردن.

## ئەرکۆن و فۆکۆ

کاتێ بینیم محەمەد ئەرکۆن زاراوەکانی میشێل فۆکۆ بەکاردەهێنێ، بە تایبەتی زاراوەی ئیپستیمی (*Episteme*)، لە سەرەتادا تێنەدەگەیشتم مەبەستی چیە. بێگومان مانای فەرهەنگیی ئەم وشەیە زانراوە، بەڵام لێرەدا هەمیشە فەرقێکی گەورە هەیە لە نێوان مانای فەرهەنگیو مانای زاراوەییدا. بلیمەتی هەموو فەیلەسووفێکی گەورەش لەوەدایە بتوانێ لە وشەیەکی ئاساییدا زاراوەیەکی داهێنراو بەکاربێنێو تیۆرییەکی کاملی لەسەر بنیات بنێ (مانای ئاسایی وشەی ئیپستیم لە زمانی گریکیدا واتە: زانست)، بەڵام مانای زاراوەیی ئەم وشەیە وەك ئەوەی میشێل فۆکۆ لە کتێبی "وشەکان و شتەکان"دا گەڵاڵەی کردوە، ئەوا شتێکی تری تەواو جیاواز دەگەیەنێت لە سەرەتادا زاراوەکەم وەکو خۆی -ئیپستیمی- دەگواستەوە نێو زمانی عەرەبیو پاشان ڕستەیەکی دوورو درێژم بۆ شەرحکردنی دادەنا، بەمجۆرە: "کۆی ئەو موسەللەماتە ناوەکییانەی لە ماوەیەکی دیاریکراودا تەحەکوم بە گشت بەرهەمێکی فیکرییەوە دەکات بێئەوەی لە ڕووکاردا دەربکەوێت"، ئەمە نائاگایی مەعریفیی سەرانسەری ماوەیەك یان قۆناغێکە. هەندێ کەس بەو جۆرە تێیگەیشتن کە لە بری (ڕوانینی دنیا)یە لە ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراودا. هەرچۆنێك بێت سەرجەمی کتێبەکەی فۆکۆ کە چوارسەد لاپەڕەیە لەسەر ئەم زاراوەیە بنیات نراوە، بەڵام کاتێ بابەتی زیاترم لە بارەیەوە خوێندەوەو پتر بەدوایدا چووم، ئیدی زاراوەکەم بەم چەشنە

لێرەدا هەمیشە فەرقێکی گەورە هەیە لە نێوان مانای فەرهەنگیو مانای زاراوەییدا. بلیمەتی هەموو فەیلەسووفێکی گەورەش لەوەدایە بتوانێ لە وشەیەکی ئاساییدا زاراوەیەکی داهێنراو بەکاربێنێو تیۆرییەکی کاملی لەسەر بنیات بنێ

دەکرد بە عەرەبی: (المنظومة الفكرية) -سیستمی فیکری، دواجاریش ڕای خۆم لەسەر ئەم زاراوەیە بە (نظام الفكر) سەقامگیر کرد، بەو شێوەیە ناچاربووم زیاد لە جارێك هەڵوێستی خۆم لە بارەی ئەو زاراوەیە بە عەرەبی بگۆڕم. بێگومان ئەرکۆن ئەم زاراوەیەی بۆ چەرخبەندیی فیکری عەرەبی- ئیسلامی لە ڕووی ئیپستیمۆلۆژییەوە بەکارهێناوە -واتە لە قوڵایدا- نەك لە ڕووی سیاسییەوە وەك باوە: (سەرەتای ئیسلام، چەرخی ئومەوی، چەرخی عەباسی.. هتد)، دەشێت سوڵالات و ڕژێمەکان بگۆڕدرێن و فیکر هەروەکو خۆی بەبێ گۆڕان بمێنێتەوە.

لە ڕاستیدا ئەم زاراوەیەی فۆکۆ مەسەلەی (دابڕان) و (بەردەوامێتی) لە مێژووی فیکردا دەخاتەڕوو، ئەمەش مەسەلەیەکی ئیپستیمۆلۆژیی سەخت و دژوارە، بگرە یەکێکە لە گرنگترین ئەو مەسەلانەی حاڵی حازر ژینگە ئیپستیمۆلۆژییە خۆرئاواییەکانی خەریك کردووە، ئەم مەسەلەیە لە بواری زانستە وردەکاندا خراوەتەڕوو هەروەکو لە بواری فیکرو زانستە مرۆڤایەتیەکانیشدا بە هەمان شێوە خراوەتەڕوو (لەم بارەیەوە بڕوانە توێژینەوەکانی- تۆماس کون-ی ئەمەریکی لە بارەی "نموونەی باڵا" *Paradigme* کە بە درێژایی ماوەیەکی دیاریکراو و لە وڵاتێکی دیاریکراودا دەسەڵاتی بەسەر گرووپی زانایاندا هەبوو. هەروەها بڕوانە "تیۆری کارەساتەکان"ی زانای ماتماتیکی فەرەنسی ڕینێ تۆم). هەموو ئەمانە لە دەوری مەسەلەی (دابڕان) لە مێژووی زانستەکاندا، دەخولێنەوەو هەروەها لە بارەی چۆنێتیی تەفسیرکردنی. لێرەدا وشەی "کارەساتەکان" بە شێوەیەکی میتافۆری (مەجازی) بەکارهێنراوە نەك حەرفی. لە مێژووی فیکرێکدا چ کاتێ دابڕان ڕوودەدات؟ ئەو مەرجە بابەتیانە چین کە دەبێ لەبەردەستدا بن بۆ ئەوەی دابڕان ڕوویدات؟ واتە بۆ ئەوەی خەڵکی کتوپڕ واز لەو جۆرە بیرکردنەوەیە بێنن کە پێشترو بۆ دەیان ساڵ بیریان دەکردەوە.

پاشان ئەرکۆن زاراوەیەکی تری بەکارهێناوە وەك دەلالەتێك بۆ وشەی ئیپستیمی، ئەویش زاراوەی (فەزای عەقڵی)یە *Lespace Mental*، بۆ نموونە ئەرکۆن دەڵێ: فەزای عەقڵیی سەدەکانی ناوەڕاست /یان فەزای عەقڵیی نوێ‌و ئەو دابڕانەی لە سەدەی هەژدەهەمی ئەورووپیدا هەردوو فەزاکە لە یەکتر دەترازێنێ. (کەچی فیکری ئیسلامی یان عەرەبی تا ئێستاش لەبەردەم دەرگاکانی ئەم دابڕانەدا وەستاوە بێئەوەی جورئەتی شکاندنی دەرگاکان و چوونە ژوورەوەی هەبێت). ئەرکۆن ناچارە بەراوردکارییەك بکات لە نێوان چەرخبەندیی ئیپستیمۆلۆژیای فیکری ئەورووپی/ و چەرخبەندیی ئیپستیمۆلۆژیای فیکری عەرەبی بۆ ڕوونکردنەوەیەکی زیاتری دیمەنەکە. دەبێ هەموو ئەمانەش لە ماوەیەکی دیاریکراوو لە کۆمەڵگایەکی

ئەو مەرجە بابەتیانە چین کە دەبێ لەبەردەستدا بن بۆ ئەوەی دابڕان ڕوویدات؟ واتە بۆ ئەوەی خەڵکی کتوپڕ واز لەو جۆرە بیرکردنەوەیە بێنن کە پێشترو بۆ دەیان ساڵ بیریان دەکردەوە

دیاریکراودا بە چەند زاراوەیەکی ترەوە پەیوەست بکەین، وەك: ئەوەی بیری لێکراوەتەوە (المفكر فيه)، ئەوەی بیری لێنەکراوەتەوە (اللا مفكر فيه)، ئەوەی مەحاڵە بیری لێبکرێتەوە (المستحيل التفكير فيه).

لێرەدا زاراوەیەکی دیکەی فۆکۆ هەیە کە لە زمانی عەرەبیدا چەند جۆرێك وەرگێڕانی ورووژاندووە، ئەویش زاراوەی (ئارکیۆلۆژیا)یە، واتە ئارکیۆلۆژیای مەعریفە، یان ئارکیۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتییەکان. تێبینی ئەوەم کردووە بەشێك لە وەرگێڕەکانی مەغریب ئەم زاراوەیەیان بە (الحفريات) وەرگێڕاوە (واتە: هەڵکۆڵین یان هەڵکۆڵینەکان)، هەڵکۆڵینی مەعریفە، بەڵام من دە ساڵ زیاترە هەروەکو خۆی هێشتوومەتەوە، واتە: ئارکیۆلۆژیای مەعریفە. تا ئەمڕۆیش سوورم لەسەر ئەم وەرگێڕانە (واتە دانانی زاراوەکە وەکو خۆی) بێئەوەی ئەم قسەیەم لە بایەخی کۆششە گەورەکانی برادەرە توێژەرە مەغریبییەکان کەم بکاتەوە. ئێستاش بۆ ئەوە دەچم زاراوەی هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی (الحفر الاركيولوجي) بەکاربێنم وەك دەلالەتێك بۆ میتۆدێکی کامڵی فیکریو لەسەر شێوەیەکی دیاریکراوی تەماشاکردنی کەلەپوور.

## ئەرکۆن و سۆسیۆلۆژیا (پییێر بوردیۆ)

لێرەشدا دەبینین ئەرکۆن چەند زاراوەیەکی بەکارهێناوەو لەسەر کەلەپووری ئیسلامیدا پراکتیزەی کردوون. لەوانە بۆ نمونە زاراوەی (سەرمایەی ڕەمزی) - *Le Capital Symbolique* کاتێ قسە لە بارەی سەرمایەی ڕەمزیی ئیسلام دەکات و چۆن ئێستا هەندێ لە بزاوتە سیاسییەکان دەیانەوێ ئەم زاراوەیە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاربێنن لە پێناوی مۆبیلیزەکردنی لایەنگرانی خۆیان یاخود لە پێناوی گەیشتن بە دەسەڵات.

دەبێ ناوی زاراوەیەکی بنچینەیی دیکەش بهێنین، ئەویش زاراوەی گۆڕەپانە (الساحة) *Le Champ* وەك ئەوەی دەڵێین: گۆڕەپانی ئایینی، گۆڕەپانی فیکری.. هتد. لە سەرەتادا ئەم زاراوەیەم بە شێوەیەکی حەرفی بە کایە (الحقل) وەردەگێڕا، پاشان بۆم دەرکەوت زاراوەی گۆڕەپان (الساحة) باشترە، بەڵام هەندێجار سیاقی ڕستەکە وا دەخوازێ زاراوەی کایە (الحقل) بەکاربێنم. ئاشکرایە پییێر بوردیۆ ئەم زاراوەیەی لە زانستە وردەکانەوە خواستووە بەتایبەتی لە زانستی فیزیك بۆ ئەوەی گەورەترین ڕێژەی زانستێتی بە سۆسیۆلۆژیا ببەخشێ (بۆ نموونە لە فیزیادا دەووترێ: گۆڕەپانی کارۆموگناتیسی). دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ چەند کەرتێك یان بۆ چەند یەکەیەکی بچوك، پرۆسەی لێکۆڵینەوەکە ئاسانتر دەکاو شیکردنەوەی کۆمەڵگا وردبینتر دەکات وەك لەوەی بە یەك جار لێکۆڵینەوە لەسەر هەموو کۆمەڵگا بکرێ. بەمجۆرە دەڵێین:

دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ چەند کەرتێك یان بۆ چەند یەکەیەکی بچوك، پرۆسەی لێکۆڵینەوەکە ئاسانتر دەکاو شیکردنەوەی کۆمەڵگا وردبینتر دەکات، وەك لەوەی بە یەك جار لێکۆڵینەوە لەسەر هەموو کۆمەڵگا بکرێ

گۆڕەپانی ئایینی، گۆڕەپانی سیاسی، گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی، گۆڕەپانی ڕۆشنبیری، گۆڕەپانی هونەری، گۆڕەپانی ئابووری.. هتد، کۆی ئەمانەش سەرجەمی کۆمەڵگا پێکدەهێنن. هەموو گۆڕەپانێکیش "یاریزان" و یاسای گەمە ناوەکییە تایبەتیەکانی خۆی هەیە. دەشبێ هەریەکە لەو گۆڕەپانانە بە جیاو بە دوورو درێژی لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ بەرلەوەی بە هەموو بزاوتی کۆمەڵگاوە -وەك گشتێك- ببەسترێتەوە. بۆ نمونە بڕوانە ئەو ململانێیەی لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی عەرەبی یان فەرەنسیدا لەسەر سەرمایەی مەعنەوی (واتە نێوبانگ) یان سەرمایەی مادیدا دەکرێ. هەروەها بڕوانە ململانێی نێوان پیاوانی ئایین لە گۆڕەپانی ئاینیدا لە پێناوی مۆنۆپۆلکردنی هەیبەتو ڕەواییدا. ئەم هەیبەت و ڕەواییەش سەرمایەیەکی ڕەمزی پێکدەهێنێو پاشان بە خێرایی دەگۆڕدرێو دەبێ بە سەرمایەیەکی مادیی ڕاستەقینە. نێوبانگ دەبێتە هۆی دەستکەوتی پارەو پلەوپایە، واتە لە سەرمایەی مەعنەوییەوە دەبێ بە سەرمایەی مادیی ڕاستەقینە بە تایبەتی ئەگەر خاوەنەکەی بزانێت چۆنی بەکاربێنێت.

بەڵام وشەی -*Habitus*- م بەمجۆرە وەرگێڕاوە: (التقمص الجسدي للعقائد) و دەکرا بەمشێوەیەش وەربگێڕدرێ: ("العادة المستبطنة جسدياً" کە تاڕادەیەك بە شێوەیەکی نائاگایی تەحەکوم بە ڕەفتاری تاکەکەسەوە دەکات) ئەمە دەستەواژەیەکە لە بارەی ئەو شتانەی لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی خۆمانەوە وەریدەگرین و ئەوەی کە بمانەوێ یان نەمانەوێ تەحەکوم بە ڕەفتارو کاردانەوەکانمان دەکات. ئەمە ڕێسای ئەو گەمە ناوەکییە کە پابەندە بە بارودۆخی هەریەك لە ئێمە لەناو گۆڕەپانەکەدا، ئەو گۆڕەپانەی ڕەفتاری ئێمە بە ئاراستەیەکی دیاریکراودا دەبات. وەك ئاشکرایە هەرکەسێك شوێنگەیەکی تایبەتی لەو گۆڕەپانە کۆمەڵایەتیەدا هەیە کە ئینتیمای بۆ دەکات، ئەم شوێنگەیەش، بە بەراورد لەگەڵ شوێنگەکانی دیکەداو هەروەها لە حاڵەتی ململانێ یان تەبایی پۆزەتیڤی بێت یان نێگەتیڤی-، دیاری دەکرێ. (لێرەوە، تیۆریای بوردیۆ بە حەتمییەت تۆمەتبار کراوە، بەو مانایەی مرۆڤ لە کارو ڕەفتارەکانیدا موسەییەرە نەك موخەییەر، بەڵام لە واقیعدا پەراوێزێك بۆ ئازادی تاکەکەس جێدەهێڵێ سەرباری هەموو ئەو کۆتانەی شوێنگەکەی خۆی لە گۆڕەپانەکەدا دەیسەپێنێ بە هۆی مەرجدارێتی کۆمەڵایەتی یان ئایینی یان مەزهەبی یان پیشەیی..).

## زانستی مێژوو و ئایینەکان

لەنێو ئەو زاراوانەی کە قوتابخانەی بڵاوکراوەی ساڵانە -حولیات- (بە تایبەتی برۆدێل) دایهێناوە، لێرەدا ئەم زاراوانە هەیە: (ماوەی دوورو درێژی مێژوو)، (ماوەی مامناوەندیی مێژوو)، (ماوەی کورتی مێژوو). ئەمانەش بەسەر مێژووی مەسیحی-

بڕوانە ئەو ململانێیەی لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی عەرەبی یان فەرەنسیدا لەسەر سەرمایەی مەعنەوی دەکرێ. هەروەها بڕوانە ململانێی نێوان پیاوانی ئایین لە گۆڕەپانی ئایینیدا لە پێناوی مۆنۆپۆلکردنی هەیبەتو ڕەواییدا

ئەورووپیدا پراکتیك دەبن هەروەکو بەسەر مێژووی عەرەبی -ئیسلامیشدا پراکتیك دەبن. ئەم ماوە زەمەنییە مێژووییانە سوودیان بۆ لێکۆڵینەوە لە (دیاردەیەك) هەیە لە میانی چەند بینینێکی ماوەی کورت یان درێژی جیاجیا. لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان سەیرکردنی دیاردەیەك (بۆ نموونە دیاردەی "توندڕەوی") ئەگەر لە ماوەیەکی کورتی مێژوویی یان ماوەیەکی درێژی مێژوویی سەیری بکەین. (ماوەی کورت: لە چەند ساڵێکەوە تا بیست ساڵ دەگرێتەوە. ماوەی مامناوەندی: لە پەنجا ساڵەوە تا سەد ساڵ دەگرێتەوە. ماوەی دوورو درێژ: لە چەند سەدەیەکەوە تا هەزار ساڵ و زیاتریش دەگرێتەوە).

هەندێجار ناچاردەبین دیاردەیەك بخەینە ناو ماوەی دوورو درێژی مێژووەوە و لەوێوە سەیری بکەین بۆ ئەوەی لە ڕەگوڕیشە قووڵەکەی تێبگەین، چونکە جاری وا هەیە ئەگەر لە ماوەی کورتی مێژوودا لەو دیاردەیە بڕوانین و لێی بکۆڵینەوە ئەوا دەشێت لە ئاستی چەند دیوێکی ئەو دیاردەیەدا نابینابین و شتێکی زۆر کەمی لێ بزانین.

هەندێجار ناچاردەبین دیاردەیەك بخەینە ناو ماوەی دوورودرێژی مێژوووەوە و لەوێوە سەیری بکەین
بۆ ئەوەی لە ڕەگوڕیشە قووڵەکەی تێبگەین، چونکە جاری وا هەیە ئەگەر لە ماوەی کورتی مێژوودا لەو دیاردەیە بڕوانین،
ئەوا دەشێت لە ئاستی چەند دیوێکی ئەو دیاردەیەدا نابینابین و شتێکی زۆر کەمی لێ بزانین

بەڵام زاراوەی (*Anachronisme*)ی فەرەنسی، هەندێجار بە "هەڵەکاریی مێژوویی" (المغالطة التاريخية) وەرم دەگێڕاو هەندێجاری تریش بە (الاسقاط) و جاروبارێش بە هەردوو شێوەکە وەرم دەگێڕا.

زاراوەی ئۆرثودۆکسی (*Orthodoxie*)م هەروەکو خۆی گواستۆتەوە بۆ زمانی عەرەبی، ئەمە ئەگەرچی لەوانەیە ئەم وشەیە لە مانادا لەگەڵ مانای (مەزهەبی ئۆرثودۆکسی)ی مەسیحیدا تێکەڵ ببێت. بەڵام لە دواییدا ئەم تێکەڵکردنە نامێنێت ئەگەر زانیمان ئەم زاراوەیە لە بنەڕەتدا پێش مەزهەبی ئۆرثودۆکسی کەوتووە، مانا حەرفیەکەیشی واتە: هێڵی ڕاست یان ڕای دروست. بەڵام مانا زاراوەییەکەی بێگومان جیاوازە؛ مانا زاراوەییەکەی واتە: ناوکی پتەوی دۆگمایی داخراو بەسەر خۆیدا (واتە ناوکی پتەوی دۆگمایی ئاینێك یان ئایدیۆلۆژیایەك یان ڕەوتێکی سیاسی) کە هەر شتێك لە دەرەوەی خۆیدا بێت ڕەتیدەکاتەوەو بە سەرلێشێواو و گێرەشێوێنی لە قەڵەم دەدات. ئەم زاراوەیە شوێنێکی گرنگ لە زانستی ئاینەکان و لە زانستە مرۆڤایەتیەکان بە گشتی دەگرێ، بۆ نموونە دەڵێین: ئۆثودۆکسی مەسیحی، یان یەهودی، یان ئیسلامی، یان تەنانەت ئۆرثودۆکسی سوننی یان شیعی، یان کاتۆلیکیو پرۆتستانتی، بگرە دەشێ باسی ئۆرثودۆکسی مارکسیزمیش بکەین و.. هتد. مومکین نییە بەبێ بەکارهێنانی ئەم زاراوە زۆر گرنگە، لە زانستی ئایینەکان تێبگەین.

هەمان شت سەبارەت بە زاراوەیەکی دیکەی نزیك لە زاراوەکەی پێشوو، ئەویش: دۆگماتیزمە (*Dogmatisme*) و هەروەکو خۆی هێشتوومەتەوە ئەگەرچی لە بەرامبەریدا

وشەیەك بە عەرەبی هەیە ئەویش: (العقائدیة)یە، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە وشەی (العقائدیة) بە زەرورەت هەمەڕەنگییەکی نێگەتیڤی لەخۆناگرێت وەك لە زاراوە فەرەنسیەکەدا هەیە، تەنها ئەگەر وشەیەکی دیکەی بۆ زیاد بکەین ئەویش وشەی "تەسك" - (الضیقة)، ئەوسا دەڵێین دۆگماتیزمێکی تەسك یان تەسکبین و داخراو (العقائدیة الضیقة او المغلقة) وەك وەرگێڕانێکی گونجاو و تەواوی زاراوە فەرەنسیەکە. ئەمە لەگەڵ وەرگێڕانی زاراوەکەی ئەرکۆندا ڕێك دێتەوە کە بەمجۆرە وەرمگێڕاوە: "چوارچێوەی دۆگمایی داخراو یان پەرژینی دۆگمایی داخراو" (السیاج الدوغمائی المغلق) *La cloture Dogmatique* کە پارێزگاری لە هەموو مەزهەبێك یان هەموو تایەفەیەکی ئایینی یان تەنانەت عەقیدەیەکی حیزبی دەکات. واتە من نەمنووسیوە (السیاج العقائدی المغلق) ئەگەرچی ئەم وەرگێڕانەیان ڕاستترو عەرەبیترە وەك لەوەی یەکەم، دەشێ دواتر پەنا بۆ ئەمەشیان ببەم.

ئەرکۆن لە زمانی فەرەنسیدا دوو زاراوەی داهێناوە: "ئەزموونی مەدینە" (*LeExperience de Medine*) و "نموونەی یان مۆدێلی مەدینە" (*Le Modele de Medine*) کە دەبوایە بڵێم: ئەزموونی نموونەیی مەدینە (تجربة المدینة المثلی)، یان: مۆدێلی هەرە مەزنی مەدینە (نموذج المدینة الاعظم)، چونکە ئەرکۆن لە زمانی فەرەنسیدا وشەکە بە پیتی گەورە (کەپیتال) بەکاردەهێنێ. جا لەبەرئەوەی لە زمانی عەرەبیدا پیتی گەورە نییە ئەوا ئێمە ناچارین وشەی (المثلی) یان (الاعظم) بۆ هەردوو دەستەواژەکە زیادبکەین. ئەرکۆن وای پێباشترە ئەم دوو زاراوەیە بەکاربێنێت وەك لەوەی زاراوەی "ئیسلام" بەکاربێنێ کە لەلای نووسەرانی خۆرئاوا یان خۆرهەڵاتدا باوە. ئەرکۆن بۆیە ئەم کارە دەکات بۆ ئەوەی هەرچی زیاتر کاری پێغەمبەر بخاتە نێو مێژووگەراییەوەو هەروەها لە پێناوی ئەوەی خەرمانەو شەبەنگی بە ئەفسانەکردن و بە ئایدیۆلۆژیکردن (الاسطرة و الادلجة) لەسەر هەر ڕووداوێکی مەزنی مێژوویی ئاشکرا بکات.

ئەرکۆن بۆیە ئەم کارە دەکات بۆ ئەوەی هەرچی زیاتر کاری پێغەمبەر بخاتە نێو مێژووگەراییەوەو هەروەها لە پێناوی ئەوەی خەرمانەو شەبەنگی بە ئەفسانەکردن و بە ئایدیۆلۆژیکردن لەسەر هەر ڕووداوێکی مەزنی مێژوویی ئاشکرا بکات

هەمان شت سەبارەت بە جیاکردنەوەی نێوان (دیاردەی قورئانی/ و دیاردەی ئیسلامی) (الظاهرة القرآنیة/ و الظاهرة الاسلامیة)، هەندێ کەس ئەوەیان پێشنیار کردووە بەمجۆرە وەریان بگێڕم: (ڕووداوی قورئانی/ و ڕووداوی ئیسلامی) (الحدث القرآني/ و الحدث الاسلامي)، بەڵام من وەرگێڕانەکەی یەکەمم پێ باشتربوو. (دیاردەی ئیسلامی لە خستنە سەرێکی دواتری دیاردەی قورئانییەوە بەسەر مێژووی بەشەریداو هەروەها لە ناوەندە کۆمەڵایەتییە فرەچەشن و فرەڕەنگەکانەوە بەرهەمهێنراوە).

پاشان ناچاربووم زاراوەی "بە ئیسلامکردن" (الاسلمة) لە زمانی عەرەبیدا دابتاشم لە بەرامبەر زاراوەی (*Islamisation*)ی فەرەنسیدا. وەك ئەوەی بۆ نموونە دەڵێین: "بە ئیسلامکردنی کۆمەڵگای تونسی لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا ئەنجامدرا" (تمت اسلمة

المجتمع التونسي في القرن الأول للهجرة). هەمان شت سەبارەت بە زاراوەی: بە كەلەپووركردن (التتریث) لە بەرامبەر زاراوەی (*Traditionalisation*) (ترادیسیۆنالیزەكردن)، ئەمەش پێچەوانەو دژی زاراوەی نوێكردنەوەیە (التحدیث) (*Modernisation*) (مۆدێرنیزەكردن).

پاشان بۆ ماوەی پتر لە دە ساڵ هەردوو زاراوەی: بە ئەفسانەكردن و بە ئایدیۆلۆژیكردن (الأسطرة و الأدلجة)م داتاشیو بەكارمهێنان كە دواتر لە لایەن كەسانی دیكەشەوە بەكارهێنران و بڵاوبوونەوە، ئەمەش مانای وایە ئەم داتاشینە چانسی سەركەوتنی هەبوو. لە ڕاستیدا هیچ كەسێ ناتوانێ لە ساتەوەختی داتاشین یان خستنەڕووی زاراوەیەكدا یەكسەر گرەنتیی سەركەوتنی لەلای جەماوەردا بدات. تەنها تێپەڕبوونی ڕۆژگار ڕادەی سەركەوتن یان سەرنەكەوتنی ئەو زاراوەیە ئاشكرا دەكات. زاراوەكانیش لە بوونەوەری زیندوو دەچن دەشێت بژین و بەردەوام بن و دەشێ بشمرن. واتە زاراوەكانیش دوچاری یاسای پاكتاوكردنی سروشت دەبن وەك ئەوەی داروین لە وتە بەناوبانگەكەیدا "مانەوە بۆ باشترین" باسی كردووە.

زاراوەكانیش لە بوونەوەری زیندوو دەچن دەشێت بژین و بەردەوام بن و دەشێ بشمرن، واتە زاراوەكانیش دوچاری پاسای پاكتاوكردنی سروشت دەبن، وەك ئەوەی داروین لە وتە بەناوبانگەكەیدا "مانەوە بۆ باشترین" باسی كردووە

كێشی (فعلويّ) و (فعلويّة)

دوای دوودڵیەكی زۆر، جەختم لەوەكرد كە دەبێ ئەو دوو "كێش"ە بچنە ناو گۆڕەپانی بەكارهێنانی عەرەبییەوە ئەگەرچی سەرەتا "دزێو"و ناشیرین دەردەكەون. لە ڕاستیدا ئەم دوو كێشە پێشتر لەسەر دەستی هەندێ نووسەرو دانەردا هێنراونەتە نێو زمانی عەرەبییەوە، ئەمەش مانای وایە ئەم دوو وەزنە پێداویستییەك دەنوێنن بۆ فراوانكردنی تەعبیرو پاشان بۆ فراوانكردنی بیركردنەوە لە زمانی عەرەبیدا. ئەم دوو وەزنە بۆ دیقەت و جیاكاری پێویستن. بەمجۆرە، ئێمە بۆ نمونە ئەم وشانە بەكاردێنین:

(اسلامويّ) بەرامبەر بە (اسلامي)
(علمويّ) - - ( علمي)
(عقلانويّ) - - (عقلاني)
(شعبويّ) - - (شعبي)
(ماركسويّ) - - (ماركسي)
(قومويّ) - - (قومي)
(علمانويّ) - - (علماني).. هتد.

هەروەها ئەم وشانە لە بەرامبەر یەكتردا بەكاردێنین:

اسلاموية اسلامية

علموية علمية

عقلانوية عقلانية

ماركسويةماركسية

شعبوية شعبية

علمانوية علمانية

قوموية قومية... هتد.

ئاشكرايە كە كێشی (فعلوي) و (فعلوية) هەمەڕەنگیەكی نێگەتیڤانەی (مانا) لەخۆدەگرێ (واتە: بۆ نموونە یەكێ خۆی بە عەقڵانی لە قەڵەم بدات -عقلانوي- و لە ڕاستیدا عەقڵانی نەبێت -و-). ئەم دوو كێشە لە زمانی فەرەنسیدا باوو بڵاون، بۆنمونە دەڵێین:

*Scienifique # Scientiste*

پاشان زاراوەی هەڵوەشاندنەوە (التفكيك)م لە بەرامبەر زاراوە فەرەنسیەكەدا (*La deconstruction*) بەكارهێنا كە جاك دێریدا بەر لە پتر لە چارەكە سەدەیەك گەڵاڵەی كردو سەركەوتنێكی بێوێنەی بەدەستهێنا. وشەی (التفكيك) لە زمانی عەرەبیدا بە تەواوی بنجی بەست و بڵاوبۆوە ئەگەرچی ئەو وشەیە لە ڕووی سیاسییەوە مانایەكی سەلبی هەڵدەگرێ، بەڵام نابێ بیەڵین هەمەڕەنگیی سیاسی بەسەر وشەكەدا زاڵبێت و ڕێی ئەوەمان لێبگرێ وەكو زاراوەیەكی فەلسەفی بەكاریبهێنین وەك دەلالەتێك بۆ سەرجەمی میتۆدێك لە فیكردا. هەڵوەشاندنەوە تەنها پرۆسەیەكی سەلبی نییە بەڵكو پرۆسەیەكی كاریگەرو ئیجابیشە چونكە دەبێتە مایەی سەرلەنوێ دارشتنی پێكهاتێكی نوێ بۆ واقیع.

لێرەدا زاراوەی "خەیاڵكراو" (المتخيَّل) (*Limaginaire*) هەیە كە شوێن و بایەخێكی گەورە لە فیكری ئەركۆندا داگیردەكات. ئەم زاراوەیە لە زانستی ئەنترۆپۆلۆژیاو زانستی نوێی مێژوو (یان مێژووی عەقڵییەتەكان)ەوە هاتووە. ئەم زاراوەیە وەك كاردانەوەیەك بۆ پەرگیریی ماتریالی یان ماركسەوی لە لێكۆڵینەوەی مێژوودا گەڵاڵەكراوە. بە تەنها كاركردی ماتریالی بزاوتی مێژوو یەكلایی ناكاتەوە، بەڵكو كاركردی ڕەمزیش ڕۆڵی خۆی دەبینێ بە تایبەتی لە كۆمەڵگاكانی سەدەكانی ناوەڕاستدا (واتە ئەو كۆمەڵگایانەی تا ئەمڕۆش لەناو فەزای بیركردنەوەی سەدەكانی ناوەڕاستدا دەژین -و-) كە ئابوورییەكی جێگیریان هەیە، بە گشتی لە هەموو كۆمەڵگا كشتوكاڵیەكانی بەر لە پیشەسازی. وشەی خەیاڵكراو (متخيَّل) *Imaginaire* جیایە لەگەڵ وشەی خەیاڵ *Imagination* ئەگەرچی هەردوو وشەكە سەر بە هەمان خێزانی زمانەوانین.

بەڵام نابێ بیەڵین هەمەڕەنگیی سیاسی بەسەر وشەكەدا زاڵبێت و ڕێی ئەوەمان لێبگرێ وەكو زاراوەیەكی فەلسەفی بەكاربهێنین، وەك دەلالەتێك بۆ سەرجەمی میتۆدێك لە فیكردا

وشەی "خەیاڵکراو" دەلالەت بۆ ئەو شتە دەکات کە لە ڕووی مێژووییەوە لە کۆنەست یان لە زەیندا پێکهاتووە یان شێوەی گرتووە، ئەمەش قابیلی ورووژاندن و جوڵاندنەوەیە بە تایبەتی ئەو کاتانەی پێویست بە ورووژاندنی بکرێ. بۆ نموونە: خەیاڵکراوی ئیسلامی لە دژی خۆرئاوا، یان خەیاڵکراوی خۆرئاوایی لە دژی ئیسلام. ئەم شتە لە ڕووی مێژووییەوە شکڵی گرتووەو لە قووڵایی نائاگاییدا ڕیشەی هەیە. لێرەدا خەیاڵکراو بریتییە لە تۆڕێك لەو وێنانەی دەشێت لەهەر ساتەوەختێکدا -بە شێوەیەکی نائاگاییو وەك جۆرێك لە کاردانەوە- بورووژێنرێ. بگرە لێرەدا خەیاڵکراوی کاتۆلیکی لە دژی پرۆتستانتیش هەیە یان پرۆتستانتی لە دژی کاتۆلیك، یان خەیاڵکراوی شیعی لە دژی سوننی و بە پێچەوانەشەوە.. هتد، هەموو تویژێك وێنەیەکی دیاریکراو لە بارەی تویژەکەی تر پێکدەهێنێو ئەم وێنەیەش بە تێپەڕبوونی زەمەن لە کۆئاگاییدا جێگیر دەبێ. دەشێت ئەمە بە شێوەیەکی واقیعیو مەیدانی تەئکیدی لەسەربکرێ. مومکین نییە ئەم خەیاڵکراوە تەجاوز بکرێ تەنها ئەوکاتە نەبێ کە لە ڕووی زانستی یان لە ڕووی فەلسەفییەوە هەڵبوەشێنرێتەوە بە تایبەتی کاتێ بارودۆخ و ساتەوەختی ئەو هەڵوەشاندنەوەیە لە ئارادا بێت. بۆ نموونە ئێستا خەیاڵکراوی کاتۆلیکی لە فەرەنسای بە عەلمانیکراوو نوێدا خەیاڵکراوێکی دوژمنکارانە نییە لە دژی پرۆتستانت، کەچی لە سەدەکانی ناوەڕاستداو تەنانەت بەر لە سەد ساڵیش ئەو خەیاڵکراوە دوژمنکارییە هەبووە. ئەمە مانای وایە خەیاڵکراو مێژوویەکی گۆڕاوی هەیەو پەیوەستە بە پلەی پێشکەوتن یان پێشنەکەوتنی کۆمەڵگا، پلەی پێشکەوتن یان پێشنەکەوتنی عەقڵانییانەی کۆمەڵگا. لێکۆڵینەوەی محەمەد ئەرکۆن لە بارەی چۆنێتی شکڵگرتنی خەیاڵکراوی ئیسلامی لە ڕووی مێژووییەوەو چۆنێتی بەکارهێنانی لە لایەن هەندێ لە بزاوتە سیاسییەکانەوە شوێنی متمانەپێکردنە، هەروەها لێکۆڵینەوەی ئەرکۆن بۆ میکانیزمی کۆمەڵگای خۆرئاواییو هەستی دوژمنکارانەی خەیاڵکراوە کۆمەڵایەتیەکەی لە دژی ئیسلام و عەرەب دیسان شوێنی متمانەپێکردنە. بەم مانایە "خەیاڵکراو" بریتیە لە ڕستێك لەو حوکمی پێشوەخت و بەهێزانەی میللەتێك لە دژی میللەتێکی تر هەڵیدەگرێ (یان تایفەیەك لە دژی تایفەیەکی ترو مەزهەبێك لە دژی مەزهەبێکی ترو چینێك لە دژی چینێکی ترو.. هتد).

لە سەرەتادا ئەم زاراوەیەم بە "خەیاڵگە" یان "خەیاڵدان" (المخيال) وەردەگێڕا، پاشان بە پێی ئامۆژگاریی هەندێ لە ڕۆشنبیران ڕای خۆم گۆڕی و ئیدی "خەیاڵکراو"م بەکارهێناو ڕای خۆم لەسەر ئەمەیان سەقامگیرکرد. بەمجۆرە دەنووسم: خەیاڵکراوی ئایینی، خەیاڵکراوی کۆمەڵایەتی.. هتد.

بەمانایە "خەیاڵکراو" بریتیە لە ڕستێك لەو حوکمی پێشوەخت و بەهێزانەی میللەتێك لە دژی میللەتێکی تر هەڵیدەگرێ

## زاراوە زمانەوانیەکان یان سیمانتیکیەکان

لەبەرئەوەی محەمەد ئەرکۆن بەشێکی گەورەی بایەخدانەکانی خۆی دەباتە سەر لێکۆڵینەوە لە دەقە دامەزرێنەرەکانی کەلەپووری ئیسلامی (قورئانی پیرۆز، فەرموودەکانی پێغەمبەر، فیقهو تەفسیر، زانستی کەلام.. هتد) دەبینین وەك قۆناغی یەکەم لە قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەو شیکاریدا پەنادەباتە بەر پراکتیزەکردنی زاراوە زمانەوانیەکان بە سەریاندا، بێگومان کارێکی چاکی کردووە. ئەرکۆن بەم کارە -ئەگەر بۆ ساتەوەختێکیش بێت- ئیمەی لە دەسەڵات و هەیبەتی گەورەی دەق ڕزگارکردووە، ئەو دەسەڵات و هەیبەتەی کە حەقیقەتی ماتریالیی زمانەوانی دەقی دامەزرێنەرمان لێدەشارێتەوە (واتە حەقیقەتی ئەوەی کە دەقی دامەزرێنەر بە پیتی زمانێکی بەشەریی دیاریکراو نووسراوەتەوە، واتە بە پێی ڕێساکانی سەرف و نەحوی زمانی عەرەبی نووسراوە). شیکردنەوەی زمانەوانی یان سیمانتیکی (دەلالی) یارمەتیمان دەدات تا مەسافەیەك لە نێوان خۆمان و ئەو باوەڕە ئیماندارییە دابنێین کە هەر لە منداڵییەوە بە میرات تیاماندا ماوەتەوە، بێگومان ئەم قسەیەش هەرگیز مانای لەنێوبردنی ئیمان ناگەیەنێت (ئیمان هەمیشە بە ڕەوایی دەمێنێتەوە، بەڵام ئیمانی پاش ڕزگاری نەك پێش ڕزگاری..) (لێرەدا هاشم ساڵح مەبەستی لە ڕزگارکردنی دووەمە کە لە پاش ڕزگارکردنی یەکەم دێت، واتە ڕزگارکردنی بیرو زەینی مرۆڤ لە بیروباوەڕە دۆگماتیزمەکانی کەلەپوورو نەریتەکان کە دەبێ لە پاش ڕزگارکردنی نەتەوەییو سیاسییەوە کاری بۆ بکرێت -و-).

شیکردنەوەی زمانەوانی (واتە پرۆسەی شیکاریی زمانەوانی بەسەر دەقە دامەزرێنەرەکاندا) پرۆسەیەکی سەرەتایی بۆ سنوردارکردنی هەموو حوکمە تیۆلۆژییە پێشوەختەکان ئەنجام دەدات، ئەو حوکمە تیۆلۆژییە پێشوەختانەی لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا ئەمڕۆ بە میرات وەرگیراون، ئەوانەی بەربەستێك دەخەنە بەینی ئێمەو سەیرکردنی دەق وەکو خۆی کە هەبووە یان هەیە. بەمجۆرە دەبینین شیکردنەوەی زمانەوانی دەبێتە قۆناغی یەکەم و پلەی یەکەم وەردەگرێ بە تایبەتی ئەوکاتەی ئەم مەسەلەیە پەیوەست دەبێت بەو دەقە دێرینانەی لە چرکەساتی سەرهەڵدان و گەشەکردنیانەوە ڕۆدەچنە نێو قوڵایی زەمەنەوەو وا دەردەکەون کە لە سەرووی مێژوو و لە سەرووی زەمەندان. لە دوای شیکردنەوەی زمانەوانی ئینجا ڕۆڵی شیکردنەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتیو ئەنترۆپۆلۆژی دێت لە پێناوی ڕۆشنکردنەوەی دەق و ئاشکراکردنی مەرجدارە مێژووییەکەی. ئەم هەڵکۆڵینە ئارکیۆلۆژیە بۆ مانای وشەکان و لە پێناوی گەیشتن بە تەرایی یەکەمی، زۆر پێویستە. ئەوەیشی یارمەتیمان دەدات بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، دوو زاراوەی بنەڕەتی زانستی زمانەوانین کە بریتین لە:

شیکردنەوەی زمانەوانی یان سیمانتیکی (دەلالی) یارمەتیمان دەدات تا مەسافەیەك لە نێوان خۆمان و ئەو باوەڕە ئیماندارییە دابنێین کە هەر لە منداڵییەوە بە میرات تیاماندا ماوەتەوە

زاراوەی هاوزەمـــەنیی زمانـــەوانی- ســـانکرۆنی (التزامنیـــة اللغویـــة) و زاراوەی پەرەسەندنی مێژوویی- دیاکرۆنی (التطوریة اللغویة، التعاقبیة). لێرەدا مەبەستمان لە "سانکرۆنی" لێکۆڵینەوەیە لە مانای دەقێك یان مانای وشەیەك بەپێی ئەو مانایەی لە سـەردەمەکەی خۆیـدا بـاوبووە نـەك لـە سـەردەمێکی دواتـردا (ئەمـە پێـی دەوتـرێ: خوێندنەوەی سانکرۆنیی دەق). بەڵام "دیاکرۆنی" (یان "مێژوویی" کە پێشتر بـەو جۆرە تەرجەمەم دەکرد) واتە لێکۆڵینەوە لـەو گۆڕانکاریانـەی لـە سـەردەمێکەوە بـۆ سەردەمێکی تر بەسەر مانای وشەدا دێت. جێی داخە تا ئەمڕۆ فەرهەنگێکی مێژوویی لـە زمـانی عـەرەبیدا نییـە، ئەمـەش بۆتـە مایـەی ئـەوەی نـەتوانین بـەپێی سـەردەمە مێژووییـەکان لـە مانـای وشـەکان تێبگـەین. بـۆ نموونـە تـا ئێسـتا بـە شـێوەیەکی سانکرۆنی لێکۆڵینەوە لەسەر قورئانی پیرۆز نەکراوە.

ئاشکرایە لێکۆڵینەوەیەکی لەوجۆرە ناچارمان دەکات بگەڕێینەوە نیمچە دوورگەی عەرەب لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا، بێگومان بە قەدەر ئەوەی ئەم گەڕانەوەیە مومکین بێت (چونکە بە داخەوە لێرەدا چەند دەقێکی باوەڕپێکراوی هاوسەردەمی قورئانی پیرۆزمان لە بەردەستدا نییە، چەند شیعرێك نەبێت) ئەگەر دەقی لەو چەشنە هەبوایە ئەوسا دەمـانتوانی بـەراوردکارییان لـە نێوانـدا بکـەین و دەمـانتوانی بگەینـە مانـای وشـەکان لـەو سـەردەمەدا. لەگەڵ ئەوەشدا هـەردەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو سەردەمە لـە پێناوی تێگەیشتن لە وشـەکانی قورئـانی پـیرۆز لـەژێر ڕۆشـنایی ئـەو مانایـەی لـەو زەمەنەدا باوبووە نەك لەژێر ڕۆشنایی ئەو مانایەی لە زەمەنی ئێمەدا باوەو تەنانەت لەو زەمەنانەش کە لە پاش زەمەنی قورئانەوە هاتوون. ئەمەیە بە زۆر سەپاندنی مانا یان بە زۆر خستنە سەر (الاسـقاط) یـان کەوتنـە نێـو داوی هەڵـەکاریی مێژووییـەوە (المغالطة التاریخیة). ئێمە وەهمی ئـەوەمان لـەلا دەخوڵقێ کە قورئان دەخوێنینەوەو تەفسیری دەکـەین لـە کـاتێکدا ئێمـە سـەردەمی خۆمـان دەخوێنینـەوە یـان چـەند سەردەمێکی دیکەی غەیری سەردەمی قورئان. لێرەدا نموونەیەك دەهێنینەوە: مانای وشەی موسڵمان (المسلم) لە قورئاندا یان لەسەر ئاستی قورئاندا لەگەڵ ئەو مانایەی دواتـرو لـە پـاش دروسـتکردنی دەوڵـەت و لاهوتـی ئیسـلامیدا پـەیدابوو، ئـەو دوو مانایـە جیـاوازن یـاخود جـووت نـین. هـەروەها مانـای وشـەی عـەقڵ (افـلا تعقلـون؟ افـلا یعقلـون) لـە قورئـانداو ئینجـا مانای ئەم وشەیە لـە سـەردەمی عەباسـیو لـە پـاش تێکـەڵبوون بـە میللـەتانی دیو کولتوورەکـانی دیو هـاتنی لۆجیـك و فەلسـەفەی یۆنـانیو.. هتـد، بێگومان کۆمەڵێ وشەی تریش. (تەنانەت وشـەی "عـەقڵ"یش لە مانادا گۆڕانکاریو مێژووی خۆی هەیە).

جێی داخە تا ئەمڕۆ فەرهەنگێکی مێژوویی لە زمانی عەرەبیدا نییە، ئەمەش بۆتە مایەی ئەوەی نەتوانین بەپێی سەردەمە مێژووییەکان لە مانای وشەکان تێبگەین. بۆ نموونە تـا ئێسـتا بە شـێوەیەکی سانکرۆنی لێکۆڵینەوە

ئەم مەسەلەیە لەلای (نیچە)ی فەیلەسووف گەیشتە ئەوەی بڵێت "هەموو وشەیەك بریتیە لە حوكمێكی پێشوەخت" واتە هیچ وشەیەكی بەرینو بێتاوان بوونی نییە بە پێچەوانەی ئاگایی سادەی ئێمە كە پێی وایە لە مانای وشەكە تێگەیشتووە، لە كاتێكدا پێچەوانەی ئەو مانایەی وەرگرتووە یان شتێكی دیكەی غەیری مانا ئەسڵییەكە. هەموو وشەیەك مێژوویەكی هەیە، هەموو وشەیەك لە مانادا كۆمەڵێ گۆڕانكاریی بەسەردا دێت. تەنانەت كاتێ پێمان وا دەبێت مانای یەكەم و پاكژی وشەكەمان گرتووە دەبینین بەرانبەرێكی كەمتری هەیە لەوەی پێمان وایە. چونكە ئەو مانایەش پێشتر چەند مانایەكی دیكەی هەیەو ئێمە نایزانین یان لە زمانە بیانیەكانی تردا مانای تری هەیە، بەڵام بەبێ چ گومانێك لێرەدا بەرانبەرێكی ڕێژەیی هەیەو دەبێ لە چركەساتێكی دیاریكراودا لە چوونە نێو قووڵایی زەمەن بوەستین، دەنا دەخزێینە ناو چاڵێكی بێبنەوە! قورئانی پیرۆزیش سەرەتای دامەزراندن (واتە بەرانبەری یەكەم)ی زمانی عەرەبی پێكدەهێنێ.

## نزیكبوونەوە لە هەرێمی حەقیقەت

لەو باوەڕەدام ئێوە دەزانن من ئەو هەموو زاراوەیەم بۆ ئەوە نەخستۆتەڕوو تا لە بەرامبەر ئێوەدا شانازیان پێوە بكەم، یان بۆ ئەوەی بە قورسی بیدەمە بەرگوێتان وەك هەندێ لەو كەسانە ئەمە دەڵێن كە هێرش دەكەنە سەر ئەو هێڵە فیكرییەی چوومەتە ناویەوەو ئیشی تیادەكەم. ئەو كەسانە دەڵێن گوایە پراكتیزەكردنی ئەمجۆرە میتۆدو زاراوە بیانیانە بەسەر كەلەپووری ئیسلامیی دێرینی ئێمەدا زیانی پێدەگەیەنێ یان ئاڵۆزی دەكات یاخود دەیشێوێنێ. بەڵام ئەو كەسانە ناگایان لەو كۆشش و ماندووبوونە نییە كە لە پێناوی تەعریبكردن و "بە ئیسلامیكردنی" ئەو زاراوانەدا كراوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەكی دروست بۆ كەلەپووری ئێمەش بگونجێو پراكتیك بكرێو بچێتە نێو گۆشت و چنینەكانیەوە. بێگومان هەندێ پراكتیزەی خێرای میتۆدە خۆرئاواییەكان زیانی بۆ ئەدەب و كەلەپووری ئێمە هەبووە، لەبری ئەوەی ڕۆشنی بكاتەوە تاریكتری كردووە، یان لانیكەم بە شێوەیەكی زۆرەملێو ناشیرین و خێرا دەركەوتوون و كەسیشیان ڕازی نەكردووە ئەگەرچی بە جوانی ڕازێنراونەتەوەو لە پشتی ناوە بیانییە درەوشەدارەكانەوە خۆیان حەشارداوە.

بەڵام ئێوە دەزانن ئەم مەسەلەیە، دواجار، مەسەلەی شێوەگەریو ڕیزكردنی زاراوەكان نییە. چونكە لە پشتی ئەمەوە شتی گرنگترو زۆر قووڵتر هەیە. ئێستاش كاتی ئەوە هاتووە بچمە نێو كرۆكی بابەتەكەوە.

هەموو وشەیەك مێژوویەكی هەیە، هەموو وشەیەك لە مانادا كۆمەڵێ گۆڕانكاریی بەسەردا دێت. تەنانەت كاتێ پێمان وا دەبێت مانای یەكەم و پاكژی وشەكەمان گرتووە دەبینین بەرانبەرێكی كەمتری هەیە لەوەی پێمان وایە

ئێستا بۆ کەسانی شارەزا لە مەسەلەکان و لە نهێنیەکان، ڕوونبۆتەوە کە ئێمە، وەك عەرەب و موسوڵمان، لەگەڵ سەردەمدا دوچاری گرفتێك بووین، گرفتێك لەگەڵ چوونە ناو مێژوو و سەردەمەوە، گرفتێك پێی دەوترێ تازەگەریی جیهانی یان گەردوونی. ئێستا بۆ هەر کەسێ دوچاوی هەبێت ڕوونبۆتەوە کە ئەم تازەگەرییە (مۆدێرنێتی) موجامەلەمان ناکات و لە دۆزینەوەی ڕێگەیەکی تایبەتیش بۆ چوونە ناویەوە یارمەتیمان نادات، بگرە لەوانەیە ئومێدی ئەوە بخوازێت هەمیشە لە دەرەوەیدا بمێنینەوەو تا بێکۆتایی لەناو گرفت و ئازارەکانی خۆماندا بتلێینەوە (دواشت کە تازەگەری بیری لێبکاتەوە ئەوەیە ئێمە هێڵێك یان ڕێچکەیەك یان دەریچەیەك بۆ چارەسەرکردن بدۆزینەوە..).

ڕۆشنبیرانی ئێمە لە دەستنیشانکردن و تەفسیرکردنی ئەم قەیرانە سەخت و دژوارەدا بۆچوون و ڕێگەچارەی جیاوازیان هەیە. هەندێ لەوانە گلەییەکە دەبەنە سەر پاشکەوتوویی تێکنۆلۆژیو پێیان وایە هەر ئەوەندەی دەستمان بگاتە تێکنۆلۆژیا ئیدی کێشەکان چارەسەر دەکرێن. هەندێکی دیکە تەرکیز دەکەنە سەر شیکردنەوەی بایەخی ئابووریو ڕۆڵی ئابووری لە پرۆسەی پاشکەوتوویی ئێمەدا. هەندێکی دیکە پێیان وایە سەرچاوەی هەموو نەخۆشیەکانی ئێمە نەبوونی پلورالیزمی سیاسیو ئازادی ڕادەربڕین و جیاوازیە. هەندێ کەسی دیکەش خەمی کۆمەڵێ کێشەی تریان هەیە وەکو دواکەوتوویی کۆمەڵایەتیو بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواریو ئازادی ئافرەت و.. هتد.

گومانی تیانیە هەریەکێ لەم شیکردنەوانە بەشێکیان لە ڕاستی تیایە، لەگەڵ ئەوەشدا من باوەڕم وایە دەبێ بۆ مەسەلەی دەستنیشانکردن لەمانەش دوورترو قووڵتر بڕۆین. دەبێ "هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی لە قووڵاییدا" بگاتە دوورترین و قووڵترین خاڵ بۆ ئەوەی کرۆکی لاوازیو نەخۆشییە کوشندەکان ئاشکرا بکرێن. باشە ئەگەر بۆمان دەرکەوت جەوهەری کێشەکان لە شوێنێکی تردایە، چی ڕوودەدات؟ چی ڕوودەدات ئەگەر بۆمان ئاشکرابوو کە هۆکاری سەرەکیی نەخۆشیەکانمان ڕۆحیە بە قەدەر ئەوەی مادیشە، هەروەها ئاینییە بە قەدەر ئەوەی دنیاییشە؟ باوەڕم وایە هۆی سەرەکیی کێشەو نەخۆشیەکانی ئێمە بەرلەوەی لە (دەرەوە)دا بێت لە (ناوەوە)یە، بێئەوەی ڕۆڵی دەرەوەو فشارو دوژمنکاریەکانی دەرەوە فەرامۆش بکەین. باوەڕم وایە ئەو مەسەلە بنچینەییەی ئەمڕۆ خراوەتە سەرشانی ئێمەی ڕۆشنبیران، بریتیە لەوەی: چۆن دەشێ ڕۆحی عەرەبی- ئیسلامی لە عەقڵی دواکەوتووانەی ڕزگار بکرێ؟ بە چ جۆرێ ئەم ڕۆحە لە خودی خۆی ڕزگار بکرێ؟ بە چ شێوەیەك ڕزگار دەکرێ لە پەککەوتوویی چەندین سەدەی خود؟

دەبێ "هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی لە قووڵاییدا" بگاتە دوورترین و قووڵترین خاڵ بۆ ئەوەی
کرۆکی لاوازیو نەخۆشییە کوشندەکان ئاشکرا بکرێن

لەوانەیە بپرسن: کێ ئەو ڕۆحەی بەندکردووە؟ چی بەسەرهاتووە تا تووشی ئەم شکست و پاشەکشێیە بێت کە پێشتر بە پێچەوانەوە بەرەو بەرزی هەڵدەکشاو شارستانیەتی دروست دەکردو چرای ڕووناکیی بە میللەتانی تر دەبەخشی، لەوانە میللەتانی ئەورووپیش؟ بۆچی سڵەمییەوەو لەناو خودی خۆیدا لوولی خواردو تەنانەت لە سێبەرەکەی خۆیشی دەترسێ؟ ئەو ڕۆحەی پێشتر هێزێکی گەورەی هەبوو و مێژووی دروست دەکرد؟ داخۆ ئەم ڕۆحە عەرەبی- ئیسلامییە چیی بەسەرهاتووەو تووشی چی بوە؟

کەسێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە ئەوا چارەسەریش پێشکەش دەکاو حەقیقەتیش ئاشکرا دەکات. لەو باوەڕەدانیم تا ئەمڕۆش هیچ یەکێ لە ئێمە بتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە. ئێمە لێرەو لەوێ گیرمان خواردوەو هەوڵدەدەین ڕۆشناییەکی کەم لە تاریکستانی تونێلێکی تاریکدا بدۆزینەوە.

دوای ئەوەی بابەتەکەم گەیاندە ئەم خاڵە، ئیدی بۆ خۆم ئەم سەرچڵییە دەستپێدەکەم و وەك تاریقی کوڕی زیاد کەشتیەکان دەسووتێنم تا نەتوانم پاشەکشە بکەم، هەوڵدەدەم هەنگاوێکی تر بچمە پێشەوە. (نیچە)ی فەیلەسووفی ئەڵمانی دەیوت: ئازاترین کەسێك لەنێو ئێمەدا کەمدەستە لە درکاندنی حەقیقەت (واتە هەموو حەقیقەت). لێرەدا کەسانێك هەن دەتوانن بە ڕێژەی *20%* یان *50%* یان تەنانەت *70%* بەرگەی حەقیقەت بگرن. دەشێ لێرەدا کۆمەڵێ زانای گەورەو خاوەن ویژدان هەبن بە ڕێژەی *90%* بەرگەی حەقیقەت بگرن. بەڵام هیچ کەسێ ناتوانێ بە ڕێژەی *100%* بەرگەی حەقیقەت بگرێو بتوانێ هەموو حەقیقەت بدرکێنێ. چونکە ئەم حەقیقەتە هەر لە سەرزەمینی خۆیدا دەیکوژێ! وریابن لە نزیکبوونەوە لە حەقیقەتەکان زیاد لە پێویستی خۆی یان بەر لە وادەی خۆی. من باوەڕم وایە -بە پێچەوانەی زۆر کەسەوە- ئێمە ئێستا لە هەرێمی حەقیقەت نزیك بووینەتەوە، نزیك بووینەتەوە لە قۆناغی ڕاشکاوییەکی ناوەکیانە لەگەڵ خودێکی قووڵدا (واتە خودێکی کەلەپوورگەرایی عەرەبی- ئیسلامی). باوەڕیشم وایە چارەسەرکردن تەنها بەم ڕێچکەیەدا تێدەپەڕێ، هەموو هەوڵدانێکیش بۆ خۆدوورخستنەوە لەم ڕێچکەیەو خۆشاردنەوە لێی، سوودێکی نابێت. ڕێگەچارە تەنها (لە ناوەوەدا) بوونی هەیەو تەنها لە ناوەوەدا ئەنجام دەدرێ. ڕێگەچارە لە جورئەتی ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکانی ناوەوەیە، لە گەورەترین پرۆسەی پاکژکردنەوەی ناوەوەیە، لە هەڵگیرساندنی گەورەترین جەنگە لەگەڵ ناوەوەدا. چونکە چوونە نێو سەردەم و مێژوو بە شێوەیەکی سەرکەوتوو تەنها لە ڕێگەی پرۆسەی پاکژکردنەوەی ناوەوەدا دابین دەکرێ. قۆناغی سەلبیانەی کارکردن پێش قۆناغی ئیجابیانە دەکەوێت. (بە مانای: پرۆسەی

چوونە نێو سەردەم و مێژوو بە شێوەیەکی سەرکەوتوو تەنها لە ڕێگەی پرۆسەی پاکژکردنەوەی ناوەوەدا دابین دەکرێ.
قۆناغی سەلبیانەی کارکردن پێش قۆناغی ئیجابیانە دەکەوێت

هەڵوەشاندنەوەی بیری کۆن پێش پرۆسەی بنیاتنانی نوێ دەکەوێ -و-). لێرەدا چەندین بەربەست و دیوار هەن ڕێگەی چوونە ناو سەردەممان لێدەگرن. چەندین گرێی موزمین هەن نایەڵن لەگەڵ سەردەمدا بگونجێین. لێرەدا چەندین بۆمبی کارتێکراو هەن هێشتا نەتەقیونەتەوە. چەندین حیساباتی گەورە هەن هێشتا یەکلایی نەکراونەتەوە. کەواتە هەردەبێ ئەو گرێیانە بکرێنەوەو ئەو بۆمبانە بتەقێنرێنەوەو ئەو حیساباتانە یەکلایی بکرێنەوە بۆ ئەوەی قودرەتی چوونە ناو تازەگەریو سەردەممان هەبێت و هاوکات پارێزگاری لەوەش بکەین کە ئێمە عەرەب و موسڵمانین. ئەوسا ئاشتبوونەوەیەکی گەورەی مێژوویی خودی عەرەبی- ئیسلامی لەگەڵ خودی خۆیدا دێتە ئاراوە، ئەوسا خۆمان خۆمان دەبین، خۆمان دەبینە خاوەنی خۆمان بەبێ گرێو سەرئێشەو بێئەوەی هەست بەوە بکەین کە زەوتکراوین و بێئەوەی لە بەرامبەر سەردەم و خودی مێژووگەرابیدا هەست بە گوناه بکەین.

لە کاتێکدا ئەم هەموو شتە دەڵێم، لافی ئەوەش لێنادەم کە من هەموو حەقیقەتم درکاندوە یان تەنانەت نیوەیشیم وتبێت ئەمە ئەگەر گریمانی زانینی حەقیقەت بکەم. هەموو ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە: من هەوڵمداوە لە حەقیقەت نزیك ببمەوە، بەرەو ڕووی بڕۆم، لە دەوری ڕوخسارو لە دەوری گەشانەوەی ئاگرەکەیدا بسوڕێمەوە.

من هەوڵمداوە لە حەقیقەت نزیك ببمەوە، بەرەو ڕووی بڕۆم، لە دەوری ڕوخسارو لە دەوری گەشانەوەی ئاگرەکەیدا بسوڕێمەوە

## سەرچاوە

محمد ارکون، این هو الفکر الاسلامی المعاصر؟ ترجمة و تعلیق: هاشم صالح، دار الساقي -ط2- 1995.



Carl Henning Pedersen

فازیل ئەلعەزاوی

# وێنەیەکی کاریکاتۆری نوێکاری خۆرئاوا




**لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵ**

به درێژایی چارەکە سەدەیەك، نووسەر و ڕۆشنبیرەکانمان لە بارەی نوێکارییەوە نووسیان، لەبەرئەوەی تاکە ڕێگەیەك بوە بۆ گەیشتن بە هێزی ماتی سەردەمەکەمان. زۆرینەیەك لەوانە ئەوەیان دۆزییەوە، کە سۆزە نەتەوەییەکان بەس نین بۆ بەدەستەوەگرتنی ئەو هێزەی نموونەکەیان لە خۆرئاوادا بەدیکردبوو. بێگومان ئەوانە باسی تەکنەلۆژیاو زانستیان کرد، بەڵکو نوێترین تیۆرە هزریو ڕەخنەییەکانیان هاورد، بەڵام بەبێ ئەوەی پێمان بڵێن چۆن لە کۆمەڵگەکەماندا بیانخەینەگەڕ، کۆمەڵگەیەك کە هێشتا، بەلای کەمەوە لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە، لە دەرەوەی کاتی نوێکاری دەژیو ناتوانێ خۆی لە کۆت و پێوەندەکانی سەدەکانی پێشوو ڕزگاربکات.

لە واقیعی حاڵدا ڕۆشنبیرەکانمان خەیاڵپلاویی (وهم) نوێکارییان بە دەستهێنا نەك خودی نوێکاری، چونکە ئەوانە پێیانوابوو تەکنەلۆژیا، بەدەر لە هەلومەرجەکەی لە گۆڕێدەبێو وەك هەر شمەکێکی دیکە دەشێ بە پارەی زۆری نەوت بەدەستبهێنرێت.

بێگومان ئەمە هەڵەبوو، چونکە تەکنەلۆژیا نوێکاری نییە، ئەگەرچی پەیوەستیشە پێوەی‌و بەبێ گۆڕانکارییەکی هەمەلایەنی بنەما هزری، سیاسی، ئەخلاقی‌و دەروونیەکانی نێو کۆمەڵگە واتای خۆی لە دەستدەدات. تەکنەلۆژیایەك كە پشت بە زۆرداری‌و چەوساندنەوە یاخود نەریتەکانی پاشکەوتوویی دەبەستێ خودی خۆی ڕەتدەکاتەوەو لە دوائەنجامدا جگە لە تێکشکان هیچ ئەنجامێکی دیکەی نابێ (وەك ئەوەی لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو ڕوویدا)، یاخود دەبێتە هۆی خستنەوەی سەرچڵی‌و سەرەتاییبوون (وەك ئەوەی لە ئەڵمانیای نازیدا ڕوویدا). کەواتە تەکنەلۆژیا لە سەرەتاوە گرێدراوی ڕۆحی ڕۆشنگەری ئەورووپی بوو، کە ناوەڕۆکی نوێکاریی سەردەمێکی نوێی پێکهێناو تاکو ئێستاش بەردەوامەو بە پێویست کۆتایی بە دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی و کڵێسا هێناو مرۆڤی لەو خەیاڵپڵاویانە قوتارکرد کە چەندین سەدە جڵەویان دەکرد. جیاوازیی نێوان نەبزۆکی‌و ڕۆشنگەری لە جیاوازیی نێوان ئەو عەرەبانەیەی وڵاخ ڕایدەکێشێ‌و شەمەندەفەردا نییە، بەڵکو بەرلەوە لە دۆزینەوەکەی گالیلۆدایە کە دەڵێ گۆی زەوی چەقی گەردوون نییە، بەڵکو ئەستێرەیەکی نێو سیستەمی گەردوونە. هەروەها لە دۆزینەوەی بنەچەی ڕاستەقینەی مرۆڤدایە لە لایەن چارلز داروینەوە. ئەگەر بمانەوێ هەموو ئەو شۆڕشانە تاوتوێ بکەین، کە مێژووی مرۆڤایەتیان وەرچەرخاند، ئەوا ئەوە دەدۆزینەوە کە لە بنەچەدا شۆڕشی هزری بوون یاخود بەرهەمی ئەو جۆرە شۆڕشە بوون.

ئەو شۆڕشە هزرییەی پێویست بوو ڕۆشنبیرەکانمان بەر لە نیو سەدە هەڵیگیرسێنن و هەڵنەگیرسا. لەوەش زیاتر ئەوانە تەنانەت کلیلی ڕاستیان بۆ کردنەوەی ئەو دەرگایانەش بەدەستەوە نەبوو، کە لە بەردەمیاندا دەوەستان و چاوەڕوانی ئەوە بوون بچنە نێو ئەو نوێکارییەوە، کە دەیانکاتە هاوشێوەی ئەوی دی، ئەویش خۆرئاوایە. ئەوانە پێیانوابوو نهێنییەکە لە هێزدایە، بۆیە ئەوەی لە تەکنۆلۆژیادا سەرسامیکردن، تواناکەی نەبوو بۆ بنیاتنانی بناغەی مەتریالیستانەی کۆمەڵگە، بەڵکو سروشتە سەربازییەکەی بوو، کە مەبەستی بە دەستهێنانی نوێترین تەکنۆلۆژیای چەکداری بوو. بە داخەوە لە حەفتاو هەشتاکاندا سەدان ملیار دۆلار بە فیڕۆدران بۆ کڕینی نوێترین فڕۆکەو زرێپۆش و دامەزراندنی کارگەی چەکی کیمیاوی‌و بایۆلۆژی‌و ناوی پیاوچاکەکانی ئیسلام درایە موشەکە گشتکوژەکان. لە سایەی خەیاڵپڵاویی هێزدا، کە زیاتر لە هەر شتێکی دیکە تاودەرەوەی خەیاڵپڵاوی نوێکاری بوو، زۆربەی ڕۆشنبیرەکانمان (کە لە مێژە پیربوون و دەستەوەستانە لە ئاست چارەسەرکردنی ئەو ئیشکالیەتانەی ڕووبەڕوویان دەبوەوە، جا لەمەڕ پەیوەندییانەوە بێت بە مێژوو و ڕابردووەوە یاخود هۆشمەندیان بێت بەرامبەر بەو ڕۆژگارەی تیایدا

ئەوانە پێیانوابوو نهێنییەکە لە هێزدایە، بۆیە ئەوەی لە تەکنۆلۆژیادا سەرسامیکردن، تواناکەی نەبوو بۆ بنیاتنانی بناغەی مەتریالیستانەی کۆمەڵگە، بەڵکو سروشتە سەربازییەکەی بوو، کە مەبەستی بە دەستهێنانی نوێترین تەکنۆلۆژیای چەکداری بوو

ئەگەر عەرەب بە ڕاستی پێویستیان بەو مەعریفانەی خۆرئاوا هەبێ کە گرنگن بۆ دامەزراندنی کارگە، نەخشەکاری شارەکان، دروستکردنی ڕێگاوبان، بنیاتنانی فرۆکەخانەو بەدەستهێنانی فرۆکەو زرێپۆشەکان، ئیتر چ پێویستیەکیان بە سیستەمەکانی خۆرئاوا، هزر، بڕواو نەریتەکانی ئەو هەیە کە گرێدراوی مەسیحیەتن؟

دەژیان) ناچاربوون چەپڵە بۆ ئەو پاڵەوانە نوێیە لێبدەن کە هاتبوە نێو گۆڕەپان و شمشێرەکەی ڕاکێشابوو و بەرەنگاری خۆرئاوا ببوەوەو بانگهێشتی کردبوو بۆ زۆرانبازی. بەوجۆرە لە پڕێکا یەکسان بووین بە خۆرئاوا، چونکە پاڵەوانی نوێ، کە خوڵقاندومانە، وەك جادووگەرێکی بەتوانا، هەموو ئەو بەربەستانەی لەکارخست کە لە بەرەنگاربوونەوەی نوێکاریی ئەوی دی داماندەبڕن. بەوجۆرەش ئەو شوێنەوارەمان بە دەستهێنایەوە کە بەر لە چوارده سەده لە دنیادا هەمانبوو، ڕۆشنبیرەکانیشمان لەسەر پشتی موشەکێك بە ناوی عەباس یاخود حوسەینەوە گەیشتنە کەناری نوێکاری.

لە ڕاستیدا نوێکارییەکەمان وێنەیەکی کاریکاتۆری نوێکاریی خۆرئاوا بوو. پێدەچێ ئەو نوێکارییە، لەنێو ئەو ناکۆکیانەدا کە عەرەب دەستەوەستاوبوو لە ئاست چارەسەرکردنیاندا، نەیدەتوانی شتێکی دیکەبێ. ئەوە بوو عەرەب ئاستی ئەو هێزەی دۆزییەوە کە ژیواری (حضارة) خۆرئاوا هەیبوو، ئەوەش کاتێ ناپلیۆن بۆناپارت بە سوپاکەیەوە بەر لە دوو سەدە چوە نێو میسر و پاش داگیرکردنی بەشێکی فراوانی نیشتمانەکەمان، پاش هەرەسهێنانی دەوڵەتی عوسمانی، لە لایەن بەریتانیاو فەرەنساوە. ئەم دۆزینەوەیەی بە ڕاچڵەکین دەچێ، توخمە هەرە رووناکبیرەکانی ئێمەی هاندا بانگەوازی نوێکردنەوەی کۆمەڵگەو سودوەرگرتن لەو ژیوارە ڕابگەیەنن کە خۆرئاوا دروستیکردبوو، چونکە تاکە ڕێگەیەك بوو بۆ هەڵساندنەوەی کۆمەڵگەکانیان. لەم بوارەدا هەمیشە لایەنی ماددیی ژیواری خۆرئاوا دوپاتدەکرایەوەو لایەنی ڕۆحی وەلاوەدەنراو وێڕای هەبوونی هەندێ ڕیزپەڕ لەنێو پێشەواکانی سەرەتادا، ئەو ئاقارە زاڵبوو بەسەر عەقڵی عەرەبداو تاکو ئێستاش زاڵە بەسەریدا.

ئەگەر عەرەب بە ڕاستی پێویستیان بەو مەعریفانەی خۆرئاوا هەبێ کە گرنگن بۆ دامەزراندنی کارگە، نەخشەکاری شارەکان، دروستکردنی ڕێگاوبان، بنیاتنانی فرۆکەخانەو بەدەستهێنانی فرۆکەو زرێپۆشەکان، ئیتر چ پێویستیەکیان بە سیستەمەکانی خۆرئاوا، هزر، بڕواو نەریتەکانی ئەو هەیە کە گرێدراوی مەسیحیەتن؟ لە ڕوانگەی ئەوانەوە، تەکنۆلۆژیا تەنیا ئامێرو کەلوپەلە بێلایەنەکانە، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە بڕوای مرۆڤەوە نییە، هزرو سیستەمەکانیشی ناکۆکن لەگەڵ بڕواو نەریتەکانی خۆیاندا، وێڕای ئەوە دەبێتە هۆی لەدەستدانی ناسنامەی خۆیان. لێرەشدا سەخت نەبوو هێما بۆ ئەو مێژوە پایەبەرزەی بکەن کە عەرەب تیایدا خاوەن ژیوارێکی مەزن بوو، لە کاتێکدا کە ئەورووپا نقومی تاریکی بوو هەروەها چاوەڕوانکراو بوو هەندێك سەرهەڵبدەن و بڵێن پاشکەوتوویی ئێمە بە بەراورد لەگەڵ خۆرئاوا دەستبەرداربوونی ئەو ئیسلامەیە کە بناغەی ڕاست و هەتاهەتایی بۆ هەموو شتێکی ژیان دامەزراند، جا ئەگەر مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ بنەچەکان، ئەوا زاڵدەبێ بەسەر

خۆرئاوادا. لە ڕاستیدا ئەم لۆژیكە ئوسوڵیە لەنێو كۆمەڵێك ناكۆكی بێكۆتاییدا دەجوڵێتەوە. چونكە یەكەم گریمانەی ئەوە دەكات موسڵمانەكان، بە درێژایی سەدەكانی پاش دەسەڵاتی خەلیفەكانی ڕاشدین تاكو ئیمڕۆ، دەستبەرداری ئیسلام بوون. ئەمەش گریمانەیەكی ڕاست نییە، چونكە ئەگەر موسڵمانەكان دەستبەرداری ئیسلام بووبن، ئەی چۆن بە موسڵمان ماونەتەوەو چۆن ئیسلام تاكو ئێستا بە زیندویێتی ماوەتەوە؟

لە ڕوانگەی ئەم تێڕوانینە چەوتەوە، ئەو بانگهێشتكارانە ئیسلامیان بە ڕاچێتەیەكی ئامادەكراو داناوە، كە لە توانایدایە ئیشكالیەتی نوێكاری چارەسەربكات و ڕابەرایەتیمان بكات بەرەو قۆناغی ئەو نوێكارییەی ئیمڕۆ خۆرئاوا تیایدا دەژی، ئەمەش لە ڕێگەی هاوكێشەیەكی سادەوە: ئیسلام + تەكنەلۆژیای خۆرئاوا. گەورەترین هەڵەیەك كە ئەوانە تێیدەكەون ئەوەیە، سروشتێكی سیحری دەدەنە ئیسلام كە ناشێ هەیبێ و لە ئایینەوە دەیگوێزن بۆ تیۆرێك سەبارەت بە ئەستێرەناسی، مرۆڤناسی، كیمیا، فیزیا، ئابووری و سیاسەت. بێگومان ئەمەش خزمەتی ئیسلام ناكات، بەڵكو زیانی پێدەگەیەنێ، چونكە زۆر بە سادەیی ئایدیای كۆششی مرۆڤایەتی و ململانێی كۆمەڵایەتی ڕەتدەكاتەوەو ئیسلام ناكۆك بەرامبەر ئایدیای پێشكەوتن لە مێژوودا ڕادەگرێ.

ناشێ هیچ چارەسەرێك بۆ ئیشكالیەتی نوێكاری لە كۆمەڵگەی ئێمەدا هەبێ، بەبێ چارەسەركردنی ئیشكالیەتی نێوان ئیسلام و نوێكاری. لێرەدا گەرەكمان نییە بچینە نێو ئیشكالیەتی ئایینەوە، بەڵام پێمانوایە ژیواری ئیسلام هی هەموومانەو توانستی گرتنەبەری ڕێگەی نوێكاری گرێدراوە بە پاككردنەوەی لەو خەیاڵپڵاوییانەی پەیوەستن پێوەی. چونكە ناكۆكی نێوان عەرەب و خۆرئاوا تەنیا ناكۆكی نییە لە نێوان كۆمەڵگەی پاشكەوتوو و كۆمەڵگەی پێشكەوتووی پیشەسازیدا، بەڵكو لە پەككەوتەیی عەرەبدایە بۆ چوونە نێو ژیواری نوێ و تێگەیشتنی ئەو ژیوارە. لە واقیعدا ئەوانە لەنێو و دەرەوەی ئەو ژیوارە دەژین لە هەمان كاتدا، بیانەوێ و نەیانەوێ، ناچارن مامەڵەی لەگەڵدا بكەن و بۆ هەموو شتێك پشتی پێببەستن، هەر لە ماشێنەوە بیگرە كە لێی دەخوڕن تاكو ئەو پێڵاوەی لە پێیدەكەن، كەچی نایانەوێ ژیوارەكەیان وەك ئەوەی ئەوان بێت، چونكە ناچاریاندەكات دەستبەرداری بڕوا ئایینیەكان و نەریت و كەلەپووری خۆیان بن، ئەمەش تاڕادەیەك ڕاستە. جا ئەگەر عەرەب لە ڕێگەی داڕشتنەوەیەكی ژیواریی نوێی ئیسلامەوە ئەو وێچوونەی نێوان زانست و ئیسلام لەنێونەبەن، ئەگەر چەمكی نوێكاری لای ئێمە گرێدراو نەبێ بە شۆڕشێكی هزری هەمەلایەنەوە، كە لە توانایدایە ڕابردوو و ئێستا تاوتوێ بكات و

ئەو بانگهێشتكارانە ئیسلامیان بە ڕاچێتەیەكی ئامادەكراو داناوە، كە لە توانایدایە ئیشكالیەتی نوێكاری چارەسەربكات و ڕابەرایەتیمان بكات بەرەو قۆناغی ئەو نوێكارییەی ئیمڕۆ خۆرئاوا تیایدا دەژی، ئەمەش لە ڕێگەی هاوكێشەیەكی سادەوە: ئیسلام + تەكنەلۆژیای خۆرئاوا

بایەخ بۆ ئازادیی ئیجتیهادکردن و داهێنان بگێڕێتەوەو هەموو ئەو نەریتانە وەلاوەنێ کە سەر بەم ڕۆژگارە نین، چونکە کۆسپن لە بەردەم پێشکەوتندا، ئەوا بۆ هەتاهەتایە ئەو دیمەنە کاریکاتۆرە تایبەتیەی نوێکاری دووبارەدەکەینەوە کە نوێکاری دەگۆڕێ بۆ خەیاڵپڵاوی نوێکاری.

* * *

هەمیشە جیاوازی هەیە لە نێوان ئایین و زانستدا، چونکە هەریەکەیان خاوەنی سیستەمی هزری و سمبولە تایبەتیەکانی خۆیەتی کە مامەڵەیان پێدەکات، هەریەکەشیان خاوەنی جیهانێکە کە جیاوازە لەگەڵ جیهانی ئەوی دیکە

هەمیشە جیاوازی هەیە لە نێوان ئایین و زانستدا، چونکە هەریەکەیان خاوەنی سیستەمی هزری و سمبولە تایبەتیەکانی خۆیەتی کە مامەڵەیان پێدەکات، هەریەکەشیان خاوەنی جیهانێکە کە جیاوازە لەگەڵ جیهانی ئەوی دیکە. ئەوەی ئایینیە ناکرێ بە ڕێگەی تاقیکردنەوەی زانستی بسەلمێنرێ، ئەوەی زانستیشە ناکرێ بە شێوەی ئایینی بسەلمێنرێ، چونکە لە کاتێکدا زانست مامەڵە لەگەڵ هەستپێکراو دەکات و ملکەچی تاقیکردنەوەیە، کەچی ئایین بایەخ بەوە دەدات کە ئەودیوی ئەوانەیە، مەبەست لایەنی میتافیزیکی مانای دەرکپێکراوە، ئەوەی زانست ناشێ وەڵامی بداتەوەو گرێدراوە بەو پرسیارانەوە کە تایبەتن بە مانای ژیان و گەردوون. فیزیای نوێو ئەستێرەناسی ئێستا دەتوانێ قسە دەربارەی سەرەتای خولقاندنی گەردوون بکات، ئەمەش بە ڕێگەیەکی زانستی بەهۆی "تەقینەوەی مەزن"ەوە، کە لە ڕۆژگارێکی دێرینی ڕابردوودا ڕویداوە. ئەوەی بەلای ئەو زانستانەوە گرنگە ئەو یاسا فیزیاییانەیە کە بوونەتە هۆی سەرهەڵدانی ملیاردەها ئەستێرەو ڕۆژو مانگ نەك ماناكانیان، چونکە ئەو مانایە دەکەوێتە دەرەوەی بازنەی ئەوان و ئەرکی فەلسەفە لە لایەك و ئایینە لە لایەکی دیکەوە بیدۆزنەوە.

جیاکردنەوەی ئایین و زانست هەر گرنگ نییە، بەڵکو تەنیا ڕێگەیەکە بۆ چارەسەرکردنی ئیشکالیەتی نێوان ئایین و زانست، ئەو ئیشکالیەتەی لە بنچینەدا بەری بەخشینی ئەرکێکە بە ئایین کە ناشێ هەیبێت. جا ئەگەر گرنگیی چارەسەرکردنی ئەم ئیشکالیەتە دووپاتبکەینەوە، ئەوا لەبەر ئەوەیە کە هاوکێشەی نوێکاری (ئیسلام + تەکنۆلۆژیا) ئایین و زانست پێکەوە هەڵدەتەکێنێ. چونکە تەکنۆلۆژیا تەنیا ئامێرو کەلوپەل نییە، بەڵکو بەر لەهەر شتێك زانستەو پەل دەهاوێژێ بۆ هەموو لقەکانی مەعریفە مرۆڤایەتیەکان. لێرەدا ئەگەر بمانەوێ زمانی زانست تێکەڵ بە زمانی ئایین بکەین، ئەوا بە زمانێك شاددەبین کە ئایین و زانست پێکەوە مەسخ دەکات. چونکە زمانێکی غەیبیە لە دەرەوەی ژیان.

لە بەرامبەر ئیسلام (تابۆ) + تەکنۆلۆژیا، ئەو ئاقارەی ئەزموونی ئیسلامی ئێران بە تایبەتی دەریبڕیو لە بەردەم نوێکردنەوەی کۆمەڵگەی ئێراندا شکستەیخوارد و ئێستا لە کۆمەڵگەکانی ئێمەدا ئاقارە ئوسوڵیەکانی میسرو جەزائیرو تونس بە تایبەتی

نیشانیدەدەن، ئاقارێکی دیکە لە گۆڕێبوو کە هاوکێشەی نوێکاری بە جۆرێکی دیکە دارشت: ناسیۆنالیزم+ ئیسلام (لافیتە) + تەکنۆلۆژیا (وەك سەرچاوەی هێزی سەربازی). ئەم ئاقارەش لە واقیعی بە کردەوەدا نیشتمانی گەورەمانی بەرەو زنجیرەیەك کارەسات برد، کە تاکو ئێستاش ژیانیان تێدا دەگوزەرێنن.

ئەم دوو ئاقارە بۆ تێگەیشتن لە نوێکاری هەر لە سەرەتاوە تێکشکانیان بۆ نووسرابوو، ئەو تێکشکاندنەی زیاترو زیاتر لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەدا دووپاتدەکرێنەوە کە لە سەردەمەکەماندا ڕوودەدەن، جا قەبارەی ئەو لایەنگیرییە هەرچەندێك بێت لە لایەن جەماوەرێکەوە کە بڕوای بە نموونە تێکشکاوەکانی نوێکاری نەماوەو بێهیوایە بە ڕژێمە دیکتاتۆرەکان. تێکشکانی ئەم دوو ئاقارە تەنیا لەوەدا نییە کە پەککەوتەبوون لە ئاست تەقاندنەوەی وزەی داهێنەرانەی بەدەستهاتوو لە ژیواری عەرەبی- ئیسلامییەوەو یەکێکیان وەك (تابۆ) و ڕەچێتەیەکی ئامادەکراوی هەتاهەتایی ڕوانیویەتە ئیسلام، کە وەڵامی هەموو شتێکی پێیە، ئەویتریشیان وەك ئیسلامی وەك هەر لافیتەیەکی تر بە پێی بەرژەوەندیی خۆی بەکارهێناوە، بەڵکو لەوەشدایە کە هەردووکیان هەوڵیانداوە نوێکاری لە ڕێگەی سەربازیکردنی کۆمەڵگەو سەرکوتکردنەوە بهێننەدی، کە هەموو ئازادییەکی شیاوی هزرو بیروڕا ڕەتدەکاتەوە. جا ئەگەر ئازادی هزرو دیموکراسیی سیاسی و مافی مرۆڤ ئەو کۆڵەکانە بن کە نوێکاری لە سەریان ڕادەوەستێ، ئەوا ئەم دوو ئاقارە تاکو ئێستا ئەوەیان سەلماندوە، بە هۆی سروشتی سەرکوتکەرانەی هزریانەوە، کە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ناکۆکن بە ئازادیو دیموکراسیو مافی مرۆڤ، وەك ئەوەی نەتوانن بەبێ خستنەوەی ڕۆژانەی قوربانیەکان بەردەوامبن.

بێگومان ئاقاری دیکەش هەبوون کە جیاواز وەڵامی ئیشکالیەتی نوێکاریان داوەتەوە، وەك ئاقاری مارکسی کە سۆسیالیزمی سۆڤیەتی بە نموونەی نوێکاریی عەرەبی دەزانیو ئاقاری لیبرالی (بە واتا تایبەتیەکەی) کە هەمیشە لە نێوان عیلمانیەتو ئیسلام لە لایەك و دیموکراسی و دیکتاتۆری لە لایەکی دیکەوە لە هەڵبەزودابەزدا بوە، بەڵام ڕێگەی تایبەتی نوێکاری هەمیشە ونبووەو ناکۆکی جەستەی هەموو ئەو ئاقارە سیاسیو هزریانەی تەنیوەتەوە، کە دەستەوەستاون لە ئاست دۆزینەوەی ئەو ڕێگەیەی لە شەوی سەدەکانی ڕابردووەوە ڕووەو ڕۆژی نوێکاریمان دەبەن.

* * *

نووسەرەکانمان بە هەڵەدا دەچن (ئەمەش ئەوەیە زۆربەی نووسەرو ڕەخنەگرەکانمان تێیدەکەون کە وێڵن بە دوای نوێکاریدا) کاتێك سروشتێکی نامێژوویی دەکەن بە بەری نووسینەکانیاندا، واتە ڕووتیاندەکەنەوە لە

ئەگەر ئازادی هزرو دیموکراسیی سیاسی و مافی مرۆڤ ئەو کۆڵەکانە بن کە نوێکاری لە سەریان ڕادەوەستێ، ئەوا ئەم دوو ئاقارە تاکو ئێستا ئەوەیان سەلماندوە، کە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ناکۆکن بە ئازادیو دیموکراسیو مافی مرۆڤ

نووسەری ئێمە دەبێ چ نوێكارییەك لە نووسینەكانیدا بهێنێتەدی؟ نوێكارییەك كە تاكو ئێستا ڕێگەی نەدۆزیوەتەوەو لەهەمان كاتدا لە ناوەوەو دەرەوەی سەردەمەكەدا دەژی، یاخود نوێكاری ئەودیو نوێكاری كە خۆرئاوا بەخۆوەی دیوە؟

پەیوەندییەكانیو هەلومەرجە ڕۆشنبیری، كۆمەڵایەتی، سیاسی، دەروونیو زمانەوانییەكانی. ئەمە سروشتێكی مەحاڵە، جا نووسینەكە چەند سەرچڵانەو پێشڕەوانەو دژ بە ئاقارە باوەكان بێت. بێگومان هەر نووسینێك پرۆسەیەكی تاكەكەسییە، بەڵام لەو ساتەوەختەدا كە دەگاتە دەستی خوێنەر دەگۆڕێ بۆ پرۆسەیەكی كۆمەڵایەتی، واتە ئامانجێكی دەبێ كە دەخوازێ ئەوی دیكە دەركی پێ بكات، جا سروشتی ئەو ئامانجە هەرچییەك بێت. دەشێ خەیاڵپڵاویی نووسینی نامێژوویی ئەنجامی ئەو سروشتی ڕۆشنبیرییە ناكۆكە لای نووسەر سەرهەڵدابێ، كە لەم سەردەمەدا تیایدا دەژی، چونكە ئەو تەنیا لەنێو ڕۆشنبیرییەكی نەتەوەییدا نییە، بەڵكو لەناو ڕۆشنبیرییەكی دیكەشدایە كە زۆر دوورە لە ڕۆشنبیرییەكەی خۆیو خاوەنی بنەمای جیاوازو هەلومەرجی مێژوویی تایبەتی خۆیەتیو ئەوەی لەوێ ڕوودەدات ئەوە نییە كە لێرە دەگوزەرێ. نووسەری ئێمە (بێگومان ڕۆشنبیریش) ئەوە بەدیدەكات كەلێنێك ئەو دوو ڕۆشنبیرییە (قوڵیی ڕۆحیو دەروونیشیان) لێك جیادەكاتەوە، ئەوەش هەمان كەلێنی نێوان كۆمەڵگەی پیشەسازیی گەشەكردو ئەو كۆمەڵگە كشتوكاڵییەیە كە تاكو هەنوكە ڕێگەیان نەدۆزیوەتەوە. واتە كەلێنی نێوان كۆمەڵگەی ئەودیو نوێكاریو كۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتیی تەقلیدی. ئاستەنگەكە لێرەدایە: نووسەری ئێمە دەبێ چ نوێكارییەك لە نووسینەكانیدا بهێنێتەدی؟ نوێكارییەك كە تاكو ئێستا ڕێگەی نەدۆزیوەتەوەو لەهەمان كاتدا لە ناوەوەو دەرەوەی سەردەمەكەدا دەژی، یاخود نوێكاری ئەودیو نوێكاری كە خۆرئاوا بەخۆوەی دیوە؟

بێگومان جیاوازییەك لە نێوان ئەو دوو جۆرە نوێكارییەدا هەیە كە گرێدراوی گەشەكردنی دەروونیو ڕۆحیو مێژوویی هەریەكێكیانە. بۆیە ئەوەی بەلای یەكێكیانەوە زۆر نوێیە دەشێ لە ڕوانگەی ئەوی دیكەوە زۆر دواكەوتووبێت. بۆ نموونە، دەشێ سوفیزم گرێدراوی قۆناغی ئەودیو نوێكاری بێت لە خۆرئاوا، لە كۆمەڵگەیەكدا كە پیشەسازی زاڵە، لەبەرئەوەی گەڕانە بەدوای ڕۆحانیەتێكی ونبوودا. لە ڕاستیدا لە ڕۆشنبیریی ئەودیو نوێكاریی خۆرئاوادا ڕەوتێك ڕوەو هەموو شتێكی ڕۆحانیو سیحریو سەرنجڕاكێشی ڕۆشنبیریی خۆرهەڵات لە گۆڕێیە، هەر لە سەمای ڕۆژهەڵاتی و یۆگاوە بیگرە تاكو دەگاتە سوفیزم، بەڵام نووسینی سۆفیگەرانەی ئێمە چ نوێكارییەك بە دەستەوە دەگرێ لەو كۆمەڵگەیەدا كە پڕە لە دەروێش و لە بنچینەدا كۆمەڵگەكە تێدەكۆشێ بۆ قوتاربوون لە دەست ڕۆحانیەتەكەی، هەتا بتوانێ ڕێگە ڕوەو سەردەمەكەی بدۆزێتەوە؟ كەواتە نوێكاریی دەقی ئێمە لە كوێوە سەرچاوەدەگرێو هێما بۆ چ نوێكارییەك دەكات؟ چ نوێكارییەك دەردەبڕێ؟ چ جۆرە هۆشیارییەك سەبارەت بە نوێكاری دەخاتەڕوو؟ چ هزرگەلێك پەیوەندییان لەگەڵ

نوێکاریدا هەیەو چ هزرگەلێك ڕەتدەکرێنەوە؟ ئایا نوێکاری لە فۆرمی دەرەکی دەقدا دێتەدی یاخود لە بنەماکەیدا کە لە هەمان کاتدا پێکدێت لە توخمی کەسێتیو مێژوویی؟ ئالێرەدا لەو نوێکارییە دەپرسرێتەوە کە نووسینی ئێمە دەیخاتەڕوو.

بزووتنەوەی نوێکاری لە نووسینی ئێمەدا، هەر لە سەرەتاوە تاکو ئێستا، بەدەست هەمان ئیشکالیەتەوە نالاندویەتی کە ڕووبەڕووی بزووتنەوەی نوێکاریی سیاسیی خۆرئاوا ببووەوە، بەلام لەگەڵ بوونی جیاوازییەکدا ئەویش ئەوەیە کە بە دەگمەن دەرکی بەو ئیشکالیەتە کردوە، چونکە داهێنان لای ئێمە هەمیشە دیلی ئەو گۆشەگیرییە بوە، کە لە دەرەوەی ئەرکی گۆڕانکاریخوازانەیڕا بەسەریدا سەپێنراوە، لەبەر ئەو هۆیانەی تایبەتن بە بنەمای ڕۆشنبیریی پاشکەوتوانەی کۆمەڵگەو سەرکوتکردنی سیاسیو پیواری (غیاب) ئازادیی بیروڕا دەربڕین، ئەمەش وایکرد وەك بینایەك لە بۆشاییدا خۆ بنوێنێ. لە واقیعدا دابڕانی نووسینی ئێمە لە بابەتەکەی خۆی ڕێگربوو لە بەردەم ئەوەی بتوانێ مانای نوێکاری لە واقیعی بەکردەوەدا تاوتوێبکات و فڕێیدایە نێو خەیاڵپلاویی زیاترەوە، چونکە پێیوابوو دەتوانێ لە ڕێگەی مەرجی نووسینەوە، کە تایبەتمەندیی داهێنەرانەی خۆی هەیە، بە خودی خۆی نوێ بێت.

ئەوە خەیاڵپلاوییەکی دوولایەنە بوو، چونکە نوێکاری لای ژمارەیەکی زۆری نووسەرو شاعیر، کە لە ڕاستیدا نوێکارییەکی ڕواڵەتکارانە بوو، لە ڕێگە ونکردن شتێکی دیکە نەبوو، ئەمەش جارێك لە نووسینداو جارێکی دیکە لە کۆمەڵگەدا. بانگەوازی پێشڕەوێتی هەرچۆنێك بێت، ئەوا دەقی ئێمە وێنەیەکی تری ناکۆکیەکانی ڕێگەی تایبەتیە (سیاسی- کۆمەڵایەتی) بۆ نوێکاری. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دەقەکانی نووسەرو شاعیرەکانمان، لە سەرەتاوە تاکو ئێستا، ئەوە بەدیدەکەین خواستێك بۆ نوێکاری لە گۆڕێ بوە، بەلام بەبێ بوونی توانایەك بۆ گەیشتن بەو نوێکارییە، کتومت وەك ئاقارەکانی نوێکاریی سیاسی کە نەیانتوانی ئیشکالیەتی نێوان خەیاڵپلاوییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و ڕاستیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم چارەسەربکەن.

فۆڕمی نوێ لای شاعیرو نووسەری ئێمە هاوتای تەکنۆلۆژیایە لای سیاسیی ئێمە، بەلام وەك چۆن سیاسی تووشی سەرسامی دەبێ بەرامبەر بەو هزر، ئەخلاق، بەها، بنەماو سۆزانەی گرێدراوی تەکنۆلۆژیان، ئەوا نووسەری ئێمەش بەرامبەری تووشی نامۆبوون دەبێ، بەڵکو گرانە تێبیگات یاخود لە ڕووی دەروونی، ڕۆشنبیری، هزریو ئەخلاقیەوە قبوڵی بکات. نوێکاریی ئەوروپی، بەر لە دوو سەدە، لەسەر بناغەی تێکۆشان بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لەهەر کۆسپێکی بەردەم گەشەکردنی دامەزرا، جا

بزووتنەوەی نوێکاری لە نووسینی ئێمەدا، هەر لە سەرەتاوە تاکو ئێستا، بەدەست هەمان ئیشکالیەتەوە نالاندویەتی کە ڕووبەڕووی بزووتنەوەی نوێکاریی سیاسیی خۆرئاوا بووەوە، بەڵام لەگەڵ بوونی جیاوازییەکدا ئەویش ئەوەیە کە بە دەگمەن دەرکی بەو ئیشکالیەتە کردوە

ئەمە گرێدراوی هزر یان ئایین یاخود ئەخلاق.. بێت. ئەمە گەشەکردنێکە ئێستا، بە تایبەتی پاش گۆڕانکارییەکانی وەك شۆڕشی سێکسی، بزووتنەوەی فیمینیزم و خوێندکاران لە شەستەکانداو دوای داڕمانی سۆسیالیزمی سۆڤیەتی لەسەر ئاستی دنیا، بۆتە هۆی وەرچەرخانێکی گەورە لە چەمکەکانی ئازادی، هزرو ئەخلاقدا.

ئەم زەمینە ڕۆشنبیرییەی دەقی نوێکاریی خۆرئاوای لەسەر ڕادەوەستێ، کە دنیای تایبەت بە خۆی لە هۆشمەندی بەرامبەر ئیشکالیەتی مرۆڤ لە سەردەمەکەیدا دێنێتە ئاراوە، بنەڕەتیانە جیاوازە لەگەڵ ئەو زەمینەیەی دەقی نوێکاری ئێمەی لەسەر ڕادەوەستێ، ئەو دەقەی کەرەستەکەی لە ڕۆشنبیرییەکی دیکەوە بەدەستدێنێ، کە نیوەی لە ڕابردوودایە و نیوەکەی دیکەشی لە ئێستادا، هەروەها لەنێو ئەو ناکۆکیانەدا خنکاوە کە بەردەوام بەرهەمیاندێنێ. بۆیە سەیر نییە شاعیرو نووسەری وا ببینین ناویان گرێدراوە بە نوێکارییەوە، کەچی دیکتاتۆریەتەکان و ڕژێمە سەرکوتکارەکان و جەنگخوازەکان، بەناوی پایەبەرزیی نیشتمان و نەتەوەوە بڵند ڕادەگرن یان لەگەڵ جەلادەکاندا دەوەستن و بەشداریدەکەن لە قەڵاچۆکردنی میللەتدا، یاخود سۆزی ساویلکانەو بێزاروی بێ بناغەی خۆیان هەڵدەڕێژنە سەر لاپەڕەکان، سەبارەت بە پایەداریی هێزی سەربازی تا دەگاتە گریان بۆ خود. جگە لە کەمایەتیەك لە شاعیرو نووسەرە داهێنەرەکان؛ مرۆڤ نازانێ نووسەرەکان دەخوازن چی بڵێن و سوودی ئەو گوتەیەو شوێنەواری لە نوێکاریدا، وەك پێداویستیەکی ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی - مێژوویی، چییە؟ لەدوائەنجامدا ئەوانەی دەقە زەینییە شلوشێواوەکان دەخەنەڕوو، هەموو شتێك وێراندەکەن. ئەم خودە ناکامڵە لە هۆشیاریی نوێکاریدا دەبێتە هۆی تاودانەوەی منداڵکارییەکی ڕۆشنبیری نقوم لە تەمدا. ئەمەش هەمان ئەو خودەیە کە لە کارەساتێکەوە بۆ کارەساتێکی دیکە ڕابەرایەتیکردووین، بەبێ ئەوەی، لەبەر ساویلکەیی، هەست بە گوناهی خۆی بکات.

* * *

لە ڕووی بابەتیەوە، جیاوازیی ڕۆشنبیری لەگەڵ خۆرئاوادا لە گۆڕییەو دەشێ بۆ ماوەیەکی تا ئەم یان ئەو ڕادەیە دوورودرێژ بەردەوامبێت، ئەمەش بە هۆی چەندین سەدەی گەشەکردنی تایبەتیەوە کە ڕۆشنبیریی ئێمە لە ڕۆشنبیریی خۆرئاوا جیادەکاتەوە، هەروەها بە هۆی ئایین و دابونەریت و پێوانەکانی ئەخلاقەوە، بەڵام پێویستە ئەو جیاوازیی ناسنامەیە وامان لێنەکات سروشتی نوێی گەشەکردنی ژیواری لە هەموو جێگەیەك لەیادبکەین، واتە گوێزانەوە لە ژیواری ناوچەییەوە بۆ ژیواری جیهانی.

بۆیە سەیر نییە شاعیرو نووسەری وا ببینین ناویان گرێدراوە بە نوێکارییەوە، کەچی دیکتاتۆریەتەکان و ڕژێمە سەرکوتکارەکان و جەنگخوازەکان، بەناوی پایەبەرزیی نیشتمان و نەتەوەوە بڵند ڕادەگرن

ئەگەر سروشتی پێشوی گشت ژیوارەکان بە درێژایی هەزاران ساڵ لە دنیادا سەریانهەڵداوە گۆشەگیریی بووبێ، بە هۆی سەختی پەیوەندیکردنی نێوان گروپە مرۆییەکان و سروشتی کشتوکاڵی ئەو کۆمەڵگایانەی جگە لەو چیرۆك و ئەفسانانەی گەڕیدەکان دەیانگواستەوە هیچیان سەبارەت بە یەکتری نەدەزانی، ئەوا ژیواری پیشەسازی، کە ئەزموونێکی نوێیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، هەموو ماوە شیاوەکانی نێوان کیشوەرو نەتەوەکانی لەناوبردوە، ئەمەش بە هۆی تەلەفۆن، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، سینەما، فاکس، مانگی دەستکرد، فرۆکە، شەمەندەفەر، ماشێن، موشەك، ئاژانسی دەنگوباس و ئەو ڕۆژنامانەوە کە لە هەموو دنیادا بڵاودەکرێنەوە. بێگومان ئەم گۆڕانکارییە مەترسیدارە گرێدراوی ئەو سەرمایەدارییە بوو کە لە ڕێگەی بازاڕی جیهانیو سروشتی گەردوونی شمەك و سەرمایەدارییەوە هەموو سنورەکانی لەناوبردبوو و لە گشت کۆمەڵگەکاندا بنەمای چینایەتی نوێی (بۆرژوازیو کرێکاران) هێنایە ئاراوە. ئەمەش بوە هۆی خستنەوەی بەرژەوەندییو ئایدیۆلۆژیاکان، کە بنچینەی هاوبەشیان هەیە بۆ ڕوانینە دنیا.

لەگەڵ ئەم گەشەکردنە نوێیەدا، نزیکبوونەوەی ڕۆشنبیریی نێوان کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان قوڵبۆوە، بە شێوازێك کە بنچینەی یەکگرتوو بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگە بسەپێ: پێکهاتنی دەوڵەت و وەزارەتە تایبەتمەندەکان، ڕێکخستنی کار لە کارگەو دائیرەکاندا (کاتژمێرەکانی کات، مۆڵەت و خانەنشینی)، دۆزینەوەی باخچەی کۆرپەو ساوایان، ڕێکخستنی قوتابخانەکان (سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەییو زانکۆ)، نزیکبوونەوەی بابەتەکانی خوێندن (زمان، جوگرافیا، مێژوو، فیزیا، کیمیا، وەرزش و.. هتد) و لە کاتێکدا یارییە ناوچەییو نەتەوەییەکانی پێشوو لەناوچوون، یاری جیهانیی یەکگرتوو سەریانهەڵدا (تۆپی پێ، تێنس، بۆکس بازی، شەترەنج و یاری ساحەو مەیدان). هەروەها لە زۆربەی شوێنەکانی دنیا جلوبەرگی ناوچەیی لە بەردەم جلوبەرگی ئەورووپیدا پاشەکشەیکردوەو پایتەختی دیاریکراو بوونەتە پایتەختی مۆدە، کە بڕیار لەسەر ئەو جلوبەرگانە دەدەن پیاوان و ژنان لە بەریاندەکەن. وێڕای ئەوە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان هاتە مەیدانەوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دنیا.

ئەم ژیوارە یەکگرتووە ناچارماندەکات بە چەقۆو چەتاڵ نان بخۆین، سوپاکانمان لە بری ڕمو شمشێر بە فرۆکەو زرێپۆش چەکداربکەین، سواری ماشێنی کەسێك بین کە نایناسین و بە تاکسی ناودەبرێ، گەشت بکەین بۆ چین و ئەمریکا، بێ ئەوەی پارە لە گیرفانماندا بێ، چونکە کارتێکی بچوك لە گیرفانماندایە پێی دەڵێن "ئەمەریکا ئیکسپرێس" یان هەر ناوێکی دیکە، جەژنی لە دایکبوون دەکەین و خێزان

ئەم ژیوارە یەکگرتووە ناچارماندەکات بە چەقۆو چەتاڵ نان بخۆین، سوپاکانمان لە بری ڕمو شمشێر بە فرۆکەو زرێپۆش چەکداربکەین... گەشت بکەین بۆ چین و ئەمریکا، بێ ئەوەی پارە لە گیرفانماندا بێ، چونکە کارتێکی بچوك لە گیرفانماندایە پێی دەڵێن "ئەمەریکا ئێکسپرێس"

دروستكردن بە مانگی هەنگوین دەستپێدەكەین، ڕووداوەكانی ئەم پەڕو ئەوپەڕی دنیا لەسەر سكرینی (شاشە) تەلەفزیۆن لە هەمان ڕۆژو تەنانەت هەمان چركەساتدا ببینین‌و بە ڕێزێكی زۆرتر لە ڕێزی شاعیرو نووسەرەكانمان باسی شكسپیرو ڕامبۆو دیستۆفسكی و فۆكنەر بكەین. ئەم ژیوارە یەكگرتوە خۆی سەپاندوە بەسەر هەموو لایەكدا، بەڵام یەك ئاستی گەشەكردنی ئابووری‌و سیاسی‌و كۆمەڵایەتی‌و هزری لە دنیادا نەهێناوەتە ئاراوە. ئەوەتا لە كاتێكدا ناوەندە سەرمایەدارییە مەزنەكانی جیهان سەریانهەڵداوەو بە ڕادەی جۆراوجۆر گەشەیانكردوە، تێكڕای میللەت و نەتەوەی هەمەجۆر پاشكەوتوون یاخود سەركەتوونەبوون لە بەجێهێنانی هیچ پێشكەوتنێكدا، جارێك بە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەی بەكاربردنی سەرمایەداریی گەشەكردوەوە، جارێكی دیكە بە هۆی پەككەوتەییەوە بۆ ڕەتكردنی ئیشكالیەتەكانی خۆی‌و گوێزانەوە لە پەیوەندی‌و چەمكە گوندییەكانەوە بۆ ئەو پەیوەندی‌و چەمكانەی شۆڕشی پیشەسازی بەر لە دووسەد ساڵ لە ئەوروپا هێنایەئاراوە. لە كاتێكدا ئەو گەشەكردنە بوە هۆی یەكگرتوویی ڕۆشنبیریی دانیشتوانی جۆراوجۆری وڵاتە پیشەسازییە پێشكەوتوەكان، بوە هۆی پارچە پارچەكردنی یەككگرتوویی ڕۆشنبیریی پێشوی وڵاتەكانی دنیای سێ. بەو جۆرە جیاوازیی ڕۆشنبیری لە نێوان ئینتلجێنسیای نیشتمانی (كەمایەتی) و جوتیاراندا (زۆرایەتی) قوڵتربوەوە، بە شێوەیەك گرانە یەكێك لەو دوولایەنە لە زمانی لایەنەكەی دیكە تێبگات. بێگومان جیاوازیی نێوان ڕۆشنبیریی جوتیاری‌و ڕۆشنبیریی ئەودیو نوێكاریی خۆرئاوا، جیاوازیی نێوان گەردونێك و گەردونێكی دیكەیە.

ئەوەتا ناكۆكیە هەرە گەورەو ترا‌ژیدی‌و تاڵ و كاولكەرەكەی جیهانەكەمان دێتە بەرچاو: ژیوارێك مەرجەكانی خۆی بەسەر سەرتاپای دنیادا دەسەپێنێ‌و سنورەكان هەڵدەگرێ‌و وڵاتەكان یەكدەخات، كەچی لە هەمان كاتدا دنیا پارچەپارچەدەكات. بەوجۆرەش دوو جۆر مرۆڤ لە ئارادا دەبن: سەردارەكان (سادە) و دەستوپێوەندەكان.

كەواتە نوێكاری بەلای نووسەری ئێمەوە چییە؟

ناشێ نووسەری ئێمە لەگەڵ سەردارەكان بێت، چونكە بە پێویست خۆی دەخاتە پاڵ ئەو نادادپەروەرییەی نوێنەرایەتی دەكەن. هەروەها ناشێ دەستوپێوەندەكان ڕەتبكاتەوە، چونكە دەرك بەوە دەكات ئەوانە قوربانیی مێژوون. بەو جۆرە ئەو دەرك بەوە دەكات كە سەربەستی جەنگاوەری نییە بۆ هەڵبژاردنی یەكێك لە ئۆردوگاكان و ناچارە لە هەمان كاتدا ڕەتیان بكاتەوەو قبوڵیشیان بكات. واتە دوژمن و دۆست لێرەو دوژمن و دۆستیش لەوێ. لە واقیعدا ئەو تەنیا لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا دابەشكراو نییە، بەڵكو جارێك لەنێو خۆرهەڵاتدا دابەشكراوەو جارێكی دیكەش لەنێو

ئەوەتا ناكۆكیە هەرە گەورەو ترا‌ژیدی‌و تاڵ و كاولكەرەكەی جیهانەكەمان دێتە بەرچاو: ژیوارێك مەرجەكانی خۆی بەسەر سەرتاپای دنیادا دەسەپێنێ‌و سنورەكان هەڵدەگرێ‌و وڵاتەكان یەكدەخات، كەچی لە هەمان كاتدا دنیا پارچەپارچەدەكات

خۆرئاوادا. ئەو خاوەنی چارەنووسێکی تراژیدیانەیە کە بە چینێکی ئەستوری گاڵتەجاڕیی دۆنکیشۆتی داپۆشراوە: لە ناوچەوانی نووسراوە لە ناوجەرگەی جەنگەکەدابێ، بە دەستی ڕاستی شمشێر هەڵگرێو بە دەستی چەپیشی چەپکێك گوڵ. پەیوەندیی ئەو بەو دوو لایەنەوە کە ڕووبەڕووی یەکدی بوونەتەوە، هەمیشە پەیوەندییەکی گومان لێکراوە. ئەو لە ڕێگەی دابڕانەوە ئینتیمای بۆ کۆمەڵگەکەی خۆی هەیەو لە ڕێگەی پەیوەندیپێکردنەوە ئەوی دیکە ڕەتدەکاتەوە، ئەو ئینتیمای بۆ دەستوپێوەند هەیە بۆ ئەوەی لە دەستوپێوەندی ڕزگاریان بکات، سەردارەکانیش ڕەتدەکاتەوە بۆ ئەوەی لە سەرداریی ڕزگاریانبکات. ئەو مەسیحێکی هاوچەرخە بە دڵی یەهوزاوە. ئەو بەرەکەتی خۆی دەبەخشێتە ئەو دوو مێگەلە ڕێگە ونکردوە، بۆ ئەوەی خیانەتیان لێبکات، چونکە بەبێ ئەم خیانەتە کە بەرامبەر بە ڕۆڵی خۆی هۆشیاریدەکاتەوە، دەبێتە بەشێك لەم یان ئەو مێگەل. بێگومان خیانەتەکەی دەیکاتە حوشترێکی مێی ڕەش کە هەمیشە شوان فیتدەدات سەربڕێت.

لەم ئاهەنگەی مەسیح و یەهوزا لە دڵی ئەو نووسەرەی ئێمەدا سازیدەکەن، کە دەیەوێ لە سەردەمەکەی خۆیدابێت، ئەشکەنجەی نووسینی ڕاستەقینە دەستپێدەکات، ئەشکەنجەیەك کە خودی نووسەرەکە تێدەکۆشێ بۆ قوتاربوون لە دەستی، هەتا بتوانێ هاوسەنگی بگێڕێتەوە بۆ ڕۆحی خۆی. جا لەبەر ئەوەی زۆربەی نووسەران لە بنچینەدا ناڕواننە خۆیان و ئەوساتەی لە دایکدەبن کەوچکی پڕ لە خەیاڵپلاوی ئەو پەیامە لە دەمیاندایە کە بۆ دنیایان هەڵگرتوە، بۆیە دەبنە نێچیرێکی ئاسانی بانگەشەکارانی ئایدیۆلۆژی، کە لەسەر سوچی هەر شەقام و کوچەیەك چاوەڕوانیان دەکەن و هانیاندەدەن بۆ ئەوەی ببنە زمانحاڵی مێژوو. بەو جۆرەش نووسەری ئێمە بەوە خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ کە لە دەست یەهوزا ڕزگاریبوە بۆ ئەوەی ببێتە مەسیح؛ مەسیحێك کە بڕوای بە خۆی هەیەو تا ئاستی لەعنەت جیدییەو هیچ گاڵتەجاڕی یان گومانێك لە دەقەکەیدا نییەو قەسیدەکانی دەبێ لە کەعبە هەڵواسرێن و بە ئاوی ئاڵتون بنووسرێنەوە، بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوو شوێن پێی هەڵگرن. بەوجۆرە نووسەری ئێمە کۆتایی بە ناکۆکی خۆی لەگەڵ نوێکاری دێنی، ئەوەش لە ڕێگەی ئینتیماوە بۆ ناونیشانێك کە هەستی بە دەستەوەگرتنی ناسنامەیەکی دیاریکراوی پێ دەبەخشێو لە تەنیایی ڕۆحی قوتاریدەکات.

لەم ئاهەنگەی مەسیح و یەهوزا لە دڵی ئەو نووسەرەی ئێمەدا سازیدەکەن، کە دەیەوێ لە سەردەمەکەی خۆیدابێت، ئەشکەنجەی نووسینی ڕاستەقینە دەستپێدەکات

کێشەکە لەوەدایە گشت ناونیشانەکانی نوێکاری ئێمە (لە چوارچێوەی سیاسیو هزری گشتیدا) ناونیشانی فریودەرانە بوون و هەمیشە ڕوەو دەرەوەی سەردەمەکەمان، نەك سەردەمەکە خۆی، ڕابەرایەتیانکردووین. بۆیە ئاخاوتن دەربارەی ئاسۆیەکی لا دیکە بۆ نوێکاری، بەبێ ڕەخنەگرتن لە چەمکەکانی نوێکاریی باو لە ڕووی سیاسیو

ئابووری‌و ڕۆشنبیرییەوە، شیاونییە. ئەگەرچی هەندێ نووسەری ئێمە پێیان چاکە ئاخاوتن سەبارەت بە نوێکاری تەنیا لەناو نووسیندا بێت، وەك ئەوەی نووسین جۆرە فاڵگرتنەوە یان کارپێکردنی سیحر بێت، هەر ئاخاوتنێك لە بارەی نوێکارییەوە ئاخاوتنە سەبارەت بە هەمەلایەنی پەیوەندییە باوەکانی ڕۆژگارەکەمان و ڕادەی تێگەیشتنمان بۆیان و هەڵوێستمان بەرامبەریان، ئەمەش ئەوەندەی ئاخاوتنە دەربارەی خۆمان ئەوەندە ئاخاوتن نییە سەبارەت بەوی دی.

بەوجۆرە جارێکی دیکە دەگەڕێینەوە بۆ نوێکاریی عەرەب، بۆ ئەوەی ڕەخنە لە دەرکەوتە کۆمەڵایەتیە گەورەکانی بگرین، بەرلەوەی لەنێو نووسینی خۆماندا وەك مشکێکی تۆپیو دەست بە کلکیەوە بگرین و فڕێیدەینە نێو تەنەکەی خۆڵەوە. ئەو نموونە بەربڵاوەی ماوەیەکی دوورودرێژ خۆی خستەڕوو و ئێستا لە کۆتایی نزیکبۆتەوە، نموونەی دیکتاتۆریەتی سەربازییە، لە هەوڵیدا لە ڕێگەی نوێکردنەوەی کۆمەڵگەو بنیاتنانی سەربازیی تایبەت بە خۆی‌و دووپاتکردنەوەی ئەو سەربەخۆییەی نەیتوانی لە گەرمەی ڕووبەڕووبوونەوەی دوو ئۆردوگای نێودەوڵەتیدا بە دەستیبهێنێ، ڕەوایەتی ببەخشێتە خۆی. چونکە ئەگەر ئەو نموونەیە سەر بەم یان ئەو ئۆردوگا نەبوو، ئەوا دەتوانێ سیستەمی تایبەت بە خۆی بهێنێتەئاراوە، ئەوەی بە درێژایی سی ساڵ بە ڕێگەیەك لە نێوان کۆمۆنیزم و سەرمایەداری دانرا. ئەو ڕێگەیەی لە هەندێ وڵاتی عەرەبدا بە "ڕێگەی عەرەبی ڕوەو سۆسیالیزم" ناودەبرا، تاودەرەوەی خەونی عەرەب بوو نەك تەنیا بۆ گەیشتن بە نوێکاری خۆرئاوا، بەڵکو بۆ ڕەتکردنیشی، ئەمەش لە ڕێگەی بەخشینی سروشتی مرۆڤانە بە نوێکاری، کە خۆرئاوا لێی بێبەریە، ئەویش سروشتێکی سۆسیالیستانەیە..

پشت ئەستوور بەم بنچینە میتافیزیکیە تەلیسماویە، شۆڕشی نەتەوەیی تەشەنەیکرد، ئەو شۆڕشەی لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا شتێکی وەردەگرت کە گونجاو بوو بۆ چەسپاندنی کۆڵەکەکانی دەوڵەتەکەی‌و ئەوەی ڕەتدەکردەوە کە دژ بە مۆدێلی نەتەوەیی بوو. واتە وەك چۆن سروشتی مەتریالیستانەو زانستیانەی سۆسیالیزمی (خۆرهەڵات)ی ڕەتکردەوە، سروشتی دیموکراسی‌و لیبرالی سەرمایەداریی (خۆرئاوا)شی ڕەتدەکردەوە، وێڕای ئەوەی ئابوورییەکەی هەمیشە پاشکۆی ئابووری سەرمایەداریی جیهانی بوو و بەشێك بوو لەو ئابوورییە، کەچی سروشتی دەوڵەتی سەرکوتکەرانەی لە سۆسیالیزمەوە وەرگرتبوو. ئەگەرچی هەمیشە جنێوی بە سەرمایەداری دەدا، کەچی هەموو نەخۆشیەکانی لێ دەخواست، بەبێ ئەوەی هیچ توانایەکی بەکردەوەی بەرهەمهێنانی هەبێ. بەو جۆرە عەرەب ڕژێمی تایبەت بە خۆیان هێنایەئاراوە، کە بنەڕەتیانە جیاوازبوو لەگەڵ ئەو ڕژێمانەی تردا کە لە

هەر ئاخاوتنێك لە بارەی نوێکارییەوە ئاخاوتنە سەبارەت بە هەمەلایەنی پەیوەندییە باوەکانی ڕۆژگارەکەمان و
ڕادەی تێگەیشتنمان بۆیان و هەڵوێستمان بەرامبەریان،
ئەمەش ئەوەندەی ئاخاوتنە دەربارەی خۆمان ئەوەندە ئاخاوتن نییە سەبارەت بەوی دی

ڕۆژگارەکەماندا بە ناوەندی نوێکاری دادەنران، بەڵام بەبێ ئەوەی دەست لە ڕوانینە وێنەی نوێکاریی خۆرئاوا هەڵبگرن یاخود خۆ لە کەوتنە ژێر کاریگەریی فریودانەکانی بپارێزن.

لۆژیکی بوو، ئەگەر عەرەب بیانویستبایە ژیواری سەردەمەکەیان (لەبەر هۆی تایبەت بە خۆیان) ڕەتبکەنەوە، بەڵام ئەم ڕەتکردنەوەیە مەحاڵە، چونکە تەنیا پەیوەندیی بە خۆیانەوە نییە، بەڵکو بەوی دیکەشەوە. لەبەرئەوەی ئەوی دیکە ڕێگەیان پێنادات نەوتەکەی خۆیان لە بیابانەکانیاندا بشارنەوە. وێڕای ئەوەش، بۆ ساخکردنەوەی کاڵاکانی خۆی، وەك بازاڕ، پێویستی پێیانە. لە واقیعدا هەزارویەك هۆ هەیە بۆ ئەوەی گۆشەگیریی عەرەب مەحاڵ بێت، چونکە لە دنیایەکدا دەژین، لەنێو سیستەمێکی سەرمایەداریی خاوەن سروشتی جیهانیدا، کە سنوورەکان مانای خۆیان لە دەستداوە. جا ئەگەر گۆشەگیریی ژیواری لە ڕابردوودا، بە درێژایی هەزاران ساڵ، جیاوازیی دابونەریت و ئەخلاق سەپاندبێتی، ئەوا یەکگرتوویی ژیواری ئێستا دەیسەپێنێ بەسەر گشت مرۆڤایەتیدا لەسەر دابونەریت و ئەخلاقی یەکگرتوو ڕێکەون. ئەمەش پرۆسەیەکە لە داهاتوودا ڕوەو نەمانی جیاوازیی نێوان تێکڕای میللەتەکان بەردەوامدەبێ.

* * *

عەرەب بە درێژایی سی چل ساڵی پێشو، کاتێك بۆیان ئاشکرابوو دوو سیستەمی جیهانی (خۆرئاواو خۆرهەڵات یان سەرمایەداری و سۆسیالیزم) هەن، هەوڵیان دا سیستەمی تایبەتی خۆیان هەبێت. لەمەشدا لەگەڵ زۆرێك لەو میللەتانەدا تەبابوون کە دیلی پەیوەندییە ڕابردووخوازەکان بوون و دەستەوەستاوبوون لە ئاست پیشەسازیکردنی کۆمەڵگەکانیاندا، بەڵام دەرکیان بەوە نەکردبوو کە جیاوازیی نێوان دوو جیهانەکە سیاسی بوو نەك ژیواری- بەو جۆرە هەرەسهێنانی سۆسیالیزم نەبوە هۆی هەرەسهێنانی ژیواری جیهانی، بەڵکو بە پێچەوانەوە یەکگرتوویی توندوتۆڵتر کرد. بە دارمانی سیستەمی سیاسی سۆسیالیستانەو چونە سەر مۆدێلی سیستەمی سەرمایەداری، سیستەمی عەرەبی بە شێوە دیکتاتۆریە- سەربازی و دەرەبەگایەتیە- تیۆکراتیەکەی، هەموو توانایەکی ژیان و مانەوەی لە دەستدا.

لە حەقیقەتدا ئەم دوو شێوەیە لە ناوەڕۆکدا ناکۆکن لەگەڵ پرنسیپە سەرەتاییەکانی ژیواری جیهانیو سیستەمە سیاسییە گریمانەکراوەکەیدا (دیموکراسیو مافی مرۆڤ)، ئەو پرنسیپانەی سیستەمی عەرەبی بە هۆی چونە ناو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و ئیمزاکردنی بڕیارنامەکانیەوە خۆی پێوە بەستبوون، کەچی بە ویستی خۆیو لە سێبەری شەڕی ساردا سەرپێچیدەکرد،

جا ئەگەر گۆشەگیریی ژیواری لە ڕابردوودا، بە درێژایی هەزاران ساڵ، جیاوازیی دابونەریت و ئەخلاق سەپاندبێتی، ئەوا یەکگرتوویی ژیواری ئێستا دەیسەپێنێ بەسەر گشت مرۆڤایەتیدا لەسەر دابونەریت و ئەخلاقی یەکگرتوو ڕێکەوێن.

ئەمەش پشت ئەستوور بە بێدەنگی یان داکۆکیکردنی هاوپەیمانەکانی ئەم یان ئەو ئۆردوگا. سیستەمی عەرەبی ئێستا لە واق ورمانێکی توندوتیژدا ژیان دەباتەسەرو لە ترسدا دەلەرزێ بەرامبەر ئەو ڕێگایانەی بە سەریدا سەپێنراوە، چونکە ئیتر توانای زەوتکردنی سەربەستیەکانی هاولاتیانی نەماوە، بە حیلەکاری نەبێ، توانای ڕەتکردنەوەی دیموکراسی نەماوە، بە شەرمەوە نەبێ یاخود لە ڕێگەی ترساندنی خۆرئاواوە نەبێ بە مەترسی ئوسوڵیەتی ئیسلامی، کە سیستەمی عەرەبی ئێستا دەیەوێ بە هەمان شێوازی کۆمۆنیزم لە ڕابردوودا بەکاریبهێنێ. ئەمە مانای ئەوەیە ئوسوڵیەتی ئیسلامی دەشێ بگۆڕێت بۆ گرنگترین وەرەقە بەدەست ڕژێمە عەرەبییەکانەوە بۆ درێژەدان بە حوکمی دیکتاتۆریانەی خۆیان، لە ڕێگەی لۆژیکێکی نوێوە کە پێشکەشی دنیای دەکەن، ئەویش ئەوەیە دیکتاتۆریەتەکەی عەقلانیترو بە بەزەییترە لە دیکتاتۆریەتی ئوسوڵیەتی ئیسلامی، کە دنیا بەشێك لە بەرەکەتەکانی لێرەولەوێ بەرچاوکەوت، ئەمەش لە ڕێگەی بڕینی دەستو قاچ و بەردەبارانکردنی ژنان و بە کۆمەڵ لە سێدارەدانەوە.

ئوسوڵیەتی ئیسلامی بەرهەمی زوڵم و زۆری سیستەمی عەرەبییە، بەر لەوەی گەڕان بێت بە دوای پیاوچاکیی ون لەنێو کۆمەڵگەدا، چونکە کاتێك هیچ دەمێ کراوەنابێ، جگە لە دەمی فەرمانڕەوا کە هەموو شتێك دەزانی، بیرورا دەبێتە تاوان و دەشێ مرۆڤ بەرەو مردن بەرێت. کاتێك هەموو شتێك حەرامدەبێ، ئەوا هیچ ڕێگەیەك بۆ کەس نامێنیتەوە، جگە لە لەپەنابردن بۆ ئایین، چونکە هیچ دەسەلاتێکی عەرەب ڕێگە لە عەرەب ناگرێ پەنای بۆ بەرن، لەبەرئەوەی خۆیان بەکاریدێنن بۆ پەردەپۆشکردنی تاوانەکانیان، بەلام ئەو ئایینەی خەڵك لە سایەی سەرکوتکردندا پەنای بۆ دەبەن ئایینی یۆتۆپیای لە دەستچوە نەك ئایینی دەسەلات، بێگومان لە کاتی نەبوونی ئەڵتەرناتیڤی سیاسیو هزری ڕاستەقینەدا لەنێو کۆمەڵگەدا برەودەستێنێ. لێرەدا سەختە خەڵکی جیاوازی بکەن لە نێوان خەونی ئەو دادوەرییەی ئایین بانگەوازی بۆ بلاودەکاتەوە لەگەل شیانی جێبەجێکردنی لە واقیعدا. لە قۆناخێکی دیکەدا ئیتر هیچ شتێك بەلای خەڵکەوە گرنگ نابێ جگە لە کۆتاییهێنان بە دیکتاتۆریەت و دەستگرتن بەهەر پوشێکەوە کە خۆی دەخاتەڕوو.

ئەگەر ئوسوڵیەتی ئیسلامی لیری دیکتاتۆریەت بێت، ئەوا لە هەمان کاتدا بەری تاوانەکانی خودی خۆرئاوایە. چونکە خۆرئاوا ماوەیەکی دووروودرێژ پشتگیریی ئوسوڵیەتی ئیسلامی کرد، لەبەرئەوەی دیوارێکی ئایدیۆلۆژی بوو لەبەردەم کۆمۆنیزمدا (نموونەی ئەفغانستان)، هەروەها دوژمنایەتی هەموو شتێکی پێشکەوتنخوازانەو ژیواری کرد لە نیشتمانی عەرەبدا، بە مەبەستی چەسپاندنی ئەو

ئوسوڵیەتی ئیسلامی بەرهەمی زوڵم و زۆری سیستەمی عەرەبیە، بەر لەوەی گەڕان بێت بە دوای پیاوچاکیی ون لەنێو کۆمەڵگەدا، چونکە کاتێك هیچ دەمێ کراوەنابێ، جگە لە دەمی فەرمانڕەوا کە هەموو شتێك دەزانی، بیرورا دەبێتە تاوان و دەشێ مرۆڤ بەرەو مردن بەرێت

پاشکەوتووییەی زیاتر لە هەر شتێکی دیکە بەرژەوەندییەکانی مسۆگەردەکرد. وێڕای ئەوە لایەنگیریکردنی بەردەوامی تاوانەکانی ئیسرائیل سروشتی ململانێیەکی ئایینی نێوان ئیسلام و مەسیحیەتی بەخشیە لایەنگیریکردنەکەی. ئەمەش بوە هۆی ئەوەی زۆرێك بڕوایان وابێت بۆشاییەك لە نێوان ڕۆحی شەڕخوازانەی خۆرئاواو ڕۆحی ئیسلامدا هەبێ. ئەم بۆشاییە لە واقیعدا هەیە، بەڵام ناشێ بە دانانی ئیسلام دژ بە مەسیحیەت پڕبکرێتەوە، بەڵکو لە ڕێگەی ڕەخنەگرتنەوە لە ئیشکالیەتی عەقڵی خۆرئاوا لەلایەك و عەقڵی عەرەب لەلایەکی دیکەوە پڕدەبێتەوە، کە لە لایەن بیریارو ڕۆشنبیرەکانی هەردوولاوە کۆششێکی سەرسەختانە بکرێ دژی ڕۆحی لوتبەرزانەی خۆرئاوا لەلایەك و گۆشەگیریی خۆرهەڵاتیانە لەلایەکی دیکەوە.

* * *

دەبێ لە ئەدەبیشدا، وەك لە سیاسەتدا، وێنەیەکی نوێکاری لە مێشکماندا هەبێ، بۆ ئەوەی بتوانین ئەو ڕێگایانە بدۆزینەوە کە دەمانگەیەننە نوێکارییەکە، بەڵام: ئایا عەرەب وێنەیەکی بۆ نوێکاری بەدەستهێناوە؟ پێم وانییە، چونکە ئەوان خەیاڵپڵاویی نوێکارییان بەدەستهێناوەو مێشکی خۆیان پێ ئاخنیوەو لە هەمان ئاشدا باراشی خۆیان خستوە. لێرەدا ناکرێ مرۆڤ چاوەڕوانی شتێکی دیکە بێ، چونکە ئەو ئایدیا ڕووتەی عەرەب لە مێشکی خۆیاندا هەڵیانگرتوە، هەمیشە گرنگتر بوە لە بانگەوازەکانی ژیان و ئەم ئایدیا- خەیاڵپڵاوییەی بە بڕوایەکی پیرۆز دەچێ، هیچ کاتێك خۆی ناخاتەڕوو و لە جێی خۆیو لەنێو پەرستگای خۆیدا لە تاریکیدا دەمێنێتەوەو فرمانەکانی خۆی بۆ واقیع دەردەکات و هیچ فرمانێك لە کەس وەرناگرێت. بە ناوی ئەم بیرۆکە -خەیاڵپڵاوییەوە سەبارەت بە نوێکاری، کە دەشێ هەر جلوبەرگێك لەبەربکات خۆی بیەوێ ، عەرەب پێیان وابوو دەتوانن بچنە نێو سەردەمەکەیانەوە، بەڵام ئەم ئایدیایە لەمەڕ نوێکارییەوە هیچ کاتێك ئەوەی قبوڵ نەکردوە ڕووبەڕووی ڕەخنەو مشتومڕ بکرێتەوە. زۆرجار ڕەخنەگرتن لەو ئایدیایەی کە ڕژێم هەڵگری بوە، وەك سەرچڵی وابوە. ئەوەی لێرەدا گرنگە، ئەو تۆقاندنە نەبوو کە ئایدیاکە- خەیاڵپڵاویی پیرۆز هەمیشە دەیخاتەوە، بەڵکو ئەو یەقینەی کە بە دەستیەوەیە یان خۆی پێ دەردەخات، تەنانەت پاش گۆڕانیش بۆ لاشەیەك، کە هەمیشە تایبەتە بە خێزانەکەی بە تەنیا، بەڵام ئەوانەی سەمادەکەن و بە جۆش و خرۆشەوە دەردەپەڕنە سەر شەقامەکان زەردیی مردنیان لەسەر لاشەکە بەدی نەکردوە، چونکە هەمیشە بە بۆدرەو ئارایش داپۆشراوەو بە چاکی بۆن پرژێن کراوە. تەنانەت کاتێك ئایدیا - خەیاڵپڵاوییەکە دەگۆڕێ بۆ درۆیەکی ئاشکرا، هەر

دەبێ لە ئەدەبیشدا، وەك لە سیاسەتدا، وێنەیەکی نوێکاری لە مێشکماندا هەبێ، بۆ ئەوەی بتوانین ئەو ڕێگایانە بدۆزینەوە کە دەمانگەیەننە نوێکارییەکە

بەردەوامدەبێ لەسەر ڕۆڵی خۆی، چونکە داننان بە حەقیقەتدا تێکڕای دەستورەکانی گەمەکە دەگۆڕێ.

لە ڕاستیدا دوو خەیاڵپڵاوی بنچینەیی لە گۆشەنیگای ئێمەدا هەیە بۆ نوێکاری: خەیاڵپڵاوی ناوچەگەریی خۆرهەڵاتی و خەیاڵپڵاوی هەمەلایەنخوازی خۆرئاوایی. جا ئەگەر خەیاڵپڵاویی ناوچەگەری خۆرهەڵاتی پشت بە دابونەریت و بڕواو بەها خۆرهەڵاتیەکان ببەستێ بۆ ئەوەی پێچەوانەی داخوازییەکانی واقیعی بە کردەوە بێ لە نێو هەلومەرجی ژیواریدا، ئەوا خەیاڵپڵاویی هەمەلایەنخوازی خۆرئاوایی لە سایەی هەلومەرجی بە کردەوەی گەشەکردنی خۆرهەڵاتی عەرەبی- ئیسلامیدا کەمتر واقیعی ژیان ئینکارناکات. ئەگەر خەیاڵپڵاوی یەکەم فرێماندبداتە نێو ناخی ڕابردووەوە، ئەوا خەیاڵپڵاویی دووەم فرێماندەداتە دەرەوەی مێژوو. لێرەشدا ساویلکەییە پێمانوابێ چارەسەرکردنی کێشەی نوێکاری لەو چارەسەرە سیحرییەدایە کە هەندێک دەیخەنەڕوو، ئەویش ئەوەیە کە وەک خۆرئاوا بین. کێشەکە ئەوەیە ئەگەر بشمانەوێ ناتوانین وەک خۆرئاوابین، لەبەر هۆکارگەلێک کە تایبەتن بە مێژووی گەشەکردنی هەردوو بنەمای کۆمەڵایەتیو دەرکەوتە ڕۆشنبیریو دەروونیەکانیان. ئەگەر (بەلای کەمەوە ڕواڵەتکارانە) سوور بین لەسەر ئەوە، ئەوا بە پێویست وەک دەستوپێوەند ئینتیمایان بۆی دەبێ، کە جگە لە خزمەتکار شتێکی دیکە نابین. دەبێ ئەوەشمان بە خەیاڵدا نەیەت کە خۆرئاوا خۆشحاڵە بەوەی بمانبینێ وەک ئەومان لێهاتوە. لە واقیعدا خۆرئاوا هیچ بەرژەوەندییەکی نییە (بەلای کەمەوە لە ڕووی ئابوورییەوە) بمانبینێ بووینەتە هێزێکی پیشەسازی، ئابووری، ڕۆشنبیریو سیاسی کە دەشێ پێشبڕکێی لەگەڵدا بکەین یاخود بێبەشی بکەین لە بازاڕەکانی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی- ئیسلامی. وێڕای ئەوە خۆرئاوا ناتوانێ ڕێگەمان لێ بگرێ، ڕێگەی ژیواری ڕوەو نوێکاری هەڵبژێرین، بەڵام ئەو ڕێگەیە کامەیە کە بەرەو نوێکاری دەچێ؟ ڕێگەیەکە لە گۆڕێ نییە، بەڵام دەشێ ببێ، نەک وەک ڕاچێتەیەکی ئامادەکراو لە مێشکدا، بەڵکو وەک کردارێکی گۆڕاو لە خودی واقیعدا. ئەمە مانای ئەوەیە چارەسەری ونبوو لە هۆشمەندبووندایە بەرامبەر بە ئیشکالیەتی خودی نوێکاری لە ئاستێکی هزریو فەلسەفی نوێدا. ژیان لە ڕێگەی هەرەسهێنانی ئەزموونی سۆسیالیزمی جیهانیەوە، هەروەها لە ڕێگەی تێکشکانە بەردەوامەکانی ڕژێمە عەرەبیەکانەوە، ئەوەی سەلماندوە کە خودی ئایدیۆلۆژیا هەمیشە کۆسپی گەورە بوە لە بەردەم گەشەکردنی واقیعداو لە واقیعی ئێمەدا بەرپرسیاریی زۆر دەکەوێتە ئەستۆی، بەرامبەر بەو خوێنە زۆرەی بۆ ڕازیکردنی خەیاڵپڵاوییەکانی ڕژاوە. بەوپێیە هۆشمەندبوون بەرامبەر بەو ئیشکالیەتانە لە بنچینەدا پێویستی بە ڕەخنەگرتنە لە گشت ئەو ئاقارە

لە ڕاستیدا دوو خەیاڵپڵاوی بنچینەیی لە گۆشەنیگای ئێمەدا هەیە بۆ نوێکاری: خەیاڵپڵاوی ناوچەگەریی خۆرهەڵاتی و خەیاڵپڵاوی هەمەلایەنخوازی خۆرئاوایی

ئایدیۆلۆژیانــەی چەمکــەکانی نوێکــاریی ئێمــەیان لەســەر دامــەزراوەو ڕاچێتــەی ئامادەکراویــان خســتۆتەڕوو، کــە بلیمەتــەکانی دایانــهێناوە خــەریکبوو نەخۆشــەکە بکوژن.

بێگومان ئەمە تەنیا ڕووی دەرەوەی مانگەکەیــە، چونکە ڕەخنــەگرتن لــە چەمکە باوەکان، سەبارەت بە نوێکاری، گرێدراوی ڕەخنەگرتنێکی فراوانــترو هەمەلایــەنترە. ئەگەر بناغەیەك هــەبێ بۆ دامــەزراندنی نوێکــاری لای ئێمــە، ئــەوا ئــەو بناغەیــە ئــەو ڕەخنەیەیە کە دەبــێ ئاراســتەی ســەرتاپای بنــەمای ژیــانی خۆرهــەڵاتی بکــرێ، نــەك لەپێناو ڕەتکردنەوەیدا (ئەگەرچی ڕەخنەکە ڕەتکردنەوە لە ناخی خۆیدا هەڵدەگرێ)، بەڵکو لــە پێناو جڵەوکردنی بە کردەوەی ژیاندا، لــە ڕێگــەی دارشــتنێکی نوێــوە کــە جارێکی دیکە دەیدۆزێتەوەو هەموو مردوییەك و کۆسپێکی بەردەمی وردوخاشدەکات.

ئەو ڕەخنە بنەڕەتیەی دەبێ ئێستا ئاراستەی هــەموو توخمە پێکهێنــەرەکانی واقیعی ڕۆژهــەڵاتی عــەرەبی– ئیسلامی بکرێ، هــەر لــە ڕۆشنبیرییەوە بیگرە تــاکو سیاســەت، ئابووری، ئایین، کەلەپوور و دابونەریت، کە چەندین سەدەیە بە هۆی نەبوونی ئازادیی هزرییەوە نائامادە بوە. ئەمــەش بۆتــە هۆی شێواندنی ڕۆشنبیریو ڕۆحیو دەروونی لەنێو ئەو کۆمەڵگە عەرەبیانەی لە ڕووی کات و واقیعەوە لە ئێستادا دەژین، بەڵام تاکو هەنوکەش لە سەدەکانی ڕابردوودا جێهێڵراون.

ئەم ڕەخنەگرتنە لە خۆرهەڵات، پێویستە لە هەمان کاتدا گرێدراوی ڕەخنەگرتنێکی دیکە بێت، کە ئاسانتر نیە، لە خۆرئاواو چەمکە سیاسیو ئابووریو ڕۆشنبیرییەکانی. جــارێکی دیکــە ئەمــە بــۆ ڕەتکردنــەوەی نــەء، بــەڵکو بــۆ ڕزگــارکردنی لــە لوتبــەرزیو خۆپەرستیو کورتبینــی، بەر لــە هــەموو ئەوانــەش لــەو نادادپەروەرییــەی بــە مێــژووی بەخشی. چونکە ئەگــەرچی خۆرئاوا بزوێنــەری پێشــکەوتن بــوە لــە ڕۆژگارەکــەماندا، ئەمەش پەیوەندیی بە نوێکارییەوە هەیە، بەڵام خاوەنی بەربەریــەتی تایبــەتی خۆیشی بــوە، بــە تایبــەتی دژی گــەلانی دیکــە. تاوانــەکانی نــازیزم و فاشــیزم و ئــەو جەنگــە خوێناوییانــەی خســتیانەوە، چەوساندنەوە ئایدیۆلۆژییــەکانی هاوشــانی سۆســیالیزم بوون لــە ئــەورووپای خۆرهــەڵات و یــەکێتی سۆڤیــەت و دڕندەیی وڵاتــە یــەکگرتووەکانی ئــەمریکا لــە جــەنگی ڤێتنــام و جــەنگی دوایــی کــەنداودا، ناشــێ دەربــڕی نــاوەڕۆکی نوێکــاری بــن، چونکــە دژی ڕۆحــە ژیوارییەکــەین. بێگومــان نوێکــاری (بەوپێــەی ئاسۆییەکە بۆ گەشەکردنی مرۆڤایەتی) ناکۆکە لەگەڵ کەڵەکەکردنی هــەزاران ســەری ئــەتۆمی ئامــادەکراو بــۆ تەقاندنــەوە لەهــەر چرکەســاتێکداو کــاولکردنی ژیــوارو مرۆڤایــەتی، هــەروەها ناکۆکــە لەگــەڵ کــاولکردنی ژینگــەو ژیــان، کــە دەرەنجــامێکی گــەشــەکــردنی پیشەســــازی خۆرئاوایە. ئەگەر پێشــــکەوتن لەلایەن خۆرئــاواوە

ئەگەر بناغەیەك هەبێ بۆ دامەزراندنی نوێکاری لای ئێمە، ئەوا ئەو بناغەیە ئەو ڕەخنەیەیە کە دەبێ ئاراستەی سەرتاپای بنەمای ژیانی خۆرهەڵاتی بکرێ، نەك لەپێناو ڕەتکردنەوەیدا، بەڵکو لە پێناو جڵەوکردنی بە کردەوەی ژیاندا، لە ڕێگەی دارشتنێکی نوێوە کە جارێکی دیکە دەیدۆزێتەوەو هەموو مردوییەك و کۆسپێکی بەردەمی وردوخاشدەکات

مۆنۆپۆڵکرابێ، ئەوا هەمیشە ئەنجامی بەکاربردنی دنیای سێ بوە لە ڕێگەی میکانیزمەکانی بازاڕی جیهانییەوە، کە خۆرئاوا زاڵە بەسەریدا. بە شێوەیەك لە شێوەکان، خۆرئاوا مەبەستی بوە هەموو بنچینەکانی نوێکاری لە دنیای سێدا هەڵتەکێنێ، ئەمەش لە ڕێگەی کودەتا سەربازییە کۆنەپەرستەکان و پشتگیریکردنی ئەو دیکتاتۆرانەوە کە خزمەتی بەرژەوەندیو پلانەکانی دەکەن، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەو زمانەی بەکاریدێنێ.

ئەمە هەموو خۆرئاوا نییە، چونکە هاوشێوەی خۆرهەڵات، لە خۆرئاواش ململانێ هەیە لە نێوان ئەوەی بە ڕابردووەوە گرێدراوەو ئەوەی ڕووی لە داهاتوو کردوە، لە نێوان دەمارگیری، ڕەگەزپەرستی، خۆپەرستی، لوتبەرزی، بەکاربردن و ناعەقڵانیەت و خواستی برایەتی مرۆڤانە، یەکگرتوویی چارەنووسی مرۆڤایەتی، هاوبەشیی ژیواری، دادپەروەری، نەهێشتنی بەربەستەکان، بەربەرەکانیکردنی جەنگ و فراوانکردنی مەودای ئازادییەکان بۆ هەموو خەڵك. وەك چۆن خۆرهەڵات ئوسوڵیەت و نائەقڵانیەتی خۆی هەیە، خۆرئاواش ئوسوڵیەت و نائەقڵانیەتی خۆی هەیە، بەڵام لەگەڵ بوونی جیاوازییەکدا، ئەویش ئەوەیە کە ئوسوڵیەتی خۆرئاواو نائەقڵانیەتەکەی لەنێو بنەمایەکدا کارپێدەکرێ کە ڕێگە بە ڕۆڵی هەمەجۆر دەدات، هەتا ڕۆڵەکەی ڕەوابێت یاخود دەربڕی سەرتاپای بنەمای خۆرئاوابێت. کەچی ئوسوڵیەت و نائەقڵانیەتی خۆرهەڵات هەموو ڕۆڵەکان بۆ خۆی مۆنۆپۆڵدەکات و وەك دڕندەیەك خۆی دەخاتەڕوو کە دەخوازێ هەموو دنیا وێرانبکات. بەوجۆرە نوێکاری سروشتی جوگرافیانەی خۆی لە دەستدەدات و دەگۆڕێ بۆ تێکۆشانێك لەپێناو سەرهەڵدانی هۆشیارییەکی مرۆڤانەی نوێ سەبارەت بە پێشکەوتن، کە لەسەر تێگەیشتنی ڕەخنەگرانەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا ڕادەوەستێ، ئەوەش بە هۆی پەرەپێدانی چەمکە یەکگرتوەکانی ژیواری نوێی جیهانی لەسەر ڕادەوەستێ. واتە ئیشکالیەتی نوێکاری مەسەلەیەکی تایبەت بە خۆرهەڵات نییە بە تەنیا، بەڵکو تایبەتیشە بە خۆرئاوا. لەسەر ئاستی دوورمەودا، نوێکارییەك لەسەر دابەشکردنی جیهان دامەزرابێ‌و ناوەندەکانی پێشکەوتن لە ناوەندەکانی پاشکەوتوویی دابڕێ، دەبێتە هۆی تەقاندنەوەی سەرتاپای جیهان، ئەو تەقینەوەیەی ئیمڕۆ سەرەتاکانی لە شەڕە ناوخۆکان، یاخیبوونەکانی برسیەکان و کۆچکردنی بە کۆمەڵی خەڵکە هەڵاتوەکانی ناوەندەکانی پاشکەوتوویی ڕوەو ناوەندەکانی پێشکەوتن و ئاسودەیی خۆرئاواییدا خۆی دەبینێتەوە.

ئەگەر ئێمە چەمکی ڕاچێتە ئایدیۆلۆژییەکانمان ڕەتکردەوە، یاخود ڕەخنەمان دوپاتکردەوە، وەك ڕزگارکارێکی ڕۆحی نوێ، ئەوا ڕووبەڕووی پرسیارگەلێك دەبینەوە کە ناشێ خۆمانیان لێ لابدەین: چ پێوانەیەك بۆ نوێکاری دەمێنێتەوە؟ چۆن دەشێ بە

ئەمە هەموو خۆرئاوا نییە، چونکە هاوشێوەی خۆرهەڵات، لە خۆرئاواش ململانێ هەیە
لە نێوان ئەوەی بە ڕابردووەوە گرێدراوەو ئەوەی ڕووی لە داهاتوو کردوە

نوێکاری بگەین؟ لەدوا ئەنجامیشدا، نوێکاری چیە؟ لەو بڕوایەدام دەرفەتی ئێمە بۆ گەیشتنە نوێکاری (بە شێوە ئەوروپاییەکەی) ئەستەمە، چونکە نوێکاریی خۆرئاوایی بەرهەمی گەشەکردنێکی مێژوویی تایبەتە کە ناشێ دووبارەبکرێتەوە، بەڵام دەشێ ئێمە بە نوێکاری بگەین، بە واتا ژیوارییە پێشکەوتوەکەی، بێ ئەوە ناسنامەو مێژوو و دەستکەوتەکانی ژیوارەکەمان لەدەستبدەین، ئەمەش لە ڕێگەی ڕەتکردنی خودی نوێکاریی خۆرئاواوە ڕوەو نوێکارییەکی مرۆڤانەتر کە دەربڕی ناوەڕۆکێکی قوڵتری ژیواری نوێی جیهانەو لەسەر کۆڵەکە یەکگرتوەکان ڕادەوەستێ. ئەمەش مانای دەستهەڵگرتنە لە تاك جیهانبینی ئایدیۆلۆژی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەها نوێکانی، کە ڕۆحی سەردەم دەخەنەڕوو: ئازادیی تاکەکەسیو کۆمەڵایەتی، دیموکراسی وەك شێوەیەکی سیستەمی سیاسی، عەقڵی زانستی لەبری عەقڵی ئەفسانەیی خورافی، قوڵکردنەوەی ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیریی نێوان نەتەوەکان، گوێزانەوەی ئازادانەی تەکنۆلۆژیاو مەعریفە، کۆتاییهێنان بەو پێکدادانانەی مرۆڤەکان لەبەر هۆی ڕەگەزی، نەتەوایەتی، ئایینی، توخم یان هزری لێك جیادەکاتەوە، ڕێزگرتن لە مافی هەموو کەمایەتییەکان جا سروشتی خۆ دەربڕینی ئازادانەی هەرچۆنێك بێت، بەربەرەکانیکردنی ڕەوتی عەسکەرتاری و دانانی بە تاوانێکی دژی مرۆڤایەتیو دووپاتکردنەوەی هەموو ئازادییەکی داهێنان بێ هیچ سنوور و کۆسپێك.

ئەم کۆڵەکە ژیواریانەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەگۆڕێن بۆ بەهای مرۆڤانەی گشتی لەنێو کۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکاندا، ئەڵتەرناتیڤی بابەتیو واقیعین بۆ دەمارگیری ئایدیۆلۆژیو نەتەوەییو توخمەکان کە قۆناغی پێشووی گەشەکردنی مرۆڤایەتی ڕەنگ کردبوو. ئەمەش، بە پێچەوانەی ڕاچێتە ئایدیۆلۆژییەکانەوە، شتێك نییە جگە لە هێماکردن بۆ واقیعێك کە گۆڕینی گرێدراوە بە توانای هزری داهێنەرانەوە بۆ دۆزینەوەی بەردەوامی وەڵامەکان لە ململانێکانی خودی کۆمەڵگەدا. لێرەدا حەقیقەتێکی دیکە لە مێژوودا دەستپێدەکات، ئەویش یەکگرتنی مرۆڤایەتیە بە گشتی لەپێناو خۆڕزگارکردن لە خراپەکارییەکانی ڕابردوو و خەیاڵپڵاوییەکانیو دانانی داهێنان بە پرۆسەیەکی هەمەلایەن کە بایەخ بە هەموان دەدات. تەنیا لێرەدا، لەسەر ئەم کیشوەرە نوێیە، پێویستە داهێنەرەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەستبدەنە تەورەکانیان بۆ شکاندنی ئەو قفڵانەی دەرگاکانی مێژوو دادەخەن. تەنیا لێرەدا ڕێگە بەرەو ئەو نوێکارییە دەستپێدەکات کە هێشتا واق وڕماو لە بەردەم ڕووناکیە دورەکەیدا ڕاوەستاوین.

لێرەدا حەقیقەتێکی دیکە لە مێژوودا دەستپێدەکات، ئەویش یەکگرتنی مرۆڤایەتییە بە گشتی لەپێناو خۆڕزگارکردن لە خراپەکارییەکانی ڕابردوو و خەیاڵپڵاوییەکانیو دانانی داهێنان بە پرۆسەیەکی هەمەلایەن کە بایەخ بە هەموان دەدات

* * *

لە نووسینی نوێی ئێمەدا، هەمیشە ماناو هێماکانی نوێکاریو زەویەکەی لەسەری ڕادەوەستێ بە هەڵە لێکدراونەتەوە. وەك چۆن لە سیاسەتدا ئایدیا جلوبەرگی ڕەبەن

لەبەردەكات و خۆی بەسەر واقیعێكدا دەسەپێنێ كە نامۆیە پێی، ئاواش عەقڵی عەرەبی هیچ ڕێگەیەكی لە بەردەمدا نەبوو جگە لەوەی نوێكاری بگۆڕی بۆ بتێك كە لە پەرستگاكەیەوەو لە بەرزییەوە دەڕوانێتە ژیان. هەموو دەزانین بتەكان هیچ بەهایەكی بەكردەوەیان نییە، لە ڕێگەی ئەو خەیاڵپلاوییەوە نەبێ كە لە ناخماندا دەیتەقێننەوە. ئەوەی وا ڕاهاتووین ناوی "ئایدیۆلۆژیا"ی لێ بنێین. بێگومان ئەو نوێكارییەی گرێدراوە بە ناخی بزووتنەوەی ژیانەوەو دەربڕی ناوەڕۆكی مێژوەو شۆڕشگێڕترین هێزە بۆ تێكشكاندنی خەیاڵپلاوی‌و ساختەكارییەكان، لە ڕێگەی نوێكردنەوەی بەردەوامی مانای خودی پێشكەوتن و خودی خۆیەوە، دەشێ مەسح بكرێت و لە كاتی چاوهەڵهێناندا بەرامبەر دیمەنێكی چەوت بگۆڕدرێت بۆ گاڵتەجاڕی. نوێكاری لێرەدا ئەو پرسیاركارە تەلیسماوییەیە كە ئوبیرۆن كردیە چاوەكانی تیتانبای خەوتوەوە، لە شانۆنامەی "خەونی شەوی هاوینە"ی ولیەم شەكسپیردا، بۆ ئەوەی كاتێ لە خەو هەڵدەستێ خۆشی بوێ. وەك چۆن لە كۆمیدیای شەكسپیردا ڕوودەدات، شاعیرو نووسەرە نووستوەكانمان كە نوێكاریی تەلیسماوی كراوەتە چاویان، بەدبەختانە كاتێك چاویان بەو جنۆكانە هەڵهێنا كە هەموو بیابانەكانیان تەنیبۆوە، هێلینا ئاسا كە عاشقی دیمیتریۆس بوو، كەوتنە ئەوینیانەوە:

"من توتكە سەگەكەی تۆم دیمستریوس،
ئەگەر لێمبدەی زیاتر هۆگرت دەبم
وەك توتكە سەگێك بمبە، لێم بدە، ڕقت لێم بێتەوە، ئەشكەنجەم بدە،
بەڵام تەنیا ڕێگەم بدە ڕیسواكراوانە دواتكەوم".

ئەو جنۆكانەی بە درێژایی ماوەی ڕابردوو زاڵبوون بەسەر مێشكی ئەو نووسەرو شاعیرانەدا كە گرێدرابوون بە نوێكردنەوەی هزری عەرەبیەوە، هەمیشە وێنەیەكی ساختە بوون لە دووچاوی سیحر لێكراودا كە لە تاریكی واقیعدا جگە لەو شەبەنگانەی خەیاڵپلاوییە پەیامئامێزەكان بە دوای خۆدا ڕادەكێشن شتێكی دیكە بەدیناكەن. نووسەری ئێمە، بە شێوەیەكی خراپتر لە هێلینا، كەرامەت و تەنانەت شەرمنی نووسینی لەدەستداوە بۆ ڕژێم یان سەرۆك یان حیزب یان جەماوەر یاخود هەر بانگەشەكارێكی دیكەی نیشاندراوی بازاڕ، كە هەموو وزەكانی مێشكی خۆی دەسوتێنێ بۆ ئەوەی كار لە هەست و سۆزبكات و هانمانبدات بۆ گریان بۆ خۆمان یاخود بۆ خرۆشانمان بۆ جوێندان بە بۆشایی. خراپترین دیاردەیەكیش بشێ مرۆڤ لە نووسینی ئێمەدا بەدیبكات، وردپروشی سۆزكارانەیە لە گوتارەكەیدا، بە تاڵیەتی لە مەزنی‌و ئازایەتی دڵ، بۆیە سەختە ئەوە بە جیدی سەیربكەین كە شاعیر یان نووسەری ئێمە دەریدەبڕن. چونكە لە بنچینەدا خودی خۆی كامڵ نییەو نووسینەكەشی

نووسەری ئێمە، بە شێوەیەكی خراپتر لە هێلینا، كەرامەت و تەنانەت شەرمنی نووسینی لەدەستداوە بۆ ڕژێم یان سەرۆك یان حیزب یان جەماوەر یاخود هەر بانگەشەكارێكی دیكەی نیشاندراوی بازاڕ

ئامرازێکە بۆ گەڕان بە دوای ناوبانگی و پارەداریدا نەك سەرچڵیەك بۆ ئازادی، جا گەشتەکە چەند سەخت و قورسیش بێت.

لە ڕاستیدا گەیشتنە هاوکێشەیەکی ڕاست و دروستی نێوان هەڵوێستی سیاسی- کۆمەڵایەتی شاعیرو نووسەر بەرامبەر بە سەردەمەکەی و هەڵوێست بەرامبەر بە نووسین دەشێ زۆر ڕوون نەبێت، لەبەر ناکۆکیەکی ئاوێتەیی کە هەمیشە لە تەمومژیدا پێکدێت. هیچ کەسێك ڕێگە لە شاعیر یاخود نووسەر ناگرێت هەڵوێستی سیاسی بەرامبەر بە سەردەمەکەی هەبێت، بەڵام ئەم هەڵوێستە لە دەرەوەی هەموو حسابکردنێك نییە. چونکە نووسەر یاخود شاعیر (لێرەدا تەنیا باسی بواری کاری سیاسی دەکەین) ناشێ پاشکۆی دەسەڵاتێك بێت کە لەسەر بناغەی سەرکوتکردن دامەزرابێ یاخود هی هێزێك بێت کە دژی ئازادییە، جا بەهانە ئایدیۆلۆژییەکان هەرچییەك بن، چونکە هەڵوێستێکی وەها لە سەرەتاوە ناکۆکە لەگەڵ هەڵوێستی ڕیزپەڕانەی نووسیندا، ئەویش ئەوەیە کە شاعیر یاخود نووسەر ویژدانی مێژوە نەك ئامێرێك لەنێو مێژوودا، واتە مێژوو ڕزگاردەکات لە خەیاڵپڵاوییەکانی خۆی. لێرەدا پێویستە نووسەر یاخود شاعیر لە کاتی کارپێکردنی سیاسەتی ڕۆژانەدا، تەنانەت کاتێك گرێدراوی هەڵوێستێك دەبێ کە بە شۆڕشگێڕانەی دەزانێ، دەرك بەوە بکات دەشێ ئەو هەڵوێستە سودبەخش و بە کەڵك بێت، بەڵام هەر ڕێژەیی دەبێ، وەك هەر شتێکی دیکەی ژیان گیرۆدەی ئیشکالیەتە تایبەتیەکانی خۆی دەبێ. هەروەها نووسەر یان شاعیر ناتوانێ کرداری سیاسی بەرزبکاتەوە بۆ ئاستی یۆتۆپیا، چونکە ئەم جۆرە یەقینە ئەو پەینەیە کە خۆراك دەداتە داری تاوانکاری. لەو ساتەوەختەدا کە یەقینی سیاسی دەگۆڕێت بۆ هەڵوێستێکی پەیامبەرانەی دەمارگیرانەو خاوەنی گشت حەقیقەتەکان، ڕۆح پڕدەبێت لە زبڵ و نووسەر یان شاعیر بە پێویست دەبێتە جەلادێکی دیکە، چونکە ناتوانێ جگە لە هوشیاری ساختەکارانە بەرامبەر بە ئازادی شتێکی دیکە بخاتەڕوو، لەدوا ئەنجامیشدا ئەو مرۆڤێکی ساویلکەیەو بەهرەی بینین لە دەستدەدات، ئەو بەهرەیەی بەبێ ئەو هیچ هونەرێك بوونی نابێ.

ئێمە، لەبەر ئەوەی سواری پشتی پڵنگ بووین، ناچارین باسی هەڵوێستە سیاسیەکان بکەین، بەڵام نابێ تووشی ئەو خەیاڵپڵاویە ببین کە شیعر بگۆڕین بۆ سیاسەت و یۆتۆپیا بکەینە واقیع. چونکە نووسەر یان شاعیری ڕاستەقینە زیاتر لە کەسانی دی دەرك بە ئیشکالیەتی گەورەی بوونی مرۆڤایەتیو ئەو شوێنەوارە دەکات کە هەڵوێستی سیاسی نیوەناچڵ لەنێو ئەو ئیشکالیەتەدا داگیریدەکات. هەمیشە پرسیار: پرسیاری سووتێنەر، ڕووبەڕوومان دەبێتەوە: ئێمە بۆ لێرەین؟ ئەمانە هەموو لەپای چی؟ ئەوەی لێرەدا گرنگە وەڵامەکە نییە، بەڵکو ڕووناکیی خودی پرسیارەکەیە،

هیچ کەسێك ڕێگە لە شاعیر یاخود نووسەر ناگرێت هەڵوێستی سیاسی بەرامبەر بە سەردەمەکەی هەبێت، بەڵام ئەم هەڵوێستە لە دەرەوەی هەموو حسابکردنێك نییە، چونکە نووسەر یاخود شاعیر ناشێ پاشکۆی دەسەڵاتێك بێت کە لەسەر بناغەی سەرکوتکردن دامەزرابێ یاخود هی هێزێك بێت کە دژی ئازادییە

ئەو ڕووناکیە گەردوونیەی دەپرژێ بەسەر کرداره ڕۆژانەکانمانداو سنووره ڕاستەقینەکانیان بەدیدەکەین و دەکەوێتە سەرچاوەکانمان و لەو سڕبوونە هەڵماندەسێنێ کە خەیاڵپلاویی دووبارەوەبوو دەیخولقێنێ. نووسەر یان شاعیری ڕاستەقینە ئەوە ڕەتدەکاتەوە هەڵخەڵەتاو بێت، جا هەر جۆرە فریودانێك ڕووبەڕووی ببێتەوە، ئەگەر هەڵخەڵەتاوبێت، ئەوا لەبەر خەوشیەکە لە داهێنانەکەیدا یاخود بەر لەهەر شتێك خەوشیە لە هوشیارییدا بەرامبەر بە داهێنان، وەك پڕۆسەیەکی ڕزگارکردنی بنەڕەتیانەی مرۆڤ و هزرەکەی. ئەگەر شاعیر یان نووسەر هەڵخەڵەتاوبێت، ئەوا ئێمەش هەڵدەخەڵەتێنن، ئەمەش بە هۆی هزرێکەوە کە بەرەو کۆیلەیەتی دەمانبات، جا ئەگەر بە زمانی فریشتەش بدوێ بۆ ئەوەی هەڵخەڵەتاونەبین، پێویستە ڕۆح و عەقڵمان لەو خەیاڵپلاوی‌و هەستە موبتەزەلانە ڕزگاربکەین کە بە ناوی پەیامە ساختەکانەوە مرۆڤ دەکەنە بکوژو کوژراو، لەو کاتەدا کە هەموو تەپڵەکانی خۆیان دەکوتن و خۆیان وەك ڕزگارکاری مرۆڤایەتی بێدەرەتان دەخەنەڕوو کە دەبێ قوتاربکرێ، گرنگە ئەو تەڵانە ببینرێن کە لە دارستانەکاندا نراونەتەوە: هیچ بەهەشتێك یاخود دۆزەخێك چاوەڕوانمان ناکات، چونکە ئەو دوانە هەمیشە لە دیمەنێکدا لە تەکماندا بوون و شتێك سنوورەکانی نێوانیان تێکدەشکێنێ کە پێی دەڵێن بوونی مرۆڤانە. ڕەتکردنەوەی تەڵەکەبازی مانای ئەوەیە ئەو پیرۆزیە درۆزنانەیە لە کردارەکانمان دامالێن کە سیاسەت و بەهاکانی بەکاربردنی ڕۆژانە، لەژێر ناوی ناوبانگی‌و پاڵەوانکاری یاخود پایەبەرزیدا، دەیکەن بە بەریدا. ئەو سەرکردەیەی بە هۆی لوتبەرزی‌و لەخۆباییبوونەوە هەڵدەئاوسێ، لەبەرئەوەی دروستکەری سەربلندییەکی ڕیزپەڕە، جگە لە دۆن کیشۆتێکی شایانی گاڵتەپێکردن هیچی دیکە نابێ، ئەو شاعیرەش کە بە مەبەستی بەناوبانگبوون قەسیدەکانی خۆی دەنووسێ، ئەو بێدەرەتانیە زیاتر دەکات کە دنیای تەنیوەتەوە. بۆ ئەوەی مرۆڤ شۆڕشگێڕ بێت، دەبێ ڕزگارمانبکات، نەك تەنیا لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە، بەڵکو لە ڕووی هزری‌و ڕۆحیشەوە، واتە ئەو کەسەیە کە هەڵخەڵەتاندن و خەیاڵپلاوی ڕەتدەکاتەوەو پەردە لە ڕووی ساختەکارییەکان هەڵدەماڵێ، جارێك بە هۆی هۆشیاری بەرامبەر بە ژیان و گۆڕینی ژیانەوە بە شێوازەکانی خودی ژیان، جارێکی دیکەش لە ڕێگەی ئەندێشەی مرۆڤەکانەوە، وەك سەرچاوەی هەموو داهێنانێك لە مێژوودا.

* * *

هەروەها دەبێ خۆ لەو تەڵەیە بەدووربگرین کە گەلێك جار زۆربەی شاعیرو نووسەرەکانمانی تێکەوتوون. پێویستە دەرك بە جیاوازیی نێوان کاری سیاسی هەستپێکراو و کاری داهێنان، گوتەی واقیع و گوتەی ئەندێشە بکەین، چونکە

بۆ ئەوەی مرۆڤ شۆڕشگێڕ بێت، دەبێ ڕزگارمانبکات، نەك تەنیا لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، بەڵکو لە ڕووی هزری‌و ڕۆحیشەوە، واتە ئەو کەسەیە کە هەڵخەڵەتاندن و خەیاڵپلاوی ڕەتدەکاتەوەو پەردە لە ڕووی ساختەکارییەکان هەڵدەماڵێ

هەریەکەیان خاوەنی میکانیزمی تایبەتی خۆیەتی. لە کاتێکدا کاری سیاسی گرێدراوی ئەوەیە کە ڕێژەییە لە مێژووداو خەیاڵپڵاوییەکان دەئاخنێو هەمیشە ناکۆکیەکان، ڕەقهەڵاتن و تەقینەوەکان لەخۆدەگرێ و قوربانیەکان دەخاتەوە، چونکە هۆشیارییەکی ئایدیۆلۆژیەو قابیلی بۆگەن بوونە، جا لە چرکەساتێکی دیاریکراودا چەند شۆڕشگێڕانە خۆ بنوێنێ، کەچی داهێنان لە هونەردا لە ئاسۆیەکی دیکەی قسەکردنەوە هەنگاوهەڵدێنێ، ئەویش ئاسۆی خەونی مرۆڤایەتیە، چونکە هەر دۆزینەوەیەك پردە بۆ دۆزینەوەیەکی دیکە. واتە لێرەدا هیچ وێستگەیەك نییە بۆ ڕاوەستان، بەڵکو جێگەیەکە بۆ پیاتێپەڕبوون و دەرك بەوە دەکرێ لەم گەشتەدا کە ئەندێشە ئاڕاستەیدەکات، هیچ کاتێك گەیشتن لە گۆڕێ نابێ: ئێمە شۆڕشگێڕ نین لەبەرئەوەی هەنوکە بەرەنگاری دیکتاتۆرێك دەبینەوە بۆ ئەوەی سبەینێ دیکتاتۆریەتی خۆمان دامەزرێنین و بەناوی پرنسیپە ڕاگەیەنراوەکانەوە ئەوانی دیکە بچەوسێنینەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی ئێمە هەمیشە لەگەڵ قوربانیەکانداین، لە ڕابردو و داهاتووشدا- بەم واتایە، دەبێ دژی پرۆژەی سیاسیی تایبەتی خۆشمان بین، ئەگەر لە داهاتوودا بۆگەن بوو- هەروەها دژی هەموو ئەوانە بین کە جلوبەرگی پەری دەپۆشن (ئەمە ئەگەر فریشتە لە بنچینەدا جلوبەرگ بپۆشن) و بانگەشەی ئەوە دەکەن تاقە ڕزگارکاری مرۆڤایەتین. گوتەی داهێنان هەمیشە گوتەی دۆزەرێکە کە خۆی لە ئازاریدا دەهێنێتەدی. لێرەدا پێویستە حەقیقەتی ئەو درۆیەش بخەینەڕوو کە زۆربەی نووسەرو شاعیرەکانمان تەڵەکەبازی پێ دەکەن. ئەوانەش باسی ئازادی دەکەن، بەڵام ئازادی لە ڕوانگەی ئەوانەوە تەنیا وشەیەکە وەك وشەکانی دیکەو دەشێ واتای کۆیلەیەتیش بگەیەنێ، مادام هەر وتەیەك پیاهەڵدان یاخود جوێندانە. لە حەقیقەتدا کارێکی زۆر ترسناکە لە واقیعی ئێمەدا خودی جەلادەکان زیاتر بانگەشە بۆ ئازادی دەکەن. قەیناکە، ئەوانە لەپێناو ئازادیی زیاتر بۆ ئەنجامدانی تاوان و خوێنڕشتنی زیاترو بەردەوامیدان بە چەوساندنەوەی خوێناویدا شەڕدەکەن، بەڵام ئەگەر ئێمە لە مانای سیاسی ئەم جۆرە شێواندنە ئاشکرایە بگەین، ئەوا چۆن لە هەڵوێستی شاعیر یاخود نووسەرێکی خۆمان تێدەگەین کە دەیەوێ شتێکی بەهادارمان لە ڕێگەی درۆیەکی خوێناویەوە پێ بڵێ؟

لە ڕاستیدا بەهای شیعری ئەو شاعیرانە "نوێکارو تەقلیدی" بە توانای بەرهەمهێنانی هەموو ئەو بێدەرەتانیە دیاریدەکرێ کە مێژووی ئێمەی تەنیوەتەوە، تەنانەت بەبێ ئەوەی زاتی ئەوەیان هەبێ بڕواننە دەستەکانیان کە بە خوێنی قوربانیەکان سووربوون.

ئەگەر ئێمە لە مانای سیاسی ئەم جۆرە شێواندنە ئاشکرایە بگەین، ئەوا چۆن لە هەڵوێستی شاعیر یاخود نووسەرێکی خۆمان تێدەگەین کە دەیەوێ شتێکی بەهادارمان لە ڕێگەی درۆیەکی خوێناویەوە پێ بڵێ؟

مەسەلەکە لێرەدا تەنیا ئەوەنییە ئەوە ڕەتکرێتەوە کە داهێنان فەرمانبەر بێت لای هەر دەسەڵاتێك، بەڵکو ئەوەیە ئەوە ڕەتبکرێتەوە لە خزمەتی هیچ مەسەلەیەکدا بکرێتە فەرمانبەر. ئەمە مانای ئەوەنییە شاعیر یاخود نووسەر بێبەشبکەین لە پەیوەندیکردن بە مەسەلەکانی سەردەمەکەو کۆمەڵگەکەیەوە، بە پێچەوانەوە دەمانەوێ ئەو قوڵییە تایبەتیەی پێببەخشین کە داهێنان لە ناخی خۆیدا هەڵیگرتوە، ئەو قوڵییەی پەنجەرەیەك لەبەر دەمماندا دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بڕوانینە دیمەنێکی فراوانتری بەردەممان. کاتێك داهێنان دەبێتە فەرمانبەری هەر مەسەلەیەك، جا ئەو مەسەلەیە چەند نایاب بێت، ئەوا بە پێویست سڕوساویلکەی دەکات و لە دوائەنجامیشدا ئەو زەویە لەدەستدەدات کە پێویستە لە سەری ڕاوەستێ. بەهای ئەوە چییە لە شیعردا شتێك بڵێین کە دەشێ لە گوتارێکی ڕۆژنامەنووسیدا دەریبڕین؟ بەڵێ! دەشێ قەسیدەکانمان دەربارەی هەر بابەتێك بن، بەڵام بەمەرجێك شتێك بڵێین کە جیاوازە لە وتەی بەکاربراو و بەر لە هەرشتێك ئەو توخمە شاراوانە بدۆزینەوە کە وتەی ئاسایی دەرکیان پێ ناکات، مەبەست ئەو توخمانەیە کە چەمکی سوودی هەنوکەیی ڕەتدەکەنەوە لەپێناو بەرژەوەندیی قوڵتردا کە لەدوائەنجامدا مرۆڤانەتر و شۆڕشگێڕانەترە. تەنیا داهێنان شۆڕشگێڕانەیە، چونکە جگە لە هەموو شتەکانی دیکە دەکەونە نێو بزووتنەوەی خودی ژیانەوەو دەشێ ڕۆژی دواتر بەهای خۆیان لە دەستبدەن. لە کاتێکدا داهێنان هەر توانای ئەوەی نییە مرۆڤ و ئایدیاو هەست و سۆزەکانی خەڵك بگۆڕێ، بەڵکو کاریگەریش بمێنێتەوە، تەنانەت دوای چەندین سەدەش. تاکو ئیمڕۆ ئێمە هۆمیرۆس، شەکسپیر، موتەنەبیو دیستۆفیسکی دەخوێنینەوەو لێوەیان فێردەبین، کەچی ناپلیۆن و هتلەرو ستالین جگە لە قوربانیەکان هیچی تریان جێ نەهێشتوە، ئەگەرچی خاوەنی هەزاران شاعیر بوون کە بە کردارەکانیاندا هەڵیاندەدا؟ بێگومان جیاوازیی نێوان گوتەی شیعریو ناشیعری تەنیا لە شێوازی گوتە دەربڕیندا نییە (واتە مەسەلەکە لە جیاوازیی زمانی بریقەداردا نییە، وەك شاعیرەکان تێدەگەن)، بەڵکو لە ڕۆحدایە کە گوتەیەك دەکاتە گوتەی شیعری، ئەمەش ڕۆحێکە جارێك لەسەر شکاندنی سنووری باوەکانی دەوروبەری ئایدیاکە دادەمەزرێو جارێکی دیکە لەسەر تەقاندنەوەی خودی ئایدیاکە بۆ گەیشتن بە ڕووناکی چڕبووەوەی ناوەوەی. بەوجۆرە ئایدیاکە لە بەکارهێنانی ڕۆژانەدا ئاسایی دەبێو لە گوتەی شیعریدا ڕیزپەڕدەبێو تیغیدەکات بۆ ئەوەی بگاتە پانتایی ئەوی دی، پانتایی شیعر. هەندێ بەرد لە سروشتدا بە بەردەکانی دیکە دەچن، بە تایبەتی کە بە چاو سەیریاندەکەین، بەڵام کاتێك بە زەرەبینی تایبەتی سەیریاندەکەین ڕەنگە تەلیسماویە سەنجڕاکێشەکانی خۆیان دەخەنەڕوو. ئەم زەرەبینە تایبەتیانە ئەو

مەسەلەکە لێرەدا تەنیا ئەوەنییە ئەوە ڕەتکرێتەوە کە داهێنان فەرمانبەر بێت لای هەر دەسەڵاتێك، بەڵکو ئەوەیە ئەوە ڕەتبکرێتەوە لە خزمەتی هیچ مەسەلەیەکدا بکرێتە فەرمانبەر

چاوانەن کە شاعیر بە هۆیانەوە دەڕوانێتە بابەتەکەی خۆی، بەبێ ئەمەش هەمیشە بەردەوامدەبێ لەسەر ئاخاوتن سەبارەت بەو بەردانەی بەردەوام بینیومانن. ئەمەش پرۆسەیەکی بێزارکەرەو شایانی قێزلێکردنەوەیە.

* * *

گرفتەکانی نوێکاری لە نووسینی ئێمەدا ئاڵۆزترە لە گرفتەکانی نوێکاری لەسەر ئاستی سیاسی یاخود کۆمەڵایەتی، هەڵوێستی شاعیر یاخود نووسەریش تەمومژاویترە لە هەڵوێستی سیاسی لەمەڕ نوێکاری، چونکە ناچارە دەرك بەو ئاستە جۆراوجۆرانە بکات کە مامەڵەی لە تەکدا دەکات. ئەو دەشێ لە چرکەساتێکدا دیلی ئاقارە هزری و سیاسیە باوەکانی خۆمان بێت سەبارەت بە نوێکردنەوەی کۆمەڵگە، کە جگە لە خەیاڵپلاویی نوێکاری شتێکی دیکەی بە دەست نەهێناوە. ئەمە مانای ئەوەیە دەبێ هۆشیارییەکی قوڵی هەبێ سەبارەت بە مانای نوێکاری لەنێو کۆمەڵگەو لە ڕۆژگارەکەیدا، ئەمەش لە ڕێگەی لەناوبردنی خراپەکارییەکانی دیلێتی لێرەو لەوێ لە پێناو نوێکارییەکدا کە پشت بە ڕەتکردنەوەی وێنەی خودی نوێکاری دەبەستێ. لێرەدا شاعیر یان نووسەر لە مەترسیی قوتاری نابێ، چونکە دەشێ وەك زۆربەی شاعیرو نووسەرەکان ئەرکی سیاسی گۆشەنیگا کۆمەڵایەتییەکانی و ئەرکی داهێنان تێکەڵ بە یەك بکەن. واتە دەبێ دەرك بە سروشتی تایبەتی کارەکەی خۆی بکات، بەڵام بێ ئەوەی ئەوە لە یادبکات هەریەکێك لەو دوو ئەرکە لە هەمان کاتدا ئەرکەکەی دیکە ڕۆشندەکاتەوە. دەشێ ئەمە هێما بۆ ڕێگەی گەیشتن بە نوێکاری لە نووسینی ئێمەدا بکات، بەڵام مانای نوێکاری لە نووسینی ئێمەدا ناگەیەنی، کە گرێدراوە بە خودی پرۆسەی داهێنانەوەو پەیوەندی هەیە بە هەستیاری شیعری یان هونەریی شاعیر یان نووسەرەوە، بە ئەزموونی کەسێتی و قوڵی هوشیارییەوە بەرامبەر بە بوونی مرۆڤایەتی و مێژووی ئەو ساتەوەختەی تیایدا دەژی، بە هوشیارییەوە بەرامبەر شێوازە کۆمەڵایەتی و هزری و سیاسییەکانی ڕووبەڕوویدەبنەوە، بە توانای مامەڵەکردنی ڕەخنەگرانەی کەلەپوورەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا پەیوەندیی بە هەستی ناوەکی و داهێنەرانەیەوە هەیە، بە وزەی تەلیسماوی مات لەناو زمان و ئەو شێوازانەدا کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات یاخود دەیانخولقێنێ و بەر لە هەموو شتێك بە ڕادەی ئەو ئازادییەی لە نووسینەکانیدا دەیهێنێتەئاراوە.

ئالێرەدا چرکەساتی حەقیقەت لەهەر نووسینێکدا دەستپێدەکات کە دەیەوێ شتێك بڵێت ئینتمای بۆ گوتەی نوێکاری هەبێ لە ڕۆژگارەکەماندا: شاعیرو نووسەر دەیانەوێ چی بڵێن؟ بەهای ئەوە چییە کە دەیڵێن؟ چ پانتاییەك دەکەنەوە لەبەردەمماندا؟ ڕادەی ئەو ئازادییە چییە کە دەیخەنەڕوو؟ ئەمانە پرسیارگەلێکن لە

گرفتەکانی نوێکاری لە نووسینی ئێمەدا ئاڵۆزترە لە گرفتەکانی نوێکاری لەسەر ئاستی سیاسی یاخود کۆمەڵایەتی، هەڵوێستی شاعیر یاخود نووسەریش تەمومژاویترە لە هەڵوێستی سیاسی لەمەڕ نوێکاری

مێژوو زیاتر لە جارێك ئەوەی دوپاتکردۆتەوە کە نووسەری ڕاستەقینە هەمیشە لەگۆڕێدەبێ، بەڵکو گەردەلولەکان دەیخولقێنن، ئەگەر لە سەرەتادا دەنگی کز بنوێنێ، ئەوا لە کۆتاییدا سەرتاپای نەتەوەیەك بە ئاگاوە دەهێنێتەوە

کاتی خوێندنەوەی هەر کارێکی داهێنەرانەدا ڕووبەڕووماندەبنەوە، بەڵام نابێ زیاد لە پێویست وەك ڕەخنەگر یان خوێنەر ماف بدەینە خۆمان بۆ داوەریکردنی ئەو نوێکارییەی کارێکی داهێنەرانەی دیاریکراو لە خۆ دەگرێ. بۆ ئەوەی ڕەخنەگر یان خوێنەر شایانی ئەم مافە بێت، پێویستە خۆی‌و ڕۆشنبیرییەکەی لە سەرلێشێوانە باوەکان ڕزگاربکات‌و ئەو پانتاییە نوێیە بەدیبکات کە لە بەردەممان دەیخاتە سەر گازی پشت، مەبەست پانتایی نوێکارییە، ئەمەش مەسەلەیەك نییە هەمیشە دڵنیابین بەرامبەری. ئەمە مانای ئەوەیە، ئەو بە هەڵە تێگەیشتنەی لە نووسینی ئێمەدا ڕووبەڕووی نوێکاریی دەبێتەوە ، دەربڕی ئەو بەهەڵەتێگەیشتنەیە کە چەمکەکانمان سەبارەت بە نوێکاریی هزری‌و کۆمەڵایەتی دەیخەنەڕوو و جارێکی دیکە یەکگرتوویی‌و هەمەلایەنیی ئایدیای نوێکاری، وەك پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی کە هەموو شتێك لە ژیاندا دەگرێتە خۆو سروشتی خۆی دەکات بە بەریدا، دووپاتدەکاتەوە. جا لەبەر ئەوەی نوێکاریی کۆمەڵایەتی ئێمە هێشتا خۆی نەدۆزیوەتەوە، بۆیە نوێکاری لە نووسینی ئێمەدا گرێدراوی سەرچڵیەکانی شاعیرو نووسەرەکانیەتی، کە هەریەکەیان خواستێکی تایبەتی بەرامبەر بە نوێکاری دەخاتەڕوو و زۆرجار خواستی ئاقارە سەرلێشێواوەکانە لەسەر ڕێگەی ڕەو نوێکاری، بەڵام دەشێ ئەمە کاتی بێت، چونکە مێژوو زیاتر لە جارێك ئەوەی دوپاتکردۆتەوە (لە گۆڕانکارییەکانی دوایی خودی خۆرهەڵاتی ئەوروپا)دا کە نووسەری ڕاستەقینە هەمیشە لەگۆڕێدەبێ، بەڵکو گەردەلولەکان دەیخولقێنن، ئەگەر لە سەرەتادا دەنگی کز بنوێنێ، ئەوا لە کۆتاییدا سەرتاپای نەتەوەیەك بە ئاگاوە دەهێنێتەوە. بێگومان گرەوی ئێمە لە ئێستاو داهاتووشدا لەسەر ئەم هیوایەیە.

## سەرچاوە

ئەم بابەتە لە ژمارە *51*/ سێپتەمبەری *1992*ی گۆڤاری "الناقد"ی لەندەنیدا بڵاوکراوەتەوەو به دەستکارییەکی بچووکەوە وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

## فو لی مای

# دڵی دایک*

و. عەبدولکەریم شێخانی

{لای} سەرسامییەکی لە ڕادەبەدەر دایگرتبوو.. تازە مۆڵەتی ئەوەی پێدرابوو کە بچێ بۆ بینینی ئەو منداڵەی کە کردبوویە کوڕی خۆی. هەموو هاوڕێکانی لە میلیشیای ئاواییەکە ئەوەیان زانیبوو و دەورەیان لێدابوو و پرسیاربارانیان دەکردو دیاریی زۆریشیان پێدابوو. هەریەکە دەیویست شتێك پێشکەش بە منداڵەکە بکات. یەکێك کیتەڵەیەك شیری خست: "منداڵەکە لە من زیاتر پێویستی پێی دەبێ‌و من (مانیۆل)[1]م بەسە. یەکێکی دیکەش پارچە قوماشێك کەلە پاراشووتی گوللەی ڕووناککردنەوە کرابووەوە: "بۆ ئەوەی سەربانی پەناگاکەی بەهێزبێت، چونکە کەشوهەواکەی ناخۆش دەبێت".

کچەکە تەنیا پێکەنی‌و هیچی دیکە.. نەیدەزانی چۆن وەڵامی هاوڕێکانی بداتەوە.. بە پەلە دیارییەکانی کۆکردەوەو لە کاتێکدا دەیویست شڵەژاوییەکەی خۆی بشارێتەوە، ئینجا بە وریاییەوە خستنیە ناو هەگبەی بەستەکەکانەوەو دوای ئەوە دەستی دایە چەکە ئۆتۆماتیکیەکەی خۆی‌و وەك نیشانەی ماڵئاوایی بەرزیکردەوە، ئینجا بە سووك و سۆڵی بازی دایە نێو ڕیزە خەندکەکانەوە بەرەو ئەو دێیەی ئەو منداڵەیان بۆ بردوە کە کردبوویە کوڕی خۆی.

تا چاو بڕی دەکرد، دێیەکە بە ڕاستی چۆڵ و هۆڵ بوو. ئەو بۆمبایانەی فڕۆکەی (ب 52)[2] کوێرانە فڕێیان دابوە خوارەوە، ئەو زەوییانەی کەوتبوونە باکووری هەوراز سنوری کاتیەوە، کردبوونی بە بێژنگێکی زۆر گەورە. نە ڕێگا مابوو، نە گوند، نە ڕووەك.. تەنانەت ڕێبازو دارو درەختیش نەمابوون و ئەو چاڵە گەورانەی کە لە هەموو شوێنێك وەك دەمی ڕەحەتی بڵاوببوونەوە، سووربوون، دەتگوت خوێنن. خاکەکە بوو بە ستوونی دووکەڵ لێرەو لەوێ چووبوە ئاسمان کە نیشانەی ئاگرکەوتنەوەو تەقینەوەی تازەبوون.

هیچ شێوەیەکی ئادەمیزاد لەوێ بەدی نەدەکرا.. زۆر لە مێژبوو هەموو ڕەنگ و شێوەیەکی ژیان داخزابوونە ژێر زەوی‌و چیدیکە خەڵکی لە پەناگاکانیان نەدەهاتنە دەر تاکو تەقە لە فڕۆکەی دوژمن و بەلەمی جەنگی بکەن، یان لە کێڵگەکاندا کار بکەن و بەروبووم بەرهەم بهێنن.

خاتوو لای بۆ ماوەیەکی زۆرو پێش ئەوەی دەست بە گەشتەکەی بکات بۆ پشت بەرەی شەڕو بە ڕۆژی ڕووناك، ئەو مەترسییەی هەڵسەنگاندبوو، بەڵام هەست و سۆزی هەڵچووی دایکایەتی لە دڵیدا لەوە بەهێزتر بوو. گەلێك بیری لەو منداڵە دەکردەوە کە هەڵیگرتبوەوەو کردبووی بە کوڕی خۆی، ئەو کوڕەی کە ژیانی

خۆی خستە مەترسیەوە بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات و هەر بۆ ئەوەی ژێری کاتەوە، لە بەرچاوی خەڵکی مەمکی خۆی دەرهێناو خسیە دەمیەوەو بەمەش لە شەرم و شکۆی کچێکی هەژدە ساڵی تێپەڕاند کە هێشتا هاوڕێیەکی نەبوو. توخوا مافی خۆی نیە کە خۆی بە دایك بزانێت؟ هەڤاڵە چەکدارەکانی وەك دایکێکی منداڵدار سەیریان دەکردو تێیان دەڕوانیو هەر جارێکیش لە سەردانەکەی بگەڕابایەوە، لە هەموو لایەکەوە پرسیاری بەسەردا دەباری. لە هەموو پەناگەیەکدا دەبوایە باسی گغەگغی بچکۆلەکەی بۆ بکردنایەو بە دوورو درێژی وەسفی دارەدارە کردن و چۆنێتی ڕۆیشتنی بۆ بگێڕانایەتەوە. بۆ ماوەیەکی زۆر کەوتە بەر تیری قسەی خۆش و نوکتەی هەڤاڵەکانی.. تەنانەت جارێکیان یەکێك لە دەستە خوشکەکانی پێی گوت منداڵەکە زۆر لە خۆت دەچێت.. سەیرە تۆ لە دایکبوونەکەت پێبەخشیوە، دەبێ لە بن هەنگڵتەوە هاتبێتە دەرێ".

هەموو ئەمانە لە کاتی کێوماڵ و پاککردنەوەدا ڕوویان دا، ئەوەی کە ئەمەریکاییەکان ناویان نابوو "پێوانەبەندیی بەشی باکووری ناوچەی بێچەك، یان چەك داماڵراو". بۆ خۆئامادەکردن بۆ ڕاماڵینی باکوور، کەوتنە بۆردومان کردنیو هەر لە بەیانی زووەوە، بلدۆزەرو تانکە چەکدارەکان لەبەر تیشکی خۆر بریسکەیان دەهات. هەموو دانیشتوانی ناوچەکە لە دێیەکانیان دەرکران و بە پاڵ لەنێو هیلیۆکۆپتەرانیان خزاندن و بۆ شوێنی دوور ڕاگوێزران.. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا، باخ و کێڵگەو خانووش خاپوورو وێران کران. خۆ ئەوانەیش کە بەرگرییان دەکرد، کەوتنە بەر شاڵاوی دەستڕێژی تانك و ماشێنی چەکدارەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا گوندنشینێکی زۆر توانیان بەرەو باکوور هەڵێن و لە نزیك {بن های} شەڵخەیان بەست و کۆبوونەوەو هەوڵی ئەوەیان دا بە هەر ڕێگەیەك بێ لە زێیەکە بپەڕنەوە.. هەندێکیان بە بەلەم، هەندێکی دیکە بەسەر داروپەردووی سەر ئاوکەتوو و تەنانەت هەندێکی دیکەشیان بە مەلە.

ئەمەریکاییەکان نەك تەنیا هەر تیپی زەوییان کۆکردبۆوە بۆ ئەو کۆچ وەستاندنە، بەڵکو هێزی ئاسمانی ئەمەریکاو ئوستۆڵی شەشەمیشیان دوور لە کەناری دەریا کۆکردبۆوەو بە درێژایی هێڵی بەناوبانگی {ماکنامارا} پێگەی تۆپخانەیان بەهێزکردبوو. ئەوەبوو لەپڕ گرم و هووڕی تانك و زریپۆشان دەستیپێکردو بۆمبا هاشەی هات و گولله تۆپ تەقین، بە جۆرێك کە ئاگرو پۆڵا بەسەر گشت کۆچکردووەکاندا دابارین و زۆریان لێکوژرا.

بەڵام خاتوو (لای) کە ئەوکاتە لەسەر قەراغی زێ نۆبەچی بوو، دەستبەجێ هۆشداریی دا "ئەمەریکاییەکان قڕ دەخەنە هاونیشتمانیەکانمان!" بە بەرزترین دەنگ کە بتوانێ، هاواری کرد: "با ڕزگاریان کەین".

فەرمانی کورت درا:

کۆچکردووەکان لە هێڵەکانی پشتەوە ئامادەکەن..

سەربازەکانتان کۆك و تەیار کەن!

دەست بە تەقە بکەن".

هەموو لانە شەست تیرو پارچە چەکە دژە فرۆکەکان بە تەواوەتی ئاشکرا بوون و گوللە تۆپ و مووشەك و بۆمبایان هاویشت.

تەقەو ئاگرباران یان بە خەستی دەست پێکرد، بە شێوەیەك کە ڕێگەی بۆ سەربازەکان خۆشکرد بگەنە کۆچکەرەکان و یارمەتیان بدەن.

کە خاتوو {لای} نزیك قەراغی زێیەکە بۆوە، قیژەی منداڵێك وەك بزمار لە جێگەی خۆی چەقاندی. کە گەڕایەوە منداڵێکی دەوروبەری پێنج مانگانی دۆزیەوە کە لە تەنیشت دایکە مردووەکەیەوە کەوتبوو. بە پەلە بەرزیکردەوەو بەرەو پەناگە چۆڵەکەی بردو لەوێ لەسەر زەوی دایناو وەرسووڕایەوە بڕوات، بەڵام منداڵەکە بەردەوام دەگریا. {لای} گەڕایەوەو پارچە قوماشێکی پەڵەپەڵاویی تێوە پێچاو بە پشتێنە سەربازییەکەی توند لە کۆڵی خۆی شەتەکی داو گەڕایەوە بۆ شەڕکردن.

شەڕەکە دوو سەعاتی خایاند. بە درێژایی ئەو ماوەیە، منداڵەکەی هەر لە کۆڵی بوو. پڕیشکە مووشەکێك بەر شانی کەوت، منداڵەکە خوێناوی بوو، بەڵام خۆشبەختانە نەپێکرابوو. منداڵەکە زۆر گریا، دوای ئەوە خەوت. کە بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا هەستی بە گەرمیی ئەو لەشە گەرمە ناسکە کرد، هەستی بە سۆزێکی دایکایەتی لە باسکردن نەهاتوو کرد کە بەرگری لە ژیانی منداڵەکە دەکرد.

کاتێك هەموو شتێك کۆتایی هات، کردیەوەو بە ئەسپایی خستیە نێو سندووقی ئازووقەوە.. ئەوسا لەپڕ بە خەبەر هات و وەك گیاندارێکی بە ئازار دەستی بە گریان کرد. {لای} لە کاتێکدا لە ترسان هێلینگی لێبڕابوو، زۆر شەکەت بوو، لەسەر باوەشی خۆی ڕایدەژاند: "بچکۆلەکەم ژیربەرەوە، بێدەنگ بە لەبەر خاتری دایکت".

دەم و چاوە بە تۆزو خۆڵ و بارووت ڕەش هەڵگەڕاوەکانی هەڤاڵەکانی بە پێکەنینێکی زۆر گەشایەوە.

یەکێکیان گوتی: "کوڕێکی بۆ خۆی پەیداکرد".

یەکێکی دیکەیان گوتی: "کچەکەم.. بیکە بە کوڕی خۆت".

هەموو بۆیان دەرکەوت کە منداڵەکە لە بەیانی زووەوە هیچی نەخواردوە. ژاوەژاوو هەراهەرا لەنێو پەناگەکەدا ڕوویداو هەریەکە بە پەلە بە دوای شیردا دەگەڕا.

-"کارێکی زۆر ناخۆشە، هەموو ئەو دایکانەی دەتوانن شیر بە منداڵ بدەن، ڕۆیشتوون".

-"لای.. تۆ دایکیت و دەبێ ڕێگەیەك بۆ ژیرکردنەوەی بدۆزیتەوە".

کوڕە لاوێك بە هەردوو لێوی وەك دەنگی مژین مڵچە مڵچێکی کرد، گۆناکانی (لای) سوور هەڵگەڕان. کە هیچی لە دەست نەهات بیکات، ڕوویکردە دیوارو پشتیکردە ئەوان و زێی کراسەکەی ترازاندو مەمکی نایە دەمی منداڵەکەو ئەویش بە تاسەوە مەمکەکەی گرت و گۆکەی مژی، بەڵام کە شیری وەگیرنەکەوت، دەستی کردەوە بە گریان.

هەریەکەیان بە نائومێدیەوە سەیری ئەوی دیکەیانی کرد. پەناگا- چێشتخانەکە بەر بۆردومان کەوت و هەموو کەلوپەلەکان تێکشکان. چی بکرێت باشە؟ یەکێك لە هەڤاڵە کچەکان لە سەربازگەیەکی نزیك خۆیانەوە گەڕابۆوە، سەربازەکان مەنجەڵێك و هەندێك شیری وشکیان دابوویە. کە منداڵەکە سکی تێربوو،

سەری بە سینگی تازە دایکەکەی کردو خەوی لێکەوت و هیچ نیشانەیەکی ترس و ئازار لە ڕوخساریدا نەما. گۆناکانی کە بە گەندەمووییەکی نەرم داپۆشرابوون، ڕەنگێکی تازەیان وەرگرت. هەریەکەیان بە بەزەییەوە سەیری دەکردو دەسبەجێ هەموویان قسەکانیان بڕیو پەناگاکە لە بێدەنگیدا نوقم بوو، بۆنی شیری تێکەڵ بە کۆنی ئارەقە لە هەوادا بڵاوبووەوە.

لاشەی بەنیادەمێك دەرگای پەناگاکەی گرت، سەرپەلەکە بوو. بەسەر سوڕمانەوە پرسی:

-"ئەم کۆبوونەوەیە بۆ چیە؟ ئەی نازانن فڕۆکەی (ب-52)ی ستراتیژیی بۆردومان دەکات؟"

کە منداڵەکەی لە باوەشی {لای}دا بینی، ئحە ئحێکی کردو هاتە ژوورەوە، ئینجا دەستە زلەکانی بە چاکەتەکەی سڕیەوەو لە منداڵەکە نزیك بۆوەو هەردوو دەستە بچکۆلەکانی گرت و بە نەرمی بە دەم و چاوو ڕیشە زۆرەکەیدا هێنا.

{لای} نەیویست سەیری دوو چاوە بە قووڵداچوەکانی سەرۆکەکەی بکات کە وەك دوو ئەشکەوت وابوون و دوو بازنەی ڕەشیان لە ژێرەوە بوو، دوو چاوێك کە چەند شەوێك بوو نەچووبوونە خەوو نەنووقابوون. دەیزانی کە ئەو پیاوەش پێش ماوەیەکی کەم کوڕەکەی مرد.. ئاخر ئەویش هەر لە تەمەنی ئەم منداڵەدا بوو کە ئێستا لە باوەشی ئەمدایەو ئەو کوختەیەش کە منداڵەکە لەگەڵ دایك و خوشکیدا تێیدا دەژیان، ئێستا بووەتە چاڵێك.. ئیدی باوکەکە ناوبەناو دەهات و دەچوو و لەلای ئەو شوێنە دادەنیشت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ماڵەکەی بوەو هەمیشە جگەرەشی بە دەمەوە بوو. لەو شوێنە دادەنیشت کە ڕاهاتبوو دوای گەڕانەوەی لە کێڵگە لێی بحەسێتەوە کە شنەیەکی نمدار لە زێیەکەوە دەهات. دوای حەفتەیەك.. هەر لەو شوێنەدا فڕۆکەیەکی جەنگی ئەمریکایی بە چوار گوللەی تفەنگێکی {کارابین} خرایە خوارەوە لە شەڕێکی گەرم لە نێوان جەنگاوەرانی گوندەکە کە لە تفەنگ بەولاوە چیدیکە دژی فڕۆکەی چەتەکان بەکارناهێنن.

-"چەندیش قەڵەوە!" دوای ماوەیەك بێدەنگی گوتی: "لای.. دەبێ دەسبەجێ ببرێتە دواوەی بەرەی شەڕەوە، چونکە دوژمن تۆپبارانەکە خەست دەکات و (هێن)یشت لەگەڵ دێت.. بە چاکی چاودێریی منداڵەکە بکەن".

هەر ئەو شەوە {لای} و{هێن} ئەوێیان بەجێهێشت و منداڵەکەیان لەلای خێزانێك دانا کە نەیاندەناسیو سەرەڕای بۆمباران، وەك هەموو ئەو خێزانانەی دیکە لە (فنەلی) مابوونەوە.. ئەو خێزانە لە چەند ماڵێك پێکهاتبوو و بێئەوەی هیچ خزمایەتیەك لە نێوانیاندا بێت، پێکەوە دەژیان، بۆ ئەوەی لە کاتی شەڕ لە ئیش و کاری کێڵگەو مەزرادا، یارمەتی یەکتر بدەن.

کە دوو چکەکە چوونە ژوورەوە، پیرێژنێك ئالیکی بۆ بەرازەکان دەکردە ناو قاپێکی گەورەوە کە لەسەر سێکوچکەیەکی لە پارچە بۆمبای دژە فڕۆکە دروست کراو بوو.

پیرێژنەکە پرسی: "ئەوە ئەو منداڵەت بۆ کوێ دەبەی؟ ئەی خوایە! لە کەناری زێی {بن های}ەوە هاتوون؟ وانیە؟"

-"بەڵێ.." (لای) بە سادەییەکەیەوە وەڵامی دایەوە، حەزیشی نەدەکرد خەڵکی پێبزانن کە منداڵەکە کوڕی خۆی نیە، بەڵام (هێن) گوتی:

-"دەمانەوێ ئەم منداڵە لە کن تۆ بەجێبهێڵین.. هی ناوچەی کەناری باشوورەو دایکی لە نزیکی زێیەکە کوژراوە".

پیرێژنەکە قیژاندی: "چی؟!" و بە پەلە حەسیرێکی کۆنی کەمێك سووتاوی لەسەر قەرەوێڵە سەفەرییەکە ڕاخست و لە کاتێکدا ئاوڕی لە کوڕە لاوێك دەدایەوە کە لە پشتی پەناگاکە بە دوای هەندێك کتێبدا دەگەڕا، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی:

"سو، دەرگاکە داپۆشەو لێگەڕێ با هەندێ ڕووناکیمان بۆ بێت.. باشە تۆ کە نۆرە ئێشك گرتنتە بۆچی وا زوو هاتوویەوە؟ بەشە برنجەکەت وا لە نێو سندووقی بۆمباکانی ڕووناك کردنەوەدایە".

چراکە لە گوللەیەکی بەتاڵ دروست کرابوو. پیرێژن لەبەر ڕووناکیی چراکە منداڵەکەی وەرگرت و لە ئامێزی گرت. منداڵەکە جلێکی پڕ چرچ و لۆچی گەچڵاوی تێوە پێچرابوو و دەستە بچووکەکانی درێژ کرد قژە سپییەکەی نەنکەی گرت.

پیرێژن بە خۆشەویستییەوە گوتی:

"بچکۆلەکەم.. لە کن من بمێنەوە. ئەی کوا جلەکانی؟ بۆ جلی کەمی لەبەردەکەیت؟"

(لای) وەڵامی دایەوە "جلەکانی ئەوەندە دڕاوو شڕ بوون، منیش فڕێمدان".

پیرێژن لە دەوروپشتی خۆی لە یەکێك لە گۆشەکانی پەناگەکە گەڕاو ئینجا کەمێك دوورتر لە نزیك بەردەرگای پەناگەکە لەژێر زەوییەکە بانگیکرد:

"سیدکا.. ئەرێ سیدکا.."

پیاوێك کە تا ناوقەدی ڕووت بوو، و چەقۆیەکی بە دەستەوە بوو، دەرکەوت.

-"جلی ئەو منداڵانم بۆ بێنە کە ڕۆیشتوون. ئەم منداڵە لە باشووری زێیەوە هاتووە".

کابرا بە بێدەنگی گوێی لێگرت و بە چاوی نیوە نووقاوەوە تێیڕوانی، ئینجا کەمێك لە منداڵەکە ڕاماو ورتە ورتێکی کردو دوای ئەوە بێئەوەی هیچ قسەیەك بکات سەرکەوتە سەرەوە. دەیانتوانی گوێیان لە گامێشەکە بێت کە ئالیکی دەخواردو فیشکەی دەهات.

دەنگی تەقینەوەیەك لە نێوان دیواری {بامبۆ} کە دەرگاکەی شاردبۆوە، هات و فڕۆکەیەکی تیژڕەوی جەنگی گرماندیو بە ئاسمانێدا تێپەڕیو نەنکە بە پەلە بە لەشە ئێسك دەرپەڕیوەکانی خۆی، منداڵەکەی داپۆشیو بۆ ژێر زەوی خزی.

گڕی چراکە چەند چەپۆلێکی داو زەوی لەرزییەوە. گرمەی تەقینەوەکە دوور نەبوو. {لای} هەڵسایە سەرپێ:

"دەبێ بگەڕێینەوە، هاوڕێکانمان چاوەڕوانمانن". دوای ئەوە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی: "ها ئەوە هەندێك پارە بۆ خواردنی منداڵەکەم".

پیرێژن بە نارەزاییەوە گوتی: "کچم، پارەکەت بۆ خۆت هەڵگرە، ئەم منداڵە ئەوەی منەو من پێویستە خواردنی بدەمێ".

بەو شێوەیە منداڵەکە تێکەڵ بە خێزانە تازەکەی بوو، ئەوەندەشی پێنەچوو بوو بە نازداریان و لەبەر خاتری ئەو، پێچکە ڕەوڕەوەیان دروستکرد تا لەگەڵ هەر هۆشدارییەک جێگە پێخەفەکەی ڕاکێشن. دوو جانتایان لە سندووقی تەقەمەنی بۆ دروستکرد، یەکێکیان بۆ جلەکانیو ئەوی دیکەش بۆ هەڵگرتنی خواردنی. تەنانەت {کا}ی پیرەمێرد خۆی کە بە شێوەیەکی ئاسایی کەمدوو بوو، کە سەیری منداڵەکەی دەکرد، ڕوخساری دەگەشایەوە. {کا} پیاوێکی سەیر بوو، هەرگیز بەشداری قسەی نەدەکرد.. پیاوێک بوو زۆرجار لە کاتی بۆردوماندا دەچوە دەرەوە بۆ شوێنی ناشکراو دیار.. هەر ئەو پیاوەیە کە لە پەناگاکەدا لەگەڵ گامێشەکەی دەنوێ، ئەو گیاندارەی بە پزیشکی مووشەکێك قۆچی شکاوەو وەکو خاوەنەکەشی ڕەفتاری سەیرە. پیرەمێردی کەمدوو هەموو ڕۆژێك شتێکی بۆ بچکۆلەکە دەهێنا. سیسرکە هەڵبەیەزەك، یان مێشوولەیەکی ئەیار، یان گوڵە کێویلەیەك، تەنانەت قەوانی گوللە تۆپێکی بەتاڵ و هەمیشە زەردەخەنەیەك دەیگرت ئەگەر بیدیایە پێدەکەنێ یان باڵەکانی دەجووڵاندەوە.

{لای} هەموو مانگێك جارێك، یان دوو جار، دەچوو بۆ بینینی کوڕەکەیو زۆریش بەختیار دەبوو کە دەیبینی وا زوو لەگەڵ ژیانە تازەکەی ڕاهاتووە. لەنێو خێزانەکە بە چەند ناوێك بانگدەکرا، باك (باکوور)، نام (باشوور)، یان چین تانگ (تەلار). لاوانی ئەو یەکەیەی، تەنانەت لایش ئەو ناوەی دواییان لا باشتر بوو.

کچی شوانێکی پیر بوو کە لە لایەکەی دیکەی دێیەکە دەژیا، فێربوو بوو دەهات یاریی لەگەڵ منداڵەکەدا بکات. چین تانگ فەرمانی پێدەکرد بۆ پێشەوە بڕۆ.. دەی {چین تانگ}. خێزانەکە کە دەیانبینی منداڵەکە ڕووی خۆی گرژ دەکرد، یان بە ئاماژەکردن لاسایی دەکردەوە لە خۆشییان پێدەکەنین.

بەمجۆرە ئەوەندەی پێنەچوو پەناگاکە بوو بە ژووری خەوتن بۆ هەندێك لە کچە لادێییەکان، ئەوانەی کە دوای کارکردنیان دەهاتنە ئەوێ.

لە زۆر لاوە بەنێو هێڵی سەنگەرەکان و بەژێر زەویدا دەهاتن بۆ دیتنی چین تانگ بو خەوتن لە نزیك قەرەوێڵەکەی، نەنکێ حەزیدەکرد دەریانبکات:

"لێرە دوورکەونەوە! خۆ ئەم پەناگایە ئەوەندە هەوایەی ناگاتێ هەڵیمژێ.. جگە لەوەش نابێ لە کاتی هۆشدارکردنەوەدا ئەم هەموو حەشاماتەو بەو زۆرییە لێرەدا کۆببنەوە".

هەموو ئەمانە بێسوود بوون و هەموو شەوێ پەناگەکە پڕ لە پێکەنین قسەی خۆش دەبوو.

لیژنەی حزب لە ناوچەکە چەند جارێك داوای لە نەنکە کردبوو کە منداڵەکە بباتە ناوچەکەی ئەو لایانەوە، بەڵام نەنکە گوێی نەدانێ:

"من خۆم زیندووم و هەروەها نەوەکەشم.. ئەمەریکایی دەتوانن چمان لێبکەن؟"

داوایان لە خاتوونی سەرۆکی لیژنەی کارگێڕیی ناوچەکە کرد دەستبخاتە کارەکەوە، بەڵام پیرێژن گوێی لێنەگرت، هەرچەندە ئەو خاتوونە نەوەیەتیو باوکی لە کاتی جەنگی بەرخۆدان و بەرەنگاری دژی ئیمپریالیزمی فەرەنسا لە مەیدانی شەڕەفدا شەهیدببوو. نەنکە نەیهێشت کوڕەزایەکەی قسە بکا:

"پێت وایە من ناتوانم بە چاکی بیپارێزم؟ تۆ هێشتا منداڵ بووی کە من بەشداریم لە حەنگی بەرەنگاریدا کردوە.. با ئەو نیگەرانییەت بۆ مامت و براکەت بێت، ئەو تۆپچیانەی ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە".

ئەنکە هیچ هۆیەکی بۆ ئەو بە قسە نەکردنە نەهێنایەوە، بەڵام چەند هۆیەکی قورس بۆ ئەوە هەبوون، یەکەمیان: چونکە چۆن دەتوانێ لەو منداڵە دوورکەوێتەوە لە کاتێکدا هەر کە ئەم ڕۆیشت، منداڵەکە دەستی بە گریان کردو کە کۆخیش، ئەو پێکەنی، جگە لەوەش دوو ڕۆژی پێدەوێ بۆ ئەو سەفەرە لەژێر ئەو تۆپباران و بۆمبارانەدا تا دەگاتە ناوچەکەی ئەو لایانەوە بەنێو ئەو هەموو گوندو ئاواییە خاپوورەدا، دواییش ئەی لە پاش ڕۆیشتنی ئەو کێ خواردن بۆ تیپی بەرهەمهێنان ئامادەبکات و کێش ئاگاداریی ئەو بەرازانە بکات کە سەربازانی سوپای میللی لە گوندیدا بەجێیان هێشتوون؟

{سوو}ی منداڵ کە تاکە پیاوی خێزانەکەیە بە کەشتیو فڕۆکەکانی دوژمنەوە خەریکبوو بە شێوەیەك ئەوە سێ ساڵە ئەو دەرفەتەی نەبوە بچێت سەرێك لە باوکیو خوشکی بدات لە یەکەکانی سوپای میللی کە چەند کیلۆمەترێك لە دێیەکەوە دوورن. سەبارەت بە {کا}ی پیرەمێردیش، ئەو زیاتر بیر لەوە دەکاتەوە کە ئالیك بە گامێشکەکان بدات نەك بە خۆراکی خۆی. خۆ پێشمەرگەکانیش لە برنجی سارد بەولاوە هیچی دیکە ناخۆن! دەکرێ پشت لەو هەموو پیاوانە بکات؟ لە ڕاستیدا ئەو ناتوانێ ئەوە بکات.

لای، لە کاتێکدا بەنێو دۆڵ و زوورگ و گردەکاندا دەڕۆیشت لە بیرکردنەوە نەدەوەستا سەبارەت بەو منداڵەی هەڵیگرتبوەوە. بۆ چەند سەعاتێك دەیکاتە باوەشیو منداڵەکەش دەستدەکاتە ملیو ماچێکی تەڕو بۆنداری دەداتێ.. هەموو ماندووبوونێکی خۆی لەبیردەچێتەوەو شەویش پەناگەکە دەپکشنێو دەگەڕێ تا بزانێ ئایا کۆڵەکە دارەکان دەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆرتر بەرگەی بۆردومان بگرن.

کچەکە پاش نیوەڕۆیەکی تەواو، هەر خەریکی بیرکردنەوە بوو، ئەو چەند کیلۆمەترەی بڕی کە کەناری زێی (بن های)ی لەو ڕێیەی منداڵەکەی بۆ برابوو، جیادەکردەوە، دەبوایە زۆر بگەڕێو پشکنێ پێش ئەوەی دەرگای سەردابێك بدۆزێتەوە، نەك چاڵێك کە بۆمبوردوومان دروستی کردبێت، بەڵکو لای بێشەو زەمەندێکی بە ناپاڵم هەڵقرچاو. کە (لای) خۆی بە پەناگەدا کرد، شەو داهاتبوو، ڕووناکی چرایەکی لادێیانە شەپۆلی دەدا. بە ڕووخۆشییەوە بانگی کرد: "چین تانگ، چین تانگ".

هیچ وەڵامێك نەبوو.. ئەنکێ هەر بێدەنگ بوو و لەسەر پارچە قاوغێکی بۆمبا لە نزیك ئاگردانەکە دانیشتبوو. لە کاتێکدا {سوو}ی لاو پشتی بە دیوارەوە دابوو، چاوی هەڵبڕیو بۆ تاوێك سەیری کچەکەی کرد، ئینجا دەستی کردەوە بە فیشەك ژماردن بۆ تفەنگەکەی، {کا}ی پیرەمێردیش پشتی کردبوە دەرگاو گوریسێکی دەهۆندەوەو وا پێدەچوو ئەو کەسەی کە هاتە ژوورەوە، نەیدیبێ.

لای، لە جێی خۆی وشك بوو و ئارەقەیەکی سارد بە مووڕەگەی پشتیدا هاتە خوارێ، منداڵەکە شتێکی لێهاتوە! بە دەنگێکی لەرزۆکەوە پرسی: "دایە منداڵەکەم کوا؟ لە کوێیە؟"

ئەنکە لە کاتێکدا کە فرمێسکی بە لچکی چاکەتەکەی دەسڕیەوە، وەڵامی دایەوە: "هەم.. دایکی هات و بردیەوە".

لای هاواریکرد: "ئەوە چ دەڵێی؟! سەری وەرسووڕاندو تفەنگەکەی لەسەر قەرەوێڵە سووتاوەکە دانا: "دایکی زیندوە؟"

نەنکە سەری خۆی دانەواند، لە کاتێکدا کە فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوارێ، زەردەخەنەیەك بەسەر دەموچاویدا ڕەتبوو.

"سوو" بە دەنگێکی نـزم مەسـەلەکەی بـۆ باسـکرد. لـە کـاتێکدا کـە شـانەی تفەنگەکـەی پـڕ لە فیشەك دەکرد، گوتی:

-"لە کاتی پەڕینەوەی لە ڕووبارەکە گوللەیەکی بەرکەوتبوو و لە هۆش خۆی چووبوو، بەڵام هاوڕێیانی بەرژەوەندی ئاسایش دۆزیبوویانەوەو ڕزگاریان کردبوو. ئێستاکەش لە یەکەیەکی دژە فڕۆکە چێشتلێنەرە. ڕۆژێکیان کە هاتە ئێرە بۆ ئەوەی بـەرازەکان بەرێتـەوە کـە بەتالیۆنەکـەی لای ئێمـە بـەجێیان هێشـتبوو، کوڕەکەی خۆی ناسیەوە. منداڵەکەش دایکەکەی خۆی ناسییەوەو ماچیکردو هیچ گوێی بە ئێمە نەدا".

قورگی {لای} وشکبوو و خەونەکانی هەرەسیان هێناو بوونە بڵقی سەرئاو. هەرگیز ئەو بەختیارییە بە خۆیەوە نابینێ کە منداڵەکە هەڵگرێ‌و بیکاتە باوەشی‌و گەورەی بکات تا دەبێتە پیاو.

لـەو ڕۆژە سـەخت و ترسـناکەدا، دایکەکـە بـە زیندوویـی بمێنـێ‌و بشـگەڕێتەوەو دووبـارە کوڕەکـەی بدۆزێتەوە.. ئـەوە کـارێکی ئەسـتەمە، کارێکـە قـەت ڕێـی تێناچـێ لـە خـاکی شـەهیدان، خـاکی {فنەلنە} ڕوویدات. لای، چۆن دەتوانێ دەموچاوە جوانەکەی، چەناگەکەی، دەمە کەوانەییەکەی، چۆنی لەبیر بچێتەوە لە کاتێکدا بڕگەی "با.. ما"ی دەگوت.

دوای تاوێك نائومێدی، گوتی:

-"دایکی لە کام بەتالیۆن کاردەکات؟"

نەنکە وەڵامی دایەوە: "لە بەتالیۆنی سوان".

لای، لێوی خۆی گەست:

"ئـەو (سـوان)ە ڕیشدارەی کـە لـە بـەتالیۆنی تۆپـی قورسە؟ بۆ داوات لـە دایکەکـە نەکرد بـەلای کەمـەوە منداڵەکە ماوەیەکی کەم لێرە جێبهێڵێ؟ من شارەزای ئەو بەتالیۆنەم و لە هیچ جێگایەك ئەوەندە نامێنێتەوە، مەگەر شەڕەکە زۆر سەخت بێت، ئینجا ئەگەر لە شوێنێك جێگیر بێت".

نەنکە لە کاتێکدا شیشەی ئاگرخۆشکەرەکەی بە دەستەوە بوو و دەچوو بۆ لای ئاگردانەکەو گوتی:

"داوای ئەوەم لێکرد.. تەنانـەت منداڵەکە پێیداگرت کە چاوەڕوانت بکات تا تۆ دێیتـەوە، بەڵام گریـاو لێمـان پاڕایەوەو گوتی کە سبەینێ بەتالیۆنەکە جێدەهێڵێ‌و بۆ خولێکی نەخۆشەوانی دەچێتە {هـانۆی} منداڵەکـەش لەگـەڵ خۆی دەبات. لە بارودۆخێکی ئاوادا، تۆ بڵێ چیمان پێدەکرێ؟ لە ڕاستیدا دایکەکـە کوڕەکەی خۆی دۆزیوەتەوەو ئەمەش دەبێ ئێمە بەختیارو دڵخۆش بکات.

{کا}ی پیرەمێرد ئەو پارچە گوریسەی کە بە دەستیەوە بوو فڕێداو، بەرەو دەرگای دەرەوە چوو و تاوێك ونبـوو. کوڕەکـەش تفەنگەکـەی بـە دیـوارەوە هەڵپەسـاردو لـە بەرامبـەر پـەردەی {بـامبۆ}کـە چـەقی‌و ڕووناکاییـەکی لەعنـەتی دنیـا ڕووناکردنـەوە لـە بۆشـاییدا بریسـکەیەکی دا.. پەناگەکـە نوقمـی چۆڵـی‌و

بێدەنگییەکی قورس بوو. دوای ئەوە (لای) گوێی لە قرتەقرتی مێروویەك بوو کە داری کوڵەکەکەی دەقرتاند، هاوکات بۆنی گڵی تەڕی سارد ئەو ناوەی پڕکرد.

دەستیدایە هەگبەو تفەنگەکەی و هەستا بۆ ئەوەی بڕوات. دەبێ جارێکی دیکەو بۆ دواجار چاوی بە منداڵەکە بکەوێت، کوڵمە خڕەکانی بۆ دواجار ماچکات و ئەو حەلواو خواردنەش کە هاوڕێکانی پێیاندا ناردبوو بدات بە دایکەکەی و تەنیا چەند قسەیەك لەگەڵ ئەو دایکە بکات کە بە ڕاستی ئێرەیی پێدەبات و دوای لێبکات کە ناوبەناو هەواڵ و دەنگوباسی کوڕەکەی بۆ بنێرێ.

نەنکە بۆ ژێرزەمینەکە خزی و کە گەڕایەوە، گوزەیەك مۆزی پێشکەش بە (لای) کردو گوتی:

"ها.. ئەمە بۆ بچکۆلەکەو (سوو)ش لەگەڵت دێت چونکە ئەو لە (سوان) باشتر ڕێگاکە پێدەزانێت.

کوڕە لاوەکە چووە گۆشەیەکەوەو دەستیدایە کڵاوو تفەنگەکەی، ئینجا پەیژەکە چاوەڕوانی (لای) کرد.

لەپڕ بیرۆکەیەکی تازە بە مێشکیدا تێپەڕی.. لای گوتی:

-"دایە.. ئەرێ لە ژنەکەت نەپرسی لە چ بەروارێکدا گەیشتۆتە فنەلنە؟"

بە سەرسامی وەڵامی دیەوە: "چی؟"

-"لە ژنەکەت پرسی لە چ شوێنێك لەگەڵ منداڵەکەی لە بەلەمەکەی هاتنەدەرێ؟"

-"لەلای گوندەکەی تۆوە".

-"چ ڕۆژێك؟"

نەنکە سەیری لاوەکەی کرد: "سوو.. تۆ پێی بڵێ".

-حەوتی ئایار، ئەو ڕۆژەی ئەمەریکاییەکان تیپەکەی خۆیان کێشایەوەو ماددەی کیمیایی ژەهراوییان بە درێژایی زێدا بڵاوکردەوەو تۆپخانەی ئێمەش دەستیکرد بە تۆپبارانی (کون تین) و (دیك مو).

**(لای) قیژاندی: "تو هەقی ئاسمان.. بەخوا هەڵەی کردوە، ئەوە منداڵی ئەو نیە!"**

**نەنکە بە واق وڕماوی وەڵامی دایەوە: "بۆ؟!"**

**(کا)یە پیرەو کوڕە لاوەکە بە ترسەوە چاویان بڕییە کچەکە.**

**(لای) دووبارەی کردەوە:**

**"هەڵەی کردوە.. (چین تانگ)م لە ڕۆژی پێنجی ئایار هەڵگرتەوە، ئەو ڕۆژەی ئەمەریکاییەکان کێوماڵەکەیان دەستپێکردو ئەو ژنە دوو ڕۆژی دوای ئەوە لە زێی (بن های) پەڕیوەتەوە".**

**(کا)ی پیرەمێرد چاوی ئەبڵەق بوو و بە دەنگێکی نزم گوتی:**

**"بە ڕاستتە؟ ئەو قسانەی کردتن ڕاستن؟"**

**کچەکە وەڵامی دایەوە: "بە دڵنیاییەوە ڕاستن؟".**

**(کا) بازی دایە گۆشەیەك و تاوی دایە تفەنگە فەرەنسەییەکەی کە خرابوە ژێر پێخەفەکانەوەو هاواری لە نەنکە کرد:**

**"من دەچم منداڵەکە دەهێنمەوە! سوو لەگەڵم وەرە".**

**نەنکە لە کاتێکدا قۆڵی (لای) گرتبوو بە تووڕەییەوە گوتی:**

"لەسەرخۆبە.. هیچ نەکەی".
هەرچواریان بۆ ماوەیەك سەیری یەکتریان کرد.
نەنکە گوتی:
"نە، هەقی ئەوەمان نیە جارێکی دیکەش ژیانی ناخۆش بکەینەوە.. هەوڵبدەن تێمبگەن".
بێدەنگ بوو.. لە دەرەوەش گرمەی تەقینەوەهات، کەس قسەی نەکرد. (کا)ی پیرە تفەنگەکەی خستەوە شوێنەکەی خۆی‌و دەستیکردەوە بە گوریس هۆندنەوەو خەریکی سەوزە چنینی خۆی بۆوەو، لاوەکەش بە تفەنگەوە سەرکەوتە سەر پەیژەکەو لەنێو ڕۆشنایی کزی تەقینەوەی مووشەکەکاندا ونبوو.

## سەرچاوە

*لە کۆمەڵە چیرۆکێکی ڤێتنامییەوە کە لە کتێبێکدا بڵاوبۆتەوە بە ناوی (الرحیل) وەرگێردراوە
**چەند ساڵێك لەمەوبەر ئەم چیرۆکە لە گۆڤاری (کاروان)دا بڵاوکرایەوە، بەڵام هەڵەی چاپی زۆر تێکەوتبوو، بۆیە بڕیارم دا جارێکی دیکە لە گۆڤاری سەردەمدا بڵاویکەمەوە.

## پەراوێز

1-بەری ڕووەکێکە زۆر لە پەتاتە دەچێت.
B52-2 بۆمبا هاوێژێکی ستراتیژی ئەمەریکاییە.

## ساتیاجیت رای

# ملیۆنێر

### لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد

تریدیب چودهوری کە ئیدی توانای بەرگەگرتنی ئەو ئازارەی نەمابوو، بۆ بانگهێشتی کارگوزارەکە پەنجەی بە دوگمەی زەنگەکەدا نا، ماوەیەك بوو هەستی بەوە دەکرد، ئەو کووپەیەی[1] کە تیایەتی‌و وایدەزانی فێنکە وا دەرنەچوو، هەرچەندە سێ گەشتیاری تر لە پرخە پرخی خەودا بوون. گرفتی سەرەکی لەوەدا بوو کە تا ئەوکاتە هیچ کەسێك بیری لەوە نەکردبووەوە کە بەرانبەر ئەو هەموو بێسەرەو بەرەییو ستەمەی دەرهەق بە گەشتیارەکان دەکرا، بێزاریەك دەربپڕێت، سەیر نەبوو کە باری ژیانی خەڵکی، لە هەموو ڕوویەکەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو خراپتر دەچوو.

لە دەرگای کووپەکە درا.

-فەرموو.

دەرگای کووپەکە کەوتە سەرلاو کارگوزارێك هاتەژوورەوە.

تریدیب بابو بە شێوەیەکی پەلاماردەرانە پێی وت: "دەزانیت پلەی گەرمی ناو ئەم کووپەیە چەندە؟"

-نەخێر گەورەم.

-وتت چی؟ بۆ نایزانیت؟ بۆ کەسێك کە بلیتی شەمەندەفەری دەرەجەیەکی بڕیبێت، کە دەرگای فێنك کردنەوەی تێدایە، دەبێت ئازاری گەرما بچێژێت؟ ئێوە هیچ بەرپرسیار نین بەرانبەر بەمە؟

کارگوزارەکە دەیتوانی چی بڵێت؟ بە دەم پێکەنینێکی گەمژانەوە لە تریب بابوی ڕوانی.

قسەکانی تریدیب بابو، ئەو پیاوەی لە خەو هەستاند کە خەڵکی باشووری هیندستان و لە شوێن خەوی سەرەوەی کوپەکەدا نوستبوو، تریدیب بابو ناچاربوو توورەییەکەی خۆی بڕەوێنێتەوە؛

-زۆر چاکە، تۆ دەتوانیت بڕۆیت، لە بیرت نەچێت لە سەعات شەش و نیوی تەواوی بەیانیدا پیاڵەیەك چام بۆ بێنیت.

-زۆر چاکە، گەورەم.

کارگوزارەکە چووەدەرێ، تریدیب بابو دەرگاکەی داخست و ڕاکشا، ئەگەر ئەو بە فڕۆکە سەفەری بکردایە تووشی ئەم دەردی سەریە نەئەهات، کەسانێکی وەك ئەو، کە دەیانەوێت لە کەلکەتاوە بۆ ڕانچی بڕۆن، ئاسایی سواری فڕۆکە دەبن، بەڵام تریدیب بابو، بە هۆی ڕووداوێکەوە، ترسێکی وای لە فڕۆکە بوو کە

مایەی سەرزەنشت کردن بوو، ئەو لە دوانزە ساڵ لەوەو پێشەوە کە بە فڕۆکە بۆ بۆمبای چوبوو، یادوەریەکی سامناکی لە زەینا بوە! ئاووهەوای ئەو ڕۆژە ترسناك بوو، هەرکە فڕۆکەکە لە زەوی هەستا، تا کاتی نیشتنەوەی بەردەوام دەنگێکی ترسناکی لێدەهات، بۆیە، کاتێك کە دەبوو بۆ ڕانچی سەفەربکات، بلیتی شەمەندەفەری خێرای بڕی، بەڵام وا ئێستا ئەوە دەرکەوت کە دەبێت هەرگیز بیر لەوە نەکەیتەوە لە شەمەندەفەرێکدا کە دەزگای فێنك کردنەوەی تیابێت سەفەری ئاسودە بکەیت. تریدیب بابو لە ژوورە تاریکەکەدا چاوی نانە سەریەك و لەگەڵ بیرکردنەوەکانیدا تەنیا مایەوە. بیرکردنەوە لە سەردەمی منداڵی جارێکی دی هاتەوە بەر زەینی. ئەو لە رانچی لە دایك ببوو، ئادینات چودهری باوکی پزیشکێکی بەناوبانگ بوو، تریدیب بابو، دوای تەواو کردنی قوتابخانە، بۆ بەردەوامیدان بە خوێندن چووبوو بۆ کەلکەتا، لە ماڵی مامی مایەوەو دەستی بە تەواوکردنی خوێندنەکەی کرد، کەمێك دوای ئەوە، هاوڕێیەکی پێشنیازی ئەوەی بۆ کرد بڕواتە نێو کارێکەوە کە ئەو خۆی دەیکرد، سەرەتا بەسەرمایەیەکی کەمەوە دەستی بەو کارە کرد کە -سکراب فرۆشی- بوو. فریشتەی بەخت بۆی پێکەنیو پارەو پووڵی بەسەردا ڕژا. ئەگەرچی باوك و دایکی لە رانچی دەژیان، بەڵام ئەو هەر لە کەلکەتا مایەوە.

لە سەرەتادا لە شەقامی سەردار شانکار ئاپارتمانێکی بە کرێگرت. پاشان، کە دەرامەتی زۆر بوو، گوێزایەوە شەقامی هارینگلتون بۆ قاتی خوارەوە لە خانوویەکی دوو قاتدا. بەڵام هەمیشە پەیوەندی لەگەڵ باوك و دایکیا هەبوو، ساڵی جارێك دەگەڕایەوە رانچیو بە لایەنی کەمەوە هەفتەیەك لای باوك و دایکی ئەمایەوە، لەسەر داوای کەسو کاری لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا ژنی هێنا، دوای دوو ساڵ کوڕێکی بوو، ئێستا کوڕەکەی لە ئەمریکا دەخوێنێت.

تریدیب بابو منداڵی تری نەبوو، پێش سێ ساڵ ژنەکەی کۆچی دوایی کردبوو، بەڵام دایکی لە ساڵی *1972* و باوکی لە ساڵی *1974*دا کۆچی دواییان کردبوو. ئەو خانوەی لە رانچی هەیانبوو باخەوانێك و کارگوزارێك ئاگاداریان لێئەکرد. تریدیب بابو، لە ماوەی دە ساڵی ڕابوردودا بە ڕێکوپێکی مووچەی دابونێ، ئامانجی لە پاراستنی ئەو خانوە تەنیا ئەوە بوو کە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك حەسانەوەو بەسەربردنی ڕۆژانی پشوو شوێنێکی هەبێت. بەڵام سەرقاڵیەکەی کەمتر هەلی بۆ حەسانەوە دەهێشتەوە، بێجگە لەوە، سێ ڕۆژ دوورکەوتنەوە لە شوێنی کار، واتا لایەنی کەم پێنج هەزار ڕوپیەی لە دەست دەچێت، بۆ کەسێك کە تاقە مەبەستی لە ژیاندا کۆکردنەوەی پارەو پوول بێت، حەسانەوە مانایەکی نیە، تریدیب بابو ئەوسا ملیۆنێر بوو، ئەمە تەواو بە پێچەوانەی باوەڕی بۆنگالیەکانەوەیە کە نەیاندەتوانی لەو کارە گرنگانەدا کە پێویستیان بە بێباکیو قیروسیا بوو سەرکەوتن بەدەستبێنن.

هاتنی ئەمجارەی بۆ ڕانچی بە مەبەستی کارێکی تر بوو، کڕین و فرۆشتنی لاکی شووشەیی سوودێکی زۆری هەبوو، تریدیب بابۆ دەیویست ئەوەیش تاقیبکاتەوە. ئەو ئەیویست لە خانوەکەی خۆیدا بحەسێتەوەو بە حسابی خۆی، کارەکەی بە دوو ڕۆژ تەواو ئەبوو. نامەیەکی بۆ پراسانت سرکار نووسیبوو تا بەکارگوزارەکەی بڵێت خانوەکەی بۆ ڕێك و پێك بکات. پراسانت هاوڕێی منداڵی تریدیب بابو بوو کە ئێستا لە قوتابخانەیەکی مەزەبیدا لە رانچی وانەی دەوتەوە. لەوە دەچوو ئەو دوانە پەیوەندیەکی ڕێکوپێك و

هەمیشەییان لەگەڵ یەكتردا نەبێت، بەڵام تریدیب بابو دەیزانی ئەگەر هەر داوایەك لە پراسانت بكات ئەو بەخۆشیەوە بۆ هاوڕێ دێرینەكەی خۆی ئەنجامیدەدات.

بیری تریدیب بابو، لە شتێكەوە دەچوە سەر شتێكی تر، ئەو نەیزانی كەی خەوتوەو، لە كاتی خەوتنیشیدا، چۆن لەگەڵ پرخەپرخێكی هاوئاهەنگ و سێ گەشتیاری تردا گونجاوە.

شەمەندەفەری خێرای رانچی، بە پێی بەرنامە، دەبوو سەعات حەوت و چارەكی سەرلەبەیانی بگەیشتایەتە ئێستگە، پراسانت سركار، پێش دە دەقیقە بە گەیشتنی شەمەندەفەرەكە، بۆ بەخێرهاتنی هاوڕێكەی هاتبوە ئێستگە. ئەو لە سەردەمی قوتابیەتیدا زۆر لە تریدیبەوە نزیك بوو، ئەوسا منتویان پێدەگوت، ئەم دوانە، تەنانەت دوای ئەوەیش كە تریدیب لە كەلكەتادا نیشتەجێ بوو، هەر بە شێوەیەكی رێكوپێك و بەردەوام پەیوەندی نامەگۆڕینەوەیان هەبوو. بەڵام دوای ئەوەی كە تریدیب چوە زانكۆ، پەیوەندیان بەرەو كزی چوو، بێگومان لەم بارەیەوە زیاتر سەرزەنشتی تریدیب دەكرێت نەك پراسانت. ئەو كە چەند جارێك بۆ دیدەنی باوك و دایكی گەڕابوەوە رانچی پراسانتی ئاگادار نەكردبوو، بۆیە زۆربەی كات، ئەو دوانە تەنانەت بۆ چەند دەقیقەیەك قسەكردنیش یەكتریان نەدەبینی، پراسانت، لە سەرەتادا نەیتوانی پەی بەو نهێنیە بەرێت كە بۆچی هاوڕێكەی وا گۆڕاوە. ئەو، دوای ماوەیەك لە رێگای خوێندنەوەی ڕۆژنامەوە تێگەیشت كە تریدیب بابو بوە بە بازرگانێكی بەناوبانگ و گرنگ، ئەمەیش بەو مانایەیە كە ئیتر وازی لەم هێناوەو چوەتە ناو چینێكەوە كە تەواو لەگەڵ ئەمدا جیاوازە، ئەم مەبەستە لەو نامە كورت و وشكانەوە دەردەكەوت كە بۆ پراسانتی دەناردو دوور بوو لە هەر خۆشیو جوانیەك.

پراسانت پانو، بەم گۆڕانەی كە بەسەر هاوڕێكەیدا هاتبوو دڵتەنگ بوو. تریدیب چودهری ملیۆنێری ئەمڕۆ، لەگەڵ "منتو"ی خۆشەویست و سادەی دوێنێدا كە ئەم دەیناسی، جیاوازی هەبوو، ئایا مرۆ لە ڕێڕەوی دەورەی ژیانی خۆیدا، بە ڕاستی تا ئەم ڕادەیە دەگۆڕێت؟ ڕاستە باری دارایی تریدیب چودهری بە ئاشكرا گۆڕانی بەسەرداهاتبوو، بەڵام پرسانت سركار ئەو كەسە نەبوو لە ڕوانگەی سامانەوە داوەری لەسەر خەڵكی بكات. ئەم جۆرە كەسایەتیەی لە باوكیەوە بۆ مابوەوە. پراماتاسركاری باوكی پراسانت، لەوانەبوو كە پەیڕەوی لە گاندی دەكردو بڕوای پێهەبوو، لە ژیانی پراسانتا، شتێكی وا گرنگ ڕوویندابوو كە گۆڕانێكی گەورە بەسەر ژیانیدا بهێنێت، تێكڕا ژیانی بەڕێوەبەری قوتابخانەیەك ئەوەی لێ چاوەڕێ نەدەكرا كە ڕووداوێكی تازەی بە هەراوزەنا دروستبكات. لەم لایەنەوە، چ گرفتێك نەبوو كە ئەو لە شوێنێكدا وەستابوو كە لە سەردەمی منداڵیدا بە پانو ناوزەد دەكرا، هەروا بمێنێتەوە. بەڵام دەشێت ئەمە بۆ تریدیب چودهریش بوترێت؟ پراسانت بە تاسەوە بە دوای ئەمەدا دەگەڕا، ئەگەر تریدیب بە ڕاستیی ببوە ئەو كەسەی كە خۆی بە گەورەپیاو بزانێت، ئەوا پراسانت نەیدەتوانی لەگەڵیا هەڵبكات.

شەمەندەفەرەكە دوای دە دەقیقە دواكەوتن گەیشتە ئێستگەكە. لەو شوێنەدا كە بڕیاربوو ئەو دیدارە كورتە پێكبێت تریدیب بابو، بێجگە لە جانتایەكی گچكەو فلاسكێك چا هیچی تری لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو. هەرچەندە تریدیب گەلێكی هەوڵدا، بەڵام پراسانت جانتاكەی هەر لەدەست وەرگرت و پاشان بە جووتە بەرەو شوێنی تاكسیەكان بەڕێكەوتن.

تریدیب چودهری پرسی: "ناچاربووی زۆر چاوەڕوان بکەیت؟"
-تەنیا بیست دەقیقە.
-من چاوەڕوانی ئەوە نەبووم کە بێیتە ئێستگە، هەر پێویستیشی نەدەکرد، بێ لەوە، خۆ ئەمە یەکەمجارم نیە بێمە ڕانچی.
پراسانت پانو زەردەخەنەیەکی کرد، بەڵام هیچی نەوت، ئاگای لەوەیش بوو کە لە کاتی قسەکردندا دەنگی هاوڕێکەی ئاوازێکی بە وێڵ و گونجاوی هەبوو.
تریدیب بابو پرسی: "لێرەدا کارەکان باش بەڕێوەدەچن؟"
-بەڵێ، هەموو شتێك ڕێکوپێکە، چینتامانی باخەوانتان بەوە زۆر شڵەژابوو کە ئاغاکەی دەگەڕێتەوە.
چینتامانی چێشتلێنەر پاسەوانی خانوەکە بوو.
-خانوەکە هێشتا قابیلی تێدا ژیانە یان بۆتەماڵی دێوو درنج؟
جارێکی دی پراسانت پانو زەردەخەنە گرتیو دوای کەمێك بێدەنگی وتی:
"من هیچ لەوە نازانم کە بووبێتە ماڵی دێوو درنج، بەڵام شتێك هەیە کە دەبێت هەر پێت بڵێم، چەند ڕۆژێك لەمەوبەر بەوێدا تێپەڕیم، کوڕێکی بچووکم بینی کە لە نێو باخی خانوەکەتدا یاریدەکرد".
-شەوبوو؟
-بەڵێ، درەنگ وەختێك بوو، نزیکی سەعات یانزەو نیو، من هەڵسڵەمیمەوە، وام هاتە بەرچاو کە "منتو"ی تەمەن دە ساڵە گەڕابێتەوە.
-وێڵیکە، بێگومان ئەوە ڕۆح نەبوە، باوکم ئەو خانوەی دروستکردوە، بۆیە کێ لەوێدا ژیاوەو مردوە هەموو شتێکیان لە بارەوە دەزانم، ئەوەی کە زیاتر حەز ئەکەم بیزانم ئایا باش پاك کرابوەوە یان نا؟
-ماڵەکە تەواو پاك و تەمیزە، من خۆم دوێنێ دیومە، چاکە، دەتەوێت چی بکەیت و بۆ کوێ بڕۆیت؟
-دەبێت ئەمڕۆ دوای نانی نیوەڕۆ بچم بۆ نامکان، لەوێ پیاوێك هەیە بەناوی ماهشوارجاین، کاری کڕین و فروشتنی لاکی شووشەییو ئەو جۆرە شتانەیە، بڕیارە سەعات دوونیو یەکتر ببینین.
-زۆرباشە، دەتوانیت هەر ئەو تاکسیەی کە سواری دەبین بە کرێی بگریت، شۆفێرەکەی دوای نانی نیوەڕۆ بگەڕێتەوەو بتبات بۆ نامکان، تا ئەوێ زیاد لە دە دەقیقە ناخایەنێت.
هەردووکیان سواری تاکسی بوون، دوای کەمێك، پراسانت سرکار، ئەسڵی مەسەلەکەی خستەڕوو "ئێ.. لێرە چەند ئەمێنیتەوە؟"
-ئەگەر ئەمڕۆ لەگەڵ ئەم ئاغای جاینەدا کارم ساز نەبێت، ناچارم بەیانیش بۆ قسەکردن بڕۆمەوە لای، بۆیە دوو بەیانی دەگەڕێمەوە بۆ کەلکەتا.
-پێ دەچێت تۆ زۆرت فەرق کردبێت.. مرۆڤ کە بیەوێت قسە لەگەڵ تۆدا بکات بە ناچاری تووشی دوودڵی دێت.
-چیت ئەوێ بیڵێ. ئەملاو ئەولای پێمەکە، من گومان لەو کەسانە دەکەم کە پێچ و پەنایان هەیە.

–له ڕاستیا هیچی وا نیه، ته‌نیا داواکاریه‌که، ئه‌گه‌ر بەڵێن بده‌یت، ئه‌م هاوڕێی سه‌رده‌می منالیه‌ت زۆرت سوپاسی لێده‌کات.

–ئه‌و داوایه چیه؟

–تۆ باوکی ویلیامت له‌بیره؟

–ویلیام؟ ویلی.. ڕیش سوور؟

–بەڵێ، ڕیش سوور، ئه‌و پیاوه نزیکه‌ی پێنج ساڵ له‌وبه‌ر قوتابخانه‌یه‌کی بۆ منداڵه هه‌ژاره‌کان دروستکرد، هه‌مو جۆره منالێك، بێئه‌وه‌ی گوێ بدرێته ڕه‌چه‌ڵه‌ك و تیره‌و تایفه بۆ ئه‌و قوتابخانه‌یه ده‌چێت–هیندوسه‌کان، موسوڵمانه‌کان و مه‌سیحیه‌کان. باوکی ویلیام به ڕاستی زۆری هه‌وڵداوه که ئه‌و قوتابخانه‌یه هه‌ر بمێنێت، ئه‌و پیاوه زۆر به تاسه‌وه‌یه که تۆ دیده‌نی ئه‌و قوتابخانه‌یه بکه‌یت، ئه‌مه زیاد له نیو سه‌عات ناخایه‌نێت. ئه‌گه‌ر بچیت، باوکی ویلیام زۆری پێخۆش ده‌بێت.

–ڕۆیشتن بۆ ئه‌وێ یه‌عنی ده‌فرێکی سواڵت ده‌خه‌نه به‌رده‌م.

–یه‌عنی چی؟

–تۆ له مه‌به‌ستی سه‌ره‌کی ئه‌و جۆره داوه‌تیه ناگه‌یت؟ ده‌زگای تازه پێویستی به سه‌رمایه هه‌یه، کرپارێکی ده‌وڵه‌مه‌ندو ده‌فرێکی سواڵی. ئه‌گه‌ر پێویست بکات که به‌ناوی خێرو خێراته‌وه من پاره‌ی خۆم ته‌خشان و په‌خشان بکه‌م، چاکتره ئه‌م کاره هه‌ڵبگرم بۆ سه‌رده‌می پیری، ئه‌وکاته‌ی که ده‌بێت بیر له‌و دنیا بکه‌یته‌وه، به‌ڵام ئێستا کاتی ئه‌وه نیه، ئه‌مڕۆ ڕۆژی پاشه‌که‌وته، ئه‌گه‌ر من ناوم وا ده‌ربچێت که که‌سێکی به‌خشنده‌و خاوه‌ن به‌زه‌ییم، ئیتر ئه‌م جۆره داواکاریانه بۆ کۆمه‌ك پێکردن ته‌واونابن، له‌به‌رئه‌وه داوای شتی وام لێمه‌که، چونکه من به خه‌یاڵما نایه‌ت، دڵنیایشم ئه‌گه‌ر ئه‌م باسه لای باوکی ویلیام بکه‌یته‌وه خۆی هه‌موو شتێك تێئه‌گات، هه‌موو ئه‌و کاره‌ی که ده‌مه‌وێت ئه‌نجامی بده‌م بێجگه له کاره بازرگانیه‌که، که‌مێك حه‌سانه‌وه‌یه، من له که‌لکه‌تا ئه‌وه‌نده‌م ئیسراحه‌ت نیه.

–زۆرباشه.

هه‌رگیز پراسانت چاوه‌ڕوانی کاردانه‌وه‌یه‌کی هێند توندوتیژ ئامێز نه‌بوو، وه‌ڵێ ده‌شێت ئه‌مه کارێکی که‌مێك سروشتی بێت، ئه‌مه ئه‌و منتویه نیه که سه‌رده‌مانێك ده‌یناسی، ئه‌م ئێستا که‌سێکی بێگانه‌یه. به‌ڵام تریدیب بابو که دیمه‌نی شوێنی له دایکبوونه‌که‌ی خۆی دی، که‌مێك له ده‌ستداگرتنه‌که‌ی شلکردو ڕووی خۆشتر بوو، پراسانت به هه‌ل زانیو پێشنیازی دووه‌می بۆ کرد.

–هاوڕێی خۆشه‌ویست، تۆ یه‌کێك له پێشنیازه‌کانمت ڕه‌تکرده‌وه، به‌ڵام ناچاری ئه‌میان قبووڵ بکه‌یت، ژنه‌که‌م زۆری داوا لێکردم که ده‌بێت ئه‌مشه‌و بۆ شێوکردن لای ئێمه بیت، ئێمه پاره‌ی زۆرمان نیه، به‌ڵام ئه‌توانم به ته‌واوی دڵنیاییه‌وه پێت بڵێم که هیچ که‌سێك له ماڵی ئێمه به ده‌فری سواڵکردنه‌وه پێشوازیت لێناکات.

پێخەفەکەی لەو ژوورەدا داخرابوو کە بە منداڵیش لەوێ دەنووست. تازە نانی خواردبوو، بۆ خەوتن هێشتا زوو بوو، تریدیب بابو بڕیاریدا ماوەیەك لەسەر کورسی قووڵی هەیوانەکە بحەسێتەوە.

لە نیو سەعات کەمتر، هەستیکرد ئاسەواری ماندوویەتی لە لەشیا نەماوەو بە تواناو ئارامە.

مانگە ڕەنگ پەڕیوەکەی نێو دڵی ئاسمان خۆی نمایش دەکردو، تریدیب بابو لەژێر ڕوناکیەکەیدا لقی ڕەشی داگەڕاوی درەختە بێ گەڵاکانی حەوشەی دەبینی، ئەو تەنانەت گوێی لە دەنگی هەناسەی خۆی بوو، لەوە دەچوو کە ئەو دەنگە، تاقە دەنگی بوونەوەری ئەم جیهانە بێت.

بەڵام ئایا وابوو؟

نا، دەنگی شتێکی تری تێکەڵ ببوو، دەنگێکی کز، نەتدەزانی سەرچاوەکەی لە کوێوەیە.

تریدیب بابوو گوێی هەڵخست، کوڕێکی منداڵ شیعرێکی لەبەر ئەخوێندەوە، وتەیەکی سەرواداری بەناوبانگ کەلە باخچەی منداڵاندا دەخوێنراو زۆر زوو تریدیب بابو بیری کەوتەوە.

هێشتا دەنگەکە کزبوو، بەڵام وشەکان ئاشکرابوون.

باع، باع، بەرخۆلە

خوریەکەت کورت و زۆرە

وا دەهاتە بەرچاو کە دێڕە شیعریەکان لە سووچێکی بیریدا خۆیان حەشاردابێت و ئەو دەنگە وەبیری هێنابێتەوە.

هێدی هێدی دەنگەکە کز بوو، تریدیب بابو هەستا، چاوبڕینە ڕابردوو کەڵکی نەبوو، ئەوەی گرنگی بە ژیان دەدا ئاینده بوو، نەك ڕابردوو، ئەو دەیزانی کە دەبێت لە ئایندەدا سامانێکی زیاتر پێکەوە بنێت و پلەی کۆمەڵایەتی بەرەو بەرزی بچێت و ببێتە ملیاردێر. ڕابوردوو مرۆڤ تەمەڵ و لاواز ئەکات، لە کاتێکدا کە بیرکردنەوە لە ئایندە هێزو توانای تری پێدەبەخشێت.

تریدیب بابو چوە ناو ژورەکەو دەموچاوی پێکدادا، دیسان کارەبا بڕاو مۆمێکی کز لەسەر مێزی کەنار جێگاکەی دەسووتا، تەنانەت لەبەر ئەو ڕوناکیە کزەیشدا بە جوانی ئەوەی بینی کە پێخەفەکەی باش ڕێکوپێك نەکراوە، متیل و سەرچەفەکە چرچ و لۆچ بوون، خۆی ڕێکیخستن و دوای لابردنی کراسەکە چوە ناو جێگاکەوە، دەبوو مۆمەکە هەر بسوتێت؟ نا، پێویستی نەدەکرد، کوژاندیەوە، بۆنی کوژانەوەی مۆمەکە، تا ماوەیەك ئەو ناوەی پڕکردبوو، پەنجەرە کرابوەوەو لەوێوە تەماشای ئاسمانی دەکرد، مانگ کەوتبوە تریفە، ئەو بە جۆرێك ڕاکشابوو کە دەرگا کراوەکەی ژوورەکەی بەرانبەر بوو، بەشێکی ڕاڕەوو پلیکانەکان دەبینران، هیچ پاساوێك نەبوو کە تەماشای پلیکانەکان بکات، بەڵام شتێك خستبوویە سەر کەڵکەڵە، دەنگی پێیەکی پەتی بوو کە لە پلیکانەکان سەردەکەوت.

بەڵام کەس بە ڕاستی نەهاتە ناو ژوورەکە، دەنگەکە لە ناوەڕاستی پلیکانەکاندا بڕا.

تریدیب بابو کوتوپڕ هەستی بە گەلۆری کرد، هەموو ئەمانە بێجگە لە خەیاڵی خۆی هیچی تر نەبوون، هەموو ئەو بیرە وەهمزایانەی لە خۆی دورخستنەوەو یەکسەر چاوی لێکنا، سەعاتی ژاپۆنی ژووری میوانی

قاتی خوارو، یانزە جار لێیداو سەعات یانزەی ئاشکراکرد، ئەو سەعاتە لە کار وەستابوو، بەڵام بەیانی ئەو ڕۆژە تریدیب بابو دووبارە خستبوویەوە گەڕ.

کە دوا لێدانی سەعاتەکە وردە وردە نەما، وا دەهاتە بەرچاو کە بێدەنگیەکە زیاتر قووڵ بوبێت.

تریدیب بابو، تەنانەت بە چاوی نوقاویشەوە دەستی بە بینینی شتەکان کرد -وردە پارچەی وێنەیەکی شکاو، پارچەی پێکەوە نەبەستراوی خەونێك، دەیزانی زوو خەوی لێدەکەوێت، تەواو وەك گۆرانی بێژێك کە پێش گۆرانی وتن، لەبەرخۆیەوە هەندێك لە ئاهەنگەکە دەڵێت.

ئەو پارچە خەونە نەگونجاوانە سەرەتای نووستن بوو.

بەڵام هەرچەندە پێڵوی نابونە سەریەك، هێشتا بە تەواوی خەو نەچوبوە چاوی، هەستی شەشەمی پێیوت کە یەکێك هاتۆتە ناو ژوورەکەوە، نا، ئەمە تەنیا هەستی شەشەم نەبوو، گوێشی هەروای دەوت، لە ڕاستیا ئەو هەستی بە هەناسەدانی کەسێك دەکرد، وا پێدەچوو یەکێك خێرا لە پلیکانەکان سەرکەوتبێت و ئێستا لەبەر دەرگاکەدا هەناسەبڕکێی بێت.

تریدیب بابو، دڵنیا لەوەی کە بە ڕاستی دەتوانێت ئەو کەسە ببینێت، چاوی کردەوە، ئەو بە هەڵەدا نەچووبوو.

کوڕێکی منداڵ لە بەردەم چوارچێوەی دەرگاکەدا وەستابوو، دەستی ڕاستی بێ دەربەستانە خستبوە سەر دەستگیری دەرگاکەو پێی چەپی کەمێك هەڵبڕیبوو، وەك بینینی کەسێك لەناو ژوورەکەدا سەری منداڵەکەی بە سوڕهێنابێت و وایلێکردبێت کە لە دوا هەنگاوناندا لە جووڵە کەوتبێت.

تریدیب بابو هەستیکرد تەزوویەکی سارد بە پێیدا هات، بە بڕبڕەی پشتیا تێپەڕیو گەیشتە سەری، پراسانت پێی وتبوو کە منداڵێکی لە باخەکەدا دیوە، کوڕێکی منداڵی چکۆڵە. "منتو"ی سەردەمی منداڵیەتی ئەو..

هەموو ئەندامەکانی لەشی وەستان، دەمارێکی لاجانگی کەوتە لێدان، وایزانی بە پشتا دەکەوێت، ترسی زۆر لە جووڵەی خست.

منداڵەکە هەنگاوی بەرەو پێشەوە نا، کراسێکی ئەرخەوانی لەبەرا بوو، سەیرە! ئەمە هەمان ئەو کراسەیە..

تریدیب بابو، تەواو پێش ئەوەی لە هۆش خۆی بچێت، گوێی لە پرسیارێك بوو کە بە دەنگێکی منداڵانەی شیرین وتی:

-کێ لە ژوورەکەی مندا نوستوە؟

* * *

تریدیب بابو، وەك عادەتی ڕۆژانی دی، سەعات شەش و نیوی بەیانی لە خەو هەستا، نەیدەتوانی ئەوە بێنێتەوە بەر یادی خۆی کە شەو، کەی هاتۆتەوە هۆشی خۆیو دووبارە کەی خەوتۆتەوە. پراسانت وتبووی تریدیب دەتوانێت سەعات حەوت و نیو بێتەماڵیان و لە گەڵیاندا نانی بەیانی بخوات، ئەو

نەیدەتوانی بیری خۆی لەسەر کارەکانی ڕۆژانە جەم بکات. ڕووداوەکانی شەوی ڕابوردوو، تەواو شێواندبوویان، لە تەواوی تەمەنیا، هەرگیز کارەساتێکی وای لێ ڕوونەدابوو.

وتە سەروادارەکانی منداڵی کە شەوی پێشو گوێی لێببوو، هەمان ئەو شیعرانە بوون کە لە سەردەمی منداڵیدا لە پۆلداو لەبەر دەیخوێندنەوەو تەنانەت خەڵاتیشی لەسەر وەرگرتبوون، ئەی خەڵاتی دووەم؟ ئەو خەڵاتە درابوە پراسانت سرکار، منتو ئەمەی پێناخۆشبوو.

ئەو بە خۆشەویست ترین هاوڕێی خۆی، پانوی وتبوو: "ئەگەر هەردووکمان خەڵاتی یەکەمیمان پێبدرایە چەند خۆش دەبوو".

ئەو هەرگیز دەموچاوی ئەو کوڕە منداڵەی کە شەوی ڕابوردو هاتبوە ژوورەکەی، نەدیبوو، بەڵام زۆر لە کراسەکەی بەری ڕامابوو، هەر ئەو کراسە ئەرخەوانی ڕەنگە بوو کە پووری بۆی هێنابوو، ئەو زۆری حەز بەو کراسە بوو، یەکەمجار کە کردبوویە بەریو چوبوو بۆ قوتابخانە، پانو پێی وتبوو: "خوای گەورە- ئەمڕۆ لە منداڵێکی ئەوروپایی دەچیت!"

مەبەست لە ڕوداوی شەوی ڕابوردو تا ئەندازەیەك ڕوون بوو، تریدیب چودهوری ئەمڕۆ، هەرگیز ئەو منداڵە نەبوو کە پێیان دەوت منتو، ئیدی منداڵێك بە ناوی منتۆوە وجودی نەبوو، ئەمە ڕۆحی ئەو بوو کە شەوی پێشوو هاتبوە لایو پێی وتبوو کە تریدیب چودهوری نوێ، -ملیۆنێری گەورە- بێجگە لە گەمژەیەکی نەفرەت لێکراو چیتر نیە، مرۆڤێکە لە گەڵیا هەڵناکەیت.

تریدیب بابو لە بارەی پێشهاتەکەی دوێنێ شەوەوە هیچی بە پراسانت نەوت. وەلێ دەیزانی کە هێشتا هەستی ماندوەو ناتوانێت هێزی خۆی بەدەست بێنێتەوە. ڕەنگە هەر لەبەرئەمەیش بوویێت کە دوای چەند دەقیقەیەك، پراسانت هەروا لێی پرسی: "چیتە؟ ئەڵێی دوێ شەو باش نەنوستوویت؟"

-نا.. ئاه.. من، مەبەستم ئەوەیە کە.. لەبەرئەوەی کارەکانم تەواو کردوەو هێشتا کاتم ماوە. دەمەوێت بزانم ئەمڕۆ دەتوانین بچین بۆ ئەو قوتابخانەیەو باوکی ویلیام ببینین؟

پراسانت سرکار بە ڕوویەکی خۆشەوە وتی: "ئەمە بیرکردنەوەیەکی گەورەیە"

بەڵام ناچار بوو زەردەخەنەکەی بشارێتەوە، ئەو نەخشەیەی کە کێشابووی باش بە ئەنجام گەیشتبوو، دەبێت پراسانت لە کاتی گەڕانەوەدا سەرێك لە ماڵی هاوسێکەیان بدات و بە بابو، کوڕی دراوسێکەیان بڵێت کە شەوی ڕابوردوو کارەکەی بە چاکیو تەواوی ئەنجامداوەو وانەکەی باش جێبەجێ کردوە، هەڵبەت دەبێت خەڵاتێکی باشی **چینتامانیش** بکات کە بۆ ئەم پلانە هاوکاریی کردبوو.

## پەراوێز

*1*-کوپە *Coupe* وشەیەکی فەرەنسیە، شوێنی دانیشتنی گەشتیارە لە بەشێکی واگۆنی شەمەندەفەردا "فەرهەنگی عەمید"

*2*-پوورە *Puree* (فەرەنسی) جۆرە خواردنێکە لە ئاردو نۆك یان پاقلە یان پەتاتەی ڕنەکراو کە لەگەڵ لۆبیاو نیسکدا پێکەوە دەکوترێت. (فەرهەنگی عەمید).

## سەرچاوە

ساتیاجیت رای- بیست داستان

وەرگێرانی بۆ فارسی: اصغر اندرودی- نشر نقطە *1373*

# توندوتیژی

ئاخۆ شارستانیەتی نوێی مرۆڤایەتی توانیویەتی ڕادەی توندوتیژیو بەرهەمهێنانی توندوتیژی لە کایە جیاجیاکانی ژیانی ئادەمیزاددا کەمبکاتەوە؟ شارستانیەتی کە لافی ئەوە لێدەدات ژیانی سەرەتاییو بەربەریەت و وەحشیگەریی جێهێشتوە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویست بەوە ناکات زۆر وردبینەوە تا بۆمان دەربکەوێ کە چۆن تا ئێستاش دیاردەی توندوتیژی بە هێزێکی سەیرەوە خۆی لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤدا دەنوێنێت. بە تایبەتی کە ئێستا بە هۆی تۆڕە جیهانیەکانی ڕاگەیاندنەوە بە شێوەیەکی ئاسانتر ئەتوانین ئاگامان لە بەشێکی ئەو شتانە بێت کە لەم دونیا بەرینەدا ڕوودەدەن. هەر بۆیە چاومان بەهەر ڕۆژنامەو گۆڤارو کەناڵێکی تەلەفزیۆنیو هتد.. دەکەوێ؛ بە جۆرێك لە جۆران دەرکەوتەکانی توندوتیژی دەبینینەوە.. تەقاندنەوەی بینایەك لەوێ، لەناوبردنی میللەتێك لە شوێنێکی دی، کوشتنی ئافرەتێك لێرە، دەسدرێژی کردنە سەر منداڵان، گرتن و ئەشکەنجەدان و سەربڕین و هتد.. ئەنجامدانی ئەم توندوتیژیە لە کوشتنی چۆلەکەیەکەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە پاکتاوکردنی ئیتنیو کوشتنی بە کۆمەڵ. ئەمە یەکێکە لە سیما "مەدەنی!"یەکانی ئەم چاخەی ئێمە، هەڵبەت لە زۆربەی جارەکانیشدا توندوتیژیو تیرۆر دەمامکی ئەم ئایدیۆلۆژیەت و ئەو ئاین و فلانە بیرۆکەو.. هتد دەپۆشێو بیانووشی بۆ دەهێنرێتەوە. هێزێك بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ خۆی بە ڕەوا دەزانێو بۆ بەرامبەرەکەی بە ناڕەوا، تەنانەت زۆرجار لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا سیمای توندوتیژی دەڕازێندرێتەوەو لای لاوان و منداڵان شیرین ئەکرێ. بە ئاشکرا دەبینین کە

فایلی ژمارە

ئەمە یەکێکە لە ناکۆکیەکانی ئەم سەردەمەمان. ئەو سەردەمەی کە لافی دابینکردنی ئازادیو دیموکراسیو پاراستنی مافی مرۆڤ و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی بۆ مرۆڤایەتی لێدەدات؛ بە دیویکی تردا توندوتیژیەکی ئاشکراو هەندێ جاریش شاراوە بەرامبەر ئادەمیزادەکان پیادە دەکات و بەرگی ئالو والآی لەبەردەکات.

هەڵبەت قسەکردن لەسەر دیاردەو چەمکی توندوتیژی زۆر هەڵدەگرێت و فرە ڕەهەندو لایەنە. توندوتیژی چیە؟ سەرچاوەکانی چین؟ شێوازەکانی دەربڕینی چین؟ ئایا توندوتیژی هەر لە سەرەوەی هەرەمی کۆمەڵگاوە بۆ خوارەوە دێت یان لە خوارەوە سەرچاوە دەگرێت و سەرەوە دەرکەوتەو دەرەنجامی توندوتیژییەکەی خوارەوەیە؟

لە ڕاستیدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بە درێژایی مێژووی زانست و فیکر چەندەها تیۆرە هاتوونەتە گۆڕێو هەریەکەو لە گۆشەنیگایەکەوە ویستوویەتی بۆ مەسەلەکە بچێت، بەڵام بە بڕوای ئێمە پێویستە هەر تۆژینەوەیەك لەسەر توندوتیژی هەمەلایەنە بێت و لە تەواوی ڕەهەندە جیاوازەکانی بکۆڵێتەوە. هەر بۆ نموونە پێویستە باس لە ڕەهەندی بایۆلۆژی، سایکۆلۆژی، سۆسیۆلۆژی، کەلتووری، تەکنۆلۆژی، ئابووریو.. هتد ی ئەم دیاردەیە بکرێ تا بتوانین بە وردی لایەنەکانمان بۆ ڕوون بێتەوە.

لە کاتێکا کە هێشتا کۆمەڵگای کوردیش بەدەست هەندێ لە شێوازە ئاشکراو شاراوەکانی توندونیژییەوە گرفتارە، توندوتیژی دژ بە ژنان، توندو تیژی دژ بە منالآن، توندوتیژی خێزانی، توندوتیژیی سیاسی.. بە پێویستمان زانی کە "سەردەم" لە ڕوونکردنەوەی هەندێ دیوی دیاردەی توندتیژیدا بەم فایلە بەشداری بکات، کە بە داخەوە فایلەکە لە ئاستی داوای ئێمەدا نیە؛ بەڵام هیواداریـن بتوانێ لەم ڕووەوە بەشداریەکی خاکیانە بکات.

*بەڕێوەبەری نوسین*

ئارۆن گاندی

# ناتوندوتیژی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بە پێی ڕێبازەکەی گاندی



فرانشیسکۆ دی گۆیا

و. لە عەرەبیەوە: ئازاد بەرزنجی

**( ئارۆن گاندی نەوەی مەهاتماگاندیەو، دامەزرێنەرو بەڕێوەبەری پەیمانگای نێم. تی. گاندییە بۆ ناتوندوتیژی لە مەمفیس- تینیسی- ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەمەش یەکەم وتارە کە بە ڕێکەوتن لەگەڵ بەشی خزمەتگوزاریی هەواڵی دەزگای "زەمینێکی هاوبەش- *Common- Ground*"داو بە هاوکاریی یەکێتیی ئەوروپاییو یۆنسکۆ بلاوبێتەوە ).**

هۆی ئەو تێنەگەیشتنە گشتیەو بە هەڵەداچوونەی سەبارەت بە فەلسەفەی ناتوندوتیژی هەیە- لانی کەم بە گوێرەی لێکدانەوەی گاندیانە بۆی- نەگونجانی زمانی ئینگلیزیە. ناتوندوتیژی بە مانا حەرفیەکەی واتە توندوتیژیی جەستەیی بەکارنەبەین. لەکاتێکدا چاو لەو توندوتیژیە ناجەستەییە دەپۆشین کەخۆمان چ وەك

تاکەکەس و چ وەك گروپ؛ هەموو ڕۆژێك ئەنجامی دەدەین. ئەم توندوتیژییە ناجەستەییەش یان ئەم توندوتیژییە پاسیڤە خراپترە؛ لەبەرئەوەی تووڕەیی بەرهەمدێنێت و دەبێتە مایەی توندوتیژیی جەستەیی. هەر بۆیە تا دان بە توندوتیژیی "پاسیڤ"ماندا نەنێین و چارەسەری نەکەین، ناتوانین توندوتیژیی "جەستەیی" چارەسەر بکەین.

ناتوندوتیژی بە پێی ڕێبازەکەی گاندی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە پێویستە پەیوەندی نێوان تاکە کەسەکان و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش لەسەر بنچینەی پرنسیپە ئیجابیەکان بێت؛ وەك: ڕێز، لێکدی گەیشتن، یەکدی قبوولکردن و لەبەرچاوگرتنی باری یەکدی. نەك لەسەر بنچینەی پرنسیپە سەلبیەکانی وەکو خۆپەرستیو بەرژەوەندیی تایبەتی، هەروەکو ئێستا لای ئێمە باوە. ئەمەش گەرەکی بە ڕێزگرتنە لە تەواوی ئاینەکان، کەلتورەکان، نەتەوەکان و تایبەتمەندیە ماتەریو کۆمەڵایەتیەکانی دی. هەرکاتێ ڕێزگرتن بوو بە بناغەی پەیوەندییەکانی نێوانمان، ئیدی زەحمەت دەبێ بتوانین توندوتیژی ئەنجامبدەین.

پاشان ناتوندوتیژی بە پێی ڕێبازەکەی گاندی پشت ئەستورە بە خۆشەویستیو سۆزو بەزەیی بۆ تەواوی بوونەوەرەکان. هەربۆیە کاتێ خەڵك گومان لە بوونی ناتوندوتیژی دەکەن؛ بەوە گومان لە بوونی ڕێزو خۆشەویستیو سۆزیش دەکەن.

ناتوندو تیژی بەپێی ڕێبازەکەی گاندی ستراتیژێك نیە بۆ چارەسەرکردنی ململانێکان، چەکێکیش نیە لەکاتی پێویستدا بەکاربهێنرێو لە کاتێکیشدا کە پێویست نەبێ ئافەرۆز بکرێ. بەڵکو ڕێبازێکە بۆ ژیان، چ وەك هەڵوێست و چ وەك جیهانبینی، کە پێویستە ئادەمیزاد تیایدا بژیو ڕەفتاری پێ بکات، پێی بیربکاتەوە. ناتوندوتیژی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێ دان بەوەدا بنرێ کە هەر کەسێك لایەنی چاکەی تێدایەو دەبێ وا لەو لایەنە بکرێ گەشە بکات تا بتوانرێ بەسەر "خراپە" (تووڕەییو توندوتیژی)دا زاڵ بێت. کاتێ تەمەنم دوانزە ساڵان بوو؛ گاندی فێری ئەوەی دەکردم کە تووڕەیی وەکو کارەبا سوودمەندو بەهێزە، بەڵام تەنها کاتێ کە بە زیرەکیو وریاییەوە بەکارمان هێنا. پێویستە لە سەرێشمان فێربین چۆن ڕێز لە تووڕەیی دەگرین، بەو شێوەیەی ڕێز لە کارەبا دەگرین.

توندوتیژیش لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا وەکو توندوتیژی لەهەر شوێنێکی دیکە؛ خۆی لەو ڕق و پێشێلکردنی ماف و خۆپەرستیەدا دەردەخات کە لەناو ناخی هەموومواندا هەیە. ئەو هەڵوێستە سەلبیانەی پەیوەندییەکانمان دیاری دەکەن ڕوحیەتمان دەناسێنن. ئەو کێبەرکێیەی لە ئاینەکانماندا ئەنجامیمان داوە؛ ئەو تۆوی توندوتیژییەی لەناو خۆیدا هەڵگرتوە کە تانوپۆی ژیانی ئەمڕۆمان تێك و پێك

ناتوندوتیژی بە پێی ڕێبازەکەی گاندی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە پێویستە پەیوەندی نێوان تاکە کەسەکان و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش لەسەر بنچینەی پرنسیپە ئیجابیەکان بێت؛ وەك: ڕێز، لێکدی گەیشتن، یەکدی قبوولکردن...

دەدات. ئایا ئەم کێبەرکێیە قابیلی گۆڕینە؟ گاندی وتوویەتی هیچ شتێك نیە لەم دونیایەدا بەدیهێنانی ئەستەم بێت؛ بە مەرجێ ئیرادەی ئەنجامدانیمان هەبێت. ئێمە لە ڕووی مێژووییەوە هەڵەی گەورەمان کردووە، لە هەمووشیان وێرانکەرتر دابەشبوونی ئاینیی هەندێ دەوڵەتی وەکو ئێرلەندەو هیندستان و فەلەستین ئیسرائیل بوو. ئەم دابوشبوونانە لەسەر ئاستێکی زۆر گەورە بوونە مایەی ڕق و دان نەنان بە مافی یەکترداو توندوتیژیو کۆمەڵێك شتی سەلبیی تری وا زۆر کە خەریکە کۆتایی مەنتیقی دەبەزێنن.

بە ماوەیەکی کەم بەر لە کوشتنەکەی گاندی لە *30*ی کانونی دووەمی *1948*دا لێیان پرسی: "چارەسەری کێشەی فەلەستین چیە؟ وەڵامی دایەوە: "ئەم کێشەیە وای لێهاتوە کە پێدەچێت چارەسەرکردنی ئەستەم بێت، من ئەگەر جوولەکە بوومایە پێم دەوتن: هیچ و پووچ مەبن و پەنا مەبەنە بەر تیرۆر. پێویستە جوولەکەو عەرەب پێکەوە کۆك بن، هاوڕێ بن، پشت بە یارمەتیی بەریتانیاو یارمەتیی ئەمریکا نەبەستن، بەڵکو تەنها بەوەی کە لەلای خوداوە دێ".

گەر ئەوساو لە ساڵی *1948*دا چارەسەرەکەی قورس بووبێت، ئەوا ئێستا گەلێ قورسترە؛ گەرچی ئەستەم نیە.

لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیشدا، هەروەکو چۆن لە هیندستان و ئێرلەندەشدا؛ پرسیارەکە ئەوەیە: بەلای هەریەکەوە ئامانج چیە؟ فەلەستینیەکان و ئیسرائیلیەکان هەوڵیان دا لە ڕێی توندوتیژیەوە یەکتری سەرکوت بکەن و بگرە یەکتری بشفەوتێنن، کە ئەمە کارێکی هەم نالۆژیکی و هەم نامرۆییشە. چارەسەری نموونەییش ئەوەیە کە ئەو لایەنانە پەیڕەوی لە شێوازێکی مرۆییتر بکەن. هەروەکو "گاندی"یش دەڵێت: گەلان لە نێوان خۆیاندا دەبن بە هاوڕێو چارەسەری قایلکەر بۆ هەموان دادەنێن و پێکەوە وەکو هاوڕێ دەژین.

لەبەرئەوەی زۆر لە مێژیشە گەلان لە یەك دوورکەوتوونەتەوە، هەربۆیە نزیك کردنەوەیان لە یەکدی لە ڕووی کردەییەوە ئەستەمە. زۆرجار یەکخستنەوەی ئەڵمانیا بە نموونە دەهێننەوە؛ بەڵام دابەشکردنی بۆ خۆرهەڵات و خۆرئاوا دابەشکردنێکی ئایدیۆلۆژی بوو؛ نەك ئاینی. کاتێ ناکۆکیە ئایدیۆلۆژیەکانیش لە نێوان هەردوولادا چارەسەرکران، یەکبوونیان ئاسان بوو.

ناکۆکیە ئاینیەکانیش وا بە ئاسانی لە یەکدی نزیك ناکرێنەوە، تەنها دەبێ ڕێزلێگرتن لە نێوانیاندا هەبێت، هەر بۆیە یەکبوونی دوو ئاینی جیاواز کە کەرت کەرت بوون؛ قورسترە. دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاویش نایەتە ئاراوە؛ تەنها ئەوکاتە نەبێ کە ئەو دوو گەلەی ئەو دوو وڵاتە ناکۆکە بڕیارئەدەن نەبن بە داشی دامەی دەست سیاسەتەکانی هێزە نێودەوڵەتیەکان.

ناکۆکیە ئاینیەکانیش وا بە ئاسانی لە یەکدی نزیك ناکرێنەوە، تەنها دەبێ ڕێزلێگرتن لە نێوانیاندا هەبێت، هەر بۆیە یەکبوونی دوو ئاینی جیاواز کە کەرت کەرت بوون؛ قورسترە

مادامەکی دەوڵەتە خۆرئاواییەکانیش، بە تایبەتی وڵاتە یەکگرتوەکان؛ لە پێناوی ئامانجە تایبەتیەکانی خۆیاندا دەوڵەتی لە خۆیان بچووکتر دەچەوسێننەوەو، مادامەکی گەلانی ئەو وڵاتە چەوساوانەش ڕێ نەدەن کە بچەوسێنرێنەوە، چارەسەرەکە ئەستەم دەبێت.

گاندی وتوویەتی سیاسەت بەبێ پرنسیپ گوناهێکی کوشندەیەو توندوتیژی بەرهەمدێنێت. تا لە ڕێی ئاکارو بەهاو سۆزیشەوە حوکم نەدەین؛ ئەوا توندوتیژی هەر تواناى ژیانمان دەپڕووکێنێت. لەم دواییەدا پۆستەرێکم بەسەر ماشێنێکەوە بینی کە بە کورتی گوزارشت لەم حەقیقەتە دەکات؛ نووسرابوو:

"کاتێ گەلان ڕێبەرێتیان کرد؛ ئەوسا سەرکردەکان دوای ئەوان دەکەون".*

## سەرچاوە

پاشکۆی "تیارات"ی "الحیاة" ژمارە *11433*ی ڕۆژی یەکشەممە *25*ی نۆڤەمبەری *2001*



## جۆرج تەرابیشی

# کاتێ ڕژێمە دیکتاتۆریەکان دڕندە دەبن!



و: شاهۆ سەعید

پێگەی سەدەی بیستەم لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، پێگەی سەدەیەکە زۆرترین کاری توندوتیژی تێدا ئەنجامدراوە. بە تایبەتی لە نیوەی یەکەمیدا کە سووتەمەنیە خوێناویە ترسناکەکانی جەنگە جۆراوجۆرەکان (هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم، جەنگە کۆلۆنیالیەکان، جەنگە ناوخۆییەکان و جەنگە ئایدیۆلۆژیەکان) چەندین ژمارەی پێوانەیی تۆمارکرد، بەلام لە سەرەتای نیوەی دووەمی هەمان سەدەوە گۆڕانکاریەکی لەبەرچاو تێبینی دەکرێ سەبارەت بە هەستیاری لە ئاست توندوتیژیدا. ئیتر توندوتیژی عادلانە بووبێت یان زاڵمانە، خۆی لە خۆیدا بۆتە بەهایەکی سووک.

ڕەنگە هیچ شتێك وەك بەراوردکاری لە تیوریزەی سیاسی نێوان نیوەی یەکەم و نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، پێودانگی ڕاستەقینەی/ ئەو گۆڕانکاریە نەبێت سەبارەت بە هەستیاری لە ئاست توندوتیژیدا

سەدەی بیستەم، کە زیاتر لە سەد هەزار قوربانی پێشکەش بە قەسابخانەی توندوتیژی کردوە، توشی جۆرێك لە دڵتێکەڵان بوە، وەك ئەو کەسەی ئینتەلای کردبێ و هەست بە قێزکردنەوەو بێزاری بکا. ئەڵبەتە ئەم هەستکردنە نێگەتیڤانەیزە پاشخانی گەشەکردنی ئەو بەها پۆزەتیڤەیە کە خۆی لە دیموکراسیدا دەنوێنێ و لە کۆتایی سەدەی بیستەمەوە، بە تایبەتی لە دارمانی کۆمەنیزمەوە، بۆتە بەهایەکی گەردوونی، خودی ئەو دارمانەش بەڵگەی /ئەو ڕاستیە بوو/.

ڕەنگە هیچ شتێك وەك بەراوردکاریی لە تیوریزەی سیاسی نێوان نیوەی یەکەم و نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، پێودانگی /ڕاستەقینەی/ ئەو گۆڕانکاریە نەبێت سەبارەت بە هەستیاری لە ئاست توندوتیژیدا. لە نیوەی یەکەی ئەو سەدەیەدا چەمکی لینین و ترۆتسکی و مارکسیزم بە گشتی سەبارەت بە زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانەو ڕۆڵی توندوتیژی لە مێژوودا، چەمکێکی باڵادەستی بێ ڕکەبەربوو، تا ئەو ئەندازەیەی ژەنەراڵێکی ئەڵمانی وەك کلاوزڤیتس /لە تیۆریزەکردندا بۆ توندوتیژی/ بە جۆرێك پەرگیری نواند کە جەنگی وەك دۆخێکی سروشتی لە قەڵەم دا، ئەو پێی وابوو "جەنگ بەردەوامیدانە بە سیاسەت بە شێوازی تر". بەڵام لە نیوەی دووەمی هەمان سەدەدا خانمە فەیلەسوفێکی وەك هانا ئارێنت -کە ئەویش هەر ئەڵمانیە- بێ هیچ دوودڵیەك پێی وایە کە دەسەڵاتی دیموکراتی دەسەڵاتێکی دژە زەبروزەنگە، تا ئەو ئەندازەیەی بۆ ئەو دەسەڵاتە نیە، لە ڕووی پرەنسیپەوە، پەنابەرێ بۆ هیچ جۆرە زەبروزەنگێك، بە زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانەشەوە، کە لە ناخی خۆیداو بە هۆی پەیڕەوکردنی زەبروزەنگەوە، هەڵگری بەکتریای هەڵگەڕانەوەی دەسەڵاتە شۆڕشگێڕەکانە بۆ دەسەڵاتی تۆتالیتاری.

لە ڕاستیدا کۆتایی کۆمۆنیزم، هەروەك لە فیکری سیاسی هاوچەرخدا تێبینی دەکرێ، لە بنەڕەتدا مانای "کۆتایی ئەفسانەی کۆمەڵگایەکی تازە لە منداڵی توندوتیژییەوە. /هەروەها کۆتایی/ ئەو باوەڕەی کە پێی وابوو ڕێگای پێشکەوتن بریتیە لە "لەناوبردنی تەیارو سڕینەوەی بەرامبەر"، هەر لە چوارچێوەی قێزکردنەوە لە زەبروزەنگ و تەماشاکردنی وەك دیاردەیەك کە لە جەوهەریدا دژ بە ڕەوتی گەشەی دیموکراسیە، ئێستە لە فیکری سیاسی هاوچەرخدا(*)، سەرلەنوێ بەها دەگەڕێتەوە بۆ چەمکی "بەرەنگاری مەدەنی" وەك چەمکێکی چالاك کە هێشتا تەلاق نەدراوە، لە پرۆسەی درزبردن بە ڕژێمە دیکتاتۆریەکانداو ناچارکردنی زۆردارەکان تا باروبارگەیان بپێچنەوەو کۆچ بکەن، /بە تایبەتی/ دوای ئەوەی لە زۆر حاڵەتی جیاوازدا بە ئەزموون ئەوە ساغ بۆوە کە ڕوخاندنی دیکتاتۆریەت بە زەبروزەنگ، هیچی لێناکەوێتەوە جگە لە دیکتاتۆریەتێکی دیکە -ئاڵتەرناتیڤ.

ئەندرێ زاخارۆف (کە بەرهەڵسەتکارێکی سیاسی بوو) لە دەسەڵاتی سۆڤێتی پێشوو جیابووبۆوە، لە ساڵی *1978*-ەوە، شێوازێکی تری خستەڕوو. بۆ دروستکردنی مێژوو: "هەموو ئەو ڕەوتە ئۆپۆزسیۆنانەی کە ناسیومن خاڵێکی هاوبەش هەموویان کۆدەکاتەوە: خەبات بە شێوەیەکی ئاشکرا، بەرگریکردنی گشتی دوور لە زەبروزەنگ لە مافەکانی مرۆڤ. ئەمەش ئەو ئایدیۆلۆژیایەیە کە لە وڵاتی ئێمەدا هەموو ئەو کەسانە کۆدەکاتەوە، یان دەکرێ کۆیان بکاتەوە، کە خاوەنی ئاسۆی سیاسیو نەتەوەییو ئاینی جیاوازن".

وەك هەر چەمکێکی نوێ، خەسڵەتی یەکەمی بەرەنگاریی مەدەنی، کە سەلماندی خاوەنی چالاکییەکی پڕبەهایە، لە درزپێهێنانی ڕژێمە دیکتاتۆرو تۆتالیتارەکاندا، سەرەتا لە ئەورووپای باشور لە حەفتاکانداو دواتر لە ئەورووپای ناوەڕاست و ئەمریکای لاتینی لە هەشتاکاندا، بریتیە لەو فرەییە لە ناونانی ئەو چەمکەدا: جگە لە "بەرەنگاریی مەدەنی"، هەندێکیان ناویان نا "بەرەنگاریی ئاشتیخوازانە" و هەندێکیشیان ناویان نا "شۆڕشی بێ زەبروزەنگ"، لای هەندێکی تریشیان ناوی "شۆڕشی ئەرمونیان-مەخمەڵی"ی لێنرا، بەڵام سەرەڕای جیاوازی لە ناونانی ئەو چەمکەدا، ئەوەی کە تا ئاستێکی زۆر بەرەنگاری مەدەنی لە ڕووی ناوەڕۆك و شێوازی کارکردنەوە لە /جۆرەکانی تری بەرەنگاری/ جیادەکاتەوە ئەوەیە کە "مەبەستی نیە شت لە دیکتاتۆرەکان بستێنێ، هێندەی مەبەستێتی هیچیان پێ نەبەخشێ". ئەمە بەو مانایە نا کە بەرەنگاری مەدەنی بەرەنگارییەکی ڕەتکەرەوەی پەتیە. ئەڵبەتە شایستەی ئەوەیە کە پێناسەی بکەین بە "توانای ڕەتکردنەوەو، وتنی نا"، هەروەها ئامرازی سەرەکی ئەو بەرەنگارییە ڕەتکردنەوەی هاریکاریە، بە تایبەتی لە ڕێگای یاخیبوونی مەدەنیو خۆپیشاندان و گردبوونەوەی بێدەنگ و مانگرتن لە خواردن، بەڵام لە هەمان کاتدا لەسەر بنەمای جەمسەرێکی ئیجابی /قبوڵکردن/یش دامەزراوە بەوەی جەخت لەسەر هەمان ئەو شوناس و هەمان ئەو مەشروعیەت و هەمان ئەو بەها جیاوازانە دەکا کە بەرامبەرە دیکتاتۆرەکە پەنای بۆ دەبا. بەم مانایە، بەرەنگاری مەدەنی بەرلەوەی بەرەنگارییەکی سیاسی بێت، بەرەنگارییەکی کلتورییە، واتە لە بری ئەوەی پەنا بۆ کاری سیاسی ڕاستەوخۆ بەرێ، سیمبول دەخاتەگەڕو ڕەگ لە مێژوودا دائەکوتێو شێوازی نوێی ژیان پێشنیار دەکا. ئەم بەرەنگارییە گرەو لەسەر ئەو ئیفلیج بوونە دەکا کە ساتێك لە ساتەکان گەماڕۆی دەسەڵات دەدا، دوای ئەوەی گومانی لا دروست دەبێ لەوەی کە بتوانێ لە دەسەڵاتی حوکمدا بەردەوام بێت، یان کاتێ کە ڕۆحی بەزین باڵ بەسەر دیکتاتۆرەکاندا دەکێشێ، ئیتر پێشتر ڕۆحی خۆ بە گەورە زانینیان لەهەر ئاستێکدا بووبێ، کاتێ خۆیان لە بەردەم ئیجماعی گشتیدا دەبیننەوەو (هەست بە بەزین دەکەن).

بەرەنگاری مەدەنی بەرلەوەی بەرەنگارییەکی سیاسی بێت، بەرەنگارییەکی کلتورییە، واتە لە بری ئەوەی پەنا بۆ کاری سیاسی ڕاستەوخۆ بەرێ، سیمبول دەخاتەگەڕو ڕەگ لە مێژوودا دائەکوتێو شێوازی نوێی ژیان پێشنیار دەکا

ئەگەر سروشتی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان، بە تایبەتی ئەگەر تۆتالیتاری بن، ئەوە بخوازێ کە کۆمەڵگای مەدەنی لاواز بکەن، یاخود هەر بیسڕنەوە، ئەوا بواری کاری بەرەنگاریی مەدەنی ئەو پەراوێزە بەرتەسکەیە کە دیکتاتۆریەت ناچارە بەجێی بهێڵێ، نیتر ئەو دیکتاتۆریەتە چەندە تۆتالیتاریش بێت، بۆ بزاوتی کۆمەڵگای مەدەنی. لە ڕاستیدا تەنانەت لەو دۆخەشدا کە دەسەڵات بە تەواوی دەست بەسەر کۆمەڵگای مەدەنیدا دەگرێ، گرنگترین ئەرکی بەرەنگاریی مەدەنی بریتییە لە سەرلەنوێ دروستکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی، لە قۆناغی یەکەمدا دروستکردنەوەیەکی ڕەمزیو لە قۆناغەکانی تردا دروستکردنەوەیەکی عەمەلیو لە داو قۆناغیشدا دروستکردنەوەیەکی سیاسی. بلیمەتی میللەتانیش لەم بوارەدا بێسنورە. بەرەنگاریی نەتەوەیی کە شایستەی ئەوەیە بەردەوام فۆرمی چاوەڕوان نەکراو وەرگرێ، دواجار- لانی کەم لە کاتی سەرکەوتنیدا- گوزارشت لە "هێزی لاوازەکان" دەکاو دەسەڵاتی ئەو کەسانە بەرجەستە دەکا کە /بێدەسەڵات/ن.

بەرەنگاریی مەدەنی خاوەنی هیچ یاسایەکی سۆسیۆلۆجیی نیە، بەڵکو سەرکەوتن یان شکستی ئەو بەرەنگاریە، هەموو جارێك بەندە بە سروشتی ئەو دۆخە تایبەتەوە کە لە هیچ دۆخێکی تردا خۆی دووبارە ناکاتەوە. زانستی کۆمەڵناسی سیاسی چوار فاکتەری خستۆتەڕوو کە ڕەنگە گەشە بەو بنیاتە چالاکانە بدەن کە بەرەنگاریی مەدەنیان لێدەکەوێتەوە.

یەکەمین فاکتەر، فاکتەری ئاینیە، حاڵەتەکانی ئێران و پۆڵۆنیاو فلیپین ئەم ڕاستیەیان دەرخست. فاکتەری ئاینی دەکرێ سەرچاوەیەکی سەرەکیی پێکەوەلکانی کۆمەڵایەتی بێت دژی ستەمکاریی سیاسی، بە تایبەتی لە هەلومەرجێکدا کە تۆتالیتاریەت هەوڵدەدا لە ڕێگای ڕەتکردنەوەی فاکتەری ئاینیەوە جێپێی خۆی قایم بکا، وەك ئەوەی لە سیستمە کۆمۆنیستەکاندا بینرا. بەڵام ئاین-یش ڕۆڵی پۆزەتیڤی خۆی ناگێڕێ وەك فاکتەرێکی دامەزرێنەری پێکەوەلکانی مەدەنی لە کۆمەڵگایەکدا کە لە ڕووی ئاینیەوە دابەش بووبێ بەسەر چەند گروپ و مەزهەبێکدا. لە هەلومەرجێکی وادا، خودی ئاین دەبێتە بوارێك بۆ ململانێو داینەمۆیەك بۆ بەرهەمهێنانی زەبروزەنگ. هەروەکو هەردوو نمونەی پۆڵۆنیاو فیلیپین-یش دەریانخست،، ئەو ڕۆڵەی کە ئاین دەیگێڕی لە هەڵوەشاندنەوەی ڕژێمە تۆتالیتارەکاندا دەبێ بەندبێت بە بەرەنگارییەکی ترەوە، بەرەنگاری ئەو فریوەی خودی فاکتەری ئاینی، تاکو نەبێتە فاکتەرێکی تۆتالیتاری. وەك لە نمونەی ئێراندا ڕوویدا. ڕەنگە لە پۆڵۆنیاش ڕووبدا ئەگەر ململانێی سیاسی بە بەرژەوەندی چەند ناوەندێکی ئاینی توندڕەودا بشکێتەوە، کە بڕوایان وابوو کەنیسەی کاتۆلۆکی کاندیدی گرتنە دەستی دەسەڵاتە لە دوای دەسەڵاتی کۆمۆنیستیەوە.

ئەگەر سروشتی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان، بە تایبەتی ئەگەر تۆتالیتاری بن، ئەوە بخوازێ کە کۆمەڵگای مەدەنی لاواز بکەن، یاخود هەر بیسڕنەوە، ئەوا بواری کاری بەرەنگاریی مەدەنی ئەو پەراوێزە بەرتەسکەیە کە دیکتاتۆریەت ناچارە بەجێی بهێڵێ

دووەم فاکتەر، فاکتەری ئەخلاقیە: هەرچەندە ئەم فاکتەرە تا دوێنێیەکی نزیک هەڵگری خەسڵەتێکی ئایدیاڵی بوو، واتە خاوەنی چالاکی /واقعی/ نەبوو، بەڵام لە سێ دەیەی ڕابردوودا پێگەی مەرکەزی خۆی لە بزاوتەکانی بەرەنگاریی مەدەنیدا وەرگرتوە، دوای ئەوەی جەختی لەسەر ئایدیۆلۆژیی مافەکانی مرۆڤ کردوە. بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە مافی مرۆڤ خۆی وەك بەهایەکی گەردونی دەنوێنێ، دەکرێ بخرێتەگەڕ وەك شورایەکی پارێزەر دژی ستەمکاریی دەوڵەتی نەتەوەیی. کاتی خۆی، سەروەریی نەتەوەیی /دەبووە بەهانەی/ دەسەڵاتە نیشتمانیە سەرکوتکەرەکان وەك ئاڵتەناتیڤی دەسەڵاتە گەندەڵەکان، بەڵام هاوکات لەگەل (بڵاوبوونەوەی) مافەکانی مرۆڤ و، گەڕانەوە بۆ دەقە یاساییە نێونەتەوەییەکان، دەکرێ کەلێن و درز بخرێتە بەهێزترین سیستمی دیکتاتۆرییەوە. لێرەوە گوتاری مافەکانی مرۆڤ هەڵگری خەسڵەتێك یاخود خاڵێکی بەهێزە: یان بە مانایەك لە ماناکان گوتارێکی دوو لایەنە. واتە لە بنەڕەتدا گوتارێکی ئاڕاستەکراو نیە دژی دەوڵەت، چونکە بە هەمان ئەو ئەندازەیەی داوا لە دەوڵەت دەکا لێپرسراوێتی خۆی پراکتیزە بکا، دان بە دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەشدا دەنێ، بەڵام بەو پێیەی ئەو دەوڵەتە لە واقعی پراکتیکیدا ڕێز لە مافی تاکەکان ناگرێ، ئەوا جەختکردن لەسەر مافەکانی مرۆڤ نیشانەی پرسیار دەخاتە سەر ڕەوایەتی ئەو دەسەڵاتە. بەهەرحاڵ پەرۆشی هەر دەوڵەتێکیش بۆ پاراستنی ڕەوایەتیو دوورخستنەوەی هەر گومانێك لە خۆی، ناچاری دەکا لە ڕووی تیۆرییەوە ئەو گوتارە قبوڵ بکا، تەنانەت گەر بە کردەوە پێشێلیشی بکا، بەڵام لەو پەراوێزە بەرتەسکەی کە دەکەوێتە نێوان تیۆرەو پراکتیکەوە، دەکرێ ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ جێپێیەك بۆ خۆیان بدۆزنەوە، با لە سەرکوتکەرترین ڕژێمیشدا بێت.

سێیەم فاکتەر، فاکتەری ڕاگەیاندنە: هاوزەمان لەگەڵ شۆڕشی نوێ لە بواری هۆکانی گەیاندندا، سەروەریی نەتەوەیی هیچ دەوڵەتێك هاوشان نیە لەگەڵ سەروەریی ئیعلامیدا. واتە چەند دەوڵەتە سەرکوتکەرەکان سنورەکان بەسەر خۆیاندا کلۆم بدەن، دواجار ڕووبەرێکی کراوە لە بەردەم گەشەی ئۆپۆزیسیۆنی ناوخۆدا دەمێنێتەوە بۆ بەزاندنی سانسۆری سنورە نەتەوەییەکان، لە ڕێگای پەیوەندی بە هۆکانی ڕاگەیاندنی جیهانییەوە، تەنانەت گەر هۆکانی ڕاگەیاندنی دەرەکی لە دەوڵەتێکی سەرکوتکەردا ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆش نەبینێ لە خەملاندنی ئۆپۆزیسیۆنی مەدەنیدا، ئەوا ئامادەیی جیهانی دەرەکی خۆی لە خۆیدا دەستەبەری ئەوە دەکا کە پەراوێزەکان بۆ دواجار دانەخرێن. ڕاستە ڕەنگە ئەو دەوڵەتە تەشویش بخاتە سەر ئێزگە دەرەکییەکان و سەتەلایت قەدەغەبکا، بەڵام گەشەی بەردەوامی تەکنەلۆژیای هۆکانی ڕاگەیاندن چارەسەر بۆ هەموو تەگبیرێکی دژ بە پێشکەوتنی ڕاگەیاندن دەدۆزێتەوە. ئەڵبەتە

بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە مافی مرۆڤ خۆی وەك بەهایەکی گەردونی دەنوێنێ، دەکرێ بخرێتەگەڕ وەك شورایەکی پارێزەر دژی ستەمکاریی دەوڵەتی نەتەوەیی

بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە پەیوەندی نێوان کەسی سیاسیو کەسی عەسکەری پێگەی دڵ لە کێشەی بەرەنگاریی مەدەنیدا داگیردەکا، دەشێ ڕەوایەتی دەستوری، تەوزیف بکرێ وەك تەکنیکێکی دژ بە کودەتاگێڕی

ئاشکراشە کە ڕژێمە سەکوتکەرەکان ناتوانن بیر لەوە بکەنەوە کە ئامێری ڕادیۆو تەلەفزیۆن قەدەغەبکەن، چونکە لە ڕێگەی ئەو ئامێرانەوە ژیان بە بەر خۆیاندا دەکەنەوە. واتە هەمیشە بوارێك بە کراوەیی دەمێنێتەوە لە بەردەم دزەکردن لە دەرەوە بۆ ناوەوە، هەروەها لە ناوەوە بۆ دەرەوە. بە مانایەکی تر، چیدی هیچ دەسەڵاتدارێك بە ڕەهایی لەناو شاشەی تەلەفزیۆنەکاندا نامێنێتەوە: ئیدی سەرکوتکردن لە دۆخێکی وادا پێویستی بە چوونە دەرەوە هەیە.

دواهەمین فاکتەر، فاکتەری ڕەوایەتی سیاسیە، بەڵام ئەم فاکتەرە هەڵگری کاردانەوەیەکی پێچەوانەشە. لە ڕێگای پاراستنی دیموکراسیەتی تەڕو لاسك نەرمەوە ڕۆڵی خۆی دەگێڕێ نەك لە ڕێگای درزخستنە شورای ڕژێمە دیکتاتۆرەکانەوە. بە مانایەکی تر، هەندێ جار ڕەوایەتی سیاسی ڕۆڵی لەمپەرو ڕێگری بەردەم پرۆژەی کودەتا سەربازیەکان دەگێڕێ لە ڕژێمە دیموکراتیە تازە لە دایکبوەکاندا. بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە پەیوەندی نێوان کەسی سیاسیو کەسی عەسکەری پێگەی دڵ لە کێشەی بەرەنگاریی مەدەنیدا داگیردەکا، دەشێ ڕەوایەتی دەستوری، تەوزیف بکرێ، بە تایبەتی لە دۆخی ژانگرتنی دیموکراسیدا، وەك تەکنیکێکی دژ بە کودەتاگێڕی. دیارترین نمونەش لەمبارەیەوە ئەو ڕۆڵە شەخسیە بوو کە "خوان کارلۆس"ی پادشای ئیسپانیا گێڕای، وەك هەڵگری ڕەوایەتی تاجی شاهەنشاهیو فەرماندەی باڵای هێزە چەکدارەکان، کاتێ هەوڵێکی کودەتای شکست پێهێناو لە 23ی شوبات- فیبرایەری 1981دا سوپای وڵاتەکەی ناچارکرد بگەڕێتەوە بارەگاکانی خۆی. ئەو ڕۆژە سوپا تەلاری پارلەمانی دگیرکردبوو، پارلەمانتارەکانی دەستبەسەر کردبوو، هەوڵیدەدا بۆشاییەك لە دەسەڵاتی مەدەنیدا دروست بکا. بێ هیچ وردەکارییەکی مێژوویی، هێندە بەسە ئاماژە بدرێ بەو بەیاننامەیەی کە سەعات یەکی سەرلەبەیانی 24ی شوبات- فێبرایەر خوان کارلۆس پێشکەشی گەلی ئیسپانیای کردو تیایدا پشتیوانی خۆی بۆ سیستمێکی دەستوری لە چوارچێوەی ئەو شەرعیەتەی کە هەیە ڕاگەیاند، ئەو بەیاننامەیە بەس بوو بۆ ئەوەی کودەتاچیەکان لە سنوری خۆیاندا ڕابگرێ، لە کاتێکدا ئەوان ناوی کارلۆس-یان کردوە بە بەهانەیەك بۆ کودەتاکەیان. بۆریس یەڵتسن لە دژایەتیکردنی کودەتاچیەکانی 19 ئاب- ئۆگەستی 1991دا نمونەیەکی دیکەی پێشکەشکرد سەبارەت بە توانای ڕەوایەتی دەستوری، لە بەرەنگاریی تانکی کودەتاچیەکاندا. هەر لە سەعاتەکانی یەکەمی هەوڵی کودەتاکەوە، یەڵتسن-یش سواری پشتی تانکێك بوو، بەوپێیەی سەرۆکی هەڵبژێرراوی فیدراسیۆنی ڕوسیا بوو، بانگەوازێکی ئاراستەی گەلی مۆسکۆ کرد بۆ بەرەنگاری. هەرچەندە ئەو خاوەنی هیچ هێزێکی فیعلی نەبوو، بەڵام دەستپێشخەریە

شەخسیەکەی‌و دەرکەوتنە ئیعلامیەکەی بەس بوون بۆ ئەوەی ڕەوایەتی ئەو سیستمە تازە پێگەیشتوە لە بەرامبەری ناڕەوایەتی کودەتاگێڕەکاندا بچەسپێنێ، بەڵام ئەوەی پێویستە تێبینی بکرێ، ئەوەبوو ڕەوایەتی سەرۆکایەتی یەڵتسن کە لە شکستی کودەتاچیەکاندا گەیشتە لووتکە، خۆی لە خودی خۆیدا پووکایەوە. ئەو پووکانەوەیە لە تشرینی یەکەم- ئۆکتۆبەری *1993*دا گەیشتە لوتکە کاتێ خودی یەڵتسن پەنای برد بۆ چەك و تۆپی تانك لە ڕووبەڕووبوونەوەدا لەگەڵ ڕەوایەتیی ئەو پارلەمانتارە رووسانەدا کە لە تەلاری پارلەماندا مانیان گرتبوو. ئەو پووکانەوەیەی ڕەوایەتی یەڵتسن لە سەردەمی ئێستادا، کە هەستیارییەکی باڵای دژ بە زەبروزەنگی هەیە، پرسیارێك دەخاتەڕوو: ئایا پەنابردن بۆ هێز، تەنانەت لە لایەن دەسەڵاتێکی خاوەن ڕەوایەتیشەوە بێت، لە قۆناغێکی داهاتوتردا ڕەوایەتی لەو دەسەڵاتدارێتیە ناسەنێتەوە؟ چونکە زەبروزەنگ لە خودی خۆیدا پووکێنەرێ ڕەوایەتیە. لێرەوە، پێویستە هەمیشە ڕووبەرێك لە نێوان ڕەوایەتی تیۆریی زەبروزەنگ و پەنابردنی کردەیی بۆ ئەو زەبروزەنگە بمێنێتەوە. کاتێ مەسەلەکە پەیوەندی بە خوێنەوە دەبێت، ئەوا مەرج نیە ڕەوایەتی ڕەوایتیەتی ئەخلاقی بێت، یان وردتر ڕەوایەتیەکی جوان بێت. لە سەردەمێکدا کە هەستیاریی سەردەم، لە وێنە گەڕۆکە بینراوو بیستراوەکاندا، /بەرامبەر توندوتیژی/ لە بەرجەستەبووندایە.

> ئایا پەنابردن بۆ هێز، تەنانەت لە لایەن دەسەڵاتێکی خاوەن ڕەوایەتیشەوە بێت، لە قۆناغێکی داهاتوتردا ڕەوایەتی لەو دەسەڵاتدارێتیە ناسەنێتەوە؟

## پەراوێز

**Jacques Semelin (Ed.) Quand les dictatures se fissurent, Paris, Editions Desclee de Brouwer, 1995.*

## سەرچاوە

جورج طرابيشى، عندما تتصدع الدكتاتوريات- في ثقافة الديمقراطية. _ط *1*؛ بيروت: دار الطليعة، *1998*)، ص *129-135*.

ن: لەیلا عەبدولوەهاب

# توندوتیژیی خێزانی


فرانشیسکۆ دی گۆیا

و: ڕۆشنا ئەحمەد

کاتێك دەست بە تۆژینەوەی هەر دیاردەیەك، یان هەر گرفتێکی کۆمەڵایەتی دەکەین، پێویستە سەرەتا گرنگترین ئەو چەمکە تەوەرەییانە دیاری بکرێن و پێناسەبکرێن کە تۆژینەوەکەی لە بارەوە ئەنجامدەدرێت، ئەمەش هەنگاوێکی گرنگ و پێویستە بۆ دیاریکردنی گرفتەکە لەگەڵ ئەو ڕوانینە تیۆری‌و پیادەکردنە میتۆدییانەی کە پێوەی بەندەو یاریدەدەرن بۆ گەیشتن بە ئاکامی وردتر دەربارەی تایبەتمەندیەکانی گرفتەکەو هەموو ئەو پەیوەندیە ناوخۆیی یان دەرەکیانەی پێوەی بەندن.

کاتێ لە بابەتی ئەم تۆژینەوەیەی بەردەستمان ڕادەمێنین دەتوانین سێ چەمکی بنەڕەتی دیاریبکەین، کە تۆژینەوەکەیان لە بارەوە دەکەین، ئەو سێ چەمکە لە پەیوەندییەکی ئەندامیدا پێکەوە بەستراون، لە کاتێکدا جیاکاری لە نێوانیاندا دەگەڕێتەوە بۆ پێداویستیەکانی تۆژینەوەیەکی زانستی، چەمکەکانیش بریتین لە:

*1*-توندوتژیی.

*2*-توندوتیژی خێزانی.

*3*-توندوتیژی دژ بە ئافرەت.

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی وەکو چەمك بڕوانینە توندوتیژی، ئەوا دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە پێناسەی بکەین:

"ئەو ڕەفتار یان ئەو کردەیەیە کە بە شەڕانگێزی دەناسرێت و لە لایەن کەسێکەوە یان کۆمەڵێکەوە یان چینێکی کۆمەڵایەتی یاخود لەلایەن دەوڵەتێکەوە پیادە دەکرێت، بە مەبەستی قۆستنەوەو ملکەچ پێکردنی لایەنێکی دیکە، لە چوارچێوەی پەیوەندی هێزێکی ناتەواو لە ڕووی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەوە، کە دەبێتە هۆی زیان پێگەیاندنی مادی یان ڕۆحی یان دەروونی کەسێك یان کۆمەڵێك یان چینێکی کۆمەڵایەتی یاخود وڵاتێکی دیکە"[1].

ئەگەر بمانەوێت ئەم پێناسەیە زیاتر ڕوونبکەینەوە، ئەوا وەکو ئاشکرایە هەموو کارێك کاردانەوەی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کاردانەوە کۆمەڵایەتیەکان جیاوازن لەو کاردانەوە سروشتییانەی کە دیاردە میکانیکی‌و دینامیکیەکان شیدەکەنەوە، واتە کاردانەوە کۆمەڵایەتیەکانی ئەو ڕەفتارەی بە توندوتیژی‌و شەڕانگێزی دەناسرێت بە شێوەیەکی میکانیکی ڕوونادات، چونکە چەندین هۆکاری کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیری‌و دەروونی هەن کە لە دیاریکردنی قەوارەو شێوەو چۆنیەتی‌و کاتی ڕوودانی کاردانەوەکەدا بەشداریدەکەن لای ئەو لایەنەی لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە قۆزراوەتەوەو چەوساوەتەوە، لەبەرئەوە یاسای کارو کاردانەوە بە تەنیا بۆ شیکردنەوەی چەمکی توندوتیژی بەس نیە، بەڵکو یاسای کەڵەکەبوون (التراكم) دەخرێتە سەری، کە بە هۆیەوە دەکرێت زۆربەی ئەو پەیوەندیانە شیبکرێنەوە کە لەسەر قۆستنەوەو چەوساندنەوە بنیادنراون و پەنا بۆ توندوتیژی دەبەن، هەندێك جار بە شێوەیەکی شاراوەو هەندێك جاریش بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا[2].

بەڵام ئەگەر بچینە سەر پێناسەو دیاریکردنی چەمکی توندوتیژی خێزانی، کە چەمکێکی سەرەکیە لەنێو بابەتی باسەکەماندا، دەبینین بەستراوە بە دامەزرێنەرەکەیەوە (خێزان) کە لە لایەن سیستمی کۆمەڵایەتیەوە بەڕێوەدەچێت و بە کۆنترین و ئاڵۆزترین سیستمی کۆمەڵایەتی دادەنرێت. ئەگەر پێناسەی پێشووی چەمکی توندوتیژی لە خێزاندا جێبەجێ بکەین، ئەوا دەکرێت بڵێیت:

"توندوتژیی خێزانیش یەکێکە لە شێوازەکانی ڕەفتاری شەڕانگێزی لە ئەنجامی پەیوەندیەکانی هێزی ناتەواو لە چوارچێوەی سیستمی دابەشکردنی کار لە نێوان ئافرەت و پیاو لە خێزانداو لە دیاریکردنی ڕۆڵ و پێگەی هەموو تاکێك لە

توندوتیژی، "ئەو ڕەفتار یان ئەو کردەیەیە کە بە شەڕانگێزی دەناسرێت و
لە لایەن کەسێکەوە یان کۆمەڵێکەوە یان چینێکی کۆمەڵایەتی یاخود لەلایەن دەوڵەتێکەوە پیادەدەکرێت،
بە مەبەستی قۆستنەوەو ملکەچ پێکردنی لایەنێکی دیکە

ئەندامەکانی خێزان، بە گوێرەی ئەو سیستمە ئابوریو کۆمەڵایەتیەی لە ئارادایەو کۆمەڵ دیاریکردوە"[۴].

سەرەڕای ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر خێزاندا هاتوە لە کۆمەڵگە نوێیەکانداو پاش کاریگەرییەکانی لەسەر شێوەو ڕۆڵ و وەزیفە کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیریەکان، کەچی ئەو پەیوەندیانەی لەنێو خێزاندا هەن، هێشتا بە بنەمای هێزە باوو ئاساییەکانەوە بەستراوە، کە پیاو تیایدا لە ڕووی ئابوریو کۆمەڵایەتیەوە لەناو کۆمەڵگاو خێزاندا بە تایبەتی باڵادەستە.

سەرەڕای ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر خێزاندا هاتوە لە کۆمەڵگە نوێیەکانداو پاش کاریگەرییەکانی لەسەر شێوەو ڕۆڵ و وەزیفە کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیریەکان، کەچی ئەو پەیوەندیانەی لەنێو خێزاندا هەن، هێشتا بە بنەمای هێزە باوو ئاساییەکانەوە بەستراوە، کە پیاو تیایدا لە ڕووی ئابوریو کۆمەڵایەتیەوە لەناو کۆمەڵگاو خێزاندا بە تایبەتی باڵادەستە

هەروا بە ئاسانی لە پەیوەندیەکانی هێز لەناو خێزاندا تێناگەین، ئەگەر شارەزای بنەمای هێزی کۆمەڵگا نەبین بە شێوەیەکی گشتی، ئەو بنەمایەی لە ڕێگەی ڕەوتی (نسق) بەهاو ڕۆشنبیریو ئاین و یاساوە زەمینە بۆ پەیوەندیەکانی کۆنترۆڵ کردن و قۆستنەوەی ئابوریو کۆمەڵایەتی خۆشدەکات لە کۆمەڵگەو خێزاندا بە شێوەیەکی تایبەتی، بەوپێیەی یەکێکە لە دەزگا بنەڕەتیەکان بۆ هێنانەدی جێگیربوونی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیەی لە گۆڕێدایە[۵].

ئەم مانایە جەخت لە سروشتی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و خێزان دەکاتەوە، لەگەڵ ئەوە دەوڵەت زۆربەی وەزیفە کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریەکانی خێزانی لە دەستدایە، بەڵام هیچ دژایەتیەکی سەرەکی لە نێوان دوو دەزگاکەدا ڕووینەداوە، بە تایبەتی لە شێوازی ئەو دەسەڵاتەی جیایان دەکاتەوە، هەریەک لە دەوڵەت و خێزان خاوەنی شێوازی دەسەڵاتی باوکسالارین کە بە کۆنترۆڵ و هەژموونی (باڵادەستی) کۆمەڵایەتیو سیاسی هەڵدەستن، لە لایەک دەوڵەت لە ڕێی کۆنترۆڵ و باڵادەستی چینێکی کۆمەڵایەتیەوە دەسەڵاتی خۆی بەسەر چینەکانی دیکەدا دەسەپێنێت، پیاویش لە لایەکی دیکەوە باڵادەستی خۆی بەسەر ژن و منداڵەکانیدا دەسەپێنێت، چ لەناو خێزاندا بێت، یاخود لە کۆمەڵدا بێت بە شێوەیەکی گشتی.

ئەمەش نکوڵی لە بوونی ئەو دژایەتیە لاوەکیە ناکات کە لە نێوان دەوڵەت و خێزانی کۆمەڵگەی نوێدا ڕوویداوە، بە هۆی ئەو گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیانەی چەند پەشێوییەکیان خستە نێو پەیوەندیە ئاساییو باوەکان و شێوەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتیەوە، هەروەها پەشێویان خستۆتە نێو ڕەوتی ئەو بەهایانەی پەیوەندیو شێوەکان بەڕێوە دەبەن، بە تایبەتی لە سایەی کۆمەڵگە پیشەسازیەکانی ئەوروپیدا کە خاوەنی پەیوەندیی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارین و نمونەی خێزانی ناوکییان (الاسرة النووية) هەیە، بە جۆرێک کە پەیوەندی کێشمەکێشی نێوان ئافرەت و پیاو ڕوونتر بۆتەوە، چ لە دەزگای خێزان و هاوسەرێتیدا، یاخود لە دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی دیکەی کۆمەڵگەدا[۶].

لە کاتی باسکردنی چەمکی توندوتیژی خێزان لە کۆمەڵگەکانی جیهانی سێیەمدا مەسەلە جیاوازە، ئەو کۆمەڵگەیانەی لە ڕابردووداو تا ئێستاش دوچاری شێوە جیاوازەکانی قۆستنەوەو کۆنترۆڵکردنی ئابوری‌و سیاسی هاتوون، لە سایەی سیستمی سەرمایەداری کۆلۆنیالیستی کۆن و نوێدا، کە کاری کردۆتە سەر گەشەسەندنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و ڕۆشنبیری ئەو کۆمەڵگانە، هەروەها لە خولقاندنی هەیکەل و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە شێواوەکاندا بەشداریکردوەو لە بونیادی خێزان و پەیوەندیەکانیدا ڕەنگی‌داوەتەوە.

تێڕوانینی بابەتی، لە بونیادی خێزانی کۆمەڵگەکانی جیهانی سێیەمدا، چەندین شێوەی خێزان ئاشکرادەکات، خێزانی ناوکی، خێزانی پێکەوە گرێدراو، خێزانی کشاو (ممتدة) هەیە، هەروەها لە چەند ناوچەیەکی جیهانی سێیەمدا خێزانی هۆزەکانیش دەبینرێت کە بیروباوەڕی خێڵایەتیان هەیە[6]. ئەمەش مانای ئەوەیە کە لە ڕووی میتۆدەوە گشتاندنی نمونەی خێزانی ناوکی نێو کۆمەڵگە ئەوروپیەکان بەسەر خێزانی جیهانی سێیەمدا هەڵەیە، چونکە خاوەنی خەسڵەت و میکانیزمی تایبەت بە خۆیەتی‌و لە شێوەو بابەتدا جودایکردۆتەوە لە خێزانی وڵاتە ئەوروپیەکان.

ئەو بارودۆخی دواکەوتوویی‌و پاشکۆیەتیەی کە کۆمەڵگەکانی جیهانی سێیەم بە دەستیەوە دەناڵێنن، بە شێوەیەکی چڕ باڵی کێشاوە بەسەر زۆربەی ئەو خێزانانەی لە حاڵەتی هەژاری‌و لەباری کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری دواکەوتوودا دەژین، جگە لە حاڵەتی چەوساندنەوەی سیاسی کە لە هەندێك لەم کۆمەڵگەیانەدا بەدیدەکرێت و لە ئاکامدا کەشوهەوایەکی تایبەتی‌و گشتی پێکدەهێنێت بۆ گەشەسەندنی توندوتیژی، چ لە چوارچێوەی پەیوەندیە ناوخۆییەکانی خێزاندا بێت، یان لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندیە دەرەکیانەی هێزە کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکانی نێو ئەو کۆمەڵگەیانەی بەڕێوەی دەبەن.

ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتیە ستەمکارەش کە زۆربەی خێزانە هەژارەکانی ناوچە لادێی یان شاریە پەراوێزیەکان تێیدا دەژین، شێوەیەکە لە شێوەکانی توندوتیژی کۆمەڵایەتی دژ بە هەموو ئەندامێکی ئەو خێزانانە، بە پیاوو ئافرەتەوە، ئەگەرچی ئەم توندوتیژیە جارێکی دی‌و سەرلەنوێ لەناو خێزاندا بەرهەمدێتەوە، لەسەر بنەمای دابەشکردنی هێزە ناوخۆیی‌و دەرەکیەکان، بەمجۆرە ژنان و منداڵان لەهەر کۆمەڵێکی دیکە زیاتر ڕووبەڕووی ستەم و چەوساندنەوە دەبنەوە.

ئەگەر توندوتیژی خێزانی وەکو چەمك بە ڕوونی خۆی ئاشکرا بکات لە سایەی خێزانی ناوکی ئەوروپیداو لە چوارچێوەی پەیوەندی کێشمەکێشی نێوان ژن و پیاو کە لەناو خێزانداو لە ڕێگەی پەیوەندی هاوسەرێتیەوە بەرجەستە دەبێت، لەوەدا ئافرەتی ژن دەبێتە ئەو لایەنەی دوچاری توندوتیژی ببێتەوە چ ڕۆحی یان مادی، ئەوا

ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتیە ستەمکارەش کە زۆربەی خێزانە هەژارەکانی ناوچە لادێی یان شاریە پەراوێزیەکان تێیدا دەژین، شێوەیەکە لە شێوەکانی توندوتیژی کۆمەڵایەتی دژ بە هەموو ئەندامێکی ئەو خێزانانە، بە پیاوو ئافرەتەوە

ئەم مەسەلەیە لە کۆمەڵگەکانی جیهانی سێیەمدا جیاوازە کە شێوەکانی خێزان و پەیوەندیەکانیان زۆرترە، بەم جۆرەش توندوتیژی ڕۆحی‌و مادی (فیزیکی) درێژدەبێتەوە، تاوەکو بێجگە لە منداڵ، ئافرەت وەك دایك و ژن و خوشك و کچ بگرێتەوە.

لە ڕاستیدا ئەو توندوتیژیەی دژ بە منداڵانی جیهانی سێیەم هەیە، بابەتێکە شایانی هەموو بایەخ و لێکۆڵینەوەیەکە، بە تایبەتی کە هەزاران کەس لەو منداڵانە ڕۆژانە لە برساندا دەمرن، لە ئەنجامی پەیوەندی هێزە نایەکسانەکانی نێوان وڵاتانی دەوڵەمەندو وڵاتانی هەژاردا. بێجگە لەو ملیۆنەها منداڵانەی جیهانی سێیەم کە ڕووبەڕووی توندوتیژی‌و چەوساندنەوە دەبنەوە لە سایەی پەیوەندیەکانی قۆستنەوە لە کۆمەڵدا، زۆربەی خێزانە هەژارەکان ناچاردەبن کاروکاسپی بە منداڵەکانیان بکەن، بە ئەمەش منداڵەکانیان لە بوارە سروشتیەکانی خوێندن و تەندروستی‌و چاودێری کۆمەڵایەتی‌و پەروەردەیی‌و دەروونی بێبەش دەبن.

دیارە گرنگی ئەم بابەتەو ڕەهەندە ئاڵۆزەکانی وای لە ئێمە کردوە بە پێویستی بزانین توێژینەوەیەکی سەربەخۆی بۆ تایبەت بکرێت، چونکە لە سنووری یەك توێژینەوەداو بە پێی کات و توانا دیاریکراوەکانی، هەروا بە ئاسانی لێکۆڵینەوەیەکی پوخت و تەواوی سەرجەم لایەنەکانی توندوتیژی ناکرێت لەناو خێزاندا، لەبەرئەوە ئەم باسەمان تایبەتکردوە بۆ توێژینەوەی توندوتیژی دژ بە ئافرەت لە خێزاندا، تاوەکو توێژینەوەیەی دیکە تایبەت بکەین بە توندوتیژی دژ بە منداڵان، ئەمە لە لایەنی کردەییەوە، بەڵام لەم ڕووی میتۆدەوە دەرکەوتوە کە هەموو لایەنێك لە لایەنەکانی توندوتیژی خێزانی، چ دەرهەق بە ژن یاخود بەرامبەر منداڵان بەستراوە بە گۆڕانکاری‌و ئەو باروۆخانەی جیاوازن لە یەکدی، کە بەکارهێنان و پیادەکردنی میتۆدو ئامرازەکانی شیکردنەوەی پێویست دەبێت و ناکرێت تێکەڵ بکرێت یان گشتگیر بکرێت.

ئەمە دەمانگەیەنێتە چەمکی سێیەم کە دوا چەمکەو بەندە بە بابەتی توێژینەوەکەوە، مەبەستمان لە توندوتیژی دژ بە ئافرەتە، بە مانای "ئەو ڕەفتارە، یان ئەو کردەیەی بە تایبەتی بەرامبەر ئافرەت پیادە دەکرێ، ئیدی ئەو ئافرەتە ژن بێت، یان دایك یان خوشك یان کچ، ئەو کردەیەش بە پلە جیاوازەکانی چەوساندنەوەو جیاکاری‌و ستەم و شەڕانگێزی دەناسرێتەوە کە لە پەیوەندی هێزە نایەکسانەکانی نێوان پیاوو ئافرەتەوە هاتۆتە گۆڕێ لە کۆمەڵ و خێزاندا وەك یەکن لە ئەنجامی کۆنترۆڵی سیستەمی باوکساری بە میکانیزمە ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیریەکانیەوە".

لە ڕاستیدا ئەو توندوتیژیەی دژ بە منداڵانی جیهانی سێیەم هەیە، بابەتێکە شایانی هەموو بایەخ و لێکۆڵینەوەیەکە، بە تایبەتی کە هەزاران کەس لەو منداڵانە ڕۆژانە لە برساندا دەمرن، لە ئەنجامی پەیوەندی هێزە نایەکسانەکانی نێوان وڵاتانی دەوڵەمەندو وڵاتانی هەژاردا

# سیما بونیادگەریەکانی توندوتیژی بەرامبەر ئافرەت لە کۆمەڵگەی میسردا

ئەگەر سەرنج لە دیمەنەکانی توندوتیژی دژ بە ئافرەت بدەین، دەبینین پەیوەندیەکی یەکتەواوکەر (دیالیکتیکی) هەیە لە نێوان ئەو جیاکاریو چەوساندنەوەیەی یاسای گشتی کۆمەڵایەتی بەسەر ئافرەتدا سەپاندویەتی، بە هەموو ڕەوت و پەیوەندیەکانیەوەو لە نێوان ئەو توندوتیژیە مادیو ڕۆحیەی ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە لە خێزاندا. هەوڵدەدەین لەم لاپەڕانەدا هەندێك لە سیما بونیادگەریەکانی بخەینەڕوو کە ئافرەت لە سایەی سیستمی کۆمەڵایەتیو ئەو بنەما جیاوازانەی پێوەی بەستراوەتەوە دوچاری دەبێت.

سەرەڕای ئەو گۆڕانانەی بەسەر بارودۆخی ئافرەتدا هاتوە لە کۆمەڵگەی نوێدا، کەچی سروشتی ئەو پەیوەندیەی ژن بە پیاوەوە دەبەستێتەوە لە خێزاندا، هێشتا لە لایەن پاشماوەکانی پەیوەندی کۆیلایەتی بەڕێوەدەچێت، کە لەگەڵ دروستبوونی موڵکایەتی تایبەت و کۆنترۆڵی ژیاری نێرینەیی لە مێژوودا پەیدابوە، لە سایەی باڵادەستی سیستمی باوکسالاری کە دەسەڵاتی ڕەهای بە پیاو بەخشیوەو بە زەبریش، ملکەچی بەسەر ئافرەتدا سەپاندوە[7].

زۆربەی ئەو یاسایانەی دەستیان خستۆتە نێو سیستمی خێزانەوە لە کۆمەڵگە مرۆییە جیاوازەکاندا، هەر بەو شێوەیە لایەنگری ئەو بیرۆکەیەن کە گوایە ژن و منداڵان درێژبوونەوەیەکی سروشتین لە موڵکایەتی پیاودا، لەسەر ئەم بنەمایەش یاسا ڕێگەی بە پیاو داوە ئازادانەو چۆنی بوێت مامەڵە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا بکات، بەبێ ئەوەی کەس خۆی لە کاری هەڵقورتێنێت یان لێی بپرسێتەوە، گوایە ئەوە مەسەلەیەکە لە مەسەلەکانی خێزان. لەبەرئەوە دەبینین لەوکاتەدا کە کۆمەڵ بە یاساو ڕۆشنبیرییەکەی نێوییەوە ماف بە پیاو دەبەخشێت لە ڕووی خێزانیو سێکسیو کۆمەڵایەتیەوە ئافرەت کۆنترۆڵ بکات، لە هەمان کاتدا هەستی لێبوردنی لە ئافرەتدا دروستکردوە بەرامبەر زۆربەی ڕەفتارە درێوەکانی پیاو، بە جۆرێك مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕەفتارانەدا دەکات، وەك ئەوەی ڕەفتارێکی سروشتیو تەندروست بێت[8].

هەندێك توێژینەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە پیاو لە قۆناغە سەرەتاییەکانی دروستبوونی خێزانی باوکسالاریدا مافی ئەوەی هەبوە ژنەکەی بکوژێت، هەروەکو چۆن کۆیلەکەی دەکوژێت، هەروەها مافی ئەوەشی هەبوە سەربەستانە منداڵەکانی بکوژێت، بەبێ ئەوەی کەس لێی بپرسێتەوە، چونکە ژن و منداڵ موڵکی پیاو بوون و پێیان دەوترا کۆیلەکان. زاناکانیش دەریانخستووە کە زاراوەی خێزان *Family* لە

سەرەڕای ئەو گۆڕانانەی بەسەر بارودۆخی ئافرەتدا هاتوە لە کۆمەڵگەی نوێدا، کەچی سروشتی ئەو پەیوەندیەی ژن بە پیاوەوە دەبەستێتەوە لە خێزاندا، هێشتا لە لایەن پاشماوەکانی پەیوەندی کۆیلایەتی بەڕێوەدەچێت

> هەندێك لە دیمەنەكانی نامۆبوونی ئابوریو كۆمەڵایەتی ئافرەت لە مامەڵەكردنی لەگەڵ شێوەكانی قۆستنەوەدا دەردەكەوێت، چ لە خێزانداو لەو ڕۆڵەی لە كاری ماڵدا دەیگێڕێت

بنەڕەتدا لاتینیە لە وشەی *Familia* وەرگیراوە، كە بە مانای ژمارەی ئەو كۆیلانە بن كە موڵكی یەك پیاون[9].

لە ڕاستیدا شیكردنەوەی حاڵەتی ملكەچی، بگرە حاڵەتی ئەو لێبوردنەش كە ئافرەت مامەڵەی لەگەڵ دیمەنە جیاوازەكانی ستەم و چەوساندنەوە لە كۆمەڵ و خێزاندا، كە توندوتیژی دەكاتە ئامرازێك خۆی پێدەربڕێت، دەكرێت ئەمە بگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەو ئاسایی بوونی حاڵەتی نامۆبوون لای ئافرەت، كەوا دەكات شوێن و پێگەو خواستەكانی چەوسێنەرەكەی بالآبێت، لەسەر حسابی بوونی ئافرەت وەك خودو بابەت. پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بكرێت كە حاڵەتی نامۆبوون لای ئافرەتی عەرەبی بە شێوەیەكی تایبەتی، بە یەك لایەنەوە ناوەستێت، بەڵكو دابەشدەبێت، تاوەكو لایەنە جیاوازەكانی ژیانی ئابوریو كۆمەڵایەتیو خێزانیو ڕۆشنبیریو دەروونیو سێكسیش بگرێتەوە[10].

هەندێك لە دیمەنەكانی نامۆبوونی ئابوریو كۆمەڵایەتی ئافرەت لە مامەڵەكردنی لەگەڵ شێوەكانی قۆستنەوەدا دەردەكەوێت، چ لە خێزانداو لەو ڕۆڵەی لە كاری ماڵدا دەیگێڕێت، یان لە كۆمەڵداو لە پەیوەندیەكانی بەرهەمهێنان و پێگەكەی لە پرۆسەی كارو بەرهەمی كۆمەڵایەتیدا.

ئەگەر دروستبوونی پرۆسەی دابەشكردنی كاری كۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی پەیوەندیە چینایەتیەكانی باوكسالاریدا (لە ڕوانگەی مێژووەوە) بە شێوەیەكی بنەڕەتی لە خوڵقاندنی هەستكردن بە كەمایەتی لای ئافرەت بەشداریكردبێت، ئەوا بێجگە لەمە چەندین بونیادی كۆمەڵایەتیو پەروەردەییو ڕۆشنبیریو یاساییو ئاینی دیكەش هەن كە زەمینەی ئەم هەستەیان لە ئافرەتدا سازو قوڵتر كردۆتەوە، بە درێژایی قۆناغە مێژووییەكان هەست و هۆشێكی ساختەیان لا خوڵقاندوە بەرامبەر بە خودو بوونی خۆی، بەوپێیەی ڕەگەزێكی نزمترو لاوازترەو لە ڕێگەی پیاوەوە نەبێت بوونی ئافرەت نایەتەدی.

دەتوانین لێرەدا لە مامەڵەكردنی ئافرەت لەگەڵ ئەو ڕۆڵەی لە ماڵدا دەیگێڕێت تێبگەین و شیبكەینەوە بەوەی قەدەرێكە هەر دەبێت و سروشتە بایۆلۆژیەكەی بەسەریدا سەپاندوە، لەمەشدا ژنی ماڵ جیاوازیەكی ئەوتۆی نیە لەگەڵ ئەو ئافرەتەی لە دەرەوەی ماڵ كاردەكات، چونكە كاریگەری چەمكی دابەشكردنی كاری ئاساییو باو (تقلیدی) *Sexual division of Labour* درێژدەبێتەوە بۆ ئەو ئافرەتەی لە دەرەوەی ماڵ كاردەكات، بە چاوپۆشین لە پێگەی وەزیفەكەی. زۆربەی ئافرەتانی میسرو كۆمەڵگە عەرەبیەكانی دیكەش كاری دەرەوە لە پێناو هێنانەدی خودێكی سەربەخۆی خۆیان یـــــان لە پێناو ئازادبوونیان لە ڕووی ئابوریەوە ناكەن، كە ئەمە خۆی دەبێتە

یاریدەدەرێك بۆ سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی پەیوەندیەکانی هێز لە نێوان ژنان و پیاواندا، بەڵکو زۆرجار کارکردنی دەرەوەیان بۆ ئەوەیە یاریدەی مێردەکانیان بدەن، یان بۆ ئەوەی ئاستی بژێوی خێزانەکەیان باشتر بکەن. ئەم ڕاستیەش لە تۆژینەوەیەکدا جەختی لەسەرکراوە کە بنکەی نەتەوەیی بۆ تۆژینەوەی کۆمەڵایەتی‌و تاوان (الجنائی) بە ئەنجامی گەیاند لە بارەی پێشنیاری گەڕانەوەی ژنی کارمەند بۆ ماڵەوە بەرامبەر دەستکەوتنی نیوەی کرێکەی، ئەو پێشنیارەیە کە یەکێك لە ئەندامانی ئەنجوومەنی گەل لە ساڵی *1977* خستیەڕوو، ئاکامەکانی ئەو تۆژینەوەیە دەریخست کە *52٪*ی ئافرەتان ڕەزامەندی خۆیان بەرامبەر ئەم پێشنیارە دەربڕیوەو مانەوەیان لە ماڵەوە پێباشتر بوە بۆ چاودێریکردنی منداڵ و خێزانەکانیان.

ئافرەتی لادێ واقیعی ئەو ستەم و قۆستنەوەیەی بەرجەستەکردوە کە لە چوارچێوەی کاری ناوماڵدا ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەی ئامێرەکانی سەرژمێری -لە زۆربەی وڵاتەکاندا- لە ڕووی ئابوریەوە ئەو کارەی ئافرەتی لادێ پێی هەڵدەستێت هیچ هەڵیناسەنگێنێت، چ لە ماڵەکە خۆیدا یان لە دەرەوەی ماڵەکەیدا، بەوە پۆلێن دەکرێت کە ئەو ژنی ماڵە. زۆربەی ئەو تۆژینەوانەی لەسەر ژنی لادێ بە ئەنجام گەیەنراون دەریانخستوە ئافرەتی لادێ چەندین ڕۆڵ دەگێڕێت: ڕۆڵی وەك ژنی ماڵ، کاری ناوماڵ، کاری کشتوکاڵی، هەروەك تۆژینەوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن ئافرەتی لادێ لە حاڵەتی کاری هەمیشەیی‌و بەردەوامدان، ئافرەتی لادێ یەکەم کەسە لەنێو ئەندامانی خێزانەکەیدا لە خەو بەئاگادێت و دواکەسیشە کە دەخەوێت. لە چینی کاری بەکرێگرتەشدا هەر ئەو ئافرەتانە بەشداری کاری مێردەکانیان دەکەن لە کێڵگەدا، لە کێلانی زەویەوە بۆ تۆو وەشاندن و نەهێشتنی ئافات و مێروە زیانبەخشەکان و لابردنی گژوگیاو دورینەوەی بەروبوومەکان، هەروەها کاری بەرهەمهێنان و فرۆشتنی بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی ماڵیش دەکات، لەنێو ماڵیشدا ئافرەتی لادێ چاودێری منداڵە بچوکەکان دەکات و داواکاری گەورەکانیش جێبەجێ دەکات، خواردن ئامادە دەکات و گەنم و جۆ دەهاڕێت، سوتەمەنی دابین دەکات، هەویر دەشێلێت، نان دەکات، ناوماڵ خاوێن دەکاتەوە، ئاو دەکێشێتەوە، جلوبەرگ دەدورێت، بەخێوکردنی مریشك و پەلەوەرو ئاگادارکردنی مەڕو ماڵات و دۆشینی شیرەکانیان، پەنیرو کەرە دروستدەکات، بێجگە لە هەندێك ئیشی دەستی دیکەش وەك چنین و جۆلایی، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو کارانەی ئافرەتی لادێ ڕایدەپەڕێنێت وەك جۆرێك لە جۆرەکانی کاری بەرهەمهێن دانی پێدانانرێت، هەروەها کرێی بەرامبەریان وەرناگرێت -بە زۆری- لە ڕاپەڕاندنی کارە کشتوکاڵی‌و ماڵیەکاندا[11].

ئافرەتی لادێ واقیعی ئەو ستەم و قۆستنەوەیەی بەرجەستەکردوە
کە لە چوارچێوەی کاری ناوماڵدا ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە

لە چوارچێوەی باسکردنی دابەشکردنی کاری ناوماڵ بۆ ئافرەت، دەکرێت ئاماژە بۆ دەرکەوتنی ڕێڕەوێك بکەین لەلای هەندێك کۆمەڵناس و ئابوریناسە خۆرئاواییەکان کە لەو بڕوایەدان کاری ناوماڵی ئافرەت لە سایەی پەیوەندیەکانی بەرهەمی سەرمایەداریدا پێویستە بە جۆرێك تەماشای بکرێت کە کارێکە بەهای خۆی دروست دەکات، والی سیکومب *Wally Secombe* یەکێکە لەو زانا ناسراوانەی هەوڵیداوە تیۆری (کارل مارکس) لە زێدەباییدا (فائض القیمة) بەسەر کاری ناوماڵی ئافرەتدا جێبەجێ بکات، بۆ ئەوەی جەخت لەو ڕاستیە بکات کە هەر ئەو ئافرەتانەی لە دەرەوەی ماڵ کاردەکەن و کرێ وەردەگرن بە تەنیا ئەوانە نین کە ملکەچی قۆستنەوەی سەرمایەداری دەبن، بەڵکو ئافرەتانی ماڵیش دوچاری قۆستنەوە دەبن. هەر لە چوارچێوەی زیادکردنەکەی سیکومب بۆ مۆرکی کۆمەڵایەتی لەسەر کاری ناوماڵ، سیکومب هەوڵیدا بەڵگە لەسەر ئەوە بهێنێتەوە کە ئەو کارەی لەناو خێزاندا بە ئەنجام دەگەیەنرێت بە پێکهێنەرێکی بنەڕەتی پرۆسەی بەرهەمهێنان دادەنرێت، بۆ گەڕانەوەی بەرهەمی هەریەك لە سەرمایەو هێزی کار. لە کۆڕێکیشدا بەڵگەی بۆ بڕواکانی هێنایەوە لە نێوان بەرهەمهێنانی شمەکی بچوك و کاری ناوماڵی ئافرەت، بەوپێیەی دوو شێوەن لە شێوەکانی بەرهەمهێنان و لە زۆر خاسیەتدا پێکەوە بەشداریدەکەن، ڕەنگە دیارترینیان ئەوە بێت کە هەردوو شێوەکە مۆرکێکی تاك و تایبەتیان هەیەو بەوەش جیادەکرێنەوە[12].

سەرەڕای گرنگی بیروڕاکانی سیکومب، بەڵام لە لایەن ژمارەیەك زانایانی مارکسی ڕووبەڕووی ڕەخنە بۆوە، ئەو زانایانە جەختیان لەوە کرد مەحاڵە مۆرکی کۆمەڵایەتی بخرێتە سەر کاری ناوماڵ لە ڕوانگەی سەرمایەوە، لەوەدا کە نیشانەی کەڵەکەبوون (تراکم) و ئاڵوگۆڕی (تداول) لەناو بازاڕدا تێدانیە، ئەمانەش مەرجە بنەڕەتیەکانی خوڵقاندنی بەهاو زێدەبایین، چونکە کاری ناوماڵ -ئەگەرچی مەرجێکی پێویستە بۆ گەڕانەوەی بەرهەمی هێزی کار- لە خوڵقاندنی بەهای تایبەتی خۆیدا، هاوبەشی ناکات، تەنیا لەوکاتەدا نەبێت کە ئەم شمەکە لە بازاڕدا دەفرۆشرێت[13].

جگە لەم ڕەخنەیە دەربارەی کاری ناوماڵ، ڕەخنەیەکی دیکەش ئاراستەی شیکردنەوەکەی سیکومب کراوە دەربارەی پەیوەندی هێز لە نێوان ژن و مێرد-دا لەناو خێزاندا، لە کاتێکدا سیکومب لەو بڕوایەدایە کە پەیوەندی ئابوری نێوان ژن و مێرد، پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕو هاوتایەو بەهای خزمەتەکانی ژن یەکسانە بەو بەهایەی وەریدەگرێت لە سەرجەم کرێی مێردەکەی، بەڵام بە بڕوای ڕەخنەگران ئەم شیکردنەوەیە شکست دەهێنێت لە ناسینی (زانینی) کاریگەریەکانی پشتبەستنی ژن بە ئابوری مێردەوەو لە ناسینی پەیوەندیەکانی ئەو دەسەڵاتەی لەنێو خێزاندا هەیە.

مەحاڵە مۆرکی کۆمەڵایەتی بخرێتە سەر کاری ناوماڵ لە ڕوانگەی سەرمایەوە، لەوەدا کە نیشانەی کەڵەکەبوون و ئاڵوگۆڕی لەناو بازاڕدا تێدانیە

/جین جاردنر/ لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دەخاتەڕوو دەربارەی ئەو میکانیزمەی بەهۆیەوە دەکرێت ئاڵوگۆڕی هاوتاو گونجاو لە نێو ژن و مێردەکاندا دروستبکرێت، ئەگەر ژنانی ماڵەوە پەیوەستبن بە بڕیاری بەڵگەنامەی هاوسەرێتییەوە (عقد الزواج) بە چەندین کاریگەری ئایدیۆلۆژییەوە بۆ خزمەتکردنی مێردەکانیان، ئەگەر ئەو ژنانە -لە میانەی هاوسەریدا- لە ڕووی ئابورییەوە پشت بە مێردەکانیان ببەستن و لە دەرەوەی میانەی هاوسەریدا لە دۆخی نزمکراوەدا (متدن) لەناو بازاڕی کاردا بوەستن، ئەوا چۆن چۆنایەتی ئاڵوگۆڕی هاوتا لە نێوان ژن و مێرد-دا دروستدەبێت؟[14].

لە ڕاستیدا سیکومب هێندەی بایەخی بە هاوبەشیکردنی ژنانی ماڵەوە لە کۆششکردن دژ بە چەوساندنەوەی چینایەتی داوە، ئەوەندە بایەخی بە شیکردنەوەو تۆژینەوەی پەیوەندیەکانی پاشکۆیەتیو دەسەڵات نەداوە لەناو خێزاندا. پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێت کە هەروا بە ئاسایی پەرە نادرێت بە هۆش و بیری چینایەتی ژنی ماڵ، پاشان تاوەکو ئافرەتان پێویستیان بە هەر پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ بێت لەگەڵ ئەو سەرمایەیەی بۆتە هۆی چەوساندنەوەی چینایەتیان، لە توانایاندا نابێت بچنە ڕیزی تێکۆشانەوە دژ بەو بارودۆخەی تیایدا دەژین، بەمجۆرە دەکرێت بوترێت ئەو ڕۆڵەی ئافرەتان لەناو ماڵدا دەیگێڕن لە بری ئەوەی ئاستی هۆش و توانای تێکۆشانیان بەرزبکاتەوە دژ بەو دۆخەیان، دوچاری گۆشەگیری کۆمەڵایەتیو دواکەوتنی سیاسیان دەکاتەوە، بگرە ڕێگە لە بەردەم کۆششی بە کۆمەڵیشیان دادەخات دژی هەموو چەوساندنەوەیەکی چینایەتیو سێکسی[15].

بایەخی تۆژینەوەی بارودۆخی ئابوری ئافرەت لە سایەی سیستمی سەرمایەداری یان نیمچە سەرمایەداریدا، هەروا بە ئاسانی خۆی نانوێنێت لە ڕۆڵی ئافرەتدا وەك هێزی کاری ماڵ، بەڵکو لە ڕاستیدا بە شێوەیەکی دیو خۆی لەوەدا دەنوێنێت کە ئافرەت هێزی کاری ناوماڵ و بە کرێگرتەشە لە یەك کاتدا. پێدەچێت لێرەدا ئەم جیاوازیە گەورەیە بە ڕاستی حاڵەتی ئەو نامۆبوونە دەرببڕێت کە ئافرەت بە دەستیەوە دەناڵێنێت، واتە لە بری ئەوەی ڕۆڵی دوولایەن و دژ بە یەك بۆ دۆخ و جووڵەی دینامیکی ئافرەت زیادبکات، دەبینین تەواو بە پێچەوانەوەیە، ڕۆڵی ناوماڵ هەر بەسەر شانی ئەو ئافرەتانەوەیە کە لە دەرەوەی ماڵ کاردەکەن، بە تایبەتی ئەوانەی لە بواری پیشەسازیدا کاردەکەن، سەرلەنوێ کار لە ڕووی جیاوازی ڕەگەزەوە لە زەمینەیەکی فراوانتردا بۆ ئەو بەرهەمەی کە مۆرکێکی کۆمەڵایەتی هەیە دابەشدەکاتەوە، بەوەش کرێی ئافرەتان بۆ ڕادەیەك نزمدەبێتەوە کە زۆر لە کرێی کاری پیاو کەمترە، پێگەشیان لە شوێنی زنجیرەیی کاردا لەناو پیشەیەکی زۆر تەسکدایەو دەیانکاتە نێچیرێکی ئاسان بۆ هەلپەرستی سانديکایی[16].

بایەخی تۆژینەوەی بارودۆخی ئابوری ئافرەت لە سایەی سیستمی سەرمایەداری یان نیمچە سەرمایەداریدا، هەروا بە ئاسانی خۆی نانوێنێت لە ڕۆڵی ئافرەتدا وەك هێزی کاری ماڵ، بەڵکو خۆی لەوەدا دەنوێنێت کە ئافرەت هێزی کاری ناوماڵ و بە کرێگرتەشە لە یەك کاتدا

ئەگەر ئەمە حاڵی ئافرەتە ئیشكەرەكانی پیشەسازی بێت لە كۆمەڵگە سەرمایەدارەكاندا، ئەوا حاڵی ئافرەتانی لادێ لە سایەی پەیوەندیەكانی بەرهەمی ئاسایی‌و باوداو لە سایەی مەرجەكانی پاشكۆیەتی ئابوری‌و یاساییدا هەر دەبێت دواكەوتووتر بێت، ئەمەش بۆ خۆی ڕۆڵی ژنی لادێ شیدەكاتەوە كە چەندین ڕۆڵ لە ناوماڵ و بەرهەمهێناندا دەبینێ، لە هەمان كاتدا لەو بڕوایەشدان ئەو ڕۆڵەی ئەوان لە بەرهەمهێنانی كاری كشتوكاڵیدا دەیگێڕن، ڕۆڵێكی لاوەكیەو كارەكانی -ئیدی جۆرو بایەخی كارەكەی هەرچیەك بێت -كارێكی لاوەكین و لە ڕێی پیاوەوە بە ئەنجامی دەگەینن، ئەو پیاوەی كە بە هۆیەوەو لە سایەی پەیوەندی هاوسەرێتیان بوونی كۆمەڵایەتی خۆیانی تێدا بەدیدەهێنن.

زۆربەی دیمەنەكانی چەوساندنەوەی كۆمەڵایەتی بەنێو ئەم بارودۆخە ئابوریە نزمەی ئافرەتدا تێدەپەڕێ، ئەوەش لە شێوەكانی(جیاكاری نێوان نێرو مێ) لە خێزان‌و كۆمەڵدا بە ئاشكرا دەردەكەوێت، لە بوارەكانی كارو كرێ‌و بەرزبوونەوەو (التراقی) و خوێندن و هەڵبژاردنی هاوسەرو بەشداریكردنی كۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و بڕیاردان لە خێزانداو چەندین بواری دیكەش كە پڕن لە دیمەنەكانی جیاكاری‌و چەوساندنەوەی ئافرەت[17].

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ پرۆسەكانی جیاوازیكردن بكەین كە ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە لە كۆمەڵ و خێزاندا. هێزو كاریگەری جیاكاری دەگەڕێتەوە بۆ ڕەوتی بەهاو ئەو پێوەرانەی ڕۆڵی نێرومێ‌و پێگەی هەریەكێكیان لە كۆمەڵدا دیاریدەكات، جگە لەوەی ئەم ڕەوتە نێر باشترو گەورەتر دەكات و دەسەڵاتی خێزانی‌و كۆمەڵایەتیشیان گەورەتر دەكات لەسەر حسابی سووككردن و كەمتركردنی مێیەكان و كردنیان بە پاشكۆی نێرەكان، ئەو ڕەوتی بەهاو پێوەرانە، شەرعیەتی خۆی لە بواری جیاجیاوە وەردەگرێت، گرنگترینیان ئەو باری ڕۆشنبیریەیە كە لە ئارادایە، هەروەها بۆ ماوە میللی‌و ئاینیەكان و ڕاگەیاندن و یاسا.

باری ڕۆشنبیری دان بە ڕۆڵی كچدا ناهێنێت تەنیا وەك ژن و ژنی ماڵ نەبێت، ئەگەر ڕێگەش بە كچ بدرێت بخوێنێت و كاربكات، ئەوا لەبەر ڕەخساندنی بوارێكی باشتر بۆ شوو كردنیەتی، بە جۆرێك لە دەورە بنەڕەتیەكەی نەگرێت لە خزمەتكردنی مێردو چاودێری منداڵەكانیدا، ئەگەر كچ تەمەنی شووكردنی بەسەربچێت‌و ببێتە قەیرە، یان هەر شوونەكات، یاخود ئەگەر شووبكات و منداڵی نەبێت، یان بە تەنیا منداڵی كچی ببێت، یاخود تەڵاق بدرێت یان ببێتە بێوەژن، ئەوا لە جێگەی بەزەیی پێداهاتنەوەو لاواندنەوەدا دەمێنێتەوە لە كۆمەڵدا، بە چاوپۆشین لە پلەی زانستی یان لەو پێگە پیشەییەی ئەو كچە یان ئەو ژنە بەدەستی هێناوە. واتە پێگەی

هێزو كاریگەری جیاكاری دەگەڕێتەوە بۆ ڕەوتی بەهاو ئەو پێوەرانەی ڕۆڵی نێرومێ‌و پێگەی هەریەكێكیان لە كۆمەڵدا دیاریدەكات

ئافرەت لە کۆمەڵدا، بە تایبەتی لە کۆمەڵگە لادێییەکاندا نایەتەدی، تەنیا بەهۆی لە ڕێگەی پیاوەوە نەبێت لە سایەی سیستمی خێزان و هاوسەرێتیدا. لەبەرئەوە دەبینین خێزان لە پرۆسەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتیدا ئاگاداری ڕاهێنانی کچن لە جێبەجێکردنی کاروباری ناوماڵ هەر لە قۆناغەکانی منداڵییەوە، ئەمەش لە دژایەتیو ناکۆکیەکی تەواودا ڕوودەدات. لە کاتێکدا خێزان، کچ لە منداڵییەوە بۆ ئەوە ئامادە دەکا کە ڕۆڵی ژن و ژنی ناوماڵ بگێڕێ، هاندیدەدا بۆ ئەوەی مێیەتی خۆی بەدەربخات، تاکو لە لایەن پیاوانەوە سەرنجڕاکێش و ویستراوبێت، لە هەمان کاتدا ڕێگەشی پێنادا تێکەڵی کوڕان بێت، ڕەفتارەکانی بە تاوان دەژمێررێت و ئەگەر بزانن پەیوەندیەکی سۆزداری لەگەڵ کوڕدا هەیە، ئەوا دەگاتە ڕادەی لەناوبردن و کوشتنی[18].

مصطفی حجازي ئاماژە بۆ ئەو دژایەتیە دەکات لە ڕاهێنان و پەروەردەکردنی کچاندا کە ڕەهەندی سێکسی جەستەی ئافرەت قەبە دەکات (ئافرەت تەنیا ئامرازێکی سێکس و چێژەو دەفرێکە (وعاء) بۆ منداڵبوون) ئافرەت لە بەرامبەر سەرکوتکردنی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو حەرامکردنی ئایندا دەکەوێتە نێو حاڵەتێك لە فڕاندن و دزینی سێکسیەوە، کە ئەمە لە دزینی ئابوری سەخت ترە (ئەگەر پەیوەندی نێوانیشیان پڕ لە بڕواو ڕێکییش بێت)، حجازی لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێت جەستەی ئافرەت کورتکراوەتەوە بۆ ڕەهەندە سێکسیەکەی کە پێویستە داپۆشرێت و بپارێزرێت، پێش ئەمەش موڵکایەتی ئەو خێزانەیە کە کۆمەڵ لە پشتەوەیەتی، خێزانی باوك لە سەرەتاداو ئەوجا خێزانی مێرد لە دواتردا، لە کۆتاییشدا خودی ئافرەت هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر جەستەی خۆیدا نیە، حجازی هاوبڕوایە لەگەڵ ئەو سایکۆلۆجیست و کۆمەڵناسانەی بایەخیانداوە بە توێژینەوەی ژیانی سێکسی ئافرەت، لەوەدا کە سەرکوتکردنی سێکسی یەکێکە لە گرنگترین ئەو ئامرازانەی پیاوو کۆمەڵ هەیانە بۆ دەسەڵاتگرتن و بڕیاردان بەسەر ئافرەتدا بۆ ملکەچ پێکردنی، لەبەرئەوەی کاتێك جەستە دەربازدەبێت و سەربەستانە وزەو خواستەکانی دەردەبڕێت، مرۆڤیش لە دەست بەسەرداگرتن و چەوسانەوە دەرباز دەبێت[19].

بە تێڕوانین لە پەندە میللیەکان کە بە یەکێك لە گرنگترین پاڵنەرەکان دادەنرێت لە دیاریکردنی بونیادی ئەو ڕۆشنبیریەی لە ئارادایە، دەتوانین لەنێو پەیوەندەکاندا زۆر لەو ناوەڕۆکانە بدۆزینەوە کە بەهاو پێوەرەکان دابین و تایبەت دەکەن، ئەوانەی بانگەشە بۆ چەوسانەوەی ئافرەت و بە قەوارەکردنی ڕۆڵ و بایەخیان و سوکایەتی پێکردنیان لە خێزان و کۆمەڵدا دەکەن، ئەوەندە بەسە لێرەدا ئاماژە بۆ چەند بەندێکی میللی بکرێت(20)، کە لەمجۆرە ناوەڕۆکانەی هەڵگرتووەو بەهاو پێگەی ئافرەت

سەرکوتکردنی سێکسی یەکێکە لە گرنگترین ئەو ئامرازانەی پیاوو کۆمەڵ هەیانە
بۆ دەسەڵاتگرتن و بڕیاردان بەسەر ئافرەتدا بۆ ملکەچ پێکردنی

لە خێزاندا دیاریدەکات، بە تایبەتی خێزانی لادێ. یەکێك لە شێوەکانی سوککردنی ئافرەت و کەمکردنەوەی لە ڕۆڵ و پێگەی لە خێزاندا، گەورەترکردنی لە دایکبوونی کوڕە وەك لە لەدایکبوونی کچ، چونکە لە دایکبوونی کوڕ دەبێتە هۆی خۆشحاڵی و دایك بە هۆیەوە بەهایەکی چنگدەکەوێت، بەڵام کاتێك کچ لە دایك دەبێت خەم و بێتاقەتی باڵ بەسەر ئەو خێزانەدا دەکێشێت و دایك تووشی پەژارەو بێهیوایی دەبێت‌و لە چاوی مێردو کەسوکاری مێردەکەیەوە نیگای غەم و گریانی بەسەردا دەبارێت، لەو پەندانەی بۆ لەدایکبوونی کوڕ خۆشی دەردەبڕێت و لە نرخ و بەهای دایك بەرزدەکاتەوە پەندێکە دەڵێت: ام الغلام تستاهل الاکرام (دایکی کوڕ شایانی ڕێزگرتنە)، هەروەها (کاتێك پێیانوتم منداڵەکە کوڕە، ئارامم گرت و پاڵمدایەوە). لە بەرامبەردا بۆ لەدایکبوونی کچ وتراوە (کە پێیان وتم منداڵەکە کچە، دیوارەکە ڕووخا بەسەرمدا)، لە پەندێکی دیکەشدا دەڵێن (ئەی ئەوەی کچت دەبێت، تا مردن خەمت دەبێت). بۆ هاندانی بەکارهێنانی توندوتیژی‌و ملکەچکردنی ئافرەت، کار گەیشتۆتە ئەو پەندەی بوترێت پەراسویەکی کچ بشکێنە، *24* پەراسوی تری لێوە دەردەچێت). چونکە ئافرەت سەرچاوەی نیگەرانی‌و ترس و شوورەییە، دەبینین زۆربەی خێزانە لادێییەکان لە وتنەوەی ئەو پەندە ناترسن کە دەڵێت (مردنی کچ مایەی پاراستنی خێزانە، بەڵام لە شاردا کە بە هۆی خوێندن و کارکردنەوە جیاوازیەکی ڕێژەیی کەوتۆتە بارودۆخی ئافرەتەوە، ئەم پەندەیان دەستکاری کراوەو بوە بە (شووکردنی کچ مایەی پاراستنی خێزانە)، لە هەردوو حاڵەتەکەشدا خواستی خێزان بۆ ڕزگاربوونیان لە کچ دەردەکەوێت، ئیدی بە مردن بێت یان بە شووکردن.

شووکردن لە لایەك دەبێتە پاراستنی کچ، لە لایەکی دیکەوە بارێکی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی لەسەر شانی خێزان لادەبات، ئەوەش ئاهەنگ گێڕانێکە بۆ ئەو هەوڵ و کۆششەی دراوە لە پێناو ئامادەکردنی کچ و ڕەخساندنی بۆ بینینی ڕۆڵی ژن و ژنی ماڵ. زۆر پەندیش بۆ ئەو کچە وتراوە کە شوودەکات، بە چاوپۆشین لە ڕای ئەو کچەو ڕازیبونی بەو کەسەی شووی پێدەکات، هەروەها بە چاوپۆشین لەهەر گونجاندن و هاوتاییەکی نێوانیان، لەو پەندانەی ئەم ناوەڕۆکەیان هەڵگرتوە وەك (سێبەری پیاو نەك سێبەری دیوار) (هەرزانترین پیاو ئافرەت دەوڵەمەند دەکات)، بەڵام ئەگەر کچ مافی خۆی پراکتیزە بکات، نەك لە هەڵبژاردنی هاوسەردا، بەڵکو لە ڕەتکردنەوە یان ڕازیبوون بە هەڵبژاردنی خێزان و کەسوکارەکەیدا، ئەوا ئەم پەندە دەوترێتەوە (کاتێ کچ داخوازی دەکرێ لە خۆی بایی دەبێ‌و ڕازی نابێت، کاتێکیش ماڵی کوڕە دەڕۆن پەشیمان دەبێتەوە). بە تایبەتی کە دەگاتە ئەوەی تەمەنی شووکردنی دوابکەوێت، ئەم پەندەش دەڵێنەوە (دانیشتن بە ماتی، نەك شووی پەشیمانی) مانای ئەوەیە ئارامگرتن

شووکردن لە لایەك دەبێتە پاراستنی کچ، لە لایەکی دیکەوە بارێکی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی لەسەر شانی خێزان لادەبات، ئەوەش ئاهەنگ گێڕانێکە بۆ ئەو هەوڵ و کۆششەی دراوە لە پێناو ئامادەکردنی کچ و ڕەخساندنی بۆ بینینی ڕۆڵی ژن و ژنی ماڵ

لە هەڵبژاردنی مێردی گونجاودا دەبێتە هۆی دواکەوتنی تەمەنی شوکردن و خەم و پەشیمانی دەبێتە بەشی کچ و خێزانەکەی. لە مەسەلەی بەشداریکردنی ئافرەت لە بڕیارە تایبەتەکانی خێزاندا، هەرچەندە ئەمە کەمەو بە ئەندەکێ ڕوودەدات، ئەوا بەشداریکردنەکە لای مێرد بە شاراوەییو بە نهێنی ڕوودەدات، چونکە لەو بڕوایەدان ئەگەر مێرد لەکاتی بڕیارداندا پرسی بە ژنەکەی کرد ئەوا لە پیاوەتی مێردەکە کەم دەبێتەوە، چەمکی پیاوەتی لە باری ڕۆشنبیری کۆمەڵدا، بە تایبەتی لەنێو ڕۆڵەکانی لادێو چینە میللیەکانی شاردا بەستراوە بە توانای پیاو لە دەسەڵاتی بەسەر ژنداو ملکەچ پێکردنی لە ڕووی سێکسیو کۆمەڵایەتیو خێزانیو سیاسیەوە، لەو پەندانەی کە لەم بارەیەوە وتراوە وەك (پرسیان پێبکەن و بە قسەیان مەکەن) ئەمەش ویستی پیاو بۆ دەسەڵاتخوازی دەردەخا یان ئەو پەندەی کە دەڵێ (ڕاوێژکردن بە ژن، ئەگەر ڕاست بێت ساڵێك دوادەکەوێت، ئەگەر هەڵە بێت هەموو تەمەن دوادەکەوێت).

بێجگە لە پەندە میللیەکان، پاڵنەرێکی دیکە پشتگیری بیرۆکەو بڕواو بەهاو چەمکەکان دەکات لە هێنانەکایەی پرۆسەی ئەو ستەم و چەوسانەوەیەی دوچاری ئافرەت دەبێتەوە لە کۆمەڵ و خێزاندا، ئەو پاڵنەرە ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە ژیانی میللەت و تاکەکاندا، ئەویش پاڵنەری ئاینە. بایەخی ئاین لە کۆمەڵگەی میسریو کۆمەڵگە موسڵمانەکانی دیکەشدا، وەك هیچی کەمتر نیە لە پاڵنەری ڕۆشنبیریو لەوەی بنەمایەکە لە دیاریکردنی پێوەرە ئاکاریەکان، لە هەمان کاتدا بە چاوگێکی بنەڕەتی دادەنرێت لە چاوگەکانی یاسادانان و تەمەنی یاساکانی تایبەتن بە سیستەمی خێزان و هاوسەرێتییەوە.

بەرلەوەی بچینە نێو باسی ڕۆڵی ئاین لە دیارکردنی پێگەی ئافرەت لە خێزان و کۆمەڵدا، پێویستە یەکەمجار ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئاینی ئیسلام بایەخێکی گەورەی داوە بە خێزان و کاری خێزانو پێگەی ئافرەت لە نێویدا، ئەم بایەخپێدانەشی مەسەلەکانی نیشانەکردن و هاوسەرێتیو تەڵاق و منداڵ لەخۆگرتن و میرات و سەرپەرشتی کردن (الولایة) لەخۆدەگرێت، هەروەها تیشکی خستۆتە سەر پەیوەندی نێوان ژن و مێردو باوان و منداڵان. لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە ئەو ڕاستیە بخەینەڕوو کە زانا ئاینیەکان (فقهاء) و پیاوانی ئاینی ئیسلامی دەربارەی شیکردنەوەی ئەم مەسەلانە لەنێو خۆیاندا زۆر لە یەکتر جیاوازن و دابەشبوون بەسەر دوو کۆمەڵدا: کۆمەڵێکی ڕۆشنگەری(کە کاروباری خێزان و ڕۆڵو پێگەی ئافرەت لەسەر بنەمای هێنانەدی عەدالەت و یەکسانی نێوان ژن و پیاو دادەمەزرێنێت، لەو بڕوایەدان ئاین لە بنەچەدا بۆ هێنانەدی ئەم پرەنسیپە گرنگەیە، کۆمەڵی دوەمیش هەڵوێستێکی ڕەق و چەقبەستووی وەرگرتوە لـــــەم مەسەلانەدا، جیاوازیکردن لە نێوان ئافرەت و پیاودا

بایەخی ئاین لە کۆمەڵگەی میسریو کۆمەڵگە موسڵمانەکانی دیکەشدا، وەك هیچی کەمتر نیە لە پاڵنەری ڕۆشنبیریو لەوەی بنەمایەکە لە دیاریکردنی پێوەرە ئاکاریەکان، لە هەمان کاتدا بە چاوگێکی بنەڕەتی دادەنرێت لە چاوگەکانی یاسادانان و تەمەنی یاساکانی تایبەتن بە سیستەمی خێزان و هاوسەرێتییەوە

بوە بە خاڵی دەستپێك و بنـەڕەتی ئـەم کۆمەڵەیـە لـە شیکردنەوەی ئـەم مەسـەلانەو دیاریکردنی ڕۆڵ و پێگەی ئافرەت لە خێزان و کۆمەڵدا[21].

بە بـڕوای ئێمـە جیـاوازی نێـوان زانایـان و پیـاوانی ئـاینی، تـەنیا لـە مەسـەلەی ئافرەتدا نیە، بەڵکو لە زۆربەی مەسەلە کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیەکاندا جیاوازن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی هەڵوێستی کۆمەڵایەتیو هەڵوێستە سیاسیەکانیان، ئەوان یان ئەوەتا موحافیزەکارن و لایـەنگری بـارودۆخ و سیسـتمەکانی قۆسـتنەوەو چەوسانەوە دەکـەن، یـاخود ڕادیکـاڵین و هـەوڵی گـۆڕینـی بارودۆخـەکانی دەدەن بـۆ هێنانەدی عەدالەت و یەکسانیو ڕزگاربوونی کۆمەڵایەتی. لە ڕاستیدا زۆر لە توێژینەوە مێژوویـیو ئەنسـرۆپۆلۆژییەکان سـەلماندویانە کـە بـەهاو بیرۆکـەو پـەندو ئاکـارو خوونەریتەکان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکەو لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دی، دەگۆڕێت، بە گوێرەی بارودۆخی کۆمەڵایەتیو ئەو بارە ئابوریـیەی پەیوەندیـەکانی بەرهەمهێنانی نێوی دیاریدەکات، لەبەرئەوە شتێکی گران نیە هەر کۆمەڵگەیەك لەهەر کـاتێکدا بێـت بەهایـەك لـە ئـاین وەردەگرێـت کـە لەگـەڵ بەرژەوەندیـەکانی چینـی باڵادەسـتو دەسـەڵاتداری نـاویدا بگونجێـت[22]. ئـەو پرسـیارەی لـێرەدا خـۆی بـەدەردەخات ئەوەیـە کـە بـڕوای کـام کۆمـەڵیان براوەیـەو کـاری کردۆتـە سـەر ئـەو ڕۆشنبیرییەی لە ئارادایەو لە ڕێکخستنی یاساکانیشدا کاریگەرە؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستی بە ڕوونکردنەوەو شیکردنەوە نیە، واقیعی بـارودۆخی ئـەو کۆمەڵگەیـەی بـە دواکـەوتوویی جیادەکرێتـەوە لـە ڕووی ئـابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسیو ڕۆشنبیریەوە، جگە لە بەردەوام کۆنترۆڵکردنی پەیوەندیەکانی چینایەتیو باوکسالاری لەسەر بنەمای هێز لە کۆمەڵ و خێزاندا، هەر دەبێت بیرۆکـەو بۆچوونی تەوژمە پێشینەییە پارێزگارەکان لەخۆبگرێت و ڕەواج و بڵاوبوونەوەیـەکی فراوانیشی هەبێت، چ لە ئاستی باوەڕپێکراودا (رسمی) یان لە ئاستی میللیدا[23].

ئەوەندە بەسە لێرەدا ئاماژە بەو مانایانە بدەین کە لە ئاین وەرگیراون بە ئامانجی سـوککردنی کـاری ئـافرەت و بـۆ جـەختکردن لەسـەر نزمـیو کـەمی ئـافرەت بەکاردەهێنرێت، تا ئەو ڕادەیەی کە توندوتیژی دەکەنە پاساو دژی ئافرەت، هەروەکو چۆن ئاستی ڕۆشنبیری تاکەکان لە چینە جیاوازەکانی کۆمەڵدا لـەو بڕوایـەدان کـە "ئافرەت عەورەتـە" و (ئافرەت لـە پەراسوویەکی خوار خوڵقاوە) و (ئافرەتان ئـەقڵ و ئاینیان نوقسانە) و (الرجال قوامون علـى النسـاء). چـەکی زاڵ (القوامة) لـەلای زۆر کـەس مانای ملکەچکردنی تـەواوی ژن بۆ پیاو دەگەیـەنێت، لەبەرئـەوە پێویسـتە ژن تـاوەکو بە شێوەیەکی ڕەها گوێڕایـەڵی مێردەکەی بێت، ئەوان مەسـەلەی گوێڕایـەڵی دەگـــــەڕێننەوە بۆ گوتەیەکی پێغەمبەر کە دەڵێت (لو امرت المرأة ان تسجد لغیر الله

ئەوەندە بەسە لێرەدا ئاماژە بەو مانایانە بدەین کە لە ئاین وەرگیراون بە ئامانجی سوککردنی کاری ئافرەت و بۆ جەختکردن لەسەر نزمیو کەمی ئافرەت بەکاردەهێنرێت، تا ئەو ڕادەیەی کە توندوتیژی دەکەنە پاساو دژی ئافرەت

لأمرتها ان تسجد لزوجها). لەو حاڵەتەدا کە ژن گوێڕایەڵی مێردەکەی نابێت و لە قسەی دەردەچێت، مێرد مافی ئەوەی هەیە بە ئامۆژگاریو جێگە جیاکردنەوەو لێدان تەمبێی بکات، لەم کارەشدا پشت بەو ئایەتە دەبەستێ کە دەڵێت: (واللاتی تخافون نشوزهن فعظوهن، و اهجروهن في المضاجع، واضربوهن، فإن اطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا) (سورة النساء: 34م).

ئەگەر بڕوانینە ماناکانی پێشوو دەبینین هەندێکیان گەڕاونەتەوە بۆ گوتەکانی پێغەمبەرو هەندێکی دیکەشیان بۆ چەند بەشێکی ئایەتە قورئانیەکان گەڕاونەتەوە. پەیوەندیان بە گوتەکانی پێغەمبەرەوە هەیە، ئێمە لەگەڵ ئەوانەدا نین کە بڕوایان وایە قورئان بێ لە هەر شتێکی دیکە، تاکە بەڵگەیەکەو پێویستە لە بانگەشەو شیکردنەوەدا پشتی پێببەسترێ، بۆ خۆلادان لە جیاوازیەکانی نێوان زانایان و پیاوانی ئاینی دەربارەی ئەوەی ڕاستەو ئەوەی ڕاست نیە لە گوتەکانی پێغەمبەردا.

جیاوازیمان لەگەڵ ئەوانەی ئەم بڕوایەیان هەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بۆچوونە پێشینەییەکان و ئەو باوەڕە ئاینیانەی لە ڕۆشنبیری کۆمەڵدا بڵاودەبێتەوە، بە تەنیا پشت بە فەرموودەو ئایەتەکان نابەستێت، بەڵکو بۆ قورئانیش دەگەڕێتەوە، وەك بینیمان بۆچوون و بڕواکانی تایبەت بە بابەتی زاڵبوون و بابەتی لە قسەدەرچوونی ئافرەت، سەرچاوەکەی ئایەتی قورئانی بوو، ئەمە سەرباری بوونی چەند گوتەو سەرگوزشتەیەکیش کە لە بارو پێگەی ئافرەت بەرزدەکاتەوە لە هەموو بوارەکانداو لەگەڵ پیاویشدا یەکسانی دەکات، لەوانەش بواری بەڕێوەبردن و بڕیاردان، تەنیا یەك گوتەی پێغەمبەر بۆ نموونە دەهێنینەوە کە لەمجۆرە مانایانەی زۆر هەڵگرتوە:

(كلكم راع، كلكم مسئول: الرجل راع و مسئول، و المراة راعية و مسئولة، و النساء شقائق الرجال)، لەگەڵ ئەمەشدا هیچ ڕەواج و ڕازیبوونێك نابینین بۆ ئەمجۆرە فەرموودانە، چ لەو ڕۆشنبیریەی لە ئارادایە، یان لە بیروباوەڕی پیاوە ئاینیە سەلەفییو چەقبەستوەکاندا. ئەمە بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ میتۆدو شێوازی هەڵبژێراوی هەندێك بەش، کە بە هۆیەوەو لە ڕێگەیەوە هەموو ئەو شتانە دووردەخاتەوە کە یەکسانی لە نێوان پیاوو ئافرەتدا دەهێنێتەدیو لە کارو پێگەی خێزان و کۆمەڵ بەرزدەکاتەوەو پاڵ بە ئافرەتەوە دەنێت بۆ ڕزگاریو سەربەخۆبوون و هاوبەشی کردنێکی کاریگەر بۆ بنیادنانی کۆمەڵ و پێشکەوتنی. بەکارهێنانی ئەم میتۆدە تەنیا بە گوتەکانی پێغەمبەر و سەرگوزشتەکانەوە ناوەستێت، بەڵکو پەنا بۆ قورئانیش دەبا. بۆ نموونە پەیڕەوانی ڕەوتی سەلەفیەتی چەقبەستو، ئەو بەشانە لە گوتەکانی پێغەمبەرو قورئاندا هەڵدەبژێرن و دەردەهێنن کە لەگەڵ هەڵوێستی دواکەوتوو و بەرژەوەندیە کۆمەڵایەتیو سیاسیەکانیاندا دەگونجێت، لە پێناوی هێنانەدی ئەم

بۆچوونە پێشینەییەکان و ئەو باوەڕە ئاینیانەی لە ڕۆشنبیری کۆمەڵدا بڵاودەبێتەوە،
بە تەنیا پشت بە فەرموودەو ئایەتەکان نابەستێت، بەڵکو بۆ قورئانیش دەگەڕێتەوە

کارەشدا ئایەتەکانی بەشبەش دەکەن و مانای دیکەیان دەخەنە سەر، تاوەکو لە لایەک لە خزمەتی بەرژەوەندیەکانیاندا بێت و لە لایەکی دیکەشەوە زەمینە بۆ ڕۆشنبیری نێرانە (الذکورة) خۆشبکات. لە دوا شیکردنەوەدا خۆی لە بەشێکی گرنگی ئەو ئایدیۆلۆژیا باڵادەستەدا دەنوێنێت کە پشتگیری لە شێوازی دەسەڵاتی باوکسالاری دەکات لە پەیوەندیەکان و بەها چینایەتیەکان لە کۆمەڵدا، دەزگای خێزان لە سەرو هەموو ئەو دەزگا کۆمەڵایەتیانەوەیە کە هەڵدەستێت بە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئەو بەهاو پەیوەندیانە، لە ڕێگەی دوو پرۆسەی بنەڕەتیەوە، پرۆسەی دابەشکردنی ڕەگەزی لە کاردا، لەگەڵ پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی کە لەسەر شێوازە پەروەردەییەکانی سیستمی باوکسالاری دامەزراوە. لە ئەم شتانەوە دڵنیادەبین لەوەی ئاسانە هەر کۆمەڵگەیەك لەهەر کاتێکدا بیەوێت بەهایەك لە ئایندا دەربهێنێت کە لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵ و چینە باڵادەستەکانیدا بگونجێت[25].

بە لامانەوە گرنگە لە باسکردنی بەکارهێنانی میتۆدی هەڵبژاردنی پێشوەخت و پەرتکردنی دەقەکان (المنهج الانتقائي التجزئيي) لە لایەن ڕۆشنبیری باوو پیاوانی ئاینی سەلەفیەوە، دوو نمونە بخەینەڕوو بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی ئەو مانایە. ئاشکرایە کە پیاو مافی هێنانی چەند ژنێکی هەیە بە پێی ئەو ئایەتەی دەڵێت: (فانکحوا ما طاب لکم من النساء مثنی و ثلاث و رباع)، بەشێکی ئەو ئایەتەش دەبڕێت کە لە گوتەکەدا دەربارەی چاودێری هەتیوان هاتووە، دەڵێت: (و إن خفتم الا تقسطوا في الیتامی فانکحوا ما طاب لکم من النساء مثنی و ثلاث و رباع، فان خفتم الا تعدلوا فواحدة.. النساء:*2*)، ئاشکرایە ئەم ئایەتە باس لە حاڵەتێکی تایبەت دەکات و بەندە بە بارودۆخەکانی ئەو جەنگانەی ڕوویانداوە لە بانگهێشت و بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامدا! لە ئاکامیشدا جیاوازیەکی گەورەی خستە نێو ژمارەی پیاوان و ژمارەی ژنان و زۆربوونی ژمارە هەتیوو بێوەژنەکان، لەبەرئەوە مارەکردنی چەند ژنێکیان کردە چارەسەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو گرفتە[26]. لەگەڵ ئەوەشدا ئایەتەکە هەروا هەرەمەکیانە مەسەلەکەی جێنەهێشتوە، بەڵکو مەرجی هێنانەدی یەکسانی داناوە، لەو بڕوایەشدا بووە یەکسانی لە سایەی هەبوونی چەند ژنێکدا کارێکی مەحاڵە، ئایەتە دەڵێت: (ولن تستطیعوا أن تعدلوا بین النساء ولو حرصتم.. النساء: *129*) واتە ئیسلام لە بنەڕەتدا هێنانی چەند ژنێکی حەرامکردووە، بەڵام باسکردن و پیادەکردنی ئەم مەسەلەیەش تەنیا لە حاڵەتێکی دەگمەن و بارودۆخێکی تایبەتدایە[27]. بەمشێوەیە دەبینین ئەو ڕایەی پشتئەسورە بە پەرتکردنی دەقەکان و ڕاڤەکردن و دەرهێنانی ئایەتەکان لە شوێن و میانەی خۆیاندا، ڕایەکە لە ئارادایەو ڕەواجی هەیە، لەمەش سەیرتر ئەم بڕوایە بۆتە بنەچەو بنەڕەت لە دانانی یاساکانی خێزان و دۆخی کەسایەتیدا (الاحوال الشخصیة) پشتی پێدەبەسترێت.

ئاسانە هەر کۆمەڵگەیەك لەهەر کاتێکدا بیەوێت بەهایەك لە ئایندا دەربهێنێت کە لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵ و چینە باڵادەستەکانیدا بگونجێت

بەڵام نمونەی دووەمیان کە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە دیاریکردنی پێگەی ئافرەتدا، بەندە بە مەسەلەی زاڵبوونەوە (القوامیه). زاڵبوون لە بیرو ڕۆشنبیری ئاینی کۆنەپارێزدا مانای ملکەچی ئافرەت بۆ پیاو دەگەیەنێت لە ڕووی ئابوریو کۆمەڵایەتیو خێزانیو سێکسیەوە؛ ئەگەر ئافرەت لەم بارودۆخەی یاخی ببێت، ئەوا بە بڕیاری ئاین و یاسا لە شوێن و پێگەی خۆی لایداوەو پیاو مافی ئەوەی هەیە لێرەدا تەمبێی بکات تا دەگاتە ڕادەی لێدان، ئەگەر ژن گوێڕایەڵ نەبێت، مێردەکەی دەتوانێت بەپێی مافی گوێڕایەڵی داوایەکی دادگایی لەسەر بەرزبکاتەوە لەم مەسەلەیەدا پشت بەو ئایەتە دەبەستن کە دەڵێت: (الرجال قوامون على النساء، بما فضل الله بعضهم على بعض و بما انفقوا)، هەرچەندە ئەم ئایەتە خەرجی کردۆتە پێوەرێك بۆ دیاریکردنی مەسەلەی زاڵبوون، کەچی قازیو ئەو یاسایانەی لە گۆڕێدان لە شیکردنەوەدا دەگەڕێنەوە بۆ میتۆدی پەرتکردن و هەڵبژاردنی پێشوەخت (التجزيئي الانتقائي) کە لە نیوەی یەکەمی ئایەتەکەدا هاتوە (الرجال قوامون على النساء) بەبێ ئەوەی مەرج و پێوەری خەرجی لەبەرچاو بگرن وەك لە نیوەی دوەمی ئایەتەکەدایە، بەڵام ئەگەر ئەم پێوەرە وەك بنەڕەتێك دابنرێت لە دیاریکردنی مەسەلەی زاڵبووندا، کە لە زمانی سۆسیۆلۆژیادا بە مانای (بنیادنانی هێز لە خێزاندا) دێت، ئەوا پێویستە شیکردنەوەکە تەواو جیاوازو جودا بێت، بە تایبەتی ئەگەر ئەو گۆڕانکاریانە لەبەرچاو بگرین کە بەسەر بارودۆخی ئافرەتدا هاتوە لە کۆمەڵگەی نوێدا، لە چوونە دەرەوەیان بۆ کارو بەشداریکردنیان لە چالاکی ئابوریدا لە دەرەوەی ماڵ و هاوبەشی کردنیان لە خەرجیو بەڕێوەبردنی خێزاندا.

ئەگەر لەمە زیاتریش بڕۆین ئەوا دەپرسین داخۆ هەڵوێستی پیاوانی ئاینیو یاسای کۆنەپارێزان چۆن دەبێت نەك لەو حاڵەتەدا کە ژن بەشداری مێردەکەی دەکات لە خەرجیدا، بەڵکو لەو حاڵەتانەدا کە ژن بە ڕێژەیەکی گەورەتر بەشداری خەرجیەکانی دەکات، لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی داهاتەکەی لەچاو داهاتی مێردەکەیدا، یاخود لەو حاڵەتانەدا کە خەرجی مێرد لە لایەن ژنەوە بەڕێوەدەچێت، لەوکاتانەدا کە مێردەکەی بێکار دەبێت یان کەمئەندام بێت! لە ڕاستیدا هەموو ئەم حاڵەتانەو سەرەڕای ئەو گۆڕنکاریانەی باری ئابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسی بە خۆیەوە بینیویەتیو کۆمەڵگەی میسری زیاد لە سەدەیەکە دەیبڕێت، لە نێویاندا ڕۆڵی ئەو کۆششە دیارەیە کە ئافرەتی میسری زیاتر لە حەفتا ساڵە لە ڕیزەکانی بزوتنەوەی نیشتمانیو بزوتنەوەی ئافرەتاندا کردویەتی، لە ڕێگەیەوە شوێن و پێگەی ئافرەتی پێبەرزکردۆتەوەو بەرگری لە مافی خۆی کردوە لە خوێندن و کارکردن و بەشداریکردنی سیاسیدا، لە یاساکان و دانانی یاساکاندا داوای یەکسانی نێوان

> داخۆ هەڵوێستی پیاوانی ئاینیو یاسای کۆنەپارێزان چۆن دەبێت نەك لەو حاڵەتەدا کە ژن بەشداری مێردەکەی دەکات لە خەرجیدا، بەڵکو لەو حاڵەتانەدا کە ژن بە ڕێژەیەکی گەورەتر بەشداری خەرجیەکانی دەکات

ئافرەت و پیاوی کردوە، جگە لەوەی داوای یەکسانی هەردوو ڕەگەزەکەی کردوەو بانگەشەی بۆ ڕزگاربوونی ئافرەت کردوە لە کۆت و بەندەکانی سەردەمی مەحرەم (حریم) کە سەرکردە ڕۆشنکەرەوەکانی بیری ئاینی لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا بەرزیانکردەوە، بەڵام نەیانتوانی گۆڕانێکی ئەوتۆ بخەنە نێو ناوەڕۆکەکانی بونیادی ئەو ڕۆشنبیریەی لە ئارادایە، دەربارەی کەمبوونەوەو نزمبوونەوەی کارو پێگەی ئافرەت لە خێزان و کۆمەڵدا[28]. ئەمەش خۆی لە خۆیدا جەخت لە بەردەوامی باڵادەستی سیستمی باوکسالاریو پەیوەندیەکانی دەکات، چ لە دەسەڵاتی سیاسی لە کۆمەڵدا، یاخود لە دەسەڵاتی کەسوکاردا لەناو خێزاندا.

باسکردنی ناوەڕۆکەکانی ئەو ڕۆشنبیریەی لە گۆڕێدایە بە پاڵنەرە جۆراوجۆرەکانیەوە، نابێت ئەو ڕاستیە گرنگەمان لەبیربەرێتەوە کە زۆربەی تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەکان جەختیان لەسەرکردوە، لەوەدا کە هەرچەندە هێزی کاریگەری ڕۆشنبیری بەسەر بەهاو چەمك و هۆش و ڕەفتاری تاکەکانەوە هەیە لە مەسەلە جیاوازەکانی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیدا، بەڵام ئەم کاریگەریە بە هەمان هێز هێرشی خۆی لە تاکە جیاوازەکانی کۆمەڵدا پراکتیزە ناکات، بەڵکو بە جیاوازی بارودۆخی کۆمەڵایەتیو چینایەتی خەڵکی جیاوازو جودا دەبێت، ئەمەش لەوکاتەدا ڕوون و ئاشکرا دەبێت کە ئاستی کاریگەری ناوەڕۆکەکانی ڕۆشنبیری لەسەر بارودۆخ و پێگەی ئافرەتدا جێبەجێ بکەین، هەروەکو لە ئاکامەکانی یەکێك لەو تۆژینەوانەی بە ئەنجام گەیەنرا دەربارەی ئافرەت لە لادێو شاردا، دەریانخست ئافرەت خاوەنی پلەیەك سەربەخۆیی ڕێژەییە بە گوێرەی بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکەی، واتە بە گوێرەی پلەی خوێندن و ئاستی داهاتەکەی، هەروەها پێگەی کۆمەڵایەتی خێزانی باوکی بڕێك هێزی پێدەبەخشێت بە گوێرەی ئینتمای چینایەتی خێزانەکەی[29]. ئەم ئاکامە سەرلەنوێ جەخت لە دوولایەنی ئەو چەوساندنەوەیە دەکاتەوە کە دوچاری ئافرەتانی توێژە میللیەکان و هەژارەکان دەبێتەوە لە لادێو شاردا، لەگەڵ ئەوەی ڕووبەڕووی چەوساندنەوەی چینایەتیو کەسوکارو قۆستنەوەی ئابوری دەبنەوە، کەچی لە هەموو پاراستنێکی کۆمەڵایەتی یان یاسایش بێبەشن، ئافرەتان لە هەموو کۆمەڵێکی دیکە زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەری ئەو ڕۆشنبیریەی ڕێگە بۆ چەوساندنەوەیان خۆشدەکات و هۆش و بیریان بە شێوە جۆراوجۆرەکانی چەوساندنەوەیان ساختەو چەواشە دەکەن.

لە کۆتایی شیکردنەوەکەمان لە ناوەڕۆکەکانی بونیادی ڕۆشنبیریو کاریگەرییەکەی لەسەر بە قەوارەکردنی ڕۆڵی ئافرەت و سوککردنی کارو بارەکانیو پەیوەندی ئەمەش بە بارودۆخی کۆمەڵایەتیو چینایەتی ئافرەتەوە، پێویستە ئەوەش بوترێت کە ڕەنگە باری ئەو ڕۆشنبیریەی لە گۆڕێدایە فراوان و بەهێزبێت، یان

هەرچەندە هێزی کاریگەری ڕۆشنبیری بەسەر بەهاو چەمك و هۆش و ڕەفتاری تاکەکانەوە هەیە، بەڵام ئەم کاریگەریە بە هەمان هێز هێرشی خۆی لە تاکە جیاوازەکانی کۆمەڵدا پراکتیزە ناکات

کەمبکات و لاواز بێت، لە دوا لێکدانەوەشدا بە پێویستیەك دانانرێت بۆ هەموو تاکەکان لە چینە جیاوازەکانی کۆمەڵدا.

* * *

ئەگەر بچینە سەر لێکدانەوەی بونیادو ناوەڕۆکەکانی یاسادانان و ئەو یاسایانەی تایبەتن بە ئافرەت و ڕەگەزنامەی کەسایەتیەوە (الاحوال الشخصية)،ئەوا مەسەلەکە جیاواز دەبێت؛ لەبەرئەوەی یاساکان خەسڵەتی پابەندبوونیان هەیەو بە سروشتە گشتیە ئەبستراکتەی (مجردة) جیادەکرێتەوە، واتە بە جێبەجێکردنی لەسەر هەموو ئەندامانی کۆمەڵ بە شێوەیەکی گشتی[30]. ڕاستیەکی گرنگ لێرەدا بەدەردەکەوێت، ئەویش ئەوەیە ئەگەر سیماو میکانیزم و ناوەڕۆکەکانی چەوساندنەوە باری گشتی پێکبهێنێت (هەروەکو لێکدانەوەی پێشوو ڕوونیکردەوە بۆمان)، کە تیایدا دیاردەی توندوتیژی دژ بە ئافرەت لە خێزان و کۆمەڵدا دروستدەکات و گەشەی پێدەسەنێت، ئەوا ئەم مەسەلەیە لە کاتی باسکردنی یاساکانی ڕەگەزنامەی کەسایەتیدا ڕەهەندێکی دیکە وەردەگرێت، لەبەرئەوەی خۆمان لە بەردەمی سیستمێکدا دەبینینەوە کە زەمینەی چەوساندنەوەو جیاوازکاری خۆشدەکات و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پاڵ بە ئەوەوە دەنێت توندوتیژی لە گۆڕێدا بێت.

بەوپێیەی یاسا بە پێکهێنەرێکی بنەڕەتی دادەنرێت لە پێکهێنەرەکانی سەرخانی کۆمەڵ، ئەوا بە شێوەیەکی دیالیکتیکی لە شێوازو پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان لە کۆمەڵدا ڕەنگدەداتەوە، لە هەمان کاتدا ئامرازێکی سەرەکی بۆ چینی دەسەڵاتدار پێکدەهێنێت کە خۆی لە دەوڵەت و ئامێرەکانیدا دەنوێنێت بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیە ئابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسیەکانی ئەم چینە[31].

لەبەر تیشکی لێکدانەوەی پێشوو لە بونیادی ئابوریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریداو لە زانین و ناسینی ئەو میکانیزمەی پەیوەندیەکانی بەڕێوەدەبات و پەردە لە ڕووی کۆنترۆڵکردنی پەیوەندیە چینایەتیەکانی باوکسالاری لادا لە کۆمەڵ و خێزاندا، ئەوا بە ئاسانی لە سروشتی ئەو ئایدیۆلۆژیایە تێدەگەین کە یاسای خێزان و ڕەگەزنامەی کەسایەتی لەسەر دامەزراوە لە کۆمەڵگەی میسریدا.

پێش باسکردن و خستنەڕووی دیارترین سیماکانی ئەو چەوساندنەوەو جیاکاریەی یاسا تەشریع و یاساکانی تایبەت بە ئافرەت و ڕەگەزنامەی کەسایەتی دەیهێنێتەگۆڕێ، دەمانەوێت ئاماژە بۆ یاسای ڕەگەزنامەی کەسایەتی بکەین کە ئێستا لە کۆمەڵەکەماندا کارپێدەکرێت، هەر خود ئەو یاسایەیە کە لە سایەی سیستمی مەحرەم (حەریم)دا؛ بەر لە سەدەیەك بەسەر خێزان و ژندا جێبەجێ دەکرا لە کۆمەڵگەی میسردا. لە ڕاستیدا یاساکە هەندێك گۆڕان و ڕێکخستنی بەخۆوە بینیوە، بەڵام ئەو ڕێکخستنە تەنیا لە ڕووکەشدا بووەو جەوهەری یاساکەو ناوەڕۆکەکەی هیچ نەگرتۆتەوە.

ئەگەر سیماو میکانیزم و ناوەڕۆکەکانی چەوساندنەوە باری گشتی پێکبهێنێت کە تیایدا دیاردەی توندوتیژی دژ بە ئافرەت لە خێزان و کۆمەڵدا دروستدەکات و گەشەی پێدەسەنێت، ئەوا ئەم مەسەلەیە لە کاتی باسکردنی یاساکانی ڕەگەزنامەی کەسایەتیدا ڕەهەندێکی دیکە وەردەگرێت

تەنیا سەرنجدانێك لە یاسای ڕەگەزنامەی كەسایەتی كە ئێستا كاری پێدەكرێت، دیارترین شێوەكانی جیاكاری دژ بە ئافرەت ڕووندەكاتەوە، هەروەها هەر خۆی ئەو میكانیزمە دەردەخات كە ئافرەتی پێ ملكەچ دەكرێت و دەچەوسێنرێتەوە، بەكارهێنانی هێزی یاساكان لە مەسەلەكانی وەك هاوسەرێتیو تەلاق و میراتیو سەرپەرشتی كردن و خیانەتی هاوسەرێتیو زۆر مەسەلەی دیكەش، پشت بە ڕێبازی بیروڕای زانا كۆنەپارێزو چەقبەستووەكان دەبەستێت لە دیاریكردنی بڕیارەكانیدا، زۆربەشیان بانگەشەی ئەوە دەكەن كە پشت بە شەریعەتی ئیسلامی دەبەستن، لە ڕاستیشدا پشت بە ڕێبازو بڕوای یەك تیم و كۆمەڵ دەبەستن لە شیكردنەوەدا، هەندێكی دیكەیان لە یاسای فەڕەنسیەوە وەرگیراون، بە تایبەتی بڕیارەكانی تایبەت بە خیانەتی هاوسەرێتی.

تەنیا سەرنجدانێك لە یاسای ڕەگەزنامەی كەسایەتی كە ئێستا كاری پێدەكرێت، دیارترین شێوەكانی جیاكاری دژ بە ئافرەت ڕووندەكاتەوە

شێوەكانی جیاوازیكردن لە نێوان ئافرەت و پیاو لە یاسای میسردا فرەو زۆرن، تەنیا گرنگترین و دیارترینیان دەخەینەڕوو، ئەوانیش بریین لە:

*1*-باوك مافی ئەوەی هەیە منداڵەكانی ناوو نازناوی خۆی هەڵبگرن بەبێ دایك.

*2*-باوك مافی ئەوەی هەیە ڕەگەزنامەی خۆی ببەخشێتە منداڵەكانی، تەنانەت ئەگەر ژنەكەی ئافرەتێكی بیانیش بێت، دایكیش لەم مافە بێبەش دەكرێت، باوك مامەڵەی بیانیەك لەگەڵ منداڵی ژنەكەی دەكات، منداڵەكانیش لە هەموو مافێكی كۆمەڵایەتیو سیاسی بێبەش دەكرێت وەك هاوڵاتیەكی میسری.

*3*-پیاوی میسری موسڵمان بە بێ كۆت و مەرج مافی ئەوەی هەیە تاوەكو چوار، چەند ژنێك بهێنێت، جگە لەو بەندەی خراوەتە سەر یاسای ژمارە (*44*)ی ساڵی *1979* (مادەی شەشەم بە دووبارەیی) كە تیایدا هاتووە: (ئەگەر مێرد بەبێ ڕەزامەندی ژنەكەی ژنی دیكەی هێنا، ئەوا بە زیان دادەنرێت بۆ ژنی پێشوو)، بە پێی یاسا ڕێكخراوەكە مەترسیەكانی ئەو ژنەی مێردەكەی ژنی دیكە دەهێنێت بە پێویست دادەنرێت، لەم حاڵەتەشدا ژن مافی ئەوەی هەیە داوای جیابوونەوە (تەلاق) بكات لە ماوەی ساڵێك بەسەر مێژووی ئاگاداركردنەوەكەدا لەبەرئەو زیانەی لێی دەكەوێ، لەگەڵ ئەوەی (مادە)كە مەرجی ڕەزامەندی ژنەكەی داناوە بۆ ئەوەی مێردەكەی ژنی دیكە بهێنێت، بەڵام یاداشتی (مذكرة) شیكراوەی ئەم مادەیە تەنیا مافی ئاگاداركردنەوەی پێبەس بوە، مانای ئەمەش بەهەر حاڵێك لە حاڵەكان ڕەزامەندی ناگەیەنێت، لەبەرئەوەی مەترسیەكان لە پاش هێنانی ژنێكی دیكە بە (كردەیی) دێنەگۆڕێ.

پێویستیمان بە دووبارەكردنەوەی ئەو ئایەتە نیە كە یاسا لە ڕێگەدانی هێنانی چەند ژنێكدا بۆ پیاو پشتی پێدەبەستێت، بەڵام بە كورتی بڕوای (ئیمام مەحەمەد عەبدە)

دەخەینەڕوو لە میانەی جەختکردنی لەسەر ئەوەی پێویستە کۆت دابنرێت لە بەردەم ئەم مافەی بە پیاو بەخشراوە، لە ئەنجامی ئەو زیان و گرفتانەی بە هۆی هێنانی چەند ژنێکەوە ڕوودەدەن. (محەمەد عەبدە) دەڵێت: (ئایەتی "فانكحوا ما طاب لكم من نساء" بەستراوە بە (فإن خفتم)، لەبەرئەوە دەبێت پیاوان پێش داواکاری هێنانی چەند ژنێك چاوکراوەو ئاگاداری ئەو یەکسانیە بن کە بە شەرع پێویستە لە سەریان و پاراستنی خۆشەویستی نێو منداڵەکانیان و پارێزگاری ژنەکانیشیان بکەن، لەوەی ڕەنگە کاری مێردەکەیان بەرەو کاری ناشایستەیان بەرێت، نابێت زیان بە ژن و منداڵەکانیان بگەیەنن، لەبەر هۆکارو پێویستیەکی شەرعیش نەبێت نابێت تەڵاقیان بدەن، هەروەك ئەو پیاوانەی لەخوا دەترسن و شەریعەتی یەکسانی جێبەجێ دەکەن و پارێزگاری ژن و مافەکانیان دەکەن، بە چاکی لە گەڵیاندا دەژی و لە کاتی پێویستدا لێیان جیادەبێتەوە). محەمەد عەبدە لە کاتی جەختکردنی لەوەی پێویستە کۆت لە بەردەم هێنانی چەند ژنێکدا دابنرێت، لەبەر ئەو زیانانەی لە خێزانی دەدات و هەستی شەڕانگێزی لە نێو ئەندامەکاندا دەچێنێت، هەروەها هانی کێشەو شەڕو بەکارهێنانی توندوتیژی دەدات، دەڵێت: (ئەگەر بتەوێت ئەو کێشەو نەهاتیانە جیابکەیتەوە کە بە هۆی هێنانی ژنێکەوە دێنەئاراوە، ئەوا ئەو شتانەی دەخەیتەڕوو کە موچڕك بە لەشی خاوەن باوەڕدا دەهێنن، لەو شتانە وەك دزی و زیناو خیانەت و ترسنۆکی و ساختەیی، بگرە کوشتنیش، تەنانەت کوڕ باوك دەکوژێت و باوك کوڕ دەکوژێت، ژن مێرد دەکوژێت و مێرد ژن دەکوژێت هەموو ئەمانە واقعێکی جێگیرن لە دادگاکاندا)[32].

محەمەد عەبدە لە کۆتاییدا داوای لە زاناکان کرد بڕواننە ئەم مەسەلەیە (کەس نکوڵی لەوە ناکات کە ئاین لەبەر بەرژەوەندی خەڵك و خێرو خۆشیان هاتۆتە خوارەوە، یەکێك لە بنەماکانی ئاین نەهێشتنی زیان و زیان پێنەگەیاندنە، ئەگەر مایەی تێکدەری شتێك لەسەر شتەکە ڕێز ببێت لە کاتێکدا پێشتر دوچاری نەبوە، ئەوا بێگومان پێویستە گۆڕان بخرێتە ئەو بڕیارەوەو بە سەر حاڵەتی ئێستادا جێبەجێ بکرێت، ئەویش بە کارپێکردنی ئەم ڕێسایە: (ڕێگرتن لە خراپە پێش پاراستنی بەرژەوەندیەکان دەکەوێ) بەمجۆرە لەو بڕوایەدا بوو لەبەرئەوەی خراپە لە ئارادایەو بەرژەوەندیش دژ بە خراپەیە، ئەوا پێویستە ئەو ڕێگەپێدانە قەدەغەبکرێت کە خراپەی لێدەکەوێتەوە[33].

*4*- پیاوی میسری موسڵمان مافی ئەوەی هەیە بە بێ کۆت و هەر کاتێك بیەوێت لە ژنەکەی جیابێتەوە تەڵاقی بدات، بێجگە لەو ڕێکخستنەی خراوەتە سەر یاسای *(44)*ی ساڵی *(1979)* کە هەندێکیان تایبەتە بە بەڵگاندنی (توثیق) تەڵاقەکەو ئاگادارکردنەوەی ژنەکە بەو تەڵاقە، هەندێکی دیکەشیان تایبەتە بە خەرجیکێشان (نفقة)و خەرجی چێژوەرگرتنەوە (متعة)، سەرنجدان لە وشەی (خەرجی چێژ) ئەو ناوەڕۆکە گرنگە

محەمەد عەبدە لە کاتی جەختکردنی لەوەی پێویستە کۆت لە بەردەم هێنانی چەند ژنێکدا دابنرێت، لەبەر ئەو زیانانەی لە خێزانی دەدات و هەستی شەڕانگێزی لە نێو ئەندامەکاندا دەچێنێت

دەخاتەڕوو كە یاسا بە هۆیەوە دەڕوانێە ژن لە چوارچێوەی سیستمی هاوسەرێتیدا، بەوپێیەی جەستەیەكەو پیاو مافی ئەوەی هەیە چێژی لێوەرگرێت، ئەگەر ژیانی هاوسەرێتیەكەش بە تەلاق كۆتایی پێهات، ئەوا ژن مافی ئەوەی هەیە نرخی ئەو ساڵانەی ژینی وەربگرێت كە تیایدا مێردەكەی چێژی لە جەستەی وەرگرتوە، مانای ئەمەش ئەوەیە ڕوانگەی یاسا بۆ مەسەلەی هاوسەرێتیو ژن و مێردایەتیو سێكسی لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی هەست و سۆزی ژن و مێرد نیە، بەڵكو لەسەر بنەمای هەستێك كە پەیوەندی ژن و مێردایەتی لە ناوەڕۆكە مرۆییو سۆزداریەكەی خاڵی دەكاتەوە.

*5*-لە كاتێكدا یاسا مافی ڕەها دەبەخشێتە پیاو گەر بیەوێ ژنەكەی تەلاق بدات، ئەوا پراكتیزەكردنی ئەم مافە بۆ ژن حەرام دەكات، تەنیا لە حاڵەتە دەگمەنەكاندا نەبێت، ئەویش ئەو حاڵەتەیە كە ماف و ڕاستی لای ژن بێت، دەنا ژنی زیان لێكەوتوو دەبێت ڕووبكاتە دادگاو بە شێوەیەكی مادی دیمەنەكانی ئەو زەلیل بوون و چەوساندنەوەیەی بسەلمێنێت كە لە لێدان و دەركردن و بەجێهێشتن و خەرجی نەكێشانیدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە. لەگەڵ هەموو ئەو پیادەكردنە سەخت و دوورو درێژانەی ژن بۆ سەلماندنی بارودۆخی دەیكات، كەچی لە كۆتاییدا مەسەلەكە دەكەوێتە دەست هەڵسەنگاندنی قازی كە لەتەك مادەی یاسا ستەمكارەكاندا، ڕۆشنبیری كۆمەڵێكی باوكسالاری هەڵگرتوە.

*6*-مێرد مافی ئەوەی هەیە داوای گوێڕایەڵی (طاعة) دژ بە ژنەكەی بەرزبكاتەوە، ئەگەر ئەو ژنە لە قسەی دەرچێت یان زیان لێكەوتوو بێت، چونكە لە بڕیاری یاسادا ئەو ژنە بە لەڕێدەرچوو (ناشز) دادەنرێت، واتە نەمانی هەموو مافە مادیو كۆمەڵایەتیەكانی ژن.

*7*-سەبارەت بەو مافەی پێشوو یاسا مادەیەكی زیادكردوە كە ڕێگە لە ژن دەگرێت كۆچ بكات بۆ دەرەوەی وڵات، ئیدی بارودۆخ و پێگەی ئەو ژنە هەرچیەك بێت، تەنیا بە ڕەزامەندی مێردەكەی یان لێپرسراوەكەی دەتوانێت، ئیدی باوكی بێت یان برای یان كوڕەكەی بێت!!

*8*-لە یاسای میسریدا نێر دوو ئەوەندەی مێ میراتی بەردەكەوێت، هەروەها بە بڕیاری یاسا لە میسر كەسوكاری مێ لە میراتی بێبەش دەكرێت، ئەمەش هەڵوێستی پێشوو ڕووندەكاتەوە لەوەی خێزانی میسری ئارەزووی لەدایكبوونی كچ ناكەن، چونكە ئافرەت وەك ناتوانێت ناوو نازناوی خۆی ببەخشێتە منداڵەكانی، كەسوكارەكەشی لە میراتی بێبەش دەكات، واتە ئافرەتان ناوونازناوو میراتی خێزان ناپارێزن، ئەوەش بە پێچەوانەی (نێر) پیاوەوەیە.

لە كاتێكدا یاسا مافی ڕەها دەبەخشێتە پیاو گەر بیەوێ ژنەكەی تەلاق بدات، ئەوا پراكتیزەكردنی ئەم مافە بۆ ژن حەرام دەكات، تەنیا لە حاڵەتە دەگمەنەكاندا نەبێت

*9*-لە بڕیارە تایبەتەکان بە خیانەتی هاوسەرێتی، یاسا جیاوازی دەخاتە نێوان پیاوو ئافرەتەوە، ئەگەر بە بەڵگەوە ئاشکرابوو پیاو خیانەت لە ژنەکەی دەکات، ئەوا هیچ سزایەك نادرێت، بەڵکو ئەو پیاوە تەنیا شایەتێکە لەسەر ئەو ژنەی خیانەتەکەی لەگەڵدا کردوە، بەڵام ئەگەر بە بەڵگەوە دەرکەوت ژن خیانەت لە مێردەکەی دەکات، چ لە ماڵی خۆیدا بێت یان لە دەرەوەیدا، ئەوا سزای دوو ساڵ بەندکردنی دەدرێت لە یاسای میسریدا[34]. لەگەڵیشدا هەموو مافە یاساییەکانی لێزەوت دەکرێت. یاسا لەمە زیاتریش دەڕوات، ئەگەر مێرد ژنەکەی کوشت (ئەو ژنەی خیانەتی لێکردوە) ئەوا وا حسابی بۆ دەکرێت کە پیاوەکە بەرگری لە خۆیو لە شەرەفی خۆی کردوە، بەڵام ئەگەر لە هەمان مەرج و بارودۆخدا ژن مێردەکەی کوشت، ئەوا لە ڕوانگەی یاسادا ئەو ژنە (پیاوکوژە)و یاسای تاوان و بڕیارەکانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت.

لەگەڵ ئەوەی زۆربەی بڕیارە تایبەتەکان بە یاسای ڕەگەزنامەی کەسایەتیەوە (وەکو بانگەشەی بۆ دەکەن) لە شەریعەتی ئیسلامیەوە وەرگیراون، ئەوا بڕیار لە بابەتی خیانەتکردندا پشت بە یاسایەکی فەرەنسی دەبەستێت، شەریعەت بە یەکسانیەکی تەاو، سزای نێوان پیاوو ئافرەتی یەکسان کردوە، ئەمەش بە پێی دەقی ئەو ئایەتەی دەڵێت: (الزانية و الزاني فاجلدوا كل واحد منهما مائة جلدة.. سورة النور: *2*) یاسا لەمەدا لە بەکارهێنانی میتۆدی هەڵبژاردنی مەبەستگەرا هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ ئەو ڕۆشنبیریو بیرە ئاینیەی لە گۆڕێدایە، کە لە ڕێگەی بنەماکانی باوکسالاریو چینایەتیەوە جەخت لەو فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیایە دەکات کە لەسەری بنیادنراوە، لە پێناو ئەوەشدا هەندێك جار ڕوودەکاتە شەریعەت بە گەڕانەوەی بۆ زۆربەی ڕێبازو بۆچوونی کۆنەپارێزەکان، هەندێك جاریش ڕوودەکاتە یاسای دانراو (الوضعي)، لە هەردوو حاڵەتەکەشدا زەمینە بۆ ستەم و چەوسانەوەی ئافرەت دەڕەخسێنێت، ئەو ماف و بەهانانەش دەداتە پیاو کە کۆنتڕۆڵی ئافرەتی پێبکات و بە زەبری یاسا ئافرەت ملکەچ بکات.

*10*-یاسا شایەتی ئافرەت بە شایەتیەکی ناتەواو دادەنێت، شایەتی پیاو بەرامبەر شایەتی دوو ئافرەتە، لەسەر ئەم بنەمایەش یاسا ئافرەتی لە پلەوپایەی دادوەری (القضاء) بێبەش کردوە، لە مادەی (*2*)ی یاسای ژمارە (*18*)ی ساڵی (*1952*)دا هاتوە (نابێت هیچ کەسێك لە وەزیفەی دادوەریدا دابمەزرێت تاوەکو باش لە تواناو شیاویی ئەو کەسە بۆ دادوەری نەکۆڵرێتەوە، لەبەرئەوەش کە پێگەی ئافرەت لە پیاو کەمترو نزمترە لە شایەتیدا، ئەوا ئافرەت گونجاوو شیاو نیە بۆ وەرگرتنی کاری دادوەری)، یاسادانەرانی میسری زۆربەی ئەو بۆچوون و فەتوایانەی لەیاد کردوە، کە جیاوازی نەخستۆتە نێوان پیاوو ئافرەتەوە لە مەسەلەی بەڕێوەبردندا، گوتەی (ابن جرير) بۆ

لەگەڵ ئەوەی زۆربەی بڕیارە تایبەتەکان بە یاسای ڕەگەزنامەی کەسایەتییەوە لە شەریعەتی ئیسلامییەوە وەرگیراون، ئەوا بڕیار لە بابەتی خیانەتکردندا پشت بە یاسایەکی فەرەنسی دەبەستێت

نمونە دەهێنینەوە کە دەڵێت: (نێرایەتی لە دادوەریدا نابێتە مەرج، لەبەرئەوەی ئافرەت بۆی هەیە فەتوا بدات، کەواتە بۆی هەیە ببێتە دادوەریش)، (ابی حنیفة)ش دەڵێت: (ئافرەت بۆی هەیە لە کاروباری کەسایەتیدا (الاحوال) ببێتە دادوەر) و هەروها (الطبری) دەڵێت: (ئافرەت بە ڕەهایی بۆی هەیە ببێتە دادوەر لە هەموو شتێکدا)[35]. ئەمە سەبارەت بە بۆچونی زانا ئاینیەکان، جگە لەوەی (بەنازیر عەلی بۆتۆ) دەبێتە نمونەیەکی هاوچەرخ بۆ دەسەڵاتگرتنە دەست لە پایەی سەرۆك وەزیراندا لە پاکستاندا، کە یەکێکە لە وڵاتە موسڵمانە گەورەکان.

هەڵوێستی یاسای میسری دەربارەی ئافرەت بە بڕیارو ناوەرۆکی دەق و مادەکانیەوە بەمجۆرە دەردەکەوێ، لە بڕیارەکانی سوککردن و کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئافرەت لە خێزان و کۆمەڵدا، ئەمەش پێچەوانەی دەقی مادەی *40*ی ئەو دەستورەیە کە بڕیار دەدات: (هاوڵاتیان لە ماف و ئەرکەکاندا یەکسانن، لەمەدا هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوانیاندا بە هۆی ڕەگەز یان بنەچە یان زمان یان ئاین یاخود باوەڕ).

هەندێك وڵاتی عەرەبی توانیویانە ڕێکخستن و گۆڕانکاریەکی جەوهەری بخەنە نێو یاساکانی خێزان و ڕەگەزنامەی کەسایەتیەوە کە دەبێتە هۆی هێنانەدی یەکسانی لە نێوان ئافرەت و پیاودا، لەوانەش یاسای تونسیو یاسای عێراقیە کە بە هۆیەوە توانیویانە کۆت بخەنە بەردەم مافی هێنانی ژنی زۆر بە نیسبەت پیاوەوەو مافی یەکسانی ببەخشنە هەریەك لە پیاوو ئافرەت لە داواکردنی تەڵاق لە بەردەم دادگاداو مافی یەکسانی نێرومێ لە میراتیدا، لەم بارەیەوە پێویستە ئەوەش بوترێت کە ئەم یاسایانەش پشتیان بەستوە بە ڕێبازو بۆچوونی پیاوانی ئاینی شەریعەتی ئیسلامیەوە.

ئەم پەرەسەندنە لە یاساکانی خێزاندا کە لە هەندێك وڵاتی عەرەبیدا ڕوویداوە وامان لێدەکات لە خاڵێکدا بوەستین کە هەڵگری مشتومڕو سەرنجدانە، ئەویش دەربارەی ئەو جیاکاریو دژایەتیەیە کە تیایدا شۆڕشی (یۆلیۆ *1952*) ڕوویدا بە بۆچوونە شۆڕشگێڕیو پێشکەوتوخوازەکەیەوە، کاتێك لە زۆربەی لایەنەکاندا چەندین یاسای دەرکردو دارشت کە پێشتر هەروا ئاسان نەبوو دەستیان لێبدرێت، بەوەش هەوڵی ڕووخاندنی بنەمای هێزە باوو ئاساییەکانی کۆمەڵگای دا بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی پەیوەندیەکانی هێز لەسەر بنەمای نوێوە، بە تایبەت ئەو یاسایانەی بە موڵکایەتیەوە تایبەت بوون، شۆڕش چەندین یاسای چاکردنی کشتوکاڵیو خۆماڵی کردنی دەرکرد، هەروەها ئەو بڕیارەی دەرکرد کە کرێکار مافی ئەوەی هەیە لە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکاندا بەشدای بکات، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە نەیتوانی لە یاساکانی باری کەسایەتی (الاحوال الشخصیة) نزیك ببێتەوە.

**هەندێك وڵاتی عەرەبی توانیویانە ڕێکخستن و گۆڕانکاریەکی جەوهەری بخەنە نێو یاساکانی خێزان و ڕەگەزنامەی کەسایەتیەوە کە دەبێتە هۆی هێنانەدی یەکسانی لە نێوان ئافرەت و پیاودا**

لە ڕاستیدا شۆڕشی یۆلیۆ *1952* مافێکی زۆری بەخشیە ئافرەت لە بوارەکانی ژیانی سیاسیو ئابوری و کۆمەڵایەتیدا، بۆ نمونە مافی هەڵبژاردن بە گوێرەی دەستووری *(1956)* و یەکسانی نێوان ئافرەت و پیاو لە کرێی هەمان کاردا، هەروەها یاسای خوێندن بە خۆڕایی، کە کاریگەریەکی دیاری هەبوو، بواری بۆ کچی میسری ڕەخساند وەکو کوڕ لە زۆربەی قۆناغەکانی خوێندندا بخوێنێت، بەڵام ئێمە لەو بڕوایەداین تاوەکو یاسای باری کەسایەتی هەر بەم شێوەیە بمێنێتەوەو هەروەکو خۆی پەیوەندیەکان لەناو خێزاندا بەڕێوەببات، هەموو ئەم مافانەش هەر ناتەواو دەبن و بەربەستیان لەبەردەمدایە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەگەر ئافرەت لە ڕووی مێژووییەوە لە ڕێگەی ملکەچکردنی بۆ کۆنترۆڵی پیاو لە خێزاندا کرابێت بە کۆیلە، ئەوا ئازادبوونیو ڕزگارکردنی وزەکانی تەنیا بە بەخشینی هەندێك مافی سیاسیو کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی خێزاندا نایەتەدی، بەڵکو پێویستە ئەو مافانە لەگەڵ بارودۆخی یاسا نوێیەکانی تایبەت بە باری کەسایەتیدا بڕوات لە هێڵێکی یەکساندا، بە جۆرێك ڕێکخستن و دیاریکردنی پەیوەندیەکانی نێوی لەسەر بنەڕەتێك دابمەزرێت کە یەکسانی لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا دەهێنێتەدی.

(جۆن ستیوارت میل) جەخت لەم بڕوایە دەکات و دەڵێت: (هەڵەیە ئەو پڕەنسیپەی کە پەیوەندی کۆمەڵایەتی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە بەڕێوەدەبات لەسەر یاسای ملکەچ پێکردنی ژن بۆ پیاو بمێنێتەوە، ئەمە بە گرنگترین ئەو هۆکارانە دادەنرێت کە ڕێگە لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی دەگرێت، لەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان ئەم یاسایە بگۆڕین بۆ یاسایەکی دیکە کە یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا دەهێنێتەدی)[36].

پێدەچێت دەرکردنی یاسایەکی نوێ لە باری کەسایەتیدا مەترسیدارترو جەربەزانەترو شۆڕشگێڕانەتر بێت لەچاو دەرکردنی یاسای خۆماڵی کردندا، ئەمەش یان ئەوەتا بۆ کامڵ نەبوون و پێنەگەیشتنی ڕوانگەی شۆڕشگێڕی دەگەڕێتەوە، یان بۆ کەموکووڕی لەچاونەترسێتی شۆڕشێگێڕیدا، یاخود لە هەندێك حاڵەتدا دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریو زۆرلێکردنی ڕای گشتی کە ملکەچی بۆماوەیی خونەریتە کۆنەپەرستەکانن، ئەگەرچی ئاکام لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا هەر ئاکامێکە، ئەوەیە کە دژایەتیەکی زەق لە نێوان بونیادی ژێرخان و بونیادی سەرخاندا دروست دەبێت، لە نێوان موڵکایەتی بە کۆمەڵی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و لە نێوان پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا کە نیمچە دەرەبەگایەتین[37].

ڕەنگە ئەمە حاڵەتی ئەو چەقبەستنە دەرخات کە یاسای باری کەسایەتی لەسەر ماوەتەوە، لە ساڵی *(1927)*ەوە هەوڵەکانی ڕێکخستنی ئەم یاسایە ڕاگیراوە لە میسردا،

هەڵەیە ئەو پڕەنسیپەی کە پەیوەندی کۆمەڵایەتی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە بەڕێوەدەبات لەسەر یاسای ملکەچ پێکردنی ژن بۆ پیاو بمێنێتەوە

لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکاریە ئابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسیانەشدا کە بە درێژایی ئەم ماوەیە کۆمەڵ بە خۆیەوە بینیویەتی، دەبێت ئەوەش بڵێین یاسای (44)ی ساڵی (1979) کە پێشتر ئامارەمان بۆکردو ناوەرۆکەکەی لە ڕێکخستنی ئەندەکی ڕووکەشەکەیدا بەدەرکەوت، لەژێر گوشارێکی جیهانیو لە سایەی هەڵمەتێکی نەتەوە یەکگرتوەکاندا بۆ نەهێشتنی هەموو شێوەکانی جیاکاری دژ بە ئافرەت دەرکرا، کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا بەرجەستە بوو[38]:

یەکەم: ڕاگەیاندنی جیهانی تایبەت بە نەهێشتنی جیاکاری دژ بە ئافرەت، کە لە لایەن کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە دەرکرا لە بەرواری (7/11/1968)، دەقی ئەو بڕیارەش بریتی بوو لە:

1/جیاکاری دژ بە ئافرەت ناگونجێت لەگەڵ کەرامەتی مرۆیی یان خۆشگوزەرانی خێزان و کۆمەڵداو بەبێ بەشداریکردنی ئافرەت لەسەر بنەمای یەکسانی بوونی بە پیاو لە ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوریو ڕۆشنبیریدا کاروباری وڵاتەکەی بەڕێوەناڕوات، هەروەها دەبێتە بەربەستێك لە بەردەم پەرەسەندنی تەواوەتی وزەکانی ئافرەت بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵەکەی، لەبەرئەوە دەبێت وزەو تواناکان بخرێنەکار بۆ نەهێشتنی جیاکاریو لابردنی پراکتیزەکردنی خوونەریت و هەموو ئەو شتانەی زەمینە بۆ بیرۆکەی هەست بە کەمیکردنی ئافرەت لەچاو پیاودا دەڕەخسێنێت.

2/ئافرەت هەمان ئەو مافانەی هەیە کە بە پیاو بەخشراون لە هەڵبژاردنی ئازادانەی هاوسەری ژیانیداو لە دەستپێکردنی ژیانی هاوسەرێتیدا بە ڕەزامەندی تەواو سەربەستانەی خۆی، هەروەها لەکاتی هاوسەرێتیدا یاخود لە کاتی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرێتیدا هەمان مافی پیاوی هەیە.

3/تۆمارکردنی حاڵەتەکانی هاوسەرێتیو جیابوونەوەو (تەلاق) لە لیستە ڕەسمیەکاندا پێویستە بە زۆر (اجباری) پیادەبکرێت.

4/لابردنی کارکردن بە نرخی بووك (شیربایی) و زامنکردنی مافی ئافرەت لە چاودێریکردنی منداڵەکانیداو پێویستە ئازادیش بێت لە کاتی دووبارە شوو کردنەوەیدا.

5/دەبێت بە پێی پێویستی، کار بە هەموو پیادەکردنێکی گونجاو بکرێت بۆ زامن کردنی مافەکانی ئافرەت لەسەر بنەمای یەکسان بوونی پیاو، هەروەها کار بە پیادەکردنە پێویستەکان بکرێت بۆ قەدەغەکردنی بازرگانی کردن بە ئافرەتەوەو قۆستنەوەی بۆ بەڕەڵایی.

دووەم: نەتەوە یەکگرتووەکان لە (18/12/1972)دا ڕایگەیاند کە ساڵی (1975) تایبەت بکرێت بۆ ساڵێکی جیهانی ئافرەتان، (دە) ساڵ پاش ئەوە درێژەی کێشا، لە

جیاکاری دژ بە ئافرەت ناگونجێت لەگەڵ کەرامەتی مرۆیی یان خۆشگوزەرانی خێزان و کۆمەڵداو بەبێ بەشداریکردنی ئافرەت لەسەر بنەمای یەکسانی بوونی بە پیاو کاروباری وڵاتەکەی بەڕێوەناڕوات

ساڵەکانی (1976–1985)، ئەم ماوەیەیان بە پەیمانێکی جیهانی ئافرەتان دانا، ئەمەش بە پێی ڕێکۆمێندێکی (توصیە) ئەو کۆنگرە جیهانیەی بۆ ساڵی تایبەت بە ئافرەتان لە مەکسیك بەسترا، لقەکانی ئەو ڕیکۆمێندە هەموو ئەو ڕێو شوێنانەی لەخۆگرتبوو کە پێویستە بۆ نەهێشتنی ئەو بەربەستانەی دوچاری ئافرەت دەبێتەوە لە هەموو بوارەکاندا پیادە بکرێت، لەژێر دروشمی (یەکسانیو پەرەپێدان و ئاشتی)دا.

سێیەم: نەتەوە یەکگرتوەکان لە کانوونی یەکەمی (1979)دا ڕێکەوتننامەیەکی دەرکرد بۆ نەهێشتنی هەموو شێوەکانی جیاکاری دژ بە ئافرەت، لە پێشەکی ئەم ڕێکەوتننامەیەشدا جەخت لەسەر ئەوە کراوە کە پێویستە ئافرەت و پیاو لەسەر بنەمای یەکسانی لە پرۆسەکانی پەرەپێدانی کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیدا پێکەوە بەشداری یەکتر بکەن و پێکەوە خۆشگوزەران بن، هەروەها داکۆکی لە پێویستی دابینکردنێکی جیهانی کرد کە بە شێوەیەکی یاسایی دان بنێت بە پرەنسیپی یەکسانی نێوان ئافرەت و پیاودا.

سەرەڕای هەموو گۆڕانکاریو پەرەسەندنانەی ڕویاندا، چ لە ئاستی ناوخۆیی یان جیهانی، ئەو ڕێکخستنانەی یاسای ڕەگەزنامەی کەسایەتی ژمارە (44)ی ساڵی (1979) هێنایە گۆڕێ، کە بە داوای نادەستووری ئەم یاسایە لابراو گۆڕا بۆ یاسای (100)ی ساڵی (1985) هیچ هەنگاوێکی ڕاستەقینەیی هەڵنەهێنا لە ڕێی لابردنی شێوەکانی جیاکاری لە نێوان ئافرەت و پیاو لە خێزاندا، ئەم یاسایە لە وێنەی قامچیەکی باڵادەستدا مایەوە بەسەر ئافرەتدا، تا واهەست بکات بەردەوام لە هەڕەشەدایەو هەستی دڵنیایی بە کۆمەڵایەتیو دەروونی لەلا نەمێنێت، بێجگە لەو ناڵۆزبوون و پاشەکشێیەی ئافرەت کە لە بواری بەشداریکردنی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیدا ڕوویدا لە سایەی ئەو گۆڕانکاریانەی کۆمەڵ بە خۆیەوە بینی، لە بوونیادەکانیو پەیوەندیەکانیو ڕەوتگەری بەهادا، لە ئەنجامی جێبەجێکردنی سیاسەتی بوژاندنەوەی ئابووریو ئەو شوێنەوارو ئاکامانەی لێی کەوتۆتەوە[39].

بۆ تەواو دەرخستنی ڕەهەندو لایەنەکانی ئەو دیمەنانەی توندوتیژی بونیادگەری، کە دەرهەق بە ئافرەت دەکرێت، بە پێویستمان زانی تیشك بخەینەسەر ناوەرۆکەکانی دیمەنی ئافرەت بەو جۆرەی لە ئامرازە جیاوازەکانی ڕاگەیاندن و ئەو سیاسەتەی لە پشتەوەیەتی ڕەنگدەداتەوە.

زۆربەی ئەو تۆژینەوانەی لەسەر ئەم بابەتە بە ئەنجام گەیەنران دەریانخستوە(40) بۆمان کە ناوەرۆك و ناواخنی ئەو دیمەنانەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن (خوێندراو، بینراو، بیستراو) بۆ ئافرەتی دادەنێت، لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەرناچێت:

ئەم یاسایە لە وێنەی قامچیەکی باڵادەستدا مایەوە بەسەر ئافرەتدا، تا واهەست بکات بەردەوام لە هەڕەشەدایەو هەستی دڵنیایی بە کۆمەڵایەتیو دەروونی لەلا نەمێنێت

*1*-سەرنج خستنەسەر ڕۆڵە باوو ئاساییەکانی ئافرەت (ژن، دایک، ژنی ماڵ) لەگەڵ خافڵ کردنێکی نیمچە تەواوی ڕۆڵی ئافرەت وەك هێزی کارو بەرهەمهێن و هاوبەش لە پەرەپێدان و کاری سیاسیو بڕیارداندا.

*2*-بەردەوام جەخت لەسەر بەستنەوەی کاری ئافرەت بە لادان و هەڵوەشاندنەوەی خێزان دەکەن، منداڵانی لادەرو لە ڕێدەرچوو لە ناوەڕۆکی مادەی ڕاگەیاندندا بە زۆری منداڵی ئەو دایکانەن کە لە دەرەوەی ماڵ کاردەکەن، هەروەها مەیدانەکانی خوێندن و کارکردن دەگۆڕن بۆ بوارەکانی لادانی ئافرەت، نەك بۆ بواری بەرهەمهێنان و بەدەستهێنانی زانست.

*3*-لە ناوەڕۆکی ڕاگەیاندندا بە بوارە جیاوازەکانیەوە (ڕۆژنامە، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، سینەما) دیمەنی ئافرەت وەك پاشکۆی پیاو دەردەکەوێت، ئافرەت خزمەتی پیاو دەکات و تەواو پشتی پێدەبەستێت، هەروەها لە دیمەنی ملکەچ بە بڕیارەکانی پیاودا دەردەکەوێت.

*4*-دیمەنی پیاو بە تایبەتی لە فیلمدا سیماکانی پاڵەوانێتیو هێزی ماسولکەییو توندوتیژیو زیرەکی وەردەگرێت، بەڵام دیمەنی ئافرەت بە پێچەوانەوە سیماکانی لاوازیو گەمژەییو خۆشباوەڕی و دوورکەوتنەوەی لە ئەقڵانیەت لە بیرکردنەوەو ڕەفتاردا دەردەکەوێت.

*5*-لە بەرامبەر دیمەنی ژنی ملکەچ و دایکی پیردا، مادەکانی ڕاگەیاندن بە تایبەتی فیلم و پڕوپاگەندەو وێنەی ئافرەت وەك بابەتی وروژاندن و سێکس وەردەگرێت، وەك ئەو ئافرەتەی کە لە سەریەتی خۆی بڕازێنێتەوە بۆ پیاو، ئیدی بە ئامانجی ڕاوکردنی بێت یان وروژاندنی، لەمەشدا ڕوودەکاتە ئەو لایەنە جۆراوجۆرانەی ئافرەت بایەخیان پێدەدات وەك جلوبەرگ و داوودەرمان و بۆن و سابون و فلچەو دەرمانی دان شتن.

*6*-ئافرەت لە دیمەنی بەرخۆردا بەدەردەخات، چ بۆ شمەکەکانی ناوماڵ و ئامێرە کارەباییەکان و بەرهەمە خۆراکیەکان، یان بۆ جلوبەرگ و ئامرازەکانی ڕازاندنەوە.

*7*-ناوەڕۆکی ڕاگەیاندن بێلایەنی ئاکاری پیاو دەردەخات لە بەرامبەر تاوانبارکردنی تەواوی ئافرەتدا، ئەگەر پیاو هەڵەی کرد ئەوا ڕووبەڕووی سزا نابێتەوە، چونکە پیاو زۆرجار کەوتۆتە نێو داوی ئافرەتەوە، لەبەرئەوە سزادان بە تەنیا بەشی ئافرەت دەبێت لەسەر ئەو کردەیەی پیاوێك یان دوو پیاو نواندوویانە، ئەمەش لە دراما سینەماییەکاندا ئاشکرایە کە سەرنج دەخاتە سەر دیمەنی ئافرەتی لەڕێدەرچوو (سۆزانی، ئەندامێکی نێو تیمی گێرەشێوێنەکان، دز، سواڵکەر).

*8*-ئافرەتانی چینە میللیەکان لە لادێو شاردا، زۆربەی ئافرەتانی کۆمەڵ پێکدەهێنن، کەچی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بایەخێکی کەمیان پێدەدا، چ لەو ڕووبەرەی

دیمەنی پیاو بە تایبەتی لە فیلمدا سیماکانی پاڵەوانێتیو هێزی ماسولکەییو توندوتیژیو زیرەکی وەردەگرێت، بەڵام دیمەنی ئافرەت بە پێچەوانەوە سیماکانی لاوازیو گەمژەییو خۆشباوەڕی و دوورکەوتنەوەی لە ئەقڵانیەت لە بیرکردنەوەو ڕەفتاردا دەردەکەوێت

پێیان دراوه یان له نێو بابه‌ته‌كانیاندا، نامه‌كانی ڕاگه‌یاندن كه ئاراسته‌ی ئافره‌تانی ئه‌م چینانه ده‌كرێت، شێوازی ئامۆژگاری و ڕێنمایی له خۆگرتوه، به‌و پێیه‌ی ئه‌وان به‌رپرسن له زۆربه‌ی گرفته‌كاندا، له سه‌رووی هه‌موویانه‌وه گرفتی زۆربوونی (ته‌قینه‌وه‌ی) ژماره‌ی دانیشتوان و پیسبوونی ژینگه، كه‌چی ناوه‌ڕۆكی ڕاگه‌یاندن به ناواخنه‌كانیه‌وه ڕۆڵی ئافره‌ت، به تایبه‌تی ئافره‌تی لادێ له كارو به‌رهه‌مهێنانی خێزانی‌و كشتوكاڵیداو ئه‌و گرفت و نه‌هامه‌تیانه‌ی دێته ڕێگه‌ی له هێنانه‌دی ئه‌م ڕۆڵه‌دا پشتگوێ ده‌خات.

له ڕاستیدا دیمه‌نی ئافره‌ت، به‌و جۆره‌ی له ناوه‌ڕۆكه‌كانی ڕاگه‌یاندندا ڕه‌نگده‌داته‌وه، به به‌شێك له‌و ئایدیۆلۆژیاو سیاسه‌ته داده‌نرێت كه كۆنترۆڵی ئامرازه‌كانی ڕاگه‌یاندنی كردوه له كۆمه‌ڵدا، كه به شێوه‌یه‌كی ڕاسته‌وخۆ ملكه‌چی ده‌سه‌ڵاتی ڕه‌سمی ده‌وڵه‌ته، بێگومان ئه‌مه‌ش جه‌خت له‌وه ده‌كات كه ئایدیۆلۆژیای ڕه‌سمی ده‌وڵه‌ت هه‌ڵوێستێكی كۆنه‌په‌رستانه‌ی هه‌یه به‌رامبه‌ر ئافره‌ت و دان نانێت به ڕۆڵی كۆمه‌ڵایه‌تی به‌رهه‌مهێنیدا، یان به ڕۆڵیدا له په‌ره‌پێدان و هاوبه‌شی سیاسی‌و بڕیارداندا. ئافره‌ت له ڕێگه‌ی ئامرازه‌كانی ڕاگه‌یاندنی خۆیه‌وه هه‌وڵی لایه‌نگری و دانانی به‌هاو په‌یوه‌ندیه ئاسایی‌و باوه‌كان ده‌دات له نێوان ئافره‌ت و پیاودا له كۆمه‌ڵ‌و خێزاندا، كه له كۆتاییدا خزمه‌تی بنیادنانی هێزی ئاسایی‌و باو ده‌كات له هه‌ردووكیاندا پێكه‌وه، له لایه‌كی دیكه‌وه ئه‌و ڕۆڵه‌ی ئامرازه‌كانی ڕاگه‌یاندن ده‌یگێڕن له پێشكه‌شكردنی دیمه‌نی ئافره‌ت و ڕۆڵه‌كانی له كۆمه‌ڵدا، مانای چه‌واشه‌كردنی واقیع و چه‌واشه‌كردنی هۆش و بیری وه‌ك یه‌ك له‌خۆگرتوه. چه‌واشه‌كردنی واقیع له گوێنه‌دان و غافڵ كردنی ڕۆڵی كۆمه‌ڵایه‌تی‌و سیاسی ئافره‌ته له مێژووی نوێ‌و هاوچه‌رخی كۆمه‌ڵگه‌دا، چه‌واشه‌كردنی هۆش و بیریش له جێگیركردن و قوڵكردنه‌وه‌ی بیرۆكه‌ی نزمی ئافره‌تدا خۆی ده‌رده‌خات له ڕێگه‌ی سه‌رنج خستنه‌سه‌ر ڕۆڵه ئاساییه‌كه‌ی وه‌ك ژنێكی ملكه‌چ و گوێڕایه‌ڵ و دایكێكی پیرو خزمه‌تكاری خێزانه‌كه‌ی، یاخود له سه‌رنجدانی ڕۆڵی ئافره‌ت وه‌ك مێ‌و بابه‌تی سێكس و وروژاندن.

* * *

له‌م توێژینه‌وه‌یه‌دا هه‌وڵمان دا سیماكانی سته‌م و چه‌وساندنه‌وه‌ی مرۆڤ بخه‌ینه‌ڕوو و په‌رده له ڕووی میكانیزم و ئه‌و ناوه‌ڕۆكانه‌ی توندوتیژی لابده‌ین كه بنه‌ماكانی ئابوری‌و كۆمه‌ڵایه‌تی‌و ڕۆشنبیری و ئاینی‌و ڕاگه‌یاندن له‌خۆیان گرتوه، ئێمه له‌و باوه‌ڕه‌وه ده‌ڵێین (مرۆڤ له‌هه‌ر بارودۆخێكدا مرۆڤێكی دیكه بقۆزێته‌وه یان تواناكانی له هێنانه‌دی خودو بوونی خۆیدا له‌كاربخات ئه‌وه شێوه‌ی چه‌وساندنه‌وه‌یه‌كی توندوتیژه، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر هه‌ندێك جار به به‌رگی سۆزو

له ڕاستیدا دیمه‌نی ئافره‌ت، به‌و جۆره‌ی له ناوه‌ڕۆكه‌كانی ڕاگه‌یاندندا ڕه‌نگده‌داته‌وه، به به‌شێك له‌و ئایدیۆلۆژیاو سیاسه‌ته داده‌نرێت كه كۆنترۆڵی ئامرازه‌كانی ڕاگه‌یاندنی كردوه له كۆمه‌ڵدا

پەرەییەکی زیادیش داپۆشرابێت. بە واتایەکی دیکە بوونی ئەو پەیوەندییەی لەسەر چەوساندنەوە دامەزراوە، تەنها مانای بوونی پەیوەندیەك دەگەیەنێت کە توندوتیژی تێدایە، چونکە مەحاڵە چەوساوەیەك هەبێت بەبێ بوونی توندوتیژییەك کە دەرهەقی دەکرێ[41].

* * *

بوونی ئەو پەیوەندیەی لەسەر چەوساندنەوە دامەزراوە، تەنها مانای بوونی پەیوەندیەك دەگەیەنێت کە توندوتیژی تێدایە، چونکە مەحاڵە چەوساوەیەك هەبێت بەبێ بوونی توندوتیژیەك کە دەرهەقی دەکرێ

# پەراوێزەکان

1/دەتوانین لەم بارەیەوە بگەڕێیتەوە بۆ ئەو سەرچاوەو فەرهەنگانەی بایەخیان داوە بە پێناسەکردنی چەمکی توندوتیژی وەکو:

ا- James, f. short and Marvin, E. wolfgang, Collection. New York: Aldine- 1977. PP. 101- 111

ب- Webster, S.dictionary, from Alexander R. kmritchell, Voilence in the famiely, England.

2-صلاح عامر لە تۆژینەوەی (توندوتیژیو یاسا)دا باسی گوندجاندنی یاسای توندوتیژی دەکات لەسەر هەدوو ئاستی نیشتمانی و جیهانی- القاهرة/ 1978. و چەمکی توندوتیژی بارودۆخەکانی بونیادگەری یان هەیکەلی بەرجەستەکردوە، لەو بڕوایەدایە (توندوتیژی، سیما یان ڕووکەشی ناتەواییەکی بابەتیە لە بنەمای ئەو کۆمەڵ و تۆڕانەی پەیوەندی جۆراوجۆریان دامەزراندوە)، کاتێك چاوگەکانی ناتەواویو ناهاوسەنگی لە پەیوەندیە ئابوریو کۆمەلایەتیو سیاسیەکاندا زیاد دەکات، توندوتیژی دەبێتە دیاردەیەکی (هەردەبێت- حەتمی)، وەکو کاردانەوەیەکی سروشتیو ناکامێکی چاوەڕوان کراوە لەو بارودۆخانە. هەروها بڕوانە:

Johan Galtung "A Structural Theory of Aggression,
Claggett Smith ed, Notrdam press,", London- Univ, 1971.

3-Thompsom, L. Jane, Sociology, Simble Books, Heinemam: London, 1982, pp. 52, 53, 60.

4- ا/Ibid, pp. 59

ب/Peter Bachrach and Morton S, Baroter, Oxford uniu, press, 1970.

5-Good, W. Exploration of Social Theory, 1973.

6-المسح الاجتماعی الشامل للمجتمع المصري (1952-1980) المركز القومي للبحوث الاجتماعية و الجنائية، القاهرة/ 1985- ص 134-135.

7-ليلى عبدالوهاب، تغير ادوار المراة و تطور المجتمع، المجلة الاجتماعية القومية، المركز القومى للبحوث الاجتماعية و الجنائية، مايو، سبتمبر 1978/ ص 138-139.

8-Thompson, L. jane, SociLogy, Heinemam, London 1982- pp. 69.

9-محمد عوض خميس، دفاعا عن المراة، دراسة نفسية اجتماعية جنسية، العربي للنشر و التوزيع/ 1985- ص 43، هەروەها بگەڕێوە بۆ:

ا-باخوفين، حق الامم، ترجمة: جورج طرابيشى، دار الطليعة- بيروت- 1977.

ب-انجلز، اصل العائلة و الملكية الخاصة و الدولة، دار التقدم- موسكو- 1970.

ج-بول لافرج، مسالة المراة، ص (79-115).

10-محمد عوض خميس، دفاعا عن المراة (فصل الثاني- اغتراب المراة) ص 79-115.

11-عاطف العبد، المراة الريفية، القاهرة- دار المعارف- 1987- ص 78، 79، هەروەها: علياء شكرى آخرون، المراة في الريف و الحضر، دراسة لحياتها في العمل و الاسرة، دار المعرفة الجامعية، الاسكندرية، 1988- ص 344، 345.

12-Wally, Seceombe. "The House wife and her Labor under Capitalism", New left Review, No. 83, 1974, pp. 5-4.

13-Margret Coulson, Branka Magas, and Hilare Wainwrigt: "The House wife and her labor under Capitalism" - a Critique, New left Review, No. 89, pp. 59, 60.

14-Jean Gardner: Women's Domestic labour, New left Review No. 89, pp. 64, 65.

15-Ibid, pp. 67.

16-Margret Coulson and Others, the House wife and her labour under Capitalism, pp, 60.

17-علياء شكرى و اخرون، المراة في الريف و الحضر مرجع سابق، ص 347- 370 هەروەها : ليلى عبدالوهاب (المراة المصرية و المشاركة الاجتماعية) مجلة الفكر/ ع- 13/ 1988.

18-محمد عوض خميس، دفاعا عن المراة، مرجع سابق، ص 79-87.

19-مصطفى حجازي، التخلف الاجتماعي، مدخل الى سيكوليوجية الانسان المقهور، معهد الانماء العربي- لبنان- 1980، ص 224- 225، هەروەها:

Kate Millet, Sexual Politics, Garden City, Double Day, 1970.

20-دەتوانیت لەم بارەیەوە بگەڕێیتەوە بۆ زۆربەی ئەو توێژینەوانەی بایەخیان بە پێگەی ئافرەت داوە لە ئاشتیداو هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانەی لە ڕێڕەوەکان وەرگرتوە، بۆ نمونە:

ا-الغزالي حرب، استقلال المراة في السلام، القاهرة- 1984.

ب-محمد عمارة، الاسلام و المراة في رأي الامام محمد عبده، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، 1980.

ج-محمد عمارة، قاسم أمين و تحرير المراة، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، 1980.

د-سيد عويس، الازدواجية في التراث الديني المصري، دراسة ثقافية اجتماعية تاريخية، دار الموقف العربي، القاهرة، 1985.

21/ليلى عبدالوهاب، تأثير التيارات الدينينة في الوعي الاجتماعي للمراة، مجلة المستقبل العربي، عدد 132، فبراير 1990/ ص 29-30، هەروەها

Margret Mead, "Male and female: A study of the Sexes in a Changing world". Penguin Books ltd, 1962.

22-الامتثال الشعبية التي تم الاستعانة بها، بعضها ورد في دراسات سابقة و البعض الاخر تم جمعه من عدد من الاخباريات بقرى القليوبية.

23-ليلى عبدالوهاب، تأثير التيارات الدينية في الوعي الاجتماعية للمراة، مرجع سابق، ص 37.

24-ئەوانەی لەو بڕوایەدان لە بانگەشەو شیکردنەوەدا پشت بە قورئان دەبەستن دەگەڕێنەوە بۆ گوتەی (محمد عبده) کە لەو بڕوایەدایە: "ئەو تاکە بەڵگەیەی ئیسلام لە بانگەشەکەیدا پشتی پێدەبەستێت قورئانی پیرۆزە، جگە لەمەش هەرچیەکی لە هەواڵەکاندا باسکراوە چاوگەکە چ ڕاست بێت، یان لاواز بێت، ئەوا نابێت بەسەر موسڵمانەکاندا بپرێتەوە".

25-الغزالي حرب (الاستقلال المراة في الاسلام) مرجع سابق ص (31-87)

26-هەمان سەرچاوە، ص 37.

27-المراة العربية و قوانين الاسرة، لجنة المراة العربية، الامانة العامة لجامعة الدول العربية، 1983، ص 27، 28.

"ئەو تاکە بەڵگەیەی ئیسلام لە بانگەشەکەیدا پشتی پێدەبەستێت قورئانی پیرۆزە، جگە لەمەش هەرچیەکی لە هەواڵەکاندا باسکراوە چاوگەکە چ ڕاست بێت، یان لاواز بێت، ئەوا نابێت بەسەر موسڵمانەکاندا بپرێتەوە"

ئیمام مەحەمەد عەبدە کاتێک نموونە لەسەر ئەو نەهامەتیانە دەهێنێتەوە کە لە ئەنجامی هێنانی چەند ژنێکەوە پەیدادەبێت، لە واقیعەوە هێناویەتیەوە، چونکە خۆی دادوەر بوو لە دادگا شەرعیەکاندا

*28*-سيد عويس، حديث عن المراة المصرية المعاصرة، دراسة ثقافية اجتماعية، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، *1977*، هەروەها: محمد عوض خميس، المراة و التقدم للخلف، دراسة نفسية للعادات و التقاليد، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، قاهرة، *1987*.

*29*-علياء شكرى و آخرون، المراة في الريف و الحضر، مرجع سابق ص *367-370*.

*30*-نور فرحات، الفكر القانوني و الواقع الاجتماعي، دار الثقافة للطباعة و النشر، *1981*، ص *260*.

*31*-ماركس و انجلز، الاعمال الكاملة، دار التقدم، موسكو/ ط *4*/ ص *443*.

*32*-نابێت ئەوەمان لەبیربچێت کە ئیمام مەحەمەد عەبدە کاتێك نمونە لەسەر ئەو نەهامەتیانە دەهێنێتەوە کە لە ئەنجامی هێنانی چەند ژنێکەوە پەیدادەبێت، لە واقیعەوە هێناویەتیەوە، چونکە خۆی دادوەر بوو لە دادگا شەرعیەکاندا.

*33*-المراه العربيه و قانون الاسرة، لجنة المراة العربية، الجامعة العربية، ص *29*.

*34*-محمد عوض خميس، المراة و التقدم للخلف، مرجع سابق، ص *221*.

*35*-الغزالى حرب، استقلال المراة في الاسلام، مرجع سابق، ص *217*.

*36-John Stuart Mix, "The Subjection of Women, in Alice Rossi" Essayson Sex Equality, University of Chicago press, 1970, pp. 123.*

*37*-دەتوانین لەم بارەیەوە بگەڕێینەوە بۆ:

أ-المراة العربية و قانون الأسرة، لجنة المراة العربية، جامعة الدول العربية، *1983*، ص *7*،*8*.

ب-انجى رشدى، تقويم اتفاقية القضاء على كل اشكال التميز ضد المراة، مجلة الحق، اتحاد المحامين العرب، عدد *13*، *1984*، ص *195-200*.

*39*-ليلى عبدالوهاب، المراة المصرية و المشاركة الاجتماعية، مجلة الفكر، عدد *13*، *1988*، ص *34-42*.

*40*-ئەوەندە بەسە ئاماژە بۆ گرنگترین ئەو توێژینەوانە بکەین کە دیمەنی ئافرەتیان لە ڕاگەیاندندا باسکردوە، بۆ نموونە:

أ-محمد طلال، صورة المراة في الاعلام، الهيئة المصرية العامة للكتاب، *1986*.

ب-عاطف العبد، المراة الريفية، دار المعارف، *1987*.

ج-عواطف عبدالرحمن، صورة المراة في الأعلام العربي، ندوة المراة و دورها في حركة الوحدة العربية، سبتمبر *1981*.

د-ليلى عبد الوهاب، تطور اوضاع المراة في الدول الاعضاء في اللجنة الاقتصادية لغربي آسيا من (*1976-1984*) المجلس الاقتصادي و الاجتماعي الامم المتحدة، *1984*.

*41*-باولو فريرى، تعليم المقهورين، دار القلم، بيروت، *1980*، ص *36*. هەروەها لە چوارچێوەی ڕەهەندە دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی پەیوەندی نێوان چەوسێنەر و چەوساوەدا دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ:

أ-فرانز فانون، معذبوا الارض، دار القلم، بيروت، بدون تاريخ.

ب-مصطفى حجازي، التخلف الاجتماعي، مدخل الى سيكولوجية الانسان المقهور معهد الانماء العربي، بيروت، *1980*.

ج-*Erick Fromm, Fear of Freedom, Routledge, 1980.*

## سەرچاوە

ئەم بابەتە بەشێکە لەژێر ناونیشانی (مفهوم العنف) لە کتێبی:

العنف الأسرى/ د. ليلى عبدالوهاب/ دار الهدى للثقافة و النشر/ بيروت/ ط *1994*- *2000*/ ص *15-48*.

محەمەد ڕەزا نیکفەر

# ئەخلاق و توندوتیژی



فرانسیسکۆ دی گۆیا

لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد

**ئەم وتارە باس لە ئەشکەنجەو مرۆڤ کوژیو دنیا بینییەکە کە بەرهەمی توندوتیژیە. مەبەستی سەرەکی ئەو توندوتیژیەیە کە خۆی وەك ئاوارتە دەناسێنێت و بانگەشە بۆ ڕەوایەتی ئەخلاقیانەی خۆی دەکات.**

**لە کۆتایی وتارەکەدا دەست لەسەر ئەو ڕاستیە دادەنێین کە کۆمەڵگای مۆدێرن بێشەرمانە پەردە لەسەر تاونەکان هەڵدەماڵێت و بەرگری لە نەشاردرنەوەیان دەکات و، ئەم کارەیش بەو ڕەوشتە بالآیە دادەنێت کە لە کۆمەڵگەی کۆنی جیادەکاتەوە.**

هەر فەزایەك شێوازی دەربڕینی خۆی هەیە، فەزا واتا حاڵ و هەوا، واتا حاڵەت كە لە هەست جیاوازە

هەر كلتورێك بۆ ئەگەری قبوولكردنی گەیاندن و ئاڵوگۆڕكردنەكانی، دەستەیەك لە شێوازی دەربڕین گەشە پێدەدات. ئەم شـێوازی دەربڕینانـە لـە دیدگـای جیـاوازەوە پۆلێن دەكرێن. بۆ نمونە دەشێت لە زمانی هێماو ئاماژە، زمانی سیحرو ئەفسـانە، زمانی هونەر، زمانی ژیانی ڕۆژانە، زمانی سازدانی كارو دواییش لە زمانی زانستیەوە قسەبكرێت و هـەروەها لـە زمـانی دەربڕینـی خۆشەویسـتی، زمـانی لێبـوردن، زمـانی دیـالۆگ و قەناعـەت پێكـردن، زمـانی فـەرمانپێكردن و پاشـانیش زمـانیتوندوتیژی. دەڵێن زمانی بیركاری بەوە ئیمتیـازی بەسـەر زمانەكانی تـردا هەیە كە زمانێكی بـێ پێچ و پەنایـەو جێگـا بـۆ نادیـاریو دوومانـایی ناهێڵێتـەوە. لـەم لایەنـەوە زمـانی توندوتیژی لە زمانی بیركاریش دەباتەوە، زمانی توندوتیژی لە هەموو زمانـەكانی دی ڕوون و ئاشكراترە، بۆ نموونە با زمانی گفتوگۆی نێوان لێكۆڵەرەوەیـەك و زیندانیـەك لە شوێنێكدا كە ئازاری زیندانی تیادەدرێت لە بەرچاوبگرین.

لێكۆڵـەرەوە دەپرسـێت و زیندانیەكـە وەڵامـی دەداتـەوە. لێكۆڵـەرەوە دەپرسـێت ئـەمجارە زیندانیەكـە وەڵامـی ناداتـەوە، لێكۆڵـەرەوە دەكەوێتـە هەڕەشـەكردن، شەڕپێفرۆشتن، هاواردەكات، كەچی زیندانیەكە هەر بێدەنگە. یان ئەوەی لێكۆڵـەرەوە دەیەوێت ئەو نایڵێت. لێرەدایە كە لێكۆڵەرەوە دەڵێت: "لەگەڵ تۆدا دەبێت بە جۆرێكی دی قسەبكرێت، كە قامچیت خوارد، دەكەویتە قسەكردن". ئیتر زمـانی لێكۆڵـەرەوە دەبێت بە زمانی قامچی، وشەكانی ئەم زمانە نەك لە ڕێی گوێچكەوە، بەڵكو لە ڕێی گۆشـت و ئێسـقانەوە دەگاتـە زیندانیەكـە. زمـانی ئەشـكەنجەدان زمـانێكی ڕوونـە، ناتوانیت گوێی خۆتی لێكەڕ بكەیت، ناتوانیت بەرئەنجامێكی تری لێبگریت، ناكرێت گاڵتە بە وشەكانی بكەیت.

دەڵێین: دەبێـت لەگـەڵ ئـەودا بـە زمـانی قـامچی (مسـتەكۆڵە، شمشـێر، فیشـەك) قسەبكرێت، بۆچی؟ ئەی بۆ دڵی نەدەینەوە؟ بۆ لە بەردەمیا سەما نەكەین؟ بۆ شیعری بۆ نەخوێنینەوە؟ بۆ لەگەڵیا لۆژیكیانەو عاقڵانە قسە نەكەین؟ ڕەنگە وا بزانین كە ئەم زمانانە كاریگەریان نیە، ئەو لـەم زمانانـە تێناگات، یان بە ناتـەواوی لێیان تێئـەگات، لەمانە شیمانە -احتمال-تر ئەوەیە كە خۆمان ئەو زمانانە فێرنـەبووین، كە پەنابرایە بـەر زمـانی توندوتیـژی واتـا زمانـەكانی دی سـەرنەكەوتوون لەبـەرەو پێشـبردنی گەیاندن و پەیوەندیدا، بەڵام ئەی بۆ زمانەكانی تر دەگەنە بنبەست؟

هەر فەزایەك شێوازی دەربڕینی خۆی هەیە، فەزا واتا حاڵ و هەوا، واتا حاڵـەت كە لە هەست جیـاوازە. بگەڕێینـەوە سـەر حیكمـەتی سروشـتی زمـان. دەڵێین: "ئـەو لـە حاڵەتی ترسدایە" نەك "ئەو هەست بە ترس دەكات" حاڵەتی ترس شتێكەو هەست بە ترسكردن شتێكی ترە. كەسێك لە تاریكیدا هەنگاوی خێرا بەرەو لای من دەنێت و من

دەترسم، لێرەدا قسە لەسەر هەستکردن بە ترس ئەکەین، بەڵام حاڵەتێکە فەزاکەی ترسێنەرە. بۆئەوەی شتێکی تایبەتی هەبێت کە ترسەکە دروستبکات، هەر بەم مانایەیە کە وەك فەزا باس لە خەفە کردن دەکەین و مەبەستمان ئەوە نیە کە دەستێکی دیار لە بینمان نرابێت تا بمانخنکێنێت. فەزا بەم مانایە دەورێکی وا دەداتە مرۆڤەکان کە ڕەنگە لە پێگەو شوێنی تردا ئەو دەورەیان نەبێت. هەموو شتێك لە خۆیەوە بەرەو پێشدەچێت. برا خوێنی برا دەڕێژێت، بۆئەوەی بزانێت چی دەکات. دەشێت لە باوکێکی میهرەبان، یان هاوڕێیەکی پڕ لە خۆشەویستیو چاکەخوازی گەڕەك خوێن ڕێژێك دروستبێت تێر لە خوێن نەخوات. "فەزا" چ جانەوەرێکی خەوتووی لەو کەسەدا بە ئاگاهێناوە؟ چۆن "فەزا" کارگوزارەکانی خۆی دەدۆزێتەوە؟ ئەمانە لە کوێ بوون؟ دەبێت ئەوەیش بپرسین: لە فەزایەکی توندوتیژدا چۆن دەتوانیت توندوتیژی پیست نەکات؟ چۆن لە فەزایەکی بێ ئەخلاقیدا وابەستەی ئەخلاق دەبیت؟ چۆن دەتوانیت لەو دۆخەدابیت و لەو دۆخەیشدا نەبیت؟ ئێمە دەڵێین: "ئەو دۆخە گرتینی؟" چی بکەین تا نەمانگرێت؟ چی بکەین بۆ ئەوەی کەس نەگرێت؟ مانای "گرتن" لەم ڕستەیەدا چی دەگەیەنێت؟

کە دەڵێین: توندوتیژی لە ئەنجامی سەرنەکەوتنی زمانەکانی تری گەیاندن و ئاڵوگۆڕکردنەکانەوە دێت، ئەمە ئەو مەبەستە ڕووندەکاتەوە کە ئێمە بۆ ناتوانین زمانی توندوتیژی بگۆڕین بە زمانێکی تر، وەڵێ ئەمە بەو مانایە نیە کە زمانەکانی تر توندوتیژیان تیانیە، زمانی ئاسایی ڕۆژانە پڕیەتی لە توندوتژیی، ئەم زمانە بەردەوام مرۆڤەکان بەرەو داخرانێك دەبات کە ڕەنگە دەربازبوون لێی تەنیا بەوە بێت کە بە ئاشکرا جەستە بخەیتە بەردەم توندوتیژیەوە، ئەو حوکمە پێشینە زۆرانەی کە لە زمانی ڕۆژانەدا هەیە، کلێشەکان، مۆرکە حازرو ئامادەکان، جوێن و ناسزا، دروشمی شەڕخوازی (یان ئەمە- یان ئەوە). هەموو ئەمانە بە تەواوی ڕێگا بۆ توندوتیژی خۆشئەکەن. دەتوانین لێرەدا وەك نموونە ئاماژە بەو زمانە بکەین کە پیاو لەگەڵ ژندا بەکاریدەهێنێت، بەڵام ئاخۆ بە ڕاستی لە هەموو جێگایەکدا توندوتیژی کاتێك سەرهەڵدەدات کە ئیتر شێوازەکانی تری مانەوەی پەیوەندی ناو مرۆڤەکان بە تەواوی پسابێت؟ با بچینەوە سەر ئازاردانەکە: ئایا بە ڕاستی ئازاردان لە بەردەوام بوونی لێکۆڵینەوەکەدایە؟ ئایا کاتێك زمانی لێکۆڵەرەوە نەگەیشتە ئەو ئەنجامەی کە مەبەستیەتی ئیتر لێدان دەبێتە زمان؟ ئەوانەی ئازارو ئەشکەنجەدانی خەڵکیان کردۆتە پیشەو لێکۆڵەرەوەن بانگەوازێکی وا دەکەن، بەڵام مەسەلەکە بە پێچەوانەوەیە، ئازاردان هۆ نیە بۆ لێکۆڵینەوە، لێکۆڵینەوە هۆی ئازارو ئەشکەنجەدانە، شوێنی ئازاردان نەك جێگای لێپرسینەوەو پشکنین بەڵکو مەیدانی نواندنی توندوتیژیەکی

له فه‌زایه‌كی توندوتیژیدا چۆن ده‌توانیت توندوتیژی پیست نه‌كات؟ چۆن له فه‌زایه‌كی بێ ئه‌خلاقیدا وابه‌سته‌ی ئه‌خلاق ده‌بیت؟ چۆن ده‌توانیت له‌و دۆخه‌دابیت و له‌و دۆخه‌یشدا نه‌بیت؟

ڕووتە، بۆیە لە زیندانیی دەپرسرێتەوە تا ئازار بدرێت، ئازاری دەدەن، تەنانەت ئەوکاتەیش کە دەزانین نە نهێنییەکی لە دڵدایەو نە قسەیەکی هەیە بیکات.

زمانێك کە شەڕئەنگێزیەکەی دەرئەنجامێکی سەختی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، زمانی سیاسەتە، زمانی سیاسەتێك کە بەردەوام (یان ئەمە- یان ئەوە)یەتی، تۆوی توندوتیژی دەڕوێنێت، ئەم شێوە سیاسەت کردنە بیروکرادار بەرەو بنبەست ڕاپێچ دەکات: یان دەبێت بگەڕێتە دواوەو چاو لە خواست و ئامانجەکانت بپۆشیت، یان دەبێت (کۆسپ)ێك تێکبشکێنیت. ئەم شێوە گوتارە بەردەوام (کۆسپ)ی بەرەوپێش چوون بەرهەمدێنێت. چونکە دەشێت لە ڕاستیدا پێشکەوتنێك لە کاردا نەبێت، لەبەرئەوەی کە پێشکەوتن لەکاردا نیە، دەبێت تاوانەکە بخرێتە ئەستۆی (کۆسپ)ێك، دەبێت (کۆسپ)ێك دروستبکرێت، (کۆسپ) دروستدەکرێت. ئەوسا دەوترێت: "دنیا بە پێی ویستی ئێمەیە، ئێمە بەرەو پێشەوە دەچین، ئەگەر.. ئەگەر ئەوانە نەبن، ئێمە بە ئامانجی خۆمان دەگەین، ئێمە دەمانەوێت بە ئامانجی خۆمان بگەین، کەواتە نابێت ئەوانە هەبن" ئەمە لۆژیکە خوێناوییەکەیە، ئەوەی لەو داوە بکەوێت هەمیشە گیرۆدەی "ئەوان"ە "ئەوان" بە شێوەی جیاواز خۆدەنوێنن، "ئەوان" لەنێودا نامێنن و "ئەوان"ی دی جێگای "ئەوان" دەگرنەوە، "ئەوان" دەبنە "دەستی ئەوان و، ئەگەر "دەستی ئەوان" سەرکوتبکرێن، "ئەوان" دەبنە خاوەنی "دەست"ی تر، ئەم لۆژیکە "ئەوان" بەرهەمدێنێت، چونکە بێ بەدیهێنانی کۆسپ ناتوانیت بڵێیت من لەسەر هەقم، چەندە "ئەوان" ترسناکترو "پیلاتەکانی ئەوان" ئاڵۆزو مەترسیدارتر بنوێنرێن، لۆژیکی کۆسپ هەستی ڕەوایی و هۆشمەندیی زیاتر بەهێزدەبێت "ئێمە چەندە هۆشیارین کە دەتوانین ئەم هەموو پیلانانە ئاشکرابکەین!" ئەوەی پەیڕەوی لەم جۆرە لۆژیکە دەکات، خۆی لە نێوەندی بزاوتی جیهانیدا دەبینێتەوە. "یان ئەم- یان ئەو" لە نێوان "ئەم" و "ئەو"دا دەربەندێك دروستدەبێت و، "ئەم" و "ئەو" لە دواجاردا وەك دوو ستوون لەبەرچاو دەگیرێن. لەم حاڵەدا، ئەوەی پەیڕەوی لەم لۆژیکە دەکات وا خۆی دادەنێت کە بەسەر بەرزترین لوتکەوە وەستاوە، هەستێکی وای لا دروستدەبێت کە ڕابەرو ڕزگارکەرە، وا دەزانێت کە ئەو دەتوانێت ڕێڕەوی دنیا دەستنیشان بکات. یەکێك لە جازبیەتی لۆژیکی "یان ئەم- یان ئەو" لەوەدایە کە یەکەم سەپاندنی ئەم جۆرە هەستەیە لە مرۆڤەکەداو دوەم لە ڕزگارکردنی بیری سست و تەمەڵدایە لە شەڕی دەستەویەخەی ئاڵۆزیەکانی دنیا. "دنیا سادەیە: یان ئەم یان ئەو، دەبێت تۆ بەسەر ئەم لوتکە یان ئەو لوتکەوە بیت، کە لەم بڵندیەوە بڕوانیت، بەسەر هەموو شتەکاندا زاڵیت، تۆ عەقڵی هەموویت" بەڵام کەم دەتوانن بەسەر لوتکەکەوە بوەستن، لێرەوەیە کە دەبینین "ئەمانە" دەکەونە گیانی یەکتری، هەر کەسەو دەست لە لۆژیکی "یان ئەم-

زمانێك کە شەڕئەنگێزیەکەی دەرئەنجامێکی سەختی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، زمانی سیاسەتە، زمانی سیاسەتێك کە بەردەوام (یان ئەمە- یان ئەوە)یەتی، تۆوی توندوتیژی دەڕوێنێت

یان ئەو" زیاتر دادەگرێت و ئەوی دی بەوە تاوانبار دەکات کە سازش کارەو وەك پێویست بڕوای بە ئەسڵی "یان ئەم- یان ئەو" نیە، ئەوسا لەسەر دەسەڵات دەبێت بە شەڕو "ئەمان" هەرچی چەکی توندو تیژیانە بەسەر یەکیدا دەکێشن. "ئەمان" زۆر زوو خودی "ئەمان" لەنێودەبەن نەك "ئەوان".

"یان ئەم- یان ئەو" فەزایەکی توندوتیژی بەرهەم دێنێت. دۆخێکی وا دروستدەبێت کە تۆ بۆ ئەوەی نەبیتە بەشێك لە "ئەمان" بەرەو "ئەوان" دەڕۆیت و ڕەنگە بێ ئەوەی بە خۆت بزانیت تۆیش دەست بە توندوتیژی بکەیت. لە دۆخی توندوتیژیدا دنیایش لە شێوەیەکی توندوتیژدا سادە دەبێتەوە، سادەکردنەوە لەسەر حسابی هەڵسپاردن (تعلیق)ی گەلێك لەو حوکمە ئەخلاقیانە دروستدەبێت.

هەموو سیستمە ئەخلاقیەکان کەم و زۆر جەخت لەسەر ئەوە ئەکەن کە نابێت درۆ بکەیت. نابێت ئازاری کەس بدەیت، نابێت پیلان لە دژی کەس بگێڕیت، نابێت کەس تاوانبار بکەیت، نابێت سیخوڕی بکەیت، نابێت کەس بکوژیت، بەڵام کاتێك کە فەزاکە توندوتیژ بوو، هەموو ئەم بڕیارانە لەکاردەخرێن": "ئەوان دوژمنن، هەرچیەکیان پێبڵێین ڕەوایە، نابێت لەگەڵ ئەواندا بە ویژدانەوە ڕەفتار بکرێت، ئەوان سنووری ئەخلاقیان بەزاندوە، کەواتە شەڕ لەگەڵ کردنیان ڕەوایە" لە پێشدا ئاماژەمان بە بزاوتی دەروونی "ئەمان"دا، هەر لەسەر ئەو بزاوتەیە کە دەبینین ڕێك لەو چرکەساتەدا کە "ئەوان" لە سنورێکی دیاری حوکمە ئەخلاقیەکان دەکرێنە دەرەوە، خودی "ئەمان"یش لە دژی خۆیان بێئەخلاقی دەنوێنن، تۆمەت بۆ یەکدی هەڵدەبەستن و سەری یەکدی لەژێر ئاودەنێن، تەواوی وجودیان لە فەساد هەڵدەکێشرێت.

درۆ توندوتیژی دەزێنێت: "ئەلف" دەڵێت "ب" تاوانی "پ" کردوە، "ب" نکوڵی لێدەکات. "ئەلف" دەڵێت "ب" هەقی نکوڵی کردنی نیە، بەڵام "ب" تا ئەوکاتەی کە "ب"یە هەر لەسەر نکوڵی کردنەکەی بەردەوامە، بۆ ئەوەی کە نکوڵی بکات "ب" نابێت "پ" بێت. "ب" نابێت هەبێت، ڕەنگە "ئەلف" "ب" لەناوبەرێت. هەر بەو سادەییە ڕەنگە کوشتنێك ڕووبدات. "تۆ مافی ئەوەت نیە خۆت بیت" هەروا بە سادەیی ڕەنگە بگۆڕێت بە "تۆ مافی مانت نیە" "بێدەنگ بە" ببێت بە "خەفە بە" و "خەفە بە" بگۆڕێت بە "پەتی سێدارە" لە سەرەتاوە نازیەکان وتیان "جولەکە مرۆڤ نیە" بەڵام جوولەکە مرۆڤە. "کەواتە نابێت مرۆڤ بن" "کەواتە نابێت هەبن" نازیەکان جوولەکەیان سووتاند.

تا ئێستا گەلێك پێناسە بۆ هەقیقەت کراوە، لە دەقی ئەم نووسینەدا دەتوانین پێناسەی هەقیقەت بەم شێوەیە بکەین: هەقیقەت ئەو شتەیە کە ئەگەر نکولیەکی بنبڕانە (قطعی)ت لێکرد ڕەنگە ببێتە هۆی لەناوبردنی ئەو کەسەی کە دیویەتی یان

هەموو سیستمە ئەخلاقیەکان کەم و زۆر جەخت لەسەر ئەوە ئەکەن کە نابێت درۆ بکەیت، نابێت ئازاری کەس بدەیت، نابێت پیلان لە دژی کەس بگێڕیت، نابێت کەس تاوانبار بکەیت، نابێت سیخوڕی بکەیت، نابێت کەس بکوژیت، بەڵام کاتێك کە فەزاکە توندوتیژ بوو، هەموو ئەم بڕیارانە لەکاردەخرێن

بڕوای پێیەتی. دەشێت ئەم پێناسەیە ناوبرێت بە پێناسەیەکی جینایی بۆ هەقیقەت، بۆ سەلماندنی ڕاستی ئەمە دەتوانین بگەڕێینەوە سەر ئەو فیلم و ڕۆمانانەی بابەتی تاوانن (جینایی)، "ئەلف" تاوانێکی کردوە کە "ب" شایەتە بەسەریەوە، نکوڵی بنەبڕ نەکردنی ئەو تاوانە لە لایەن "ئەلف"ەوە دەبێتە هۆیەك بۆ کوشتنی "ب" ڕەنگە هەندێك زیادەڕۆیی هەبێت لەم پێناسە جیناییەی هەقیقەتدا، بەڵام لەم زیادەڕۆییەدا هەقیقەتێکی گەورە خۆی مەڵاسداوە: نکوڵی کردن لە هەقیقەت توندوتیژی دەزێنێت، چونکە درۆ دنیا هاوبەشەکە وێراندەکات. ڕەنگە نکوڵی کردن لە هەقیقەت لە سەرەتادا شێوەی درۆیەکی ڕووت لەخۆ نەگرێت، بنەمای کلتوری درۆ، درۆی بەرژەوەندیەو زۆریش درۆ بۆ بەرژەوەندیکراوەو وایش دراوەتە قەڵەم کە بەوە ڕێگا لە فیتنەو ئاشوب گیراوە.

توندوتیژی بێ هۆ نیە، لەو کەسەی کە دەستی داوەتە توندوتیژی دەپرسین: بۆ واتکرد؟ زۆر شیمانە (احتمال)ی ئەوە هەیە کە بڵێت: "ناچاری بوو، بە زمانی خۆش قسەم لەگەڵدا کردو ئامۆژگاریم کرد، هەڕەشەم لێکرد، بێ سوود بوو، ئاخری کردم" "ناچاری بوو". لەو شوێنەدا کە توندوتیژی دەکرێت، ئاسایی سوود لەم دەستەواژەیە دەبینرێت. "ناچاری بوو" یەعنی توندوتیژی تاقە چارەی ناچاریە. یەعنی چارەسەرکردنی توندوتیژانە لە ناچاریدایە. واتا توندوتیژی ناتوانێت بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ ئەنگێزەی خۆی دیاریبکات. واتا تەنیا دەتوانێت بە پەنابردنە بەر نەبوونی توانای دی بوونی خۆی بسەلمێنێت. بە پێی ئەم لێکدانەوەیە توندوتیژی دوا پاساوە، "پێموت، قایل نەبوو، تەماعم دایە، قایل نەبوو، هەڕەشەم لێکرد، قایل نەبوو، ئازارم دا، کەمێك قایل بوو، کوشتم و پاساوەکەم لەودا تەواوکرد"

توندوتیژی هۆکاری خۆی هەیەو، ئەو کەسەی دەست بۆ زەبروزەنگ دەبات دەتوانێت بەڵگە بۆ ئەوە بێنێتەوە بۆ ڕووی لە توندوتیژی کردوە، بەڵام توندوتیژی ئاسایی هۆکارو بیانوەکانی خۆی لەیاد دەکات. گالیسکەی توندوتیژی کە -بەهەر هۆکارو ئەنگێزەیەك- کەوتەڕێ، ئیدی ڕێگای خۆی دەگرێت و فەرمان لە کەس وەرناگرێت. هەر لەبەر ئەمەیە کە کارگەی زەبروزەنگ لۆژیکی بزاوتی خۆی هەیەو لەسەرو کارگەی گەورەترەوە دەجووڵێت کە دروستی دەکات تا بە هۆی توندوتیژیەوە بە هەندێك لە ئامانجەکانی خۆی بگات. دەزگای کاری زەبروزەنگ تەنانەت لە شوێنێکدا کە پێویست بە توندوتیژی نەکات، لە شێوازەکانی توندوتیژی کەڵك وەرنەگرێت، ئەگەر هێزێکی پێچەوانە بەرانبەر بە خۆی نەبینێت، دروستی دەکات.

ئەگەری پەیدابوونی توندوتیژی لە نەبوونی ئەگەرەکانی تردایە، ئایا بە ڕاستی ئەگەری تر نیە؟ وەی بە حاڵی ئەو کۆمەڵگایەی کە نەتوانرێت ئەگەری تری تیا بدۆزرێتەوە! نەك تەنیا ئەوانەی کە توندوتیژی هەڵئەگیرسێنن، بەڵکو دەبێت هەمـــو

توندوتیژی هۆکاری خۆی هەیەو، ئەو کەسەی دەست بۆ زەبروزەنگ دەبات دەتوانێت بەڵگە بۆ ئەوە بێنێتەوە بۆ ڕووی لە توندوتیژی کردوە

کۆمەڵگاکە بەرەو دادگاییکردن ڕاپێچ بکرێت. وەڵێ دەشێت: ئەگەری تر هەبێت، بەڵام ئێمە، ئێمەیەك کە ئارەزومان لە توندوتیژیە، سوودمان لەوانە وەرنەگرتوەو ڕەنگە لە قازانجیشمان نەبێت کە سوودیان لێوەربگرین. پاساو بۆ نەهێشتنی ئەوی دی زۆرترە.

توندوتژیی هۆکاری خۆی هەیە، ئەمە ڕستەیەکی نادیارە، چونکە چەمکی (هۆکار) نادیارە، هەر لە بنەڕەتەوە -هۆکار- چەمکێکی مەترسیدارە، چونکە یەکەم نادیارەو لەبەرئەوەیشە کە ڕێگای ئەوەت بۆ دەکاتەوە ئەملاوئەولا بکەیت. دەڵێین: "ب" هۆکاری "ئەلفە" بەمپێیە "ئەلف" واز لێدێنین و ڕوو لە "ب" دەکەین، گوناهی "ئەلف" ئەخەینە ئەستۆی "ب" ئەوانەی زۆر زانان و بیری فراوانیان هەیە تەنیا بە "ب" وازناهێنن، دەپرسن "هۆکاری ب چیە؟" بەم پرسیارە ڕوو لە "ب" دەکەن و پاشان لە "ت" و ڕەنگە لە دواییدا سەر لە ئەستێرەی مەریخەوە دەربێنن. لە کاتێکدا کە مەسەلە سەرەکیەکە بریتی بوە لە لێدانێك کە پێستی زیندانیەکی داماڵیوە، کەچی بێین هەموو مەسەلەکان هەڵبگێڕینەوەو لە باتی ئەوەی کە زیندان بخەینە نێو دەقی کۆمەڵگاوە کۆمەڵگا بخەینە نێو دەقی زیندانەوە؟ بە تەمای ئەوەن هۆکاری دیاردە نادروستەکانی کۆمەڵگا بدۆزنەوە؟ بەناو زیدانەکانی کۆمەڵگادا بگەڕێن، دەتانەوێت کۆمەڵگایەکی شارستانی دروستبکەن؟ لە زیندانەکانەوە دەستبەکار بن.

توندوتژیی خۆی دەزانێت کە سنوورە دیاریکراوەکانی ئەخلاق پشتگوێ دەخات و هەر لەبەرئەمەیشە کە هەمیشە لە ئاراستەی خۆیدایە، "چارنەبوو" شێوەی گشتی ئەم ئاراستەیەیە، توندوتیژی تێدەکۆشێت خۆی وەك ئاوارتە "استثناء" دەربخات، ڕێساکە "بەکارنەهێنانی ستەمە" "بەکارهێنانەکە ئەو ئاوارتەیەیە" تەنیا لە قاڵبی ئاوارتندا توندوتیژی دەتوانێت خۆی ئاراستە بکات. بۆ ناسینی توندوتیژی لەسەر ئەم شێوە ئاڕاستەیە ئیشێك دەکەین: ئاوارتە چیە؟ هەلومەرج یان پێگە (موقعیت)ی ئاوارتەیی کامەیە؟ ئەو پێگە ئاوارتەییەی خۆی ئاراستە دەکات بە "مەگەر" دەردەکەوێت: "ئەلف"ی مەگەر لە پێگەی "ب" بە هۆی "پ"وە: نابێت تۆ درۆ بکەیت ("ئەلف") مەگەر ("ب") تەنگت پێهەڵبچنێت، کە لەبەر خاتری ڕزگارکردنی گیانی کەسێك ("ب") ناچاری ئەو درۆکردنە بیت. ڕێسای "پ" لە سیستمی بنەما ئەخلاقیەکاندا دەبێت لە ڕێسای "ئەلف" بەرزتر بێت. یاخود ئەوەی کە پەیامی پابەندبوون بە "ئەلف"ەوە لە ڕووی ئەخلاقیەوە لە پەیامی کاری "پ" خراپتر بێت. کەواتە لە پێگەی ئاوارتندا "استثنائی" دەشێت دوو ڕێسای ئەخلاقی بەرانبەر بە یەکتر بوەستن: یان "ئەلف" یان "پ" بە هۆی ئاوارتەکردن بە ڕێسای "پ" کار لەسەر بنەمای ڕێسای "ئەلف" ناکرێت. کانت ئاوارتە لە ئەخلاقدا قبووڵ ناکات: من لەبەر ماڵێکدا وەستاوم، یەکێك بە خەنجەری ڕووتەوە دێت و دەڵێت: "ئایا فلان کەس کە من

توندوتژیی خۆی دەزانێت کە سنوورە دیاریکراوەکانی ئەخلاق پشتگوێ دەخات و هەر لەبەرئەمەیشە کە هەمیشە لە ئاراستەی خۆیدایە، "چارنەبوو" شێوەی گشتی ئەم ئاراستەیەیە

دەمەوێت بیکوژم، لەماڵەوەیە؟" خودی کانت ئەم نموونەیە دەهێنێتەوەو دەپرسێت، لە حاڵێکی ئاوادا دەبێت چی بکرێت. ئەگەر بزانم ئەو کەسە لە ماڵەکەدایەو بڵێم لەوێ نیە، درۆم کردوە. ئەگەر بڵێم لە ماڵەکەدایە کارێکی مرۆڤایەتیانەم نەکردوە. کانت لەسەر ئەوە سوورە کە تەنانەت لە شوێنێکی وایشدا نابێت درۆ بکەیت، بنەمای ڕوانینی کانت باوەڕ بە هاوئاهەنگی ڕەهای ڕێسا ئەقڵانیەکان، ئەخلاقە. کانت ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە بشێت لە هەندێك حاڵەتدا ئیمکانی ئەوە هەبێت، کە ئەم ڕێسایانە لەگەڵ یەکتردا نەگونجێن. خۆزگا دنیا، دنیای ئەقڵانیەتی کانت بوایەو هەموو وەك ئەو بیریان بکردایەتەوە، بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە کە مرۆڤ چ وەك جۆرو چ وەك تاك بوونەوەرێکی ئاوارتەییەو ژیانیشی هەمیشە گیرۆدەی پێگە ئاوارتەییەکانە.

با لێرەدا کەمێك لە باسە ئەسڵیەکە دووربکەوینەوەو بێینە سەر مەبەستێکی تر: لەو شوێنانەدا کە ئاوارتەیی دێتە ئاراوە ڕەنگە ئەسڵی ئەخلاق ژێرپێ بخرێت. کەواتە کۆمەڵگا کۆمەڵگایەکی بە ڕاستی ئەخلاقیە ئەگەر لای خۆیەوە هەوڵی ئەوە بدات دانیشتوان نەکەونە بەر ئەو پێگەی ئاوارتنەوە، ئەو کۆمەڵگایەی کە ڕژێمە فەرمانڕەواکەی دانیشتوان ناچاری درۆکردن و دەمامك پۆشین بکات، ئەوە بەرەو زەلکاوی بێئەخلاقی دەچێت. خراپترین حاڵەتیش ئەوەیە کە بە ناوی ئەخلاقەوە ئەو ناچاریە بارگاوی بکرێت. لە کۆمەڵگایەکی وادا هەموو بەهاکان بەتاڵ دەبنەوە. ئەو ڕێکەوتنە سروشتیە گشتیەی لەسەر پابەندبوون بە ڕێسا ئەخلاقیەکانەوە بە درێژایی مێژووی کلتور دروست بوە تێك ئەچێت. کۆمەڵگا ئاشتیو ئاسایشی خۆی لە دەست دەدات و پڕدەبێت لە توندوتیژی، کۆمەڵگا دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵگایەکی ئاوارتەیی.

لەو شوێنانەدا کە ئاوارتەیی دێتە ئاراوە ڕەنگە ئەسڵی ئەخلاق ژێرپێ بخرێت

هیگڵ، بە پێچەوانەی کانتەوە، تەماشای ئەو هەلومەرج و پێگەی ئاوارتە کردنانە دەکات و بە سەریاندا تێناپەڕێت. ئەو جیاوازی دەکات لە نێوان سێ پێگەدا (موقعیت):

*1*-ئەو پێگانەی کە شێوەیەکی هەمەکی (کلی) و نادیاریان هەیەو لە نێوان ئەو ڕەگەزانەدا کە دروستیان کردوە گونجانێکی ڕەها هەیە، مرۆڤێکی ئەخلاقی نموونەیی کانت لەم "پێگەی ناپێگەیە"دا بەسەردەبات.

*2*-ئەو پێگە ئاساییانەی کە مەترسیان نیەو بۆ نەهێشتنی ئەو قەیرانانەی کە دێنەپێش، ئەو ڕێگایانە لەبەردەگیرێت و پێچەوانەی ڕێڕەوی ڕێسا ئەخلاقیەکان نین، لە ژیانی ئاساییو لە دەوروبەرێکی سروشتیدا دەتوانرێت گەلێك قەیران نەهێڵرێت، بێئەوەی ڕێسا ئەخلاقیەکە ژێرپێ بخرێت.

*3*–ئەو پێگەیانەی کە ناتوانیت لێیان دەربچیت، مەگەر بەوەی کە بە پێچەوانەی بنەما ئەخلاقیەکانەوە ڕەفتار بکەیت، ئەمە ئەو پێگەیەیە کە لە سەرەوە ناوی ئاوارتەمان لێنا.

توندوتیژی بە جۆرێکی ئاسایی خۆی بۆ پێگە ئاوارتەکان ئاراستە دەکات. ئەم مەسەلەیە، ئەم پێویستی بە ئاراستەکردنە، لە خۆیدا کارێکی ئیجابیە. هەر ئەوەی کە جۆرێك لە توندوتیژی خۆی لەوە جیادەکاتەوە کە تەنیا لەبەرخاتری توندوتیژی توندوتیژ بێت و هەوڵی ئەوە دەدات ئاراستەیەکی ئەخلاقیو عەقڵانی بۆ خۆی بدۆزێتەوە، ئەمە ئەوە نیشاندەدات کە هێشتا جێگایەکی ئومێد هەیە: شوێنێکی گەڕانەوە هەیە کە توندوتیژی بە گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنە دەیەوێت ڕەوایەتی ئاوارتەیی بۆ خۆی دەستەبەربکات.

زۆرجار توندوتیژی بۆ شەرعیەتدان بە توندوتیژی ئامێزیەکەی بەم جۆرە ئاراستەی خۆی دەکات: "ئەو دەستی بۆ چەك برد، منیش ناچاربووم تەقەی لێبکەم" "ئەلف"ی مەگەر لە پێگەی "ب" بە هۆی "ئەلف"ەوە. "نابێت کەس کەس بکوژێت ("ئەلف")، بەڵام ئەو دەیویست من بکوژێت ("ب") بۆ ئەوەی نەمکوژێت، واتا لەسەر ئەو ڕێسایە کە "ئەلف" داینراوەو نابێت کەس کەس بکوژێت، من ئەوم کوشت. لێرەدا ڕێسایەکی ئەخلاقی دژی خودی ئەو ڕێسایە کاردەکات. بە ڕاستی هەلومەرجەکە ئاوارتەییە.

ئاوارتە چەمکێکی تێڕامانی (تأملی) هەیە، چونکە ئاوارتە هەمیشە ئاوارتەییە لە ڕێساو ڕێسایش چەمکێکی تێڕامانیە، بەڵام لە هەلومەرجی ئاوارتەییدا (استثنائی) ئاسایی دەرفەتی تێڕامان نیە؛ یەکێك هێرشی هێناوەتە سەرو من کات و دەرفەتی ئەوەم نیە بیر لەوە بکەمەوە کە لە ڕووی ئەخلاقیەوە چی چاکترە بەرانبەری بیکەم، دەشێت گیرۆدەی هەلومەرجی ئاوارتەیی ببین، بێ ئەوەی کە لەو کاتەدا بزانین چۆن گیرۆدەی ئەو تەنگانەییە بووین. کەواتە پەنابردنە بەر ئاوارتەیی ئاسایی دوای ئەوەیە کە مەسەلەکە تەواودەبێت، کەواتە هەقە گومان لەوە بکرێت کە کێشەکە بەو شێوەیە ڕوویداوە کە لە ئاراستەی پەرچەکرداری توندوتیژ ئامێزەوە بەدیهاتوە. بۆیە دەبێت ئێمە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە کارەساتێکی توندوتیژبارا، لەو هەلومەرجەی کە گوایا "ئاوارتەیی" بوە ڕووبەڕووی دوو مەسەلە بینەوە:

*1*–ئەسڵی کارەساتەکە چی بوە؟

*2*–پەرچەکرداری تونوتیژی -ئامێز، چۆن خۆی ئاراستە دەکات و ئایا ئەم ئاراستەیە لە ڕووی تەفسیری ئەخلاقیەوە ڕەوایە یان نا؟

زۆرجار توندوتیژی بۆ شەرعیەتدان بە توندوتیژی ئامێزیەکەی بەم جۆرە ئاراستەی خۆی دەکات:
"ئەو دەستی بۆ چەك برد، منیش ناچاربووم تەقەی لێبکەم"

پێشتر لەوە دواین کە بە شێوەیەکی گشتی لە هەلومەرجی ئاوارتەییدا دەرفەتێك بۆ تێڕامان نیە، کەواتە وا باشترە کاتێك کە لە بارەی هەلومەرجی واقیعیەوە قسە دەکەین واز لە بەکارهێنانی چەمکی هەلومەرجی ئاوارتەیی بهێنین، چونکە ئەوکاتەی کە هەلومەرج واقیعیەتی خۆی لە دەستدەدات، ئەگەری هاتنەپێشی چەمکی هەلومەرجی ئاوارتەیی لە ئارادایە. بۆ ئەوەی وەسفێکی گونجاوتر بدۆزینەوە، خۆمان دیاردە ئاسنانە دەخەینە هەلومەرجێکی قەیراناویەوە: حاڵەتێکی قەیراناوی هاتۆتە پێش، دەبێت بڕیارێکی پەلەی بۆ بدەین، ئەگینا هەلمان لەدەستدەچێت، بەڵام چی بکەین؟ گێژو سەرلێشێواوین، بارێکی نالەبارو پەرێشان (دراماتیك)و ئێمەیش سەرلێشێواوین، دنیا تاریکەو ڕێدەرناکەین، بەڵام دەبێت ڕێگایەك بدۆزرێتەوە، دەبێت کۆسپێك لابەرێت، دنیا تارومارە، بەڵام بە بڕیاردان و سووربوون ڕووناك دەبێتەوە. کۆسپەکە ئەمەیەو پێویستە بنبڕانە بڕیاربدەین و کۆسپەکە تێکبشکێنین. پێش ئەوەی دەست بۆ توندوتیژی بەرین، بە توندوتیژی دنیا تاریکەکە ڕوناك دەکەینەوە، دنیا ئاڵۆزەکە بە بڕیار ئاسان دەکەین و ڕێگایەکی تیادەکەینەوە، بۆ ڕێگاکردنەوە دەبێت کۆسپێك لابەرین و کۆسپەکەیش لە وجودی ئەو کەسە یان ئەو گروپەدا بەرجەستە دەبێت، کەوایە دەبێت ئەوانە لابرێن ئەوانە لەناو ببرێن.

لێرەیشدا دەتوانین لەسەر بنەمای ئەم وەسفە بۆ سەلماندنی مەبەستێکی تر ڕابوەستین: هەرکاتێك هەست بە بارە شێواوەکە بکرێت، لێکدانەوەیەکی ساکارانە لەسەر ئەو بارە شێواوە دروست بێت و گومانی هۆی قەیرانەکە لە وجودی خودی کەسەکە یان گروپە دیاریکراوەکەدا بەرجەستە بێت، ئیتر کاری توندوتیژی دەستپێدەکات. لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بۆ جیهان بینیەك کە توندوتیژی بەرهەمدێنێت سێ تایبەتمەندی لەبەر چاو بگرین:

*1*–پیشاندانی باری دنیا لە شێوەیەکی شێواودا.

*2*–سادەکردنی توندوتیژی ئاڵۆزی دنیا.

*3*–پیشاندانی کەس، گروپ، یان دیاردەیەکی دیاریکراو وەك کۆسپێك کە بۆ دەرچوون لە قەیران، دەبێت ئەو کۆسپە لابچێت.

هەرکاتێك ئەم سێ ڕەگەزە کۆببنەوە، ئیدی دەبێت لە چاوەڕوانی خوێن ڕشتندا بیت، بە ڕای من لە نێوان ئەو سێ تایبەتمەندیەدا، سەر لێ شێواوی، سادە ڕوانین، خودگەراییدەوری سەرەکی لە دروستبوون و مانەوەی جیهانبینی توندوتیژزادا دوەم تایبەتمەندی دەبینێت.

لە پێشا ناتوانی بڵێیت کە لە هەلومەرجی قەیراناویدا دەبێت چی بکەیت، چونکە کات بە بەریەوە نیەو جێگای تێڕامان و بیرکردنەوە لە چارەسەری جیاواز بۆ

پێش ئەوەی دەست بۆ توندوتیژی بەرین، بە توندوتیژی دنیا تاریکەکە ڕوناك دەکەینەوە، دنیا ئاڵۆزەکە بە بڕیار ئاسان دەکەین و ڕێگایەکی تیادەکەینەوە

دەستنیشانکردنی پەرچەکرداری شیاونیە. تاك بە هەموو وجودیەوە بڕیارئەدات، هەموو وجود لە بڕیارداندا دەستی هەیە. وجودیش بەو بڕیارەوە کە داویەتی بە جۆرێکی تازە خۆی دەستنیشان ئەکات. لەگەڵ هەر بڕیارێکدا وجود پێناسەیەکی تازە وەرئەگرێت، نەك تەنیا وجودی بڕیاردەرەکە، بەڵکو وجودی دنیایش. دنیا لە هەلومەرجێکی قەیراناوی تاریکدایە، ئەو خۆی ڕێگای دەرچوون لەو قەیرانە پیشان نادات، بەڵام لە هەلومەرجی ئاڵۆزو شێواودا، دەبێت بە پەلە بڕیار بدرێت. دەبێت بڕیارێکی بنبڕ بدەیت، دنیای تاریك بە بنبڕکردن ڕوناك دەبێتەوە، بەو بڕیارە بنبڕە ڕێگا کراوەتەوەو هەروایش دەبێت ئەو ڕێگایە ببڕیت. ڕێدەکەوێت کە ڕێگاکە ببڕین، بەڵام بە ئامانجی خۆمان ناگەین، لە چاڵێك دەردێین و لە بیرێك دەکەوین، لێرەدایە کە هەستی پەشیمانی داماندەگرێت و دەڵێین بڕیارەکەمان هەڵە بوە، پەشیمانی چیە؟ دنیای تاریك، خۆی ڕوناك دەبێت و لەو ڕوناکیەدا ئەوە دەردەکەوێت کە ڕێگاکە بنبەست بوە. هەقیقەتی پەشیمانی لەمەدایە، دەیشتوانین لەسەر هەقیقەتی پەشیمانی قسەبکەین، چونکە هەقیقەت خۆنمایشکەری بوونی ئەوە، بەڵام بنبڕی (قاطعیت) وەك بنبڕی لە هەقیقەتەوە دوورە: ئەوە منم کە بە بڕیاردانی خۆم دنیا ڕوناك دەکەمەوەو مەرجیش نیە کە ئەم ڕوناکیە، ڕوناکی دنیای ڕاستەقینە بێت. ئەگەر وا بزانین کە ئەخلاق لە هەقیقەت دەبێت و بۆ هەقیقەتە، دەتوانین بڵێین کە لەبەر ئەم دوو شێوە جیاوازەی پەیوەندیە لەگەڵ هەقیقەتی دنیادا کە پەشیمانی ڕەهەندێکی ئەخلاقی هەیەو بنبڕی ڕەهەندێکی نائەخلاقی. مرۆڤی بە ئەخلاق ناتوانێت مرۆڤێکی بنبڕکەر بێت، بەڵام ئەو مرۆڤێکە کە بنبڕ کەرانە لایەنی هەقیقەت دەگرێت، هەر لەبەر ئەمەیشە کە مرۆڤێکی ڕاڕایە، چونکە تەنیا لە ڕێگای ڕاڕاییەوەیە کە دەتوانیت لە هەقیقەت نزیك بیتەوە.

دنیا بینیە توندوتیژزاکان بنبڕن، دەبڕنەوەو بە توندوتیژی دنیا سادە دەکەنەوە، تا بتوانن بۆ زەبرلێدان ئامانجێکی ڕونیان هەبێت، لە بنبڕیەکەیان کوژران دروستدەبێت و دەشێت لە زۆر مەسەلەی تردا بە پێچەوانەوە بێت: لە کوژرانەوە بنبڕیەتی دروستدەبێت.

بە پێی بەراوردکاریەکی دیاردەناسانە لە نێوان بنبڕیو پەشیمانیدا دەتوانین بڵێین کە لە هەلومەرجی قەیراناویدا ئەوە بڕیارێکی ئەخلاقیە کە لە دوودڵیەوە سەریهەڵدابێت، لە دوودڵیا بمێنێتەوەو بزانێت ڕاستی لەوەدایە کە کۆتاییەکەی ئەبێتە مایەی پەشیمانی، ئەمە بەو مانایەیە کە دوا حوکمدان لە بارەی بڕیارێکەوە کە لە هەلومەرجی قەیراناویدا دەدرێت، لەسەر بنەمای دراوەکانی دنیایەکی تاریك و شێواو نیە کە بڕیاری ئێمە ڕووناك دەبێتەوە، بەڵکو لەسەر پایەی دنیایەکە کە دوای نەمانی قەیرانەکە شەفافیەت لە ناوەوەی خۆیدا پەیدادەکات.: لەبەرئەوە لە هەلومەرجێکی

دنیابینیە توندوتیژزاکان بنبڕن، دەبڕنەوەو بە توندوتیژی دنیا سادە دەکەنەوە،
تا بتوانن بۆ زەبرلێدان ئامانجێکی ڕونیان هەبێت

توندوتیژنامێزدا تۆ ناتوانیت ئەخلاقی توندوتیژی بە ڕەوا یان ناڕەوا بدەیتە قەڵەم، بەڵکو حوکمی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لە هەموو هەلومەرجێکدا بڵێیت: "توندوتیژی توندوتیژیە" "ئازاردان ئازاردانە" "کوشتن کوشتنە" ئەمانەن داوەری کردنی ڕاستەقینە. توندوتیژیەك کە بەرپەرچدانەوەی توندوتیژیەکی تره، خۆی بە ئەخلاقی ناوزەد دەکات، یان بە لایەنی کەمەوە پێچەوانەی ئەخلاق نیە، ئەمە تەنیا بانگەشەیەکەو نابێت وایدابنێین کە ئاوارتەیە لە ڕێسای "توندوتیژی توندوتیژیە".

دەبێت لێگەڕێین دەورەی توندوتیژیەکە کۆتایی بێت تا ئەوکاتە حوکمێکی ڕاستەقینە کە لە ئەنجامی گەڕان و دۆزینەوەی توندوتیژیەکەوە هاتوە بدرێت، کۆتایی دەورەی توندوتیژی ئەوە نیە کە ئاگری شەڕێکی ئاشکرا بە سەرکەوتنی لایەنێك بەسەری ئەوی تردا کوژابێتەوە، تا ئەوکاتەی کە گفتوگۆیەکی ئاقڵانەی دوور لە زۆرو سەپاندن لەسەر توندوتیژی لەکارخراوەکە ئەنجام نەدرێت، هێشتا هەلومەرجەکە هەر توندوتیژنامێزە. هیتلەر دەیوت: "کە ئێمە سەرکەوین، ئیتر کەس پرسیارمان لێناکات" لەبەرئەوە دەبێت بە پلەی یەکەم لەوانە بپرسرێتەوە کە بە دەسەڵاتن یان سەرکەوتوون. هاودەمی لەگەڵ سەرکەوتووی زۆرداردا ئەنجامەکەی ڕسواییە. لەسەر ئەم بنەمایە، هەموو ئەو سیفەتانەی دەخرێنە پاڵ توندوتیژیەك، بۆ ئەوەی بەرگری توندوتیژیەتیەکەی لێ دابماڵن و بیکەن بە کارێکی ئەخلاقیو مەزنی پیێبەخشن، هۆیەکی ئەخلاقیان لە دواوەیە. تەنیا حوکمی "کوشتن هەرکوشتنە" کە یەقینێکی ئەخلاقیە.

لەسەر ئەم بنەمایە هەموو کلتوورەکان تۆمەتی بێئەخلاقیان دەدرێتە پاڵ، چونکە دەیانەوێت ئەو توندوتیژیەی کە خۆیان دروستیان کردوە ناوێکی تری لێبنێن دوور لە توندوتیژی. هەموو کلتورێك جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە تەنیا خۆی شایانی ئەوەیە لە باری "توندوتیژی"یەکەوە ڕادەرببرێت. ڕێژەگەری کلتوری -کە ئێستا بە تایبەتی لەناو ئەنترۆپۆلۆجیەکاندا برەوی زۆر پێدراوەو بە ڕواڵەتی ڕەواپێدانی "لێگەڕێن هەر کلتورێك ڕێگای خۆی بگرێت" دێتە ئاراوە -پاڵپشتێکی تیۆری ئەو جۆرە بانگەوازەیە. لەم باسەی سەرەوەدا دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە هەرکەسێك دەست بۆ توندوتیژی بەرێت، یان ببێتە هۆی دروستبوونی، ئەوە شایستەی ئەوە نیە بکرێتە سەرچاوە (مرجع) بۆ لێکدانەوەی ئەو توندوتیژیەی کە ڕوویداوە، بەم پێیە دەتوانین بڵێین لە نێوان کۆمەڵێك لەو سەرچاوانەدا کە شایستەی ئەوەن لە بارەی توندوتیژیەکەوە کە لە کلتورێکەوە سەریهەڵداوە بە دوای لێکدانەوەیاندا بگەڕێیت، خودی ئەو کلتووره کەمترین شایستەیی هەیە. هەر کلتورێك بۆ خۆی ئاوارتەیەکە، بەڵام ناتوانێت هیچ بەڵگەیەکی ئەخلاقی عاقڵانە بدۆزێتەوە کە "مەگەر"ی ئاورتەییەکەی خۆی پێ ئاراستەبکات.

لەسەر ئەم بنەمایە هەموو کلتوورەکان تۆمەتی بێئەخلاقیان دەدرێتە پاڵ، چونکە دەیانەوێت ئەو توندوتیژیەی کە خۆیان دروستیان کردوە ناوێکی تری لێبنێن دوور لە توندوتیژی

ئێستا با لە هەلومەرجێکی ئاوارتەیی بڕوانین کە ئەگەری لێڕامانی تیایە. "مەگەر"ی ئاوارتە لە چ حاڵەتێکدا "مەگەر"ێکی ئەخلاقیە، بە واتایەکی دی، ئەو بڕیارەی کە دەدرێت، لە سەر بنەمای چ تێڕوانینێك ئومێدی ئەوەی لێدەکرێت کە ئەخلاقی بێت. ئێمە ئەم مەسەلەیە نەك بە شێوەی هەمەکی (کلی)، بەڵکو لەگەڵ بابەتی توندوتیژیدا بەرەوپێشی دەبەین.

تایبەتمەندیەتی بیرۆکەی ئەخلاقیەت ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەو فراوانی خۆی بە "چاك" دادەنێت: بە شێوەیەکی ڕەها ئەوە باشە کە چاکیەتی ئەخلاق بەرفراوان بێت، فراوان بوونی دەرگای زیاتر بۆ فراوان بوون دەکاتەوە، ئامانجی ڕەهای ئەخلاقیەت ئەوەیە کە قەڵەمڕەوی فراوانبوونی ئەخلاق فروانتربکات. ئەم قەڵەمڕەوە لە مرۆڤدا وەك تاکەکان و ڕەمزەکان دروستبوە، هەر مرۆڤێك ڕەمزێکە، دەلالەت لە شتێك دەکات کە لە تاك زیاترە. پێویستە جەخت لەسەر خەسڵەتی ڕەمزایەتی مرۆڤ بکرێت بۆ ئەوەی قەڵەمڕەوی ئەخلاقیەت لەهەر بوارێکدا تەنیا لەسەر ژمارەی چەند تاکێك قۆرخ نەکرێت کە لەوێدا خۆ دەبیننەوە، ڕێدەکەوێت کە هاوکاریکردنی یەکێك ببێتە هۆی زیان گەیاندن بە زۆر کەسی دی، بێئەوەی کە ئەو زیان پێگەیاندنە دەستی ئەنقەستی تیابێت. جا وەك پاداشت لە بەرچاوبیگرێت یان بتوانێت وەك پاداشت تەعبیربکرێت. لەم شوێنانەدا خەسڵەتی بە ڕەمزکردنی مرۆڤ دەستنیشان کردنە. بۆ نمونە: کەسێك بووراوەتەوە، جێگایەکی تایبەتی لە نەخۆشخانە بۆ دەستنیشانکراوەو کۆمەڵێك پزیشك و برین پێچ بە کەرەسەو ئامێری بە نرخەوە شەووڕۆژ چاودێری لێدەکەن. ئومێدی بە هۆشهاتنەوەی نیە، ئەگەر ئەو هاوکاریە پزیشکیەی لێببڕیت دەمرێت. بەو پارەیەوە کە لەودا خەرج دەکرێت، دەتوانرێت بە فریای ئەو نەخۆشانەدا بگەیت کە ناویان لە پێڕستی نۆرە دەرماندا تۆمارکراوە. ئەگەر مرۆڤ تەنیا وەك تاکێك تەماشابکرێت، لە بەراوردێکی ژمارەیی سادەدا دەشێت بەو ئەنجامە بگەیت کە کۆمەك پێنەکردنی نەخۆشە لە هۆش خۆچوەکە کارێکی ئەخلاقیە. بەڵام لایەنی ڕەمزیەتی ئەم کۆمەك نەکردنە ئەوەیە کە کۆمەڵگا بە ئەندامێکی خۆی، کە لە هۆشچوەو ناتوانێت لە هەقی خۆی کە هەقی وەرگرتنی دەرمانە بەرگری بکات، ناتوانێت هاوکاری بکات. لەم حاڵەدا ئەو تاقە کەسە لە هۆش خۆچوە وەك ڕەمزی هەموو ئەو کەسانەی کە دەشێت ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوانیش لە هۆش بچن لەبەرچاودەگیرێت، بە لەبەرچاوگرتنی ئەم لایەنە ڕەمزیەی تاك ئەوە دەردەکەوێت کە کۆمەك پێنەکردنی ئەو کەسە دواکەوتنێکی ئەخلاقیە. دەبێت لێرەدا ئەوەیش بڵێین کەس مافی ئەوەی نیە لایەنی ڕەمزیی تاك دیاریبکات کە بە پێی چ پێوانەیەك تەفسیرو تەعبیری لێبکرێت، ڕەمز ڕاڤەی ئازادی هەیە.

تایبەتمەندیەتی بیرۆکەی ئەخلاقیەت ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەو فراوانی خۆی بە "چاك" دادەنێت...
ئامانجی ڕەهای ئەخلاقیەت ئەوەیە کە قەڵەمڕەوی فراوانبوونی ئەخلاق فروانتربکات

بۆ نموونە: کەسێك فەرمانی لە سێدارەدانی بەسەردا دەدرێت، لە سێدارەدان بە پێی سروشتی فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتەی کە ئەو حوکمەی تیادراوە، بە کارێکی ئەخلاقی لە قەڵەم دەدرێت، لەبەرئەوەی ئەو کەسەی ئەو حوکمەی بەسەردا دراوە کراوەتە ڕەمزی ناپاکی، دەشێت کلتورێك یان ڕوانینێکی ئەخلاقی تر ئەو کەسە حوکمدراوە بە ئەنجامی لاوازیی کۆمەڵگەی ئەو وڵاتە بزانێت کە نەیتوانیوە پەروەردەیەکی ئەخلاقی دانیشتوان بکات و ئەمانە قوربانی دەست سیستم و لایەنە نائیسنانیەکانی بن و لە سێدارەدانی ئەو کەسە بێجگە لە تۆڵەسەندنی ڕووت و بێئەخلاقی کردن هیچی تر نەبێت. ڕەوا نیە دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتەی کە ئەو حوکمەی تیادراوە، تەنیا بە پێی لێکدانەوەو تەفسیری خۆیان، لایەنی ڕەمزیی تاك دەستنیشان بکەن. دەشێت لە خودی ئەو وڵاتەدا بە پێی بەرەوپێشچوونی زەمان ڕەوش و سروشتی تری وا بێتە کایەوە کە جێگای ئەمانەی ئێستا بگرێتەوە، لەم حاڵەدا لە دەزگای تەفسیری تازەدا بۆ لە سێدارەدانی تاك دەربڕینی تازە دێتەگۆڕێ. ڕەنگە سبەی گەورەیی ئەمڕۆ بە ڕسوایی لە قەڵەم بدرێت.

ئەو بڕیارە ئەخلاقیەی کە لە هەلومەرجی ئاوارتەییدا دەدرێت، دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە ئایا بە ڕاستی بەو ڕێگایەی کە دەیکاتەوە، سنووری ئەخلاق فراوانتر دەبێت. ئەم پرسیارە بە تایبەتی ئەوکاتە بایەخی هەیە کە بەرانبەر بە زەبروزەنگ، بەرەنگاریکردن بڕیاری ئەوە ئەدات کە ئەویش بە "ناچاری" شێوەی زەبروزەنگی لەخۆگرتوە. بەرەنگاریەکی لەم جۆرە بە سەردەمی تیغەوە وەستاوە: وەك بەرەنگاریکردن لە بەرانبەر زەبروزەنگ ئەخلاقیەو وەك پیادەکردنی زەبروزەنگ بە سادەیی دەتوانێت بێئەخلاقی بێت یان دەبێت.

لەمەی سەرەوەدا پانتایی ئەخلاقمان لەگەڵ ئەو مرۆڤانەدا کە لەو پانتاییەدا وەك تاك و ڕەمز دەردەکەون، دیاریکرد، تاکایەتی (فردیت) بێتەوە بە واقیعێکی ئینسانی، بەڵام ئینسان وەك ئینسان زیاد لەوەی واقیعیەت بێت، ئیمکانە، ڕەمزیش تا ئەو شوێنەی کە دیارە واقیعیەتەو تا ئەو شوێنەیش کە هێشتا نادیارە، ئیمکانە. لەبەرئەوەی ئاشکرایە کە تاك ڕەمزی چیە، کە هێشتا ئاشکرا نیە، ئیتر دەبێت ڕەمزی چی بێت. کەواتە دیاریکردنی ئەوەی کە ئایا بڕیارێك کە ئێمە ئەیدەین گۆڕەپانی ئەخلاق فراوانتر ئەکات، نابێت تەنیا لەسەر بەراوردی سادەی ژمارەی ئەو کەسانە بنیات نرابێت کە دەکەونە ئەم قەڵەمڕەوەوەو ئەوانەی دەکەونە ئەودیو بازنەکەوە، ئاڵۆزکردنی ئەم بەراوردە بە لەبەرچاوگرتنی مرۆڤ وەك ڕەمز، فلان کەس لە بە واقیعکردنی خۆیدا خۆی لە دەرەوەی گۆڕەپانی ئەخلاقدا داناوە، چونکە بە ڕەفتارەکانی، لە سنوری قەڵەمڕەوی ئەخلاقی کەمکردۆتەوە، بەڵام ئایا من دەتوانم بڵێم ئێستا بە لەناوبردنی ئەو کەسە گۆڕەپـــانی ئەخلاق فراوانتر ئەبێت؟ ئەو مرۆڤە، وەك

بەڵام ئایا من دەتوانم بڵێم ئێستا بە لەناوبردنی ئەو کەسە گۆڕەپـــــانی ئەخلاق فراوانتر ئەبێت؟

مرۆڤ ئازادەو هەر ئێستا دەتوانێت بە کارێکی چاك بێتە ناو گۆڕەپانی ئەخلاقەوە، بۆیە دەشێت لەناوبردنی ئەو کەسە کارێکی نائەخلاقی بێت و هەر شتێکیش بشێت بێئەخلاقی بێت، ئەوە بێئەخلاقیە، کەواتە حوکمی لە سێدارەدان، لە ڕووی ئەخلاقیەوە کارێکی نادروستە، سزای لە سێداردان تۆڵەلێکردنەوەیەو تۆڵەسەندنەوەیش کارێکی بێئەخلاقیە، چونکە بە تۆڵە هێزی چاکە لە دنیادا زیادناکات. کەمکردنەوە لە هێزی شەڕ زیادکردنی هێزی چاکە نیە.

ڕەنگە بڵێن باوەڕهێنان بەو تیۆرانەی کە پێشان باسیان لێوەکرا لە هەلومەرجی قەیراناویدا مرۆڤ بەرەو ئیفلیجی بەرن و ئەنجامەکەی بێجگە لە بڵاوکردنەوەی دوودڵی هیچ نەخاتەوە، ئەمە بۆچوونێکی ڕاستە، بڵاوکردنەوەی دوودڵی کارێکی ئەخلاقیە، تا ئێستا بە بڕیاری بنبڕ خەڵکیان کوشتوە- ڕەنگە بە ناوی ئەخلاقیشەوە ئەمەیان کردبێت- کێ چوزانێت! بەڵام لە دوودڵیا کەمتر خوێن دەڕژێت. وەڵێ بە دوودڵی سیاسەتێك بەرەو پێش نابرێت، ئەمەیش ڕاستە، سیاسەت بە شێوە ناسراوەکەی لە سەر پایەی دۆست گرتن و شەڕئەنگێزی دروستبوە، واتا دابەشکردنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بۆ دۆست و دوژمن و چاکە بۆ دۆست و شەڕ بۆ دوژمن، کە "بژی، بڕوخێ" شێوە زیادەڕەویەکەیەتی، دەشێت ئەم پرسیارە بکرێت کە ئایا سیاسەت دەتوانێت لەگەڵ ئەخلاقدا هەڵبکات؟ بە داخەوە لە سەرەتاوە وەڵامی ئەم پرسیارە نەخێرە. سیاسەتێك کە ئامانجەکەی پاراستنی دەسەڵات و زیادکردنی بێت، ناچارە لەو پێناوەدا درۆی بەرژەوەندی، دۆستایەتی بەرژەوەندی، شاردانەوەی بەرژەوەندیو تەنانەت کوشتنی بەرژەوەندی لەبەر بگرێت و بە تەواوی ئەخلاقی ئینسانی لەکەدار بکات. سیاسەتی دەسەڵاتخوازی ناتوانێت لەگەڵ ئەخلاقدا پێکبێت، ڕەخنەگرتن لە ئەخلاقی سیاسی خۆی سیاسەتەو ئەمەیش ئەوە نیشان ئەدات کە دەشێت سیاسەت /ئەڵتەرناتیڤێك/ لەبەرچاو بگرێت کە بە ڕووی ئەخلاقدا دانەخرێت، ئەم سیاسەتە ئەلتەرناتیڤە، بە ناچاری دەبێت بەرنامەیەکی هەبێت بە پێچەوانەی بەرنامەی دەسەڵاتەوە، خودی ئەو ناتوانێت لە بیری دەسەڵاتخوازیا بێت، چونکە ئەگەر ئەوە بکات مێژوو دووبارە دەبێتەوەو جارێکی دی بەناوی ئەخلاقەوە دژی ئەخلاق کاردەکرێت، تەنیا مرۆڤی بە ئەخلاق دەتوانێت لە بەرەی پێچەوانەدا بێت، چونکە ڕەنگە لەو پێچەوانەبوونەدا بتوانرێت سیاسەت و ئەخلاق پێکەوە کۆبکرێتەوە.

دەستنیشانکردنی ئەوەی کە ئاخۆ بڕیارەکانی ئێمە لە هەلومەرجی قەیراناویدا قەڵەمڕەوی ئەخلاق فراوانتر ئەکات، کارێکی ئاسان نیە، چونکە ئاسایی تۆ ناتوانێت بە یەقینی تەواوەوە بزانیت چی ڕووئەدات. کەواتە تا ئەندازەیەك دەبێت بڕیارەکەت بنبڕ بێت. لەم حاڵەدا بە ناچاری دەبێت ئەوەت قبووڵ بێت کە دەشێت دەستی

سیاسەتێك کە ئامانجەکەی پاراستنی دەسەڵات و زیادکردنی بێت، ناچارە لەو پێناوەدا درۆی بەرژەوەندی، دۆستایەتی بەرژەوەندی، شاردانەوەی بەرژەوەندیو تەنانەت کوشتنی بەرژەوەندی لەبەر بگرێت

ئێمەیش پیس بێت. ئیمکانی ئەم دەستپیس بوونە لە ئارادایەو دەبێت لەم لایەنەوە ویژدانمان ئاسودە نەبێت. ویژدان واتا ئاگاداری لەو ئیمکانە. کەواتە نەك ویژدانی ئاسوودە، بەڵکو ویژدانی بە ئازاریش ویژدانێکی ئەخلاقیە، نەبوونی یەقین لە ویژدانی ئەخلاقیدا هۆیەکە بۆ بەدەستهێنانی یەقین، ڕەوشێکی تێرامان دێتەگۆڕێ کە ناتوانیت کۆتاییەکەی بە یەقین دەستنیشان بکەیت، دەشێت ئەم تێرامانە وا بدرێتە قەڵەم کە ئەو بڕیارەی لەو هەلومەرجی قەیراناویەدا دراوە بڕیارێکی ئەخلاقیە.

پێشتر کەمێکمان لە بارەی مانای توندوتیژیەوە باسکرد. بەو پێودانگە دەبێت بڵێین ئەو تێرامانەی کە ئێمە قسەی لە بارەوە دەکەین تەنیا لەوکاتەدا دەتوانێت هەموو لایەکی واقیعیەت ڕووبنکاتەوە، کە هەموو ئەوانەی ئەو واقیعیەتەیان دروست کردوە - بە جۆرێك لە جۆرەکان- بەشداری تیابکەن. ئەو بەشداریەیش دیالۆگەو ئەگەر یەقینێك دروست بێت دەبێت لە دڵی ئەو دیالۆگەوە سەرچاوە بگرێت.

توندوتیژی، توندوتیژی لێدەکەوێتەوە، ئەگەر وا بزانین کە توندو تیژی بە توندوتیژی لەناودەبرێت مانای وایە لە مێژوو بێئاگاین، توندوتیژی فەرمانبەر نیە، سیستماتیزکردن نیە، گەلۆریەکی ڕسواکەرە ئەگەر بڵێین: "تا فلان ڕۆژو فلان شوێن توندوتیژ دەبین و دوای ئەوە لە ئاسایش و خۆشیا دەژین" دنیای بریندار هەمیشە خوێنی لێدەتکێت، ناتوانین خوێن بە خوێن بشۆین، هەڵبەت من بڕوام بەوە نیە کە دنیا تۆڵەسێنەو لە دواییدا مێژوو، سزای ئەوانە دەدات کە توندوتیژ بوون. بە پێچەوانەوەی بۆچوونی هیگڵەوە مێژووی دنیا دادگایی کردنی نیە، ژمارەی پیاوکوژە خۆشناوەکانی مێژوو زۆر زۆرترە لە ژمارەی پیاوکوژە بەدناوەکانی. گەلێك لەو کەسانەی کە ناویان لە مێژوودا ماوەتەوەو قارەمان و گەورە ناوبراون، گەیشتنیان بەو پلەوپایە مێژووییە تەنیا لەبەرئەوە بوە کە خوێنڕێژی گەورەبوون. لە مێژوودا ئەو کەسانەی کە جەختیان لەسەر خوێنڕێژی نەکردوە بە ترسنۆك ناوبراون. مێژو درۆزنە، توندوتیژی دەشارێتەوە، لە قارەمانە دنیاگیرەکانی دەدوێت، بێئەوەی باس لە مرۆڤ کوژیان بکات، مێژوو، مێژووی بکوژانە نەك کوژراوەکان، بەڵام مێژوو بۆ درۆ دەکات؟ بۆ توندوتیژی دەشارێتەوە؟ ئایا شەرم لە هیچ دەکات؟ مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی شەرمن شەرمنانە مێژووی خۆی دەنووسێت، مرۆڤ شەرمنە، چونکە لەگەڵ توندوتیژیدا پێدەگاو ناتوانێت تیایدا بژی، سێدارەهەڵخستن لە بەری بەیاندا، لەوکاتەدا کە هێشتا دنیا ڕوناك نەبۆتەوە، هۆیەکەی شەرمە. کە بە تاریکی دەڕژێنە نێو ماڵان و مرۆڤ بەرەو بەندیخانە دەفڕێنن، هۆیەکەی شەرمە. ئازاردانی نێو ژێرزەمینە تاریکەکان، کوشتنی پەنامەکیو لەژێر چاڵ خستنی، هۆیەکەی شەرمە. دەمامك کردنی پیاوکوژان لە شەرمەوەیە. شەرم لەچی؟ شەرم بەرانبەر بە کێ؟ ئایا

توندوتیژی، توندوتیژی لێدەکەوێتەوە، ئەگەر وا بزانین کە توندو تیژی بە توندوتیژی لەناوەدەبرێت مانای وایە لە مێژوو بێئاگاین

شه‌رم دیارده‌یه‌كی ئه‌خلاقیه؟ شه‌رم واتا به‌ ره‌سمی ناسینی بوونی ئه‌وانی دی، له‌م لایه‌نه‌وه‌ شه‌رم ئه‌خلاقیه‌، به‌ڵام له‌به‌رئه‌وه‌ی شتێك ده‌شارێته‌وه‌، ده‌شێت بێئه‌خلاقی بێت، ئه‌خلاق به‌شێكه‌ له‌ هاوژیانی، ئه‌وه‌ی نه‌یه‌وێت له‌گه‌ڵ كه‌سانی دیدا بژی، نایه‌وێت به‌ ئه‌خلاق یا بێئه‌خلاق بێت. كه‌ ده‌ڵێین "فلان كه‌س بێشه‌رمانه‌ ئه‌و كاره‌ی كردوه‌" مه‌به‌ستمان چیه‌؟ مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌و كه‌سه‌ بوونی ئێمه‌ی له‌به‌رچاو نه‌گرتوه‌، خه‌ڵكی تری به‌ ره‌سمی نه‌ناسیوه‌، گوێی به‌وی دی نه‌داوه‌، له‌ باره‌ی چه‌نگیزه‌وه‌ ناوترێت كه‌ سوپاكه‌ی **بێشه‌رمانه‌ نه‌یشاپوریان** وێرانكردو كه‌سیان به‌ زیندویی تیانه‌هێشته‌وه‌، له‌ باره‌ی شا ئیسماعیل ناڵێن **بێشه‌رمانه‌** ته‌ورێزی نوقمی خاك و خوێن كرد. بۆ؟ كه‌چی ده‌ڵێن هه‌ندێك له‌ پیاوماقووڵ و میری ئێرانی بێشه‌رمانه‌ هاوكاری چه‌نگیزیان كرد، ته‌ورێزی بوون، ئه‌و بێشه‌رمانه‌ی له‌ته‌ك شا ئیسماعیلدا شمشێریان ده‌وه‌شاند؟ بۆ؟ بۆ ئه‌مانه‌ بێشه‌رمن و كه‌چی چه‌نگیزو شا ئیسماعیل بێشه‌رم نین؟ ئێستا ده‌توانین په‌نجه‌ له‌سه‌ر دژایه‌تیه‌ك (تناقض) دابنێین: مرۆڤ مێژووی خۆی به‌ شه‌رمه‌وه‌ ده‌نووسێت، مرۆڤ له‌ مێژوودا بێشه‌رمانه‌ توندوتیژیه‌كانی خۆی ده‌شارێته‌وه‌، مێژوو بێشه‌رمانه‌ شه‌رمنه‌، ئه‌م دژایه‌تیه‌ نیشانه‌ی دوو ده‌ركه‌وته‌ی دژ به‌یه‌كی ژیان -توانین- له‌گه‌ڵ -توندوتیژی و ژیان- نه‌توانین -له‌- توندوتیژدایه‌.

ئه‌گه‌ر مرۆڤ به‌ ته‌نیا واقیعیه‌تێك بێت، مێژووی نابێت، مرۆڤ بوونه‌وه‌رێكی مێژووییه‌، چونكه‌ زیاد له‌ واقیعیه‌ت، وه‌ك پێشان باسمانكرد، ره‌مزو ئیمكانیشه‌، مه‌سه‌له‌كه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ مێژوو شه‌رمناوی ده‌كات. ئه‌گه‌ر مرۆڤ به‌ ته‌نیا واقیعیه‌ت بوایه‌، له‌ توندوتیژیه‌كه‌ی توندوتیژی نه‌ده‌كه‌وته‌وه‌ "ئه‌لف" "ب"ی ده‌كوشت و كێشه‌كه‌ كۆتایی پێده‌هات. به‌ڵام ده‌شێت "ئه‌لف" ره‌مزی "ب" بگرێت و "ب" ره‌مزی "ت". ره‌نگه‌ سه‌رده‌مێك تێپه‌رێت و له‌ كاتێكدا كه‌ واقیعیه‌تی "ئه‌لف" نه‌مابێت، "ت" به‌ناوی "ب"وه‌ له‌ دژی "پ" وه‌ك ره‌مزی "ئه‌لف" راستبێته‌وه‌، ئه‌م چیرۆكه‌ ده‌شێت هه‌ر به‌م شێوه‌یه‌ چه‌ند سه‌ده‌یه‌ك به‌رده‌وام بێت و دووباره‌ بێته‌وه‌. شوێنه‌كه‌ی له‌بیر بكرێت و سه‌دان حیكایه‌تی جۆراوجۆری لیبكه‌وێته‌وه‌.

له‌ كۆمه‌ڵگای كۆندا به‌ ئاسانی شته‌كان -كۆتاییان پێده‌هات- وه‌لێ له‌ كۆمه‌ڵگه‌ی مۆدێرندا هیچ فایلێك داناخرێت، بۆیه‌ ده‌شێت له‌م دیده‌وه‌ بتوانین له‌سه‌ر كۆتایی مێژوو قسه‌بكه‌ین. ده‌توانین بڵێین هیچ یه‌كێك له‌ شه‌ره‌كانی سه‌رده‌می تازه‌ نه‌گه‌یشتووه‌ته‌ كۆتایی‌و هیچ كاتێكیش به‌ كۆتایی ناگه‌ن. هه‌ركه‌سێك فیلمێك له‌ شه‌ری ڤێتنام ببینێت له‌و شه‌ره‌دا به‌شداریده‌كات، هه‌ر وێنه‌یه‌كی تازه‌ی ئه‌و شه‌ره‌ ده‌ستگیر بێت، هه‌ر به‌ڵگه‌نامه‌یه‌كی له‌سه‌ر بڵاوبكرێته‌وه‌، هه‌ر كتێبێكی تازه‌ی له‌سه‌ر بنووسرێت به‌رده‌وامی به‌ "شه‌ر" ده‌دات. كه‌واته‌ مه‌سه‌له‌كه‌ كۆتایی پێنه‌هاتوه‌،

له‌ كۆمه‌ڵگای كۆندا به‌ ئاسانی شته‌كان -كۆتاییان پێده‌هات- وه‌لێ له‌ كۆمه‌ڵگه‌ی مۆدێرندا هیچ فایلێك داناخرێت، بۆیه‌ ده‌شێت له‌م دیده‌وه‌ بتوانین له‌سه‌ر كۆتایی مێژوو قسه‌بكه‌ین

مەسەلە هیچ کاتێك کۆتایی پێنایەت. کۆمەڵگەی مۆدێرن زۆر هەوڵئەدات شەرمنانە خوێن و توندوتیژی بشارێتەوە، بەڵام هەر لە هەمان کاتدا بێشەرمانە پەردە لەسەر توندوتیژیەکان هەڵدەماڵێت، ئەم بێشەرمیەی کۆمەڵگەی مۆدێرنە، بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵگەی کۆندا ڕەوشت بەرزترە.

## سەرچاوە

کتێبی: خشونت، حقوق بشر، جامعە مدني
نووسینی: محەمەد ڕەزا نیکفەڕ.



شۆڕش ئەمین

العفیف الأخضر

# تیرۆر لەژێر پەردەی ئاین دا




و: شوان ئەحمەد

تیرۆر لە ڕوی ستراتیژیەوە بریتیە لە پەنابردن بۆ جۆرێك توندوتیژی کە هیچ یەك لە سێ شەرعیەتە مێژووییەکە پاساوی نادەنەوە، ئەو سێ شەرعیەتەش بریتین لە: (شەرعیەتی یاسایی نێودەوڵەتی، شەرعیەتی جیهانی، شەرعیەتی سیاسی ئەقڵانی) کە شۆڕشەکان، لە شۆڕشی ئینگلیزیو لە سەدەی حەڤدەوە پشتیان پێبەستوە.

کەواتە هەموو توندوتیژیەکی بەرگری ئامێز دژ بە هەوڵ و تەقەلایەکی دوژمنکارانە، هەموو جەنگێکی بەرگری لەخۆکردن، هەموو هەوڵێك بۆ گۆڕینی ئەو هەلومەرجەی لە ئارەدایە بە زەبری هێزو لە ڕێی توندوتیژیەوە، لای زۆربەی زۆری خەڵك، شەرعیەت و ڕەوایەتی خۆی لە ڕووی مێژووییەوە لەدەست داوە.

ئەو توندتیژیـە تیرۆرستیەی سـەرکۆنە دەکرێـت توندوتیژیـە کـە مەبەسـتی بەدیهێنانی ئامانجێکی ڕەوا نیە بە شێوەیەکی سیاسی و ئەقلانی، بەڵکو تەنها بە توندوتیژیەکی بێ ئامان و خوێناوی دەمێنێتەوە، بە تایبەتی کاتێك نەخشە بۆ ئەوە دەکێشێت تا زەبر لە هاوڵاتیانی مەدەنی بێ گوناه بوەشێنێ‌و مافەکانی ئاسایش و ژیانی مرۆڤ پێشێل بکات.

توندوتیـژی ڕەوا تەنـها ئامـانجی سـەرکەوتنە، بـەڵام توندوتیـژی تیرۆریسـتی مەبەستی یەکەمی نمایشکردنی خۆیەتی. لەمڕۆشدا شۆڕشی ئاڵوگۆڕو پەیوەندیکردن چاکترین ئامرازێکی بەردەست خستوە کە ئەو لێی دەگـەڕێت، بۆ ئـەوەی کارەکـەی دەنگدانەوەیەکی جیهانی هەبێت و بگات بە هـەموو ئەوانەی بەو کردەوانە سەرسامن یاخود لێی دەترسن. تاوانباران چەندە لە هەوڵی شاردانەوەو سڕینەوەی شوێنەواری تاوانەکانیاندان، تیرۆریستان (بۆ ئەوەی بە مەرامی خۆیان بگەن)، ئەوەندە لە هـەوڵی نیشاندان و ئیعلانکردنی کردەوەکـانی خۆیـاندان بە دنیـادا، هـەر بۆ ئـەم مەبەستە ئـەنجامدەرانی پرۆسـە خۆکوژیـەکان لـە (مانـهاتن) و (پـەنتاگۆن)، کـاتژمێر نـۆی سـەرلەبەیانیان بە کاتی ئـەمریکا دەسـت نیشـانکرد، لەبەرئـەوەی ئـەو کاتـە کـاتێکی گونجاوە بـۆ جیـهانی ئیسـلامی‌و زۆرتریـن ڕێـژەی خـەڵك دەتوانـن (بـە گـەرموگوڕی) ڕوداوەکە لـە ڕێـی شاشـەی تەلەفزیۆنەکانیانەوە ببینن. ئەمـەش بـۆ ئـەوەی متمانـەی خەڵکانی عەرەبی‌و ئیسلامی بەدەست بهێنن، ئەو خەڵکەی هیچ متمانەیەکی بە خۆی نەماوە بە تایبەتی لە دوای شکستی *1967*.

زۆرجار تیرۆر، کۆمـەڵێك گروپـی بچوك بچوکـی نـهێنی پێـی هەڵدەسـتن، کـە بـە شێوەیەکی سەربازی ڕێکخراون و دژی دەوڵەت کاردەکەن، مەبەستیشیان بەدیهێنانی ئامانجگەلێکە کە نەیانتوانیوە بە ئاشکراو لە ڕێی کاری جەماوەرییەوە بەدی بهێنن.

لە کاتی جەنگی ساردەوە تیرۆر بوو بە تیۆری دەوڵەت، ئیتر ئەو دەوڵەتە لە ڕێی دەزگا سیخوڕی‌و هەواڵگریەکانیەوە ئەنجامی دابێت، یاخود بە هۆی چەند دەستەو تاقمێکەوە کە لە پشتەوە خۆی چەکداری دەکردن و یارمەتی دەدان. پێی هەستابێت. بەمجۆرە هەر گروپێکی تیرۆریست دەوڵـەتێکی لـە پشت نـەبێت سـەرکەوتوو نابێت و شکسـت دێنێـت، لەبەرئـەوەی تـیرۆری هاوچـەرخ پێویسـتی بـە دوو سەرچاوەی سەرەکی هەیە:

- پارەو پولێکی زۆرو زەوەند.
- زانیاری هەواڵگری.

جگە لە دەوڵەتیش کەس دەستی بەسەر ئەوەدا ناشکێت.

ئەمڕۆکە تەواو دڵنیاین لەوەی تیرۆری چەپڕەوەکان، لە هەریەك لە ئەڵمانیاو ئیتالیا، (کەی. جی. بی)ی لە پشت بوو. لە پەنجاکانیشدا فەرەنسای کۆلۆنیالی دەستی دابوە تیرۆر لە دژی سەرکردەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە تونس و جەزائیر. بۆ نمونە (چنگی سوور) سەرکردەی تونسی "فەرەحات حەشاد"ی تیرۆر کردو سالی 1955 "ئەحمەد بن بلە"ی سەرکردەی سوپای ڕزگاریخوازی جەزائیر، بە شێوەیەکی سەیر لە هەوڵێکی تیرۆرکاری قوتاری بوو. بە هەمان شێوە لە پەنجاکاندا ئیسرائیل تیرۆری دەوڵەتی لە دژی هاوڵاتیانی فەلەستینی پەیڕەوکرد، بۆ ئەوەی ناچاریان بکات خاك و ئاوی خۆیان جێبهێڵن و دەستبەرداری وڵاتەکەیان بن. ئەم پرۆسەیەش تا ئەمڕۆ لە دژی سەرکردەو ئەندامە چالاکەکانی (فەتح و حەماس و جیهادی ئیسلامی) درێژەی هەیە.

ماوەیەك بەر لە ئێستا "شیمون پیرێز" زانیاری ئەوەی دایە ڕۆژنامەکان کە "موشی یەعلون"ی جێگری سەرۆك ئەرکانی سوپای ئیسرائیل، لە هەوڵی ئەوەدایە "یاسر عەرەفات"ی سەرۆکی دەسەڵاتە ئۆتۆنۆمیەکەی فەلەستین تیرۆر بکات و بە یەکجاری ڕێکەوتننامەی (ئۆسلۆ) گۆڕ بکات. هەریەك لە مەراکیش و جەزائیر، لە ساڵانی شەست و حەفتاکاندا تیرۆری دەوڵەتیان دژی هەندێك لە سەرانی ئۆپۆزسیۆنی وەك: (مەهدی بن بەرەکەو محەمەد خیسەرو کەریم بلقاسم)، بەگەڕخست. هەروەها کۆماری ئیسلامی ئێرانیش ئەم پرۆسەیەی لە دژی بەرهەڵستکارەکانی، لەناوخۆی وڵات و لە ئەوروپا جێبەجێکرد. لە ئەوروپا (61) پەنابەری تیرۆر کرد، لەوانە "عەبدولڕەحمان قاسملۆ"ی سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.

شایەنی باسە، هەریەك لە ئێران و سودان و ئەفغانستان، تیرۆری دەوڵەتیان لە دژی وڵاتانی (عەرەبیو خۆرئاوایی) بەکارهێناوە، بۆ جێبەجێکردنی مەرام گەلێکی وا کە وڵاتانی دی بە شێوازی دیبلۆماتی بە دەستی دێنن.

لێرەدا دەکرێت بپرسین بۆچی ئەوانە پەنا بۆ تیرۆر دەبەن؟ لەبەرئەوەی لاوازی ئەو وڵاتانە لە ڕووی سەربازیەوە، ڕێیان پێنادات بچنە جەنگێکی کلاسیکیەوە دژ بەو وڵاتانەی ناکۆکن لەگەڵیاندا، بۆیە پەنا بۆ دەستەو تاقمە تیرۆرستە ئاینیەکان دەبەن تا لە دژی ئەو وڵاتانە بەکاریان بهێنن کە دەیانەوێت ئاسایش و ئارامیان تێکبدەن.

تیرۆری ئاینیو تیرۆری عەلمانی چونیەکن لە بەکارهێنانی توندوتیژی کوێرانەو سیاسەتی شەڕئەنگێزانەدا، بەڵام ئەوەی لێکیان جیادەکاتەوە ئەوەیە تیرۆری ئاینی پەنا بۆ شەرعیەتی ئاینی دەبات کە پێی وایە لە ڕێی ئەم سێ ئامرازەوە بەرجەستە دەبێت: (بەرقەرارکردنی ئیرادەی یەزدان لەسەر زەوی، تەکفیرکردنی مۆدێرنە، پشت بەستن بە فتوادان بۆ پاساودانەوەی تاوانەکان).

گروپێکی تیرۆرستی ئاینی هەر هێندەی پێی وابوو تەواوی حەقیقەت لای ئەوە، ئیتر دەگاتە قەناعەتی ئەوەی ئاسمان (ئەوی هەڵبژاردووە) تا پەیامی ڕزگارکردنی جیهان لە گومڕایی (بە تیرۆرکردن) بگرێتە ئەستۆ، ئەویش بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئیرادەی یەزدان لەسەر زەوی. هەر ئەمەش بوو گروپە یەهودیە ئەرسۆدەکسەکان (زەلوت) لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زاینیدا ئەنجامیان دەدا. هەروەها (حەشاشەکان) و دواتریش کڵێسای کاتۆلیکی بە درێژایی پێنج سەدە لە دژی مۆدێرنە بەگەڕی خست، بەڵام دادگاکانی پشکنین لە بری ئەوەی مۆدێرنە لەباربەرن، بۆ ئەوەی پێبزانن ڕێگایان لە بەردەمدا کردەوە.

بەمجۆرە ئەقڵی مۆدێرن بەسەر ئەقڵی تەقلیدیدا سەرکەوت، گەورەترین سەرکەوتنی مۆدێرنەش لەوەدابوو دوژمنە مێژووییەکەی هێنایە ژێر باری ئەوەی، پەیڕەوی پرانسیپەکانی بکات و خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت.

دوای ئەوەی کڵێسای کاتۆلیکی، نەیتوانی ڕێ بە مۆدێرنە بگرێت و لە بەرامبەریدا دوچاری شکست هات، ڤاتیکان ناچاربوو لە نێوان ساڵانی *1962–1970* پێکبێت لەگەڵیداو پەیوەندی خۆی لەگەڵیدا ئاسایی بکاتەوە.

گەر تا دوێنێ کڵێسا لە هەوڵی گۆڕکردنی مۆدێرنەدا بووبێت (مۆدێرنە وەك ئەوەی بریتیە لە دیموکراسیەت و عەلمانیەت و یەکسانی نێوان نێرومێ و تەواوی ڕەگەزەکان)، ئەوا ئەمڕۆ تیرۆری ئیسلامی درێژە بەو پرۆسەیە دەدات و دەیەوێت ڕێگەنەدات مۆدێرنە بێتە ناو خاکی ئیسلام و عەلمانیەکانیش کە هەڵگری پرۆژەی مۆدێرنەن لەناوبەرێت. بزاوتە ئیسلامیەکانی (میسرو جەزائیر) دەیان ڕۆشنبیرو کارمەندانی بوارەکانی ڕاگەیاندنیان تیرۆر کردوە.

سەرکردەی ئەو بزاوتە ئیسلامیانە فتوایان لەسەر ئەو مەسەلەیە داوەو بکوژانیان دەسکراوە کردوە بۆ ئەوەی خوێنی قوربانیەکانیان (لە ڕۆشنبیران) برێژن. فتوادان لە تیرۆری ئاینیدا مەسەلەیەکی جەوهەریە، لەبەرئەوەی ناهێڵێت کەسی تیرۆریست هەست بە گوناه بکات و ڕوگیر بێت، هەروەها لەو فەرمانەشی کە ناچاری دەکات (کەس نەکوژێت) قوتاری دەکات.

لە میانەی دادگایکردنی بکوژانی "د. فەرەج عەلی فۆدە"دا، دادوەر پرسیارێکی ئاڕاستەی "شێخ محەمەد غەزالی" کرد (بۆ زانیاری ئەم پیاوە سمبولی میانڕەویە لەناو سەرکردەکانی ئیخوان موسلمیندا) و لێی پرسی: حوکمی ئیسلام دەرهەق بەوانەی هەستاون بە کوشتنی "فەرەج فۆدە" چیە؟ بێ هیچ دودڵیەك و وەکی فەقیهێکی سەدەکانی ناوەڕاست کە ویژدانی نەخلاقی مردبێت "شێخ" لە وەڵامدا وتی: ئەوانە حوکمی هەڵگەڕانەوە لە دینیان بەسەردا جێبەجێکردوە، حوکمێك کە ئیمام خۆی لە

جێبەجێکردنی دزیوەتەوە. لەوکاتەدا بکوژەکە کە هەستی کرد لە هەموو گوناهێك بێ بەریە، قیژاندی: (ئێستا بە ویژدانێکی ئاسودەو ئارامەوە دەمرم و ژیان جێدێڵم). واتە بکوژەکەی "فەرەج فۆدە" دوای ئەوەی گوێ بیستی فتواکەی "شێخ غەزالی" بوو، هەستیکرد گوناهێکی گەورەی نەکردوە بەوەی (هەستاوە بە کوشتنی کەسێك کە خودا حەرامی کردوە)، بەڵکو کارێکی چاکی کردوەو شایانی ئەوەیە پاداشتی بدرێتەوە. ویژدانی بکوژەکە زۆر ئاسودەتر بوو کاتێك سەرلەنوێ دادوەرەکە لە "غەزالی" پرسی: (ئەی سزای ئەوانە لە ئیسلامدا چیە؟) "شێخ" لە وەڵامدا وتی: (ئەوان لە بەرامبەر ئیمامدا لەسەر رای خۆیان سوربوون و دەستبەرداری رای خۆیان نەبوون- افتئات- یش لە ئیسلامدا سزای لەسەر نیە). بە کورتیەکەی "شێخ محەمەد غەزالی" داوای ئازادکردنی دەکردن.

هەر بە فتوای لەمجۆرەی "شێخ"، ئیسلامیەکانی جەزائیر حوکمی هەڵگەڕانەوەیان بەسەر (61) رۆشنبیرو ژورنالیستدا جێبەجێ کرد، لەوانە "جەلال یابس"ی ئەکادیمست. "ئەنوەر هەدام"ی نوێنەری بەرەی ئینقازی ئیسلامی لە لێدوانێکیدا بۆ ئاژانسی دەنگوباسی فەرەنسی، بەرپرسیارێتی رێکخراوەکەی لە تیرۆرکردنی "یابس" راگەیاند. هەر سەبارەت بەو مەسەلەیە، رابەری ئیسلامیەکانی تونس لەسەر وتاری (المتوسط)دا تەئکیدی کردەوە: (عەلمانیەکانی تونس کە دەستیان لەگەڵ دەوڵەتدا تێکەڵکردوە، هەمان چارەنووسی -یابس-یان دەبێت).

"راشد غەنوشی" لە کتێبەکەیدا (ئازادیە گشتیەکان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا) (بەیروت 1993)، فتوایەکی بڵاوکردۆتەوە کە تیرۆرکردنی "ئەنوەر سادات" لە رووی شەرعیەوە بە کردەوەیەکی رەوا دەزانێت: (چونکە حوکمڕانی موسڵمان هەرکاتێك لە شەریعەت لایدا، کوشتنی رەوایە. بۆیە ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە بەو کارە هەستێت و هەوڵبدات بۆ رزگاربوون لێی، لەبەرئەوەی مانەوەی ئەوانە لەسەر کورسی دەسەڵات دەبێتە مایەی ئاشوب و نائارامی). فیقهی مەرگ، کە ئەم فتوا خوێناویانەی بەرهەم هێناوە، بەردەوام و تا ئێستاش لە قوتابخانەکانی جیهانی ئیسلامیو زانکۆکانیدا (بێجگە لە تونس و تورکیا) دەخوێنرێت و جگەرگۆشەکانمانی پێ گۆش دەکرێت. (فیقهی مەرگ) بەردەوام لەناو خوێندکاراندا پەرە بە (مایکرۆفاشیەت) دەدات، ئەو (مایکرۆفاشیەت)ەی سایکۆلۆژیای ناخی مرۆڤ باسی لێدەکات و پێی وایە لە ناخودئاگای هەریەکێکماندا خۆی مات داوەو هەر هێندەی هەلێکی بۆ رەخسا بەئاگا دێت و دەکەوێتەگەڕ.

تەنانەت ئەو وڵاتانەشی لە شەڕی دەستەویەخەدان لەگەڵ تیرۆر (وەکی میسرو جەزائیر)، تا ئێستاش خوێندنگاو زانکۆکانیان مەڵبەندی پێگەیاندنی ئەو

تیرۆریستانەن کە تیۆلۆژیای سەدەکانی ناوەڕاست غەریزەی مەرگدۆستیان تیادەچێنێ‌و لە ئاگایی‌و ناخودئاگایاندا، ژیانی خۆیان و ژیانی خەڵکی دیکەش بە شتێکی سوک و بێ بایەخ سەیردەکەن. دواترو بە چێژێکی سادی- مازۆخیانەو لە دیمەنێکی تراژیدیانەدا هەردوولا دەکەونە کوشت و بڕی یەکدی.

ئەم تیۆلۆژیا جیهادیە شەڕانگێزەی لە خواست و پێداویستیەکانی کات و شوێن بێ ئاگایە، هەر ئەوە کە تیرۆرستانی دەسکراوە کردوە، تا تاوانە قێزەونەکانیان بە جۆش و خرۆشێکی ئاینی کەم وێنەوە ئەنجام بدەن. هەر ئەویشە دەتوانێت دەیان هەزار لە ئیسلامیەکان و ئەوانەی لایەنگری پرۆژە خۆکوژیەکانیان لە جیهانی ئیسلامیدا، بهێنێتە سەر شەقامەکان لە ڕێی بانگەشەکردنیانەوە بۆ جیهادکردن، بە مەبەستی داکۆکی کردن لە پیاوکوژەکانی تاڵیبان و "بن لادن" و ئەو خوێنڕێژانەی بە فەرمانی ئەو کاردەکەن.

هەموو ئەمانەش بۆیە ڕوودەدەن، چونکە پرۆگرامە کۆنەکانی خوێندن مێشکی داشۆریون و هەر لە منداڵیەوە فیقهی شەڕی سەردەمی خاچ پەرستانیان پێ ئەزبەردە دەکرێت کە دەڵێت: (جیهاد ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە، هەرکاتێك جەنگ ڕووبەڕووی وڵاتێکی ئیسلامی بوەوە). ئەم تیۆلۆژیا توندڕەو و دەمارگیرە، خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو ئەوانەیە کە باس لە بێ تاوانی "بن لان" دەکەن، بەرامبەر ئەو تاوانەی دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجامی داوە. هاوکات هەر تیۆلۆژیای دەمارگیری‌و توندڕەوی بوو وایکرد، *20* هەزار خوێندکاری میسری بڕژێنە سەر شەقامەکان و خۆپیشاندان لە بەرامبەر جەنگی ئەمریکا دژ بە ئیسلام ڕێك بخەن.

لەو خۆپیشاندانەدا خوێندکاران داوایان لە حکومەتی میسری کرد (دەرگای جیهاد ئاوەڵا بکات)، هەروەها حکومەتەکانی جیهانی ئیسلامیشیان هان دا بۆ ئەوەی (هاوپەیمانیەتێکی ئیسلامی) بۆ یارمەتیدان و پشتیوانیکردنی تاڵیبان و "بن لادن" پێکبهێنن. دروشمی ئەو خۆپیشاندانانەش کتومت لەو کتێبە زەردانەوە وەرگیرابوو کە دەیخوێنن.

لە لایەکی ترەوە (لیژنەی بەدواداچونی کۆنگرەی نەتەوەیی ئیسلامی) لە لەندەن، لای خۆیەوە ڕایگەیاند کە: (وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەڵمەتێکی دوژمنکارانەی لە دژی ئەفغانستان دەست پێکردوە بە مەبەستی پاکتاوکردنی تەواوی هاوڵاتیانی ئەو وڵاتە)، چونکە ئەوانە پێیان وایە "بن لادن" ئەرکی ئاینی خۆی جێبەجێکردوە کاتێك جیهادی لە دژی ئەمریکا دەست داوەتێ.

هەموو ئەم لێدوان و دروشم و قەناعەتانەی بەلای مرۆڤی ژیرەوە وەك وێنەیەکی شەڕانگێزو خوێناوی دێتە بەرچاو، بەلای قوربانیانی تیۆلۆژیای سەدەکانی ناوەڕاست‌و فتواکانیانەوە، بە ڕوی ڕاست و دروستی ئاین دەدرێتە قەڵەم و پێیان وایە ئیسلامیەتی مرۆڤی موسڵمان تەنها بەوە تەواو دەبێت.

**سەرچاوە**: *الحیاة -ژمارە (14091)، 2001/10/14.*

# ئارکیۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتیەکان

خوێندنەوەی: سەمەد ئەحمەد




ناوی کتێب: ئارکیۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتیەکان
نووسینی: هاشم سالح
وەرگێڕانی: شوان ئەحمەد
لە بڵاوکراوەنی: بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ
ساڵی چاپ: *2001*

*(فەلسەفەی هاوچەرخی ئەورووپی) یەکەم سەرەناوی ئەم کتێبەیە، نووسەر لە پێشەکییەکی گشتیدا زۆر بە چڕی ئاماژە بە فەلسەفەی هاوچەرخی ئەورووپی دەکات، جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە لە ئاماژەیەکی وا خێرادا هەرگیز ناتوانرێت لە تەواوی فەلسەفەی هاوچەرخی ئەورووپی بگەین، بۆ ئەمە دەیان کتێب و سەدان ناوو چەندین توێژینەوەی تایبەتیمان پێویستە، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا، وەك نووسەر دەڵێت: ئێمە تەنها ڕووناکیەك دەخەینە سەر ئەم بابەتەو (ئیکتیفا دەکەین بەوەی سەرەتایەکی گشتی، یاخود وێنەیەکی پانۆرامی پێشکەش بکەین.. ل*14*).

لە درێژەی ئەم باسەدا، نووسەر لە گەشتێکی ئارامدا هەوڵدەدات مانا وشك و قورسەکانی فەلسەفە سانا بکات، ئەمەش بە وەلانانی ئەو قەیدو بەندانەی، کە تا ئێستا لە لێکۆڵینەوە ئەکادیمیەکاندا بونیان هەیە، چونکە پێیوایە دەکرێ فەلسەفەش وەك هەر ماکێکی تر، یان وەك هەر بەرئەنجامێکی تری ژیری‌و هۆشیاری‌و بیرکردنەوەی مرۆڤ تەماشابکرێت، بە مانایەکی دی نووسەر دەیەوێت بڵێت: دەکرێ فەلسەفەش ببێتە گوتارێکی کۆمەڵایەتی‌و تاکەکەسیش لە ئاستیدا تووشی سەراسی‌و دۆشدامان نەبێت، چۆن دەقێکی ئەدەبی، یان وتارێکی سیاسی دەخوێنیتەوە، هەرواش دەتوانرێت فەلسەفەش بخوێنرێتەوەو زانیاری‌و مانای قوڵیشی لێهەڵێنجێنرێت. بێگومان ئەم ئامانجە لە کاتێکدا دێتەدی گەر لەمپەرەکانی بەردەم لێحاڵیبوونی فەلسەفە بشکێنرێت. واتا فەلسەفە بە زمانی خەڵك بنوسرێتەوە.

بۆ کورتکردنەوەی ڕێگەی دوورو درێژو زوو گەیشتن بە مەنزڵی ئالۆفەلسەفە، نووسەر حیلەو فەندێکی ژیرانە بەکاردەهێنێت. دێت ناوەرۆکی کتێبێکی زیاتر لە (*800*) لاپەڕەییمان پێناشنا دەکات، (کە بەم دواییە لە دەزگای یۆنسکۆ و چاپی گالیمار لە پاریس لە چاپدراوە.. باس لە هەلومەرجی ئێستای فەلسەفە دەکات.. ل *15*) لە پانزە وڵاتی جیاجیای ئەورووپادا، کە (بەری ڕەنج و کۆششی زیاتر لە پەنجا توێژەرو مێژوونووسی فەلسەفەیە.. ل*15*). مەبەست لە فەلسەفەی هاوچەرخ چییە؟ ئەمە پرسیارێکی سەرەکی ئەم کتێبەو ئەو کتێبەیە، کە

یۆنسکۆ بە چاپی گەیاندوە. لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا (هاشم سالح) دەڵێت: (مەبەستمان تەواوی بەرهەمی فەلسەفی ئەوروپییە لە قۆناغی دوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە.. ل *16*).

لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستیەی، کە دوەم جەنگی جیهانی هەروا ڕوداوێکی سادەو ساکار نەبوە، بەڵکو کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئاستی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو فکریو سایکۆلۆژیو ڕۆشنبیریو.. هتد، بەسەر سەرجەم وڵاتانی جیهانی بەگشتیو ئەوروپا بە تایبەتی بەجێهێشت، بە جۆرێکە، کە زۆرێك لە بیرمەندان پێیانوایە، کە دوەم جەنگی جیهانی دابڕانێکی فرەو هەمەلایەنەی لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاواییدا دروستکرد.

وێرانکاری دوەم جەنگی جیهانی هەموو کەسێکی سەرسامکرد، بەڵام لە هەموان زیاتر، بیرمەندو فەیلەسوفەکان بوو، ئەم ڕەوشە وایکرد زۆرێك لە فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا، لە داهێنان و پێشکەوتن و چەرخی زێڕینی خۆیان بکەونە گومانەوە، لێرەوە کەوتنە سەرکۆنەکردنی ئەقڵانیەتی سەردەمی ڕۆشنگەری، کە زیاتر لە دوو سەد ساڵ گوتاری دیاری ڕۆژئاواییەکان بوو، نازو فیزیان پێوە دەکرد، لە ئاقاری ئەم ڕەوشەدا چەندین قوتابخانەی فکریو دیدی جیاجیا دروستبوو، هەریەکەو لە چاویلکەی خۆیەوە دەیڕوانیە دۆخەکەو دواجاریش هەر لەو دەروازەیەوە ڕاڤەی بۆ ڕوداوەکان دەکردو پرسیاری جیاجیایان دەوروژاند.

یەکێك لەو مەسەلە گرنگانەی، کە لە لایەن زۆرێك لە بیرمەندانەوە تیشکی خرایە سەر، ئەوەیە کە سیاسیەکان جگە لە ئێستا، ئایندە بە قوڵی ناخوێننەوە، بەڵام فەیلەسوفەکان زۆر بە جدی لە خەمی ئایندەی کۆمەڵدان، لەسەر ئەم مەسەلەیە توێژینەوەی چڕوپڕ خرایەڕوو، لە گەڵیشدا ئەوەیان بەیانکرد، کە (هەموو سیاسەتێك بەبێ فکرێکی ستراتژیی سەرگەردانیەو هەموو فکرێکیش، کە لەسەر زەمینەی واقیع بەرجەستە نەکرێت و سودی بۆ مرۆڤایەتی نەبێت، شتێکی ئەبستراکتەو نەبوونی چاکترە.. ل *21*).

سەرکۆنەکردنی عەقڵی مۆدێرنە چەندین ساڵی خایاند، لە پاشی ئەمە دیدێکی تر پەیدابوو، کە ڕازیبوون و پەسەنکردنی ئەو دیفاکتۆ سیاسیو کۆمەڵایەتیە بوو، کە چەند ساڵێك بوو، لە دوای خامۆشبوونەوەی ئاگری جەنگ، ڕۆژئاوا تیایدا دەژیا. وزەی دروستی ئەم بۆچوونانەش زیاتر لە دوای شکستی بلۆکی سۆشیالیستیو باڵادەستی دیدی لیبراڵیەوە سەرچاوەی هەڵگرتبوو، تەنانەت کەسێکی وەك (فۆکۆ یاما) تێزی (کۆتایی مێژوو)ی بەرزکردەوە، ئەمە بەو مانایەی، کە ئیدی کۆمەڵگەو فکری مرۆیی لەمە زیاتر حەوجێی بە هیچی دی نیە، ئەوەی هەیە سەروزیادە. ئەم گوتارانەش زیاتر لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە بانگەشەی بۆ دەکرا، بەڵام هەرچەند ساڵێك و بگرە کەمتریشی خایاند، پەرچەکرداری ئەم دیدەش پەیدابوو، (تێزەکەی فۆکۆ یاما) ڕووبەڕووی ڕەخنەگەلێکی زۆر بوەوە، کەسێکی وەك (کاستۆریادس، بە تێزێکی گەمژە ناودێری کرد.. ل *24*).

لە ئاقار ئەم کێبەرکێ فکریانەدا، ڕاستیەکمان بۆ ئاشکرا دەبێت، ئەویش ئەوەیە؛ کە هەتا مرۆڤ بمێنێت، دیدو بۆچوون و فکری نوێش لەگەڵیدا لەدایك دەبێت، بەڵام هاتنەکایەی هەر دیدێکی نوێ، مەرگی یەکجارەکی ئەوی دی ناگەیەنێت. بە کورتی بڵێین: ئەو فکرە نەمرە، کە بە بێ زەبروزەنگ و خۆسەپاندن لە پزدانی واقیعەوە لەدایك بێت.

*(فەلسەفەی هاوچەرخی ئەڵمانی) بەشێکی تری ئەم کتێبەیە، تایبەتە بە لێدوان لە فەلسەفەی هاوچەرخی ئەڵمانی، بێگومان ئەڵمانەکان لە دنیای فەلسەفەدا پشکێکی زۆریان بەردەکەوێت، ئەوان هەمیشە شانازی بەو فرە فەیلەسوفیەی خۆیانەوە دەکەن لە بەرامبەر ئەمەدا فەرەنسیەکان زۆرجار نیگەرانن و بەخیلی بە پێشەنگی ئەم بوارەی ئەوان دەبەن، واشی ڕادەگەیەنن،

کە جگە لە ئەڵمانەکان، فەرەنسیەکانیش خاوەنی دنیایەك لە فەلسەفەو فەیلەسوفن.

لەم دەلاقەیەوە (هاشم ساڵح) تیشك دەخاتە سەر گرنگترین ئاقارەکانی فەلسەفەی ئەڵمانی لە ماوەی چل ساڵی دوای دووەم جەنگی جیهانیو قسە لە قوتابخانەی فرانکفۆرت دەکات. وەك ئاشکراشە، کە دامەزرێنەرانی بریتین لە (هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ).

قوتابخانەی فرانکفۆرت، دیفاکتۆیەکی فکریو فەلسەفی بوو، لە رەوشێکی زۆر ئاڵۆزو ناجێگیری رۆژئاوادا سەریهەڵدا، لەگەڵ خۆیدا رەخنەگرتن لە ئەقڵی مۆدێرنەی وەك مۆدێکی فکریو فەلسەفی هێنایە کایەوە. رەهەندێکی فرەو هەمەلایەنە هەیە لە پشتی سەرهەڵدانی ئەم قوتابخانەیەوە، کە ئێمە لەم خوێندنەوەیەدا دەرفەتی خستنەروویمان نیە.

هەرچۆنێك بێت دەبێت بزانین، قوتابخانەی فرانکفۆرت پەرچەکردارێکی فکریو فەلسەفی ئەو رۆژگارانە بوو، کەبە هۆی جەنگەوە بوارێك بۆ ژیان نەمابووەوە.

لە درێژەی ئەم باسەدا نووسەر باسی ئامانج و ئاکارە گشتیەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەکات، هەرواش دیارترین رابەرانی ئەم رێچکە فکریەش بەسەردەکاتەوە، هەروەها ئاماژە بە نووسین و کتێبەکانی هەریەك لەو بیرمەندانەش دەکات، کە چۆن لە بن باری بێئومێدیو رەشبینیدا دەیانرکاند، بە رادەیەك، کە هەریەك لە (هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ) (بروایان بە بەرەوپێشچوونی بەردەوامی مێژوو نەما، بەڵکو گەیشتنە قەناعەتێکی وا، کە ئەو گۆرانکاریانەی لە ئەوروپا روودەدات، بێچەندو چوون بە کۆمەڵگایەك دەگات، بە شێوەیەکی رەها لە لایەن ئامێرو ئابووریو تەکنەلۆژیاوە ئاراستە دەکرێت.. ل *34*).

ئەوان پێیان وابوو کە عەقڵی مرۆیی لە دوو سەدەی رابردوودا خاوەنی چەردەیەك لە خزمەت و داهێنان بوون، گەلێ کاری مەزنیان بۆ مرۆڤ بەرهەمهێنا، بەڵام لە بەرامبەر ئەمەدا، چونکە پێشکەوتنە ئەخلاقیکان تووشی چورتمە بوون و هاوشانی پێشکەوتنە مادیەکان رێیان نەکرد (بۆیە هاوسەنگی لە پرۆژەی مۆدێرنێتی خۆرئاوادا تێکچوو.. ل *36*).

هەر لە درێژەی ئەم باسەدا، نووسەر زۆر بە چری باس لە (یۆرگن هابرماس) و متمانە بەخشینەوە بە عەقڵانیەت و مۆدێرنێتەی ئەوروپی دەکات.

(هابرماس) یەکێکە لە دیارترین فەیلەسوفەکانی سەردەم، کە هەتا ئێستاش لە ژیاندایە. لە ئاقار قەیرانە دیارەکانی مۆدێرنێتی، (هابرماس) وەك فریادرەسێك بە دیدێکی نوێوە دەرکەوت، لە خستنەرووی بۆچوونەکانیشدا پشتی بە هێڵە گشتیەکانی (ماکس فیبەر) بەست.

سەبارەت بە چەمکی عەقڵ و مۆدێرنێتی، (هابرماس) پرۆژەیەکی نوێی بەرهەمهێنا، ئەو هەروا کوێرانە نەکەوتە ستایشی ئەم و سەرکۆنەکردنی ئەو، بەڵکو لەبری ئەمە کەوتە توێژینەوەی ورد لەسەر ئەم دوو چەمکەو لە زۆر شوێنیشدا بە شێوەیەکی بابەتیانە هەردووکیانی رەخنەکرد، (ئەویش لە رێگای پێشنیازکردنی چەمکێکی تازە بۆ ئەقڵ و ئەقلانیەت.. ل *49*).

یەکێك لە دەستکەوتە مەزنەکانی عەقڵ، وەلانان و رەتکردنەوەی ئەفسانەیە، لەبری ئەمە پێشوازیکردنە لە زانست و زانیاری، لە ئاقار ئەم مەسەلەیەدا مرۆڤایەتی پێدەنێتە ناو سەردەمێکی نوێی حەقیقەت و ئەقڵەوە.

(لێرەوە بۆ یەکەمجار جیهان دەبێتە تەنێك لە دەرەوەی خۆمان.. ل *53*).

چەمکی (حەقیقەت) دیارترین چەمکێکە، کە بە درێژایی مێژوو ناوەندە فکریەکانی سەرقاڵکردوە، هەر فەیلەسوفەو لە دیدی تایبەتی خۆیەوە پێناسەی بۆ کردوەو لێیدواوە، دەبێ بزانین هەتا پێش سەردەمی مۆدێرنێتی، (حەقیقەت) بە شێوەیەکی رەها دەخوێندرایەوەو تەماشادەکرا، بەڵام لە سەردەمی

مۆدێرنێتی بەدواوە، ئەم چەمکە (حەقیقەت) ڕەهایی لە دەستداو بە شێوەیەکی ڕێژەی لێی دەڕوانێت، ئەمەش نەك هەر مایەی ترس و نیگەرانی نیە بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی، بەڵکو مژدەیەکی خۆشە بۆ هەموومان، چونکە لەژێر چەتری (ڕێژەیی حەقیقەتدا) هەموو بیروباوەڕێکی جیاواز جێگەی دەبێتەوە، بەڵام وەکی تر، هەر فکرەو ڕێچکەیەك بە ناوی حەقیقەتی ڕەهاوە، ئەوی دی لەناودەبات.. لە سۆنگەی ئەم تەرزە باسانەوەیە (باشلار) پێی وایە، کە (حەقیقەت هیچ نیە، جگە لەو هەڵەیەی بە بەردەوامی هەوڵی ڕاستکردنەوەی دەدەین.. ل *54*).

لە درێژەی ئەم باسانەدا چەندین بابەتی فکریو فەلسەفی تر دەخوێنینەوە، کە شایانی لێوردبوونەوەی زیاترن.

*(هابرماس) و ئەقڵانیەتی کۆمینیکا شێونخوازی) سەرباسێکی تری ئەم کتێبەیە، کەلە ڕاستیدا ئەم بابەتە ناوەڕۆك و خودی تیۆرەکەی (هابرماس) پێکدەهێنێت.

(هابرماس) لە خستنەڕووی تیۆرەکەیدا جەخت لەسەر دوو زاراوەی گرنگ دەکاتەوە، کە بریتین لە زاراوەی (کردار) و زاراوەی (پەیوەندی). سەبارەت بە (کردار)، (هابرماس) مەبەستی (کۆنترۆڵکردنی حاڵەتێکی دیاریکراوە.. ل *61*)، بەڵام سەبارەت بە (پەیوەندی)، مەبەستی لە پەیوەندی ئۆرگانی زمانە بە شتەکانی دەوروبەرمانەوە، بە مانایەکی دی، (هابرماس) دەیەوێت بڵێت ئێمە لە ڕێگەی زمانەوە تەبایی لەگەڵ یەکدیدا دروستدەکەین، بەبێ بوونی ئەم پەیوەندیەش مەحاڵە لە یەك حاڵی بین و دواجاریش ئارامی نێوانمان ڕابگرین، ئەمە جگە لەو کاتانەی، کە زمان وەك ئالیەتێکی چەواشەکاری، یان تەفرەدان و لەخشتەبردن بەکاربهێنرێت، چونکە مەرج نیە هەمیشە زمان هەڵگری پەیوەندیەکی تەندروست و شایستە بێت لەگەڵ شتەکانی دەوروبەردا.

زۆرجار ئەم بیرکردنەوەیەی (هابرماس) مایەی نیگەرانی کەسانی تر بوە، واتە تێزەکەی نەك هەر پەسەند نەکراوە، بەڵکو بە توندترین شێوە ڕەتکراوەتەوەو دراوەتە بەر ڕەخنە. (هابرماس) بەوە تۆمەتبارکراوە، کە ئەم دیدە زیاد لە پێویست دیدێکی (یۆتۆپی)یە، چونکە (هابرماس) (پێیوایە خەڵکی هەموو دڵساف و چاکەخوازن و هەوڵی پەیوەندی بەستن و دیالۆگ و پێکەوە ژیان و تەبایی دەدەن.. ل *66*).

لە بەرامبەر ئەم تۆمەتانەدا (هابرماس) چەندە نیگەرانە، لەوەش زیاتر هێمن و لەسەرخۆیە، ئەو بڕوای تەواوی بەوە هەبوو، کە لە بنەڕەتدا ئەقڵانیەتێکی شارراوە (یەدەگی عەقڵانیەت) لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە، بۆیە نەگونجاوە هەموو کاتێك قوربانی بە عەقڵ بدەین، چونکە دواجار لە بیرکردنەوەو مامەڵەی ڕۆژانەدا هەر حەوجێمان بە عەقڵ هەیە. (ڕاستە ئەقڵی ڕۆشنگەری بە لاڕێدا براو، لە مەبەستە سەرەتاییەکانی خۆی دورخرایەوەو بۆ مەبەستی دیکەی نامرۆڤانە بەگەڕخرا، بەڵام ئەم بەهایانە بەس نیە بۆ ئەوەی قوربانی بە تەواوی دەسکەوتەکانی مۆدێرنێتیو ئەقڵانیەت بدەین.. ل *67*).

بە کورتی بڵێین: (هابرماس) چەندە ڕەخنە لە ئەقڵ ئامێری دەگرێت، لەوەش زیاتر ستایشی مەسەلە ڕوحیەکانی مرۆڤ دەکات، ئەم دیدەش خۆی لە خۆیدا ڕاستکردنەوەی هەڵەی هەریەك لە ڕابەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت (ئادۆرنۆو هۆرکهایمەر)ە، چونکە ئەوان بە تەواوی ڕەشبین ببوون لە بەرامبەر دەستکەوتەکانی ئەقڵ.

*بەشێکی تری ئەم کتێبە تەرخانە بۆ لێدوان لەسەر فکری (ریمۆن ئارۆن)، بەڵام نووسەر پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ قسە لەسەر فکری ئەو بیرمەندە لیبراڵیە ڕاستڕەوە فەرەنسیە بکات، سەرەتا پێشینەیەك لەسەر چۆنیەتی بیرکردنەوەو پەیوەندی ئەم فەیلەسوفە لەگەڵ ژەنەراڵ (شارل دیگۆل) و شەڕە فکریو ئایدیۆلۆژیەکانی لەگەڵ (سارتەر) دەخاتە پێشچاو.

ئارۆن لە ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاو شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا زۆر لێبڕاوانە داکۆکی لە فکری لیبراڵی دەکرد، هەرواش ڕەخنەی توندی ئاراستەی بیری چەپڕەوی مارکسیستی دەکرد، کە لەو سەردەمەدا ئەمە تا ڕادەیەك شتێکی ناوازەو نامۆ بوو، چونکە لەوکاتانەدا هەژمونی فکری مارکسیستی زۆر بە ئاشکرا بەسەر بیرکردنەوەو هەموو ڕواڵەتێکی ژیاندا بەدیدەکرا، زۆر ئەستەم بوو کەسێك خۆی لێببوێرێت و بە هەندێ وەرنەگرێت، بەڵام (ئارۆن) بە شێوەیەکی بابەتیانە واقعی دەکردە سەنگی مەحەك و ئەو تێزانەی ڕەخنە دەکردو هەرواش ڕەتیدەکردنەوە.

دواجار هەموو پێشبینیەکانی (ئارۆن) هاتنەدی، هەرەسی دەسەڵاتی کۆمۆنیزم بوو بە واقیع و لەم ساڵانەی دواییەدا هەموومان بە چاوی خۆمان ئەو ڕاستیانەی، کە (ئارۆن) چەندین ساڵ بوو بانگەشەی بۆ دەکرد بینی.

(هاشم ساڵح) ئەم پێشەکیەی ئەگەرچی بە کورتی، بەڵام زۆر بە چڕو پڕی نوسیوە، کە دەتوانین بڵێین: بۆ خوێنەر پێویستیەکی حەتمیە بۆ باشتر حاڵی بوون لە هێڵە گشتیو تایبەتیەکانی بیری (ئارۆن)، ئێمە لەم پێشەکیەدا ئەوە دەخوێنینەوە، کە (ئارۆن) چۆن مامەڵەی لەگەڵ مەسەلە حزبیو سیاسیو فکریە جیاجیاکان بە گشتیو تێزی چەپڕەوی مارکسستی بە تایبەتی، کە چەندین ساڵ لە ڕۆژئاوادا، بە تایبەتی لە فەرەنسا باڵادەست بوو، کردوە؟

پاشان لە گەشتێکی فکری خێراو خۆشدا، نووسەر بە یەکبەیەکی بەرهەمەکانی (ئارۆن) ئاشنامان دەکات، لە نێوان بەرهەمێك و بەرهەمێکی تردا، وێستگەیەکی چێکردوە، ئیدی خوێنەر لە هەر وێستگەیەکدا بواری ئەمەی بۆ دەڕەخسێت، کە باشترو ڕونتر لە بیری (ئارۆن) حاڵی بێت. بۆ نمونە لە بەسەرکردنەوەی کتێبی (فەلسەفەی مێژوو)دا، کە یەکەمین کتێبی گەورەی (ئارۆن)ە و لە پێش دووەمین جەنگی جیهانی نوسیویەتی، لەوە تێدەگەین، کە (ئارۆن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ناڕاستەوخۆ کاریکردە سەر زۆر لە مێژوونووسە فەرەنسیەکان و توانی لە ئامێزی فەلسەفەی پۆزەتیفیست، فەلسەفەیەك، کە گەیشتبوە قۆناغی پیربوون و کۆنترۆڵی تەواوی ناوەندیو زانکۆی کردبوو، دەریانبهێنێت.. ل *107*).

هەر لە درێژەی ئەم گەشتەدا کتێبی (ئەفیونی ڕۆشنبیران)مان بەرچاودەکەوێت، کە یەکێکی ترە لە بەرهەمە بەپێزەکانی (ئارۆن)و لە ساڵی *1955*دا بڵاوی کردۆتەوە.

(ئارۆن) ئەم کتێبەی (بۆ بەرپەرچدانەوەی بلۆکی ڕۆژهەڵات، کۆمۆنیزم، نووسیو هەر درێژەپێدەری هەمان کتێبی پێشوی بوو.. ل *107*).

کتێبی ئەفیونی ڕۆشنبیران، چەندە کتێبێکی فەلسەفی بوو، لەوەش زیاتر کتێبێکی سیاسی ڕەنگرێژی ئایدیۆلۆژی شۆڕشگێڕانە بوو، بە شێوەیەکی واقیعیانە سەرلەبەری تێزی دیکتاتۆریانەی ستالینیزمی لەبەریەك هەڵدەوەشاندەوە.

هەر لەم گەشتەدا، خوێنەر بە سێ کتێبی تری (ئارۆن) ئاشنادەبێت، کە بریتین لە (هەژدەوانە دەربارەی کۆمەڵگەی پیشەسازی - *1962*، ململانێی چینەکان- *1964*، دیموکراسیەت و تۆتالیتاریەت- *1965*) لە کۆی هەموو ئەم بەرهەمانەدا (ئارۆن) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە گوتاری کۆمۆنیزم بۆ لەناوبردنی چینەکان، جگە لە درۆیەکی ئایدیۆلۆژی زیاتر، هیچی دی نەبوە، باشترین نموونەش ئەوەیە، کە (شۆڕشی بەلشەفی نەبوە مایەی هێنانە ئارای کۆمەڵگەیەکی خاڵی لە چینەکان.. بەڵکو گەیشت بەوەی چینێکی نوێ بگاتە کورسیو دەسەڵات بۆ خۆی پاوان بکات، لێرەوە ئەو پێی وایە ئیستبدادی تاك حزبی، زیاد لە هەر سەرمایەداریەکی دی جێی هەڕەشەو مەترسیە.. ل *110-111*).

دەبێ بزانین، کە (ئارۆن) کتێبێکی گرنگی تری هەیە بە ناوی (تراژیدیای جەزائیر)، ئەم کتێبەی لە ناوەندە ڕۆشنبیریو سیاسیەکاندا سەدایەکی گەورەی دایەوە.

(ئارۆن) لەم کتێبەیدا، کە دواجار کێشەیەکی گەورەی بۆ نایەوە، بە ڕاشکاوانە داکۆکی لەسەربەخۆیی جەزائیر دەکرد، کە لەو کاتەدا لە لایەن فەرەنساوە داگیرکرابوو، ئەم هەڵوێستەی (ئارۆن) بووە مایەی نارەزاییەکی زۆری توندڕەوەکانی فەرەنسا، تەنانەت لە لایەن هەندێ گروپ و لایەنەوە، (ئارۆن) تووشی هەڕەشەی لەناوچوون بووەوە، بەڵام ئەو زۆر ئازایانە خۆی ڕاگرت و داکۆکی لە بیروباوەڕە ئازادیخوازانەکەی خۆی دەکرد.

لە ڕاستیدا بیری (ریمۆن ئارۆن) زۆر لەوە فراوانترە، کە ئێمە لەم کورتە خوێندنەوەیەدا بتوانین هەموو لایەنێکی بخەینەڕوو، هەر هێندە دەڵێین: (ئارۆن) بە ڕاستی کوری سەردەمەکەی خۆی بوو، مێژوو سەلماندی، کە ئەو چەند بە دروستیو بابەتیانە واقیعی خوێندۆتەوە.

*بەشێکی تری ئەم کتێبە تەرخانە بۆ گەورە سۆسیۆلۆژی فەرەنساو ئەوروپا (پیربۆردیۆ).

(بۆردیۆ) خاوەنی چەندین کتێبە، کە لە دنیای فکرو فەلسەفەو سۆسیۆلۆژیادا گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە.

ئەگەر توێژینەوەیەك هەبێت لەسەر پۆلێنکردنی بیرمەندان ئەوا دەبێت (بۆردیۆ) لە ڕیزی (هۆرکهایمەرو ماکس فیبەر) جێبکرێتەوە، چونکە ئەمیش وەکو ئەوان (گەیشتۆتە قۆناغی دارشتنی تیۆریای تایبەت بە خۆی.. ل *(168)*.

نووسەر جگە لەوەی بە ناونیشانی زۆرێك لە بەرهەمەکانی (بۆردیۆ) ئاشنامان دەکات، بەڵام دواجار لەسەر دواین کتێبی (وەڵامەکان)، کە *(267)* لاپەڕەیەو لە ساڵی *1992*دا چاپ و بڵاوکرایەوە، ڕاماندەگرێت.

ئەم بەرهەمەی (بۆردیۆ) بریتیە لە وتوێژێکی دوورو درێژ کە (لویك ڤاکان)ی ڕۆژنامەنووس لە زانکۆی شیکاگۆ لەگەڵیدا سازیکردوە.

(بۆردیۆ) بۆیە ئەم کتێبەی بەمجۆرە هێنایە بەرهەم، بۆ ئەوەی خوێنەر بە ئاسانتر ئاشنای هێڵە گشتیو تایبەتیەکانی تیۆریاکەی بێت، چونکە بۆردیۆ لە یەك کاتدا لەناو زیاتر لە بوارێکدا کاردەکات، (ئەو شتەی لە بەرهەمەکانی بۆردیۆدا زیاتر مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە، هەموو سنورەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکان دەبەزێنێت و ئیعتراف بەو ئاقارە پسپۆڕخوازیە بەرتەسکە ناکات، کە زانستەکان لە یەکتری جیادەکاتەوە، سوود لە هەموویان دەبینێت بۆ دارشتنی تیۆریاو زاراوە تایبەتیەکانی خۆی.. ل *170*).

(بۆردیۆ) لە درێژەی کاری خۆیدا هەوڵیداوە هەموو ئەو نەگوتراو، نەبینراوانە بدرکێنێت و بیانخاتەڕوو، کە مرۆڤ لە ڕواڵەتی ڕۆژانەی ژیانیدا درکیان پێناکات، چونکە ئەو پێیوابوو، کە لە پشتی ڕواڵەتەکانی ژیانی مرۆڤەوە، کۆمەڵێ فاکتەری نادیارو شاراوەی تر هەن، کە لە ڕاستیدا ئەوان بزوێنەری زۆرێك لەو مەسەلانەن، کە جڵەوی کۆمەڵیان بەدەستە، بەڵام لەبەر ئەوەی مرۆڤ نایانبینێت یان بە ئاسانی هەستیان پێناکات، بۆیەش بە سانایی لێیان حاڵی نابێت.

(بۆردیۆ) لە تیۆرەکەی خۆیدا جەخت لەسەر شیکردنەوەو کارئاسانی ئەم مەسەلانە دەکاتەوە.

ئەمانەو چەندین بابەتی فکریو سۆسیۆلۆژی تر، لەوانە (ململانێی نێوان مەنهەجی بونیادگەرایی، کە "شتراوس" پێشەنگێتیو مەنهەجی فینۆمینۆلۆژی، کە سارتەر ڕابەرایەتی دەکرد، ڕاوبۆچوونی (بۆردیۆ) لەسەر ئەم دوو مەنهەجەو خستنەڕووی تیۆریایەکی نوێو.. هتد، لەم بەشەدا بە زمانێکی ڕوون و ساکار شیکراونەتەوە.

*(فێرنال برۆدێل و قوتابخانەی بڵاوکراوەی ساڵانە)

ئەمەی سەرەوە سەرەناوێکی تری ئەم کتێبەیەو (47) لاپەڕەی بۆ تەرخانکراوە. لەم باسەدا (هاشم ساڵح) سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێت، کە پانتایی ڕۆشنبیری فەرەنسی لەوە فراوانترە، کە ئێمە بینیومانە، یان بیستومانە، ئەمە لە کاتێکدایە، کە هەمووومان کەم و زۆر (ئاشنای تێزو بیرکردنەوەی هەریەك لە (فۆکۆو سارتەرو ڕۆلان بارت) هەین، بەڵام دەبێ بزانین، کە جگە لەم بیرمەندانە، چەندین بیرمەندی گەورەی تریش هەن، کە ئێمە هیچیان لە بارەوە نازانین، ئەمەش حاڵەتێکی ناتەندروستە، هۆیەکەشی زیاتر بۆ شۆرەت و ناو و ناوبانگی هەریەك لە (فۆکۆو سارتەرو بارت) دەگەڕێتەوە، نەك نزمی ئاستی ئەو بیرمەندانەی تر، کە ئێمە ئاشنای تێزو بیرکردنەوەکانیان نین.

(لوسیان ڤیڤەرو جۆرج دوبیو ژاك لۆگۆف و فرانسۆ فۆریە) و چەندین ناوی دی، پانتاییەکی فراوانیان لە ڕۆشنبیری فەرەنسیدا داگیرکردوەو هیچی واشیان لە (فۆکۆکو سارتەرو بارت) کەمتر نیە. لە نێوان ئەم تەرزە باسانەدا، (هاشم ساڵح) دزەی بۆ دەکات و لەسەر یەکێك لە قوتابخانە فکریەکانی فەرەنسا ڕاماندەگرێت، کە قوتابخانەی مێژوویی (بڵاوکراوەی ساڵانە)یە. ئیدی لێرەوە نووسەر زۆر بە چڕیو بە شێنەیی قسە لەسەر دامەزرێنەرو (فێرینال برۆدێل) وردەکاریەکانی ئەم قوتابخانەیە دەکات.

لە ماوەی سی ساڵدا (برۆدێل و ڤیڤەر)ی مامۆستای دەزگایەکی ئەکادیمی بۆ لێدوان و توێژینەوەی مێژوویی دادەمەزرێنن، کە دواجارو هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت کاریگەریەکی زۆری هەبوەو هەیە لە پێگەیاندنی مامۆستایان و خوێندکارانی تایبەت بە سەرجەم بوارەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکان.

سەرەتا کارەکانی ئەم دەزگایە تەنها تایبەت بوو بە بواری مێژوو، بەڵام دواجار زۆر بوارو بەشی تری بۆ زیادکرا، بێگومان دەبێت بزانین (برۆدێل) ڕۆڵی پێشەنگی بینیوە لەسەرخستنی ئەم پرۆژەیەدا.

(دەریای سپی ناوەڕاست) کارنامەی دکتۆراو گرنگترین کتێبی (برۆدێل)ە کە (1200) لاپەڕەیە.

ئەوەی مایەی تێڕامان و سەرسامیە، (برۆدێل) ئەم بەرهەمەی لە ماوەی پێنج ساڵی زیندانیدا (1940-1945)، کە لە لایەن هێزەکانی ئەڵمانیەوە لە دووەم جەنگی جیهانیدا بە دیل گیرا، نوسیوە.

بۆ ئەمەش پشتی بە یادەوەری قوڵی خۆیو ئەو کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامانە دەبەست، کە ڕێگەیان دەدرا بێنە زیندانەوە، لە دوای ئازادبوونیشی جارێکی تر بۆ ڕێکخستن و باشترکردنی کارنامەکەی بە دیکۆمێنتەکاندا چۆتەوە، ئینجا خستیە بەردەستی مامۆستاکەی (ڤیڤەر).

جگە لەم بەرهەمە، (برۆدێل) چارەکە سەدەیەك لە تەمەنی خۆی 1955-1985 بۆ نووسینی کتێبی (شارستانیەتی مادی، ئابووریو سەرمایەداری) کە بریتیە لە سێ بەرگ و زیاتر لە (1600) لاپەڕە دەبێت، تەرخانکرد.

لێرەبەدواوە (هاشم ساڵح) بە ناوەڕۆکی کارنامەکەی (برۆدێل) ئاشنامان دەکات. کە تیایدا دەیان بابەتی فکریو ڕوناکبیری هەمەجۆر دەخوێنینەوە. پاشان هێندی هێندی دەچێتە سەر (لوسیان ڤیڤەر) و چەردەیەك لە کارو بەرهەمەکانی ئەویش هەڵدەداتەوە. مرۆڤ کاتێك ئەو دێڕانە دەخوێنێتەوە، ناتوانێت لە ئاست وریاییو هزری باڵای ئەم گەورە بیریارە سەرسام نەبێت. ئەو لە خوێندنەوەی بۆ مێژوودا، مەسەلەیەکی زۆر گرنگی هێنایە ئارا، کە دەتوانین بڵێین: لە پێشی (ڤیڤەر) کەسی دی نەیگوتبوو.

(ڤیڤەر) پێی وایە کە (مێژوو لە ڕێڕەوە تاریك و لەسەر ئاستی بونیادە قوڵەکاندا ڕوودەدات، بۆیە پێویستە لەسەر مێژوونووس دابەزێتە ئاستی قوڵترین چین، بۆ ئەوەی پەردە لە ڕووی ئەو بونیادە سەرەکیانە هەڵداتەوە کە جڵەوی جوڵەی مێژوو دەکەن.. ل 212).

*(مێژووی بونیادگەری لە *1967*وە تا ئەمڕۆ) ناوی بەرگی دووەمی کتێبێکی (فرانسوا دوس)ە، (هاشم سالح) ناوی ئەم کتێبەی کردوە بە سەرەناوێکی تری کتێبەکەی، لەم دەروازەیەوە قسە لەسەر چەند جۆری بونیادگەری دەکات، لەمەوە تێدەگەین کە بونیادگەریش وەك هەر تەوژمێکی فکری تر، مەحکومی گۆڕانکاریەکانی سەردەمەو بە پێی هەلومەرجی نوێ گۆڕانی بەسەردا دێت. هەر لەم بەشەدا جگە لەم مەسەلانە، کێشەو ململانێی نێوان بونیادگەریو مارکسیزم شیکراوەتەوە، پاشان زۆر بە کورتی قسە لەسەر ئەو تێزانە دەکات کە ڕەخنە لە بونیادگەریی دەگرن، کە ماوەیەکی زۆر کۆنترۆڵی ڕۆشنبیری فەرەنسایان کردبوو، تەنانەت هەندێ کەس هەژمونی بونیادگەریان بە ئیمپراتۆریەتی مەعریفی داوەتە قەڵەم. لە دوای ئەم شەڕە فکریە، نووسەر باس لە هێوربوونەوەی وەزعەکەش دەکات.

*(میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی لە فەرەنسای هاوچەرخدا، زانستە مرۆڤایەتیو کۆمەڵایەتیەکان) دوابەشی ئەم کتێبەیە، لەم باسەدا ئەوە دەخوێنینەوە کە چۆن لە دوای جەنگی جیهانیەوە بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لە فەرەنسادا زانستە مرۆڤایەتیەکان بە هەموو لك و بەشەکانیەوە گەشەیان کرد، هەر لەم گەشەکردنەشەوە پسپۆڕیو تایبەتمەندی زیاتر جەختی لەسەر کرایەوە. نەك هەر ئەمە، بەڵکو بووبە خاڵی سەرەکی لە خستنەڕووی هەر بابەتێکی فکریدا. بە مانایەکی دی، ڕۆڵی ڕۆشنبیری گشتگیر، لە توێژینەوەی مەسەلە فکریو زانستە مرۆڤایەتیەکاندا کاڵ بوو، بگرە هەر نەما. ئەگەر کەسێك پسپۆڕ نەبوایە لە بوارێکدا، هەرگیز نەیدەتوانی قسەی تیابکات، چ جای ئەوەی ڕەخنە بگرێت، یان هێڵی نوێ دیاریبکات بۆ هێنانە کایەی تیۆریاو فکری نوێ.

نووسەر لە دوا لاپەڕەکانی کتێبەکەیدا چەندین پرسیار لەسەر بابەتە فکریو فەلسەفیو مەعریفیو.. بۆ خوێنەر بەجێدەهێڵێت، بەڵام دەبێت بزانین خوێنەر کاتێك وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەستگیر دەبێت، کە دەیان کتێبی وەك ئەم کتێبەی (هاشم سالح) بخوێنێتەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێم: جگە لەم بابەتانەی کە نووسەر خستویەتیە ڕوو و ئێمە زۆر بە خێرایی لەم خوێندنەوەیەدا هەندێکیمان بەسەرکردەوە، برای نووسەر کاك (شاهۆ سەعید) پێشەکیەکی بەپێزی بۆ ئەم کتێبە نووسیوە، کە من لەلای خۆمەوە وای دەدانێم کە (بەشێك -فصل)ێکی تری کتێبەکەیە، نەك هەر پێشەکیەکی سادە کە زۆرجار وەك مۆدێك بۆ کتێب دەنووسرێت.

سەبارەت بە وەرگێڕانەکەشی دەبێت بڵێم: ئەگەر سەلیقەو شارەزاییو زمانزانی کاك (شوان ئەحمەد) نەبێت، هەرگیز بابەتێکی فکری وا قورس، ئاوها بە سانایی نەدەخوێنرایەوە، بۆیە کارەکەی شایانی دەستخۆشیە. ماوەتەوە بڵێم: ئەوەی مایەی خۆشحاڵیە بۆ هەمووومان، ئەم کتێبە تاك و تەرا نەبێت، هەڵەی چاپی تێنەکەتوە، کە بە داخەوە لە چاپەمەنی ئێستاماندا ڤایرۆسێکی هەوشارو ئامادەیە.



# دوریس لیسینگ
# خاوەنی ڕۆمانی دەفتەری زێڕینە

د. کەمال مەعروف

ڕۆماننوسی بەریتانی دوریس لیسینگ، خەلاتی میری ئیسپانی ئیستوریاسی وەرگرت، کە سیو پێنج نووسەر بۆ خەلاتی ناوبراو هەلبژێررابوون، لەوانە نەجیب مەحفوز، طاهر بن جەلون، ئەمین مەعلوف، لە کۆتاییدا سێ ئەدیب دەستنیشان کران، ئەنا ماریا ماتویتی ئیسپانیو جوانا رولینغ ی ئیسکوتلەندی، بەلام لیسینگ هەموویانی تێپەڕاندو بە خەلاتی ناوبراو شاد دەبێت. لە کاروانی ئەدەبیدا گەلێ خەلاتی پێبەخشراوە، وەکو خەلاتی بازرگانی مۆم، سالی *1963*، خەلاتی شەکسپیر، سالی *1981*، خەلاتی کەتەلۆنیای جیهانی، سالی *1999*.

کاتێ خەلاتی ئیسپانی پێڕاگەیەنرا، هەوالنەری (ئەلمۆندۆ) ئیسپانی لە لەندەن (ئیرینی ئیدث بلاثکوث) گفتوگۆیەکی لەگەل دوریس سازکرد، بیروڕای بە ڕوونیو بە ئاشکرا خستەڕوو، بە لایەوە ژیان زۆر زەحمەت و گرانە، ئەدەبی بەپێز ناکرێت دابەش بکرێت بەسەر ئەدەبی ژنان و ئەدەبی پیاواندا، پێویستە ئەدەب شتێکی خودی بێت، مرۆڤ لەسەر بنچینەی شارەزاییو کەسایەتی خۆی بینوسێ، من زۆر ڕقم لە ئەدەبی ژنانە، قاوەیەکم خواردەوە هەست بە باری خراپ دەکەم، یاخود فلان پەیوەندی پێوە نەکردو بیر لە خۆکوشتن دەکەمەوە، ئەمەیە ئەدەبی ژنان، کە بەش بە حالی خۆم قێزی لێدەکەمەوە، پاشان دەلێت: زۆر بەختەوەرم چونکە ڕۆژێک باوەڕم بە ئەدەبی دەربەست نیە، هەردەم بیردەکەمەوە کە ئەم جۆرە بەرهەمە، بەرهەمێکی بێ پێزو خراپە. لە بارەی تۆنی بلێرەوە دەلێ: شتێکی ئابڕووبەرە، هیچ شتێکی نەکرد لەو شتانەی کە بەلێنی دابوو جێبەجێیان بکات، وەکو مسۆگەر کردنی تەندروستی، هەروەکو خۆی خراپە، هەروەها خوێندن. لە بارەی بوش ەوە وتی: کەسێکی گەندەلە، لە ڕووی دەردەکەوێ کە ڕوویەکی ترسنۆکی هەیە، کەسێکی پیسە.

لە بارەی ئەوەی کە ئێستا چی بەدەستەوەیە، وتی لە سێبتمبەردا کتێبێکی سیاسی بە چاپ دەگەیەنێ بە ناوی (بە چێژترین خەونەکان)، خەون یۆتۆبیایە کە خودی خۆی باوەڕی پێی هەیە، پاشان دەلێت یۆتۆبیای خراپ هەیە، وەکو یۆتۆبیای فرانکو، هیتلەر، مۆسۆلینیو ستالین لە کۆتاییدا وتی، میسالیەکان، کەسانی زێدە ترسناکن، یۆتۆبیایان، مرۆڤ دەکەنە دڕندە کە یەك ئەوی تر بکوژێ.

بەرگی دوەمی سەربردەی ڕۆماننووسی بەریتانی دوریس لیسینگ بە ناونیشانی (ڕۆیشتن لە سێبەرەکان)دا، کە پشت لە داب و نەریت و دەسکەوتەکانی چینەکەی دەکات، لایەنە خراپەکانی ڕیسوا دەکات. لە بەرگی یەکەمی (لەژێر پێستمدا) سەربردەکەی ئاشکراتر وەکو مرۆڤێکی سەرسەخت دەجەنگێ دژ بە شێوازی پێگەیاندن و پەروەردەکردن، بە

جۆرێکی توندو ئاشکرا سەیری جیهان دەکات، بەشی دووەمی سەرگوزشتەی نووسەر، باسی ژیانی ڕۆژانەی نووسەرە کە ئافرەتێکە بە قوڵی لە ئاسمانی یەکەم دەڕوانێ، پاشان دەڵێت: وازم لەم بیرە هێنا، ئێستا دەزانم شتێکی بێهوودە بوو، بە تایبەتی تەقالیدە واقعیەکان کە پێوەی گیرۆدە بووبووم، شتێکی /جدی/ نەبوو بە جۆرێك لە جۆرەکانی لە ڕۆمانەکانی تر بە تایبەتی لە ڕۆمانی (دەفتەری زێڕین)دا دەستبەرداری بووم. ساڵانی نووسینی ئەم ڕۆمانە بۆ پەنجاکان دەگەڕێتەوە کە نووسەر وەسفی ئەزموونی خۆیمان بۆ دەکات و دەڵێ: ژیان زۆر بە هێواشیو لەسەرەخۆ دەڕوا، وەکو دەرچوونی بە قونەخشکێیە لە قوڵتێکدا ڕەخنەگرەکان (دەفتەری زێڕین) یان بە باشترین ڕۆمان لە قەڵەم دا، بزوتنەوەی ئافرەتانیش بە مامۆستایەکی گرنگیان دانا، لەهەر دەفتەرێکدا چارەسەری تاقیکردنەوەیەك لە گۆشەیەکی جیاوازدا دەکات، بە شێوازی گێڕانەوەی پێکەنیناوی، ڕووداوە واقعیەکان تۆمار دەکات. لە (دەفتەری زێڕین)دا مەزنترین دۆزینەوەکانی جیهانی هاوچەرخ دادەهێنێ. هەر لەم کتێبەدا نووسەر گرنگی چوونە ناو حیزبی شیوعیو پاشان وازلێهێنانی دەخاتەڕوو.

هەردەم بە دوای شتی نوێدا دەگەڕێت، ساڵی *1952* (کوڕانی توند)ی بە چاپگەیاند، لەوکاتەوە وەکو یەکێك لە موریدەکانی جۆرج ئەلیوت (*1819–1880*) ناسراوە. منداڵانی توندی کە پاڵەوانەکەی (مارتا کویستا)یە بە دوای ناسنامەی خۆیدا وێڵە، شوێنی لە جیهاندا دەبینێتەوە کە کۆمەڵگای کۆلۆنیالزمە.

باسی پەیوەندی نێوان مارتا کویستاو دایکی دەکات، مارتا کویستا لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بۆ ژیانێکی باشتر هەوڵدەدات. لە دواییدا مارتا مێردەکات و دەوری دایکی دڵسۆز دەبینێ پاشان لە ژیانی خێزانداری بێزار دەبێو جودا دەبێتەوەو دەچێتە ڕیزی حیزبی شیوعییەوە.

ساڵی *1962* گرنگترین ڕۆمانی بەناوی (کورسیەکانی سۆر)ی بە چاپگەیاند کە خەڵاتی (میدیسیس)ی پێوەرگرت وەك باشترین ڕۆمانی بیانی.

لە حەفتاکاندا "کورتکردنەوە لە پێناو دابەزینە دۆزەخ"ی نووسی، ساڵی *1975* پاشماوەی یاداشتەکانی لە ژیاندا نووسی کە بە ڕۆمانی بەرئاوەڵەیی ناوەوە دادەنرێت، کە باس لە داڕمانی عەقڵی تاك و کۆمەڵ دەکات. ساڵی (*1979–1983*) دابڕانی (لیسینگ)ە، ئەو ڕۆمانانەی لەو ماوەیەدا نووسیویەتی بە تەواوی لە واقیع دووردەکەونەوە بەرەو ڕووداوی داستانیو ئەفسوناوی دەچن، بەڵام لە ڕۆمانەکانی تری ساڵی *1985* (تۆقێنەری باش)ی نووسی کە لە بارەی کۆمەڵە توندڕەوێکی سیاسی چینی ناوەڕاستەوە دەدوێ. ساڵی *1988* (منداڵی پێنجەمی) نووسی کە چیرۆکێکی کابوسیە، لە بارەی منداڵی دزێوو گرژ لە دایك و باوکی ئاساییدا. ساڵی *1992* (دیمەنگای لەندەنی) نووسی، کە کۆمەڵە چیرۆکێکی کورتە، پاشان ڕۆمانی (پیاوێك و دوو ژن)، (دابی خۆشەویستی)، (چیرۆکی ئەفریقی) نووسی، هەروەها بەرهەمی شانۆییشی لەسەر پشیلە نووسی کە زۆری خۆشدەویست. دوا ڕۆمانی (خۆشەویستی لە نوێوە) بە شێوازێکی زیندووی نووسیوە، کەشفی سروشتی ژیان و خۆشەویستی ڕاستیەکان تۆماردەکات، کە خودی ڕۆماننووسی تاقیکردۆتەوە، لە هەمان کاتدا ئاژاوەو پەرێشانی ژیانمان بۆ دەردەخات.

هەندێ کاری تری نووسین وەکو لە بارەی کێشەی سیاسیەوە، چارەنووسی ئافرەتان/ ترس لە کارەساتی تەکنەلۆژی، لە هەموویاندا بایەخی بە کێشەی ڕوحی دەدا خاسیەتی ڕۆمانەکانی دۆریس لیسینگ، پەیوەندیەکی قوڵیان بە سەربردەی ژیانیەوە هەیە، کە زۆربەی زۆری لە ئەزموونی ژیانیەوە هەڵقوڵاون، بە

تایبەتی لە ئەفریقا، چوونە ناو جیهانی سیاسەت، بایەخ دان بە باری کۆمەڵایەتی‌و ڕەگەزپەرستی‌و ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵ، تا دووبەرەکی لە نێوان ویژدانی تاك و بەرژەوەندی کۆمەڵدا، شێوازی گێڕانەوەی مێژوویی تاوەکو شێوازی ئاوێتەکراو پەیڕەو دەکات هەروەها شێوازی واقعیانە، لە هەمووشیاندا هۆشیاری و ئاڵۆزی زمان بەرجەستە دەکات. دوریس لیسینگ لە 22ی ئۆکتۆبەری ساڵی 1919 لە دایك و باوکێکی ئینگلیزی لە کرمانشای ئێران هاتۆتە دنیاوە، باوکی بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە بانگی ئیمپراتۆری فارسی لە کرمانشا ڕۆژئاوای ئێران و تاران کاریکردووە، ساڵی 1924 خێزانەکەی بۆ ڕۆدیسیا (زیمبابۆی ئیمڕۆ) گواستویانەتەوە، خوێندنی لە قوتابخانەی ڕاهیباتی کاسولیکی خوێندوە، ساڵی 1939 مێردی بە فەرمانبەرێکی ڕۆدیسی کردوە، پاش چوار ساڵ لێی جودادەبێتەوە، دوو کوڕی لێی دەبێت و بەجێیان دەهێڵێ، دەچێتە پاڵ کۆمەڵی حیزبی شیوعی کە (جود فرید ئەنطون) بەڕێوەی دەبرد، ساڵی 1944 مێرد بە (جود فرید ئەنطون) دەکات، کوڕێکی لێی دەبێ‌و ساڵی 1949 لەویش جیادەبێتەوە، بەرەو لەندەن دەگەڕێتەوەو کوڕەکەو دەسنووسی ڕۆمانەکەی کە بە ناونیشانی (گۆرانی گیاکانە) کە لە ئەفریقادا نووسیبووی دژ بە سیاسەتی ڕەگەزپەرستی دەدوێ کە لە لایەن پێست سپیەکانەوە پەیڕەو دەکرا، ڕۆمانەکە چیرۆکێکی ئاڵۆزە لە نێوان باغەوانێکی پێست سپی‌و کارەکەرە پێست ڕەشەکەی، لە دوای بڵاوبوونەوەی ئەم بەرهەمە وەکو نووسەرێکی ناسراو دەرکەوت و پەرەی بە ڕەگەزی ڕۆمانی بەریتانی دا. وەکو پێشڕەوێکی ئافرەتان هاتۆتە پێشەوە، ژیانی دەنگێك بوە، لە تەمەنی بیست ساڵیدا دەچێتە ڕیزی حیزبی شیوعی‌و لە ساڵی 1956 واز لە حیزب دەهێنێ، چونکە سۆڤیەت هجرستان داگیر دەکات و ڕاپەڕینەکەی خامۆش و کپدەکات، بە سەردانی بۆ سۆڤیەت دەچێ، خەلاتی (دیفید کوهی) پێبەخشرا کە باشترین خەڵاتەو بەهاکەی سێ هەزار جونەیهی ئیسترلینیە.

ساڵی 1974 بوە بە ئەندامی ئەکادیمیای ئەمریکی‌و ئامۆژگای نیشتمانی ئەمریکی بۆ ئەدەب و هونەر. لە ڕۆژی کتێبدا کە گۆڤاری (کۆزمۆپۆلیتان)ی ئافرەتان سازی دابوو، خاوەنی باشترین کتابی نوێ بەشداری تێداکرد، لە شیعرو ڕۆمان و ڕۆمانی کەسایەتی نزیکەی یانزە دەزگای چاپەمەنی پاڵپشتی لێکرد، کۆمپانیای سۆکسی (ئەی، تی، سی) کە زنجیرەیەك بازاڕی کتێب فرۆشتنی هەیە، جەماوەرێکی بەرفراوان خزانە هۆڵەکانەوە، لە یەکەم بڕگەی سیمینارەکەدا دوریس لیسنگ ئاخاوتنی تێداکرد، کە تەمەنی (75) ساڵەو خاوەنی ڕۆمانی (دەفتەری زێڕینە)یە کە کاریگەری گەورەی کردۆتە سەر ئەدەبیاتی ئافرەتان. دوریس دەڵێ: یەکەم بیرەوەریم لە کرمانشا بوو، کە باوکم سواری ئەسپە زل و ترسناك و سەرشێتەکانی دەکردم، لوریس بە شێوەیەکی بەتام و سەرنجڕاکێشەر بیرەوەریەکانی لە بارەی ئێرانەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: باغەوانێکی ئێرانی کە باخچەکەی ئاو دەدات، لە بەفراوی چیاکانەوە کە دەڕژایە جۆگەلەی باخچەکە، منیش دەچوومە ناو جۆگە ئاوەکەو دەهاتمەوە دەرێ، باغەوانەکە بەمە زۆر نارەحەت و تووڕە دەبوو، تامی بۆن‌و شتەکانی ئێران بە خێرایی ونبوون، بە هۆی ڕەنگ و دەنگ و بۆنەکانی ئەفریقاوە، پاشان بەرەو پاکستان چووین کە کۆتایی هەشتاکان بوو، بە ڕاستی جیهانێکی پڕ سەیرو سەمەرە بوو، کەڵەباب دەیقووقاند، کەر زەڕەزەڕی دەکرد، ئێستا لە لەندەنم لەسەر داوێنی گردۆڵکان کەڵەباب دەقوقێنێ بەڵام نازانم لە کوێندەرم، بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ: تەمەنم پێنج ساڵ بوو کە خێزانەکەم لە تارانەوە بە ڕێگای مۆسکۆوە بە ئاقیلەی نەوت لە دەریای قەزوینەوە پەڕینەوە بەرەو لەندەن چووین، ژووری قیتارەکان بچووك بوون، بۆنی ئارەق و ڕشانەوەو مشکیان لێدەهات، منداڵە بە ڕوو

برسـیەکانیانەوە لەبـەر پەنجـەرەکاندا ڕایـاندەکردو دەستەکانیان بە ڕووی نەفەرەکانەوە بەرزدەکرنەوە.

سەربردەی ژیانی دوریس لیسینگ پڕن لە پرسیارو تێبینـی، چونکـە پـەیوەندی نێـوان ژیـان و ڕۆمانـەکانی دەردەخا، بەشی یەکەمی سەربردەکەی کە باسی ژیانی پەنجاکان دەکات لـە ساڵی *1949* تـەواویدەکات، بەشی دووەمی سـەبردەی بەرەنگاری گیروگرفتی زۆر دەبێتـەوە چونکە بەشێکی زۆری کەسەکان لە ژیاندا ماون، بۆیـە نەیدەتوانی هەموو شتێ ئاشکرا بکات.

### سەرچاوەکانی بۆ ئەم باسە سوودم لێوەرگرتوون

*1-G. Sampcon, The Concise History of English Litterature, Cambridge, 1961.*

2-الحياة اللندنية، العدد (*11577*)، *1994*.

3-الحياة اللندنية، العدد (*12741*)، *1998*.



## ن: ڤێرجینا وۆلف

# خوشکەکەی شکسپیر

و. لە فارسیەوە: سەروەر عومەر

بۆ هەر ژنێك لە سەردەمی شکسپیردا بە تەواوەتی نامومکین بوو کە شانۆنامەکانی شکسپیر بنووسێت، چونکە دەستڕاگەیشتن بە "واقیعیەت" زۆر دژوارە، ڕێگە بدەن "تەسەور" بکەم کە ئەگەر شکسپیر خوشکێکی لە ڕادەبەدەر بەتواناى هەبوایە، بۆ نمونە بەناوی جۆدێت *Judith* چی ڕوویدەدا. بە ئەگەری زۆر، شکسپیر دەڕۆیشت بۆ قوتابخانەی ئامادەیی- دایکی خاوەنی میراتی بوو- و لەوێدا زمانی لاتینی- بەرهەمەکانی ئوید، ڤێرجیل و هۆراس- و ڕێزمان و مەنتیق فێردەبوو. زانراوە کە ئەو کوڕێکی چەتوون بوو کە بە شێوەیەکی ڕێگەپێنەدراو کەروێشکی ڕاودەکرد، ڕەنگە گاکێویشی ڕاوکردبێت. بەر لەوەختی خۆشی، لەگەڵ ئافرەتێکدا لە گەڕەکەکەی خۆیان زەواجی کرد، کە ئەویش بەر لەوەختی خۆی منداڵێکی هێنایە دونیاوە. ئەم کارە دلێرانەیەی ئەو بوو بە هۆی ئەوەی بۆ دەستکەوتنی پارەو سەرکەوتن بڕوات بۆ لەندەن. بە ڕواڵەت حەزی لە شانۆ بوو؛ ئەو کاری خۆی لە شانۆدا بە چاودێری ئەسپەکان لە پشتەوەی سالۆندا دەستپێکرد. زۆر زوو لە شانۆدا کارێکی بۆ خۆی پەیداکرد، ئەکتەرێکی سەرکەوتوو بوو و لە دڵی جیهاندا، ژیانی دەستپێکرد، هەموانی دەبینی، هەموانی دەناسی. هونەری خۆی لەسەر تەختەی شانۆدا بەڕێوەدەبرد، لە نێوان خەڵکیدا کەڵکی لە هەست و خۆشی خۆی وەردەگرت و تەنانەت ڕێگەی کۆشکی شاژنیشی دۆزیەوە.

گریمان هەر لەم کاتەدا خوشکی لە ڕادەبەدەر بەتواناى ئەو لە ماڵەوە مایەوە. ئەویش هێندەی براکەی بۆ بینینی دونیا، ڕووداوخواز، خەیاڵ پەروەرو بێ ئارامبوو، بەڵام ئەویان نەناردە قوتابخانە. ئەو تەنانەت دەرفەتی فێربونی ڕێزمان و مەنتیقیشی بۆ نەڕەخسا چ جای خوێندنی بەرهەمەکانی هۆراس و ڤێرجیل. جارجارێك کتێبێکی هەڵدەگرت، کە پێدەچێت یەکێکیش بووبێت لە کتێبەکانی براکەیو چەند لاپەڕەیەکی لێدەخوێندەوە، بەڵام پاشان دایك و باوکی دەهاتن و پێیان دەوت پارچەی گۆرەوییەکان بچنێت، یا ئاگای لە خۆی بێت و بە خوێندنەوەی کتێب و ڕۆژنامەوە خەیاڵ لێنەدات. ئەوان بە ئاوازێکی توند بەڵام میهرەبانانە قسەیاندەکرد. چونکە ئەوان کەسانێکی واقیعی و ناخەیاڵاتی بوون کە هەلومەرجەکانی ژیانی ئافرەتێکیان دەزانیو کچەکەی خۆیان خۆشدەویست. لە ڕاستیدا، ئەو بە ئەگەری زۆر نووری چاوی باوکی بوو. ڕەنگە ئەو بە شێوەیەکی نهێنی چەند لاپەڕەیەکی لە ژووورداو لەژێر

سەققی خانوودا بە پەلە نووسیبێت، بەڵام هەستی دەکرد کە دەبێت بیانشارێتەوە یا بیانسووتێنێت.

بەم حاڵەوە زۆر زوو، بەر لەوەی سەردەمی تازە لاوێتی تێپەڕێنێت، بڕیار بوو ئەو لە کوڕی بازرگانێکی خوریی دراوسێیان مارەی بڕن، ئەو دەستی کردە هاتوهاوار کە ڕقی لەزەواج دەبێتەوە، لەبەرئەوە باوکی بە توندی کەوتە لێدانی. باوکی پاشان لەسەر کۆنەکردنی ئەو دەستی هەڵگرت. لە بەرامبەردا لێی پاڕایەوە کە ئازاری نەدات و مەسەلەی زەواجی ئەو نەبێتە هۆی ئابڕوو تکانی، وتی کە ملوانکە یا ژێردامەنییەکی جوانی پێدەدا؛ گریا. چۆن دەیتوانی گوێڕایەڵی باوکی نەکات؟ چۆن دەیتوانی دڵی باوکی بشکێنێت؟ ئەو توانا و ئامادەییەی کە لە خۆیدا شکی دەبرد ئەوی بەم کارە ناچار دەکرد. شتومەکەکانی خۆی لە جانتایەکدا کۆکردەوەو بە تەنافێك لە شەوێکی هاوینیدا لە دیواری ماڵەکەیانەوە دابەزییە خوارەوەو بەرەو لەندەن بەڕێکەوت. ئەو تەمەنی لە *17* ساڵ تێنەدەپەڕی. ئاوازێك کە باڵندەکان لە دەوروبەری پەرژینەکاندا دەیانخوێند ئاهەنگئامێزتر نەبوو لە ئاوازەکانی ئەو. ئەو بۆ ئاوازی وشەکان خاوەنی بەهێزترین خەیاڵبوو، خاوەنی فەهم و توانایەك بوو وەك فەهم و توانای براکەی، ئەویش وەکو براکەی حەزی لە شانۆ بوو. لە تەنیشت دەرگای پشتی ساڵۆنێکەوە وەستا، دەیگوت کە دەیەوێت ببێتە ئەکتەر. پیاوان پێی پێکەنین. بەڕێوەبەری شانۆ -پیاوێکی قەڵەو بە لچ و لێوێکی شۆڕەوە- قاقا پێکەنی. بە هات و هاوارەوە شتێکی لە بارەی سەمای سەگەکان و ئەکتەرێتی ژنانەوە وت. وتی کە هیچ ژنێك ناتوانێ ببێتە ئەکتەر. ئەو وتی.. (خۆتان دەتوانن تەسەورکەن چی وت). ئەو نەیتوانی بۆ ئەم پیشەیە بچێتە بەر خوێندن. ئایا تەنانەت دەیتوانی بە شوێن خۆراکدا بڕواتە میوانخانەیەك یا نیوەشەو لە شەقامەکاندا بسووڕێتەوە؟ بەم حاڵەوە ئەو لە مەیدانی ئەدەبیاتدا ئامادەیی هەبوو و تینووی ئەوەبوو کە لە شێوەی ژیانی پیاوان و ئافرەتان وردبێتەوە. سەرئەنجام چونکە زۆر لاو بوو، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕوخساری لە شکسپیری شاعیر دەچوو. بە هەمان چاوانی خۆڵەمێشیو دوو برۆی کەوانی. نیك گرین *Nickgreene* بەڕێوەبەری ئەکتەرەکان دڵی بە حاڵی سووتا؛ و بینی کە ئەو جێنتڵمانێکی لە خۆیدا هەڵگرتوە، بەم پێیە -چ کەسێك دەتوانێ ئەندازەی گەرمیو توندی دڵی شاعیرێك بگرێت کاتێك ئەسیرو شەیدای جەستەی ژنێك دەبێت- لە شەوێکی زستاندا خۆی کوشت و لە زەوییەکی دابڕاودا بە خاك سپێررا، ئەو شوێنەی کە ئێستا پسەکان لێی ڕادەوەستن لە دەرەوەی مەیخانەی ئیلیفانت ئاندج کاستل *Elephant and Castle*.

بە بۆچوونی من ئەگەر ژنێك لە زەمانی شکسپیردا خاوەنی ئەو توانا و لێهاتووییەی شکسپیر ببوایە چیرۆکەکەی تەقریبەن بە هەمان شێوە دەبوو کە باسمکرد، بەڵام من خۆم لەگەڵ قەشەی خوالێخۆشبوو - ئەگەر خوالێی خۆشبووبێت- هاوڕام کە تەسەور نەکراوە لە زەمانی شکسپیردا ژنێك بلیمەتی شکسپیری هەبووبێت. لەبەرئەوەی کە بلیمەتییەك لە جۆری بلیمەتی شکسپیر لە نێوان خەڵکی کرێکارو نەخوێندەوارو خزمەتکاردا بەدی نەدەهات. لە ئینگلستان لە نێوان ساکسۆنەکان و بەریتانیەکاندا بەدی نەدەهات. ئەمڕۆکەش لە نێوان چینەکانی کرێکاراندا بەدی نایەت. کەواتە بلیمەتی چۆن دەکرێت لە نێوان ژنانێکدا کە بە وتەی پرۆفیسۆر تریڤلیان *TrevelyanK*، هێشتا پێیان لە دایەنگە نەهێناوەتە دەرەوە بەدی بێت؟ بەم حاڵەوە بلیمەتییەکی لەم جۆرە دەبێت لە نێوان ژناندا بوونی هەبێت بە هەمان شێوە کە دەبوو لە نێوان چینەکانی کرێکاراندا بوونی هەبێت. جارجار "ئەمیلی برونته[1]"یەك یا "رابرت بیرنز[2]"ێك چاوەکانی ئەبڵەق دەکات و بوونی خۆی دەسەلمێنێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە هەرگیز ناوی خۆی لەسەر کاغەز تۆمار ناکات. بەم حاڵەوە، کاتێك بەسەرهاتی ژنێکی جادووگەر کە سەری

نوقمی ژێرئاو دەکەن، بەسەرهاتی ژنێک کە هێزە شەیتانیەکانی ڕامکردوە، بەسەرهاتی ژنێکی بە ئاوەز کە گیا دەرمانیەکان دەفرۆشێت، یان تەنانەت بەسەرهاتی پیاوێکی نائاسایی کە دایکێکی هەیە، دەخوێنینەوە بە گومانم لە هەمبەر ڕۆماننوسێکی ونبوودا، لە بەردەم شاعیرێکی سەرکوتکراودا ڕاوەستاوین. ڕۆماننووسێك و شاعیرێك لە جۆری "جین ئاوستین"[3]ی بێدەنگ و نەناسراو یا ئەمیلی برۆنتەیەك کە مێشکی خۆی دەرشتە سەر زەمینێکی بەیار، یا بە هۆی ئەو ئازارانەوە کە دەدرا لەسەر ئامادەیی‌و تواناییەکەی، لە دووڕیانەکاندا وەکو شێت دەسووڕایەوە لە ڕاستیدا من بە پڕکێشیەوە پێشبینی دەکەم *Anon*[4] کە شیعرگەلێکی زۆری بەبێ ناوو بەبێ ئیمزا نووسی، زیاتر ژنێك بوو.

## پەراوێز

1- *Emily Bronte* ڕۆماننووس و شعیری ئینگلیزی *1848-1818*

2- *Robert Buns* شاعیری ئۆسکوتلەندایی *1796- 1759*

3- *Jane Austen* ڕۆماننووسی ئینگلیزی *(1817-1775)*

4- (کورتکراوەی *Anonymous*) واتە گومناو.

## سەرچاوە

گلستانە، ژمارە *32*

ساڵی سێهەم، مهر *1380*.



# دواکۆچی
# کامیلۆ خۆسێ سێلا

نا: ئازاد بەرزنجی



لە بەیانیی ڕۆژی 2002/1/17داو لەو نەخۆشخانەیەدا کە بۆ چارەسەر لێی کەوتبوو؛ ڕۆماننووسی ئیسپانیایی گەورە (کامیلۆ خۆسێ سێلا) بە نەخۆشیی دڵ و لە تەمەنی هەشتاو پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

هەستکردن بە مەرگ و ئامادەبوونی؛ بەلای سێلاوە شتێکی نامۆ نەبوو. ئەو هەر لە سەرەتاوە ڕۆحی مەرگ لە کارەکانیدا ڕەنگی دابۆوە. یەکەم شیعری کە لە ساڵی 1934دا بلاوبۆوە بە ناونیشانی "دیڤنی"وەوە بوو. لە ساڵی 1936یشدا سێلا "سروودی مەرگ"ی نووسی؛ کە تیایدا هاواردەکات "ئەی مەرگ، وەرە". هەروەها لە "سێ سۆنێتە بۆ عیشق و مەرگ"دا بەمجۆرە ڕووئەکاتە مەرگ و لەگەڵیدا ئەدوێت:

"من ئەزانم
لەهەر شوێن و ساتێکابێ
بەتیرە ژاراوییەکەت
دڵی وریام
کوناودەر ئەبێ"

ئەم برادەرێتییە لەگەڵ مردندا لە یاداشتەکانی سەرەتای ژیانی نووسینیشیدا دەبینینەوە؛ کە لە پەنجاکاندا بلاوی کردەوە. لە یاداشتەکانیدا کە ناوی "گول"ە ئەلێت:

"هەر دوو ڕۆژ دوای لەدایکبوونم خەریک بووم ئەمردم، ئیدی لەوساوە، ناوبەناو بوومەتە مایەی ترس بۆ خێزانەکەمان. تا ڕادەیەك تەندروستیم لە حیکایەتی ڕێوییەکە ئەچێت. ڕۆژێ لە ڕۆژان بە ڕاستی ئەمرم و کەسیش بڕوا ناکات".

دواجار ئەم مەرگە پڕی بە گیانی گەورەی سێلادا کرد.

سێلا لە ساڵی 1916دا لەدایك بوو، لە ساڵی 1934ەوە بە شیعر ژیانی ئەدەبیی خۆی دەست پێکردو تا مردن لەگەڵیدا بەردەوام بوو، تەنانەت کاتێ بوو بە ڕۆماننووسیش هەر وازی لە نووسینی شیعر نەهێنا. بەڵکو لە ساڵی 1996دا کۆی شیعرەکانی لە کتێبێکدا

چاپ کردو شاعیری گەورەی ئیسپانیا (خۆسێ ئەنخێل بلانسێ) پێشەکیی بۆ نووسی.

لە ساڵی 1942دا یەکەم ڕۆمانی خۆی بڵاوکردەوە کە ناوی "خێزانەکەی باسکال دوارتی" بوو، کە هەندێ لە ڕەخنەنووسان بە ڕۆمانی "نامۆ"ی کامۆیان شوبهاند. ئەم ڕۆمانە گۆمی وەستاوی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئیسپانیای ئەودەمەی شڵەقاندو تا ئێستاش هەر مایەی لێدوان و ڕەخنە لەسەر نووسینە.

ژیانی سێلا ژیانێکی پڕ بەرهەم و چالاکی بوو، ئەو جگە لەوەی ڕۆماننووسێکی بەناوبانگ و شاعیرێکی باش بوو؛ سەرپەرشتیاری گشتیی گۆڤارێکی ئەدەبیش بوو کە ناوی (*Pape lesde son Armandaus*) بوو و ڕەخنەنووسان بە یەکێك لە گۆڤارە ئەدەبییە زۆر گرنگەکانی دەزانن کە بە زمانی ئیسپانیایی دەرچوون، ئەمە جگە لەوەی کە شای ئیسپانیا پاش کۆچی ژنەراڵە ترسناکەکەو لە قۆناغی گواستنەوەدا سێلای کرد بە (سیناتۆر).

لە ساڵی (1948)دا کتێبی "گەشتێك بۆ ئەلکاریا"ی نووسی کە تیایدا ڕووبەڕوو بوونەوەی دیمەنە سروشتیی‌و دێهاتییەکان لەگەڵ کەشوهەوای خنکاوی شاردا دەبینینەوە، بەڵام لە کتێبی دواتردا کە ناوی "شانە- سێل" 1951 بوو، شار ئەو ڕۆڵە بۆ خۆی دەسەنێتەوەو مەدریدی ساڵی (1942)مان بیردەخاتەوە.

لە ساڵی (1969)دا کتێبی "سان کامیلۆ 36"ی چاپ کرد. ئەم ڕۆمانە گەرچی پەرش و بڵاوەو پڕییەتی لە کەسێتیی جۆراوجۆر؛ بەڵام دیارە کە نووسەرەکەی کارامەو لێهاتووە. ڕەخنەنووسانیش ڕایان وابوو کە ئەم ڕۆمانە لەگەڵ ئەو "ناسیاسەت"ەدا زۆر گونجاوە کە لەو دەمەدا باوبوو: "لەوانەیە ڕۆژێك بە فاشیستی لە دایك ببین و ڕۆژی دوایی ببین بە مارکسیست".

پاشتر ڕۆمانی "ڕێوڕەسمی ناشتن"ی نووسی کە لە 1194 برگە پێك دێت و وەکو خۆی دەڵێت؛ ئەم کتێبە بریتی‌یە لە "پاکژکردنەوەی دڵ".

لە ساڵی (1983)دا ڕۆمانی "ئاوازی ماسۆرکا بۆ دوو مردوو"ی بڵاوکردەوە؛ کە یەکێکە لە ڕۆمانە سەرکەوتووەکانی.

داواکاری سێلاش کتێبی "کریستۆ دژی ئەریزۆنا" بوو کە لە ساڵی 1988دا نووسی، ئەم کتێبە یەك ڕستەیەو 230 لاپەڕە دەخایەنێت، وەکو گۆنزالۆ سۆبیخانۆی ڕەخنەنووسیش ئەڵێت ئەم کتێبە بریتی‌یە لە گوتارێکی زاری سەبارەت بە یادێك کە بەردەوام لە گۆڕاندایەو لە لایەن کاراکتەرێك/ حیکایەتبێژێك/ نووسەرێکەوە دەگوترێ.

لە ساڵی (1989)دا خەڵاتی نۆبل بەخشرا بە سێلا بەڵام لە ساڵانی کۆتایی ژیانیدا گەڕایەوە بۆ جۆرە شێوازێکی کلاسیك و نووسینەکانی بەرەو داکشان چوون.

بەهەرحاڵ کاتێ باس لە ئەدەبی ئیسپانی دەکرێ لە سەدەی بیستەمدا؛ ناکرێ ناوی "کامیلۆ خۆسێ سێلا" فەرامۆش بکرێ.

## سەرچاوە

لە السفیر"ی ڕۆژی 2002/1/18 ەوە

